## مادلین ئۆلبڕایت

# دەسەڵات و دەسەڵاتی ڕەها

### پێشەکی بەپێنووسی

### بیل کلینتۆن

(سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا)

### وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

### فوئاد یونس فرحان

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● **دەسەڵات و دەسەڵاتی ڕەها**

● **نووسینی:** مادلین ئۆڵبرایت

● **وەرگێڕانی:** فوئاد یونس فرحان

● **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی

● **بەرگ:** حەمیدە یوسفی

● **چاپ:** ٢٠١٢

● **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار

● **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

● **چاپخانە:** چاپخانەی هێڤی (هەولێر)

● لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٩٤٣)ساڵی (٢٠١١)ی پێی دراوە

**زنجیرەی کتێب (٤٤٤)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك


پێشەكییەك بۆ چاپی بەریتانیا ........................................ ٩

پێشەكی لەلایەن ولیەم جێی. كلینتۆن چل و دووەمین سەرۆكی ئەمەریكا .......... ١٣

**بەشی یەكەم: خودا، ئازادی، وڵات** ........................................ ١٧

یەك: دەسەڵات و دەسەڵاتی رەها ........................................ ١٩

دوو: هەموو خەڵك چاویان بڕیوەتە سەرمان ........................................ ٣١

سێ: نییەتە باشەكان لە رێگا لادەدەن. ڤێتنام، شا ........................................ ٤٦

چوار: پرسی ویژدان ........................................ ٥٩

پێنج: عەقیدە و دیپلۆماسی ........................................ ٧٥

شەش: شەیتان و مادلین ئۆلبرایت ........................................ ٨٩

حەوت: لەبەرئەوەی ئەمە راستە ........................................ ١٠٠

**بەشی دووەم: خاچ، مانگ، ئەستێرە** ١١٥

هەشت: تێگەیشتن لە ئیسلام ........................................ ١١٧

نۆ: خاكی پیرۆز، بەڵام هی كێیە؟ ........................................ ١٣٠

دە: گەورەترین جیهاد ........................................ ١٥١

یانزدە: خودا منی وەك سەرۆك دەوێ ........................................ ١٦١

دوانزدە: عیراق دەرئەنجامە نەویستراوەكان ........................................ ١٧٠

سێزدە: رووبەڕووبوونەوەی قاعیدە ........................................ ١٨٨

چواردە: كێشەی عەرەبستانی سعودی ........................................ ٢٠٤

پانزدە: دیموكراسییەتی عەرەبی ........................................ ٢١٧

شانزده: ئیسلام لە ڕۆژئاوا ........................................ ٢٣١

حەڤدە: ئەفریقیا، پێشبڕکێی رووحەکان.................................. ٢٤٩

**بەشی سێیەم: تێڕامانی کۆتایی** ........................................ ٢٦١

هەژدە: هەموو گونجاوە پێکاوەکان........................................ ٢٦٣

نۆزدە: داواکردنی فریشتەیەکی باشتر..................................... ٢٧٧

**پێشکەشە بە:**

- **تاڤگە کە ژیانێکی خۆشەویستی پێبەخشیم...**
- **دایکم کە خۆشەویستی ژیانی فێرکردم...**
- **باوکم کە فێری ئەوەی کردم هەمیشە بە بەرزی بڕوانمە ئەو کەسانە کە خەڵکان بە نزم سەیری دەکەن...**

**پێشکەشە بە هەموو ئەو نەتەوە و باوەڕدارانەی کە هەمیشە بەرگری لە ئازادی دەکەن و ئاشتی بنیات دەنێن، نەزانی بنبڕدەکەن، ململانێ لەگەڵ هەژاری ژیاندا دەکەن، هەروا بەدوای دادگەریدا دەگەڕێن.**

# پێشەكییەك بۆ چاپە بەریتانییەكە

لە دیسەمبەری ساڵی ٢٠٠٥ دا، لە كڵێسەی خاتوو مارگرێتی پیرۆز بەشداریم لە هاوخەمییەكاندا دەكرد، كە كەوتبووە خانووی حكوومی پەرلەمانی شاری لەندەن. خۆی لەخۆیدا بۆنەكە وەك یادكردنەوەیەكی رۆبن كۆك بوو وەك وەزیری دەرەوەی بەریتانیا، هاوكات لەگەڵ ساڵانی خزمەتكردنی وەزیرایەتی خۆمەوە، خزمەتی وڵاتەكەی دەكرد. چوار مانگ زووتر لە یەكێك لە شەقامەكانی سكۆتلەند كەوت، لەوكات لەگەڵ گاینەری خێزانیدا رێیان دەكرد. دوو ساڵ بەرلەم رووداوە نامەیەكی وازهێنانی بۆ حكوومەتی بەریتانیا بەرزكردەوە لەبەر ئەوەی هەرگیز لەگەڵ داگیركردنی عێراقدا هاوبیرنەبوو.

رۆبن كۆك هەرگیز بانگەشەی باوەڕهێنانی بۆ خودا نەدەكرد، وە نە مەبەستی ئەوەشی هەبوو كەوا ژیانی لە نێو كڵێسادا یادبكرێتەوە. ئەو خۆی، هەروەك دەڵێن، ئەندامی بەرێوەبردنی كڵێسە بووە لەهەمان كاتیشدا بڕوای بە بوونی خودا نەبوو. لە بۆنەكەدا، تۆنی بلێر لە لوك وتاری خۆی خوێندەوە. گاینەر چەند دێرە شیعرێكی بەدەنگی بەرز خوێندەوە كە پێشبینیكردنێك بوو بۆ رۆژانی داهاتوو-- تاوەكو ئێستاش هەر چاوەڕێین. گۆردن براون كۆكی وەك " گەورەترین پەرلەمانتار" ناودەبرد. منیش بیرەوەری خۆمم پێشكەشكرد، لەناویدا ناوی رۆبن یشی تێدا بوو لە بەشداریكردنم كە بە "X mins" ناومان دەبرد، وەك گرووپێكی وەزیرەكانی دەرەوەی پێشوو لە ئەوروپا و كەنەدا و ولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا.

زیاتر لە ٨٥٠ نوێنەری وڵاتانی سەرتاسەری جیهان لە شوێنی بۆنەكە كۆببوونەوە. تەنها بۆ ساتێك، شێوازەكانی گفتوگۆی سیاسەتی گشتی و نێودەوڵەتی بەلاوەنراو باسیان لێوە نەكرا، چونكە هەمان پرسیارە سەرەكییەكان كەوایان لە رۆبن كۆك كرد كۆتایی بە ئاهەنگی پێشڕەوكردن بێنێ و ببێتە هۆی دروستبوونی بۆشاییەكی فراوانتر لە ئەمریكا و ئەوروپادا، هەروەها لەنێوان ئیدارەی بۆش و ئەو رەخنانەی كە لە سەرتاسەری جیهانەوە رووبەڕووی دەبێتەوە.

لەلایەکەوە، ئەوانەی کە سەیری داگیرکردنی عێراق وەك وەڵامدانەوەیەکی پێویست و خێرای ١١ی سێپتێمبەر دەکەن، ڕووداوێك بەجۆرێك یاساکانی جەنگی بەتەواوەتی لە سەرتاسەری جیهاندا گۆڕی، هەروەها شەرعیەتێکی یاسایی بە ئەمەریکا دا کە لەهەر کات و شوێنێکدا و بە هەرجۆرێك دەتوانێ بەرگری لەخۆی بکات لە کاتێکدا سەرکردەکان گڵۆپی سەوز هەڵبکەن بێگوێدانە رای گشتی و یاساکانی نەتەوە یەکگرتووەکان. لەلایەکیترەوە، هەندێکیتر هەبوون ( لەنێوانیاندا خۆشم)، سەیری تیرۆری نێودەوڵەتی دەکەن وەك مەترسییەکی جیهانی کە هەردەبێ بەسەریدا سەربکەوین لەڕێگای هاریکارییەکی چاڵاکی هاوڕێیە کۆنەکان و ئەم هاوپەیمانانەی کە بڕوای پتەویان بە مانەوەی درێژخایەنی مافەکانی مرۆڤ و بەرزڕاگرتنی یاساکانی نێودەوڵەتی هەیە. بۆیەش لەم ململانێیە سیلکی سەربازی رۆلی ئەکتیڤی خۆی دەبینێ بەڵام گۆڕەپانی یەکلایی کردنەوەی جەنگ یەکێکە لە بۆچوونەکان نەوەك هەمووی.

قسەکردن لەبارەی ستراتیژی وڵات و پلانی جەنگ شتێکی ئاساییە بۆ هەر لایەنێك کە بیکات، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی کە لەحاڵەتی جەنگدان. بەڵام ئەوەی لێرە جیاوازە ئەوەیە دەبێ دووبارە نەشتەرگەری بۆ رۆلی ئایین بکەینەوە لەبەڕێوەبردنی ئیدارەی وڵات. زۆرێك لەو وڵاتانی ئەوروپی هەروەها ئەو لایەنگرانەش کە لە داگیرکردنی عێراقدا بێدەنگییان نیشانی جیهاندا نیگەرانی ئەوەن کە ئایین زۆر بە ڕوونییەوە بە ڕوخساری وتارەکانی سەرۆك بۆشەوە دەبینرێ، نەك هەربەوەشەوە نەوەستاوە بەڵکو بەجۆرێك لە وتارەکانی جەخت دەکاتەوە کە خودا تەنها ئەوی لاپەسەندە بۆ سەرکردایەتی کردنی ئەمەریکا و هەموو وڵاتانی جیهان. ژمارەیەك لە ئەمەریکییەکانیش هەست بەم نارەحەتییە دەکەن، بەتایبەتی ئەو قوتابیانەی کە لە بواری مێژووی سیاسییەوە دەخوێنن باشتر درك بەمەدەکەن کە مەترسییەکان زیاتر لای ئەم سەرکردە سیاسییانەوە لەدایك دەبن کە خۆیان وەك جێنشینی خودا لەسەر زەوی نیشاندەدەن.

مشتومڕی ئێستای جیهان بەتەواوەتی ئالیکی دەرخواردی رای گشتی هەموو دونیای داوە بەتایبەت لەبارەی عەلمانییەتی ئەوروپی و دینداریيەتی ئەمەریکی، بەڵام خۆی لە خۆیدا ڕاستییەکان زۆر لەوە قوڵترن کە خەڵك خۆیان پێیەوە خەریککردووە. ئەمەریکا نەبۆتە تیۆکراسی، وە ئەوروپاش زۆر لە بێ دینییەوە دوورە. خۆی لەڕاستیدا، ڕێژەی ئەوروپییەکان زۆر وریاترن لە تێکەڵکردنی ئایین و سیاسەت بەیەکەوە بەبەراورد لەگەڵ ڕێژەی ئەمەریکییەکان، هەروەها کەمتر لەگەڵ ئەوەن کە ئایین و رەوشت بەیەکسانی سەیربکرێن. جیا لە ئەوروپا، ولایەتە یەکگرتووەکان هەرگیز ئەزموونی شەرێکیان بەخۆوە نەدیوە کە ئامانجی

سەرەکی ناکوکی ئایین بوو‌بێت، هەرگیزیش لەلایەن کلێسەوە حوکم نەکراوە. بەلای زۆربەی ئەمەریکییەکانەوە لێکدانەوەی ئایین بەڕوونی کاریگەری ئەرێنی هەیە. پاڵنەری موژدەبەر، کە لەسەرەتادا لە میراتی ئەورووپاوە ماوەتەوە، لە ئیمڕۆوە زۆر بەزەقی لە جیهانی نوێدا گەشەی کردووە لەوە لەنێو جیهانی کۆندا.

کاتێ هەلی ئەوەم بۆ ڕێکەوت کە گەشتێك بەدەوری وڵاتانی ئەورووپی و ئەمەریکی بکەم، زۆرجاران ناچاری ئەوە دەکرام هەوڵی ئەوە بدەم تاکەتاکە قسە لەگەڵ ئەم وڵاتانە بکەم و باسی سیاسەتی نێودەوڵەتی ستراتیژییەتی وڵاتی خۆمیان بۆ بکەم. وا هەست دەکەم وەك ئەوەی لە سەردەمی چنین و تەونکارییەوەبم، وەك ئەوەی سەدەیەك یاخود دووان بەرلە ئێستا ئەو کاتانەی کە ئەورووپا وەك وڵاتێکی دوور لەمەدەنی و پێشکەوتنەوە سەیری ئەمەریکای دەکرد و هەروەها ئەمەریکاش وەك خودای سەر زەمین دەیڕوانییە ئەورووپا. ئەمە شتێك نەبوو کە خۆم وای بۆدەچووم لەوکاتەی ماوەی خزمەتکردنم تەواو کرد و حکوومەتم لە ساڵی ٢٠٠١ بەجێهێشت. هیوبێرت ڤێدرین، وەزیری دەرەوەی فەرەنسای ئەوکات، لەوانەبوو رەخنە لە ئەمەریکا بگرێت لەوەی کە بۆتە خاوەنی "هێزێکی لەبن نەهاتووی" ناوچەکە، بەڵام کاتێ قەیرانی خوێن ڕێژییەکەی کۆسۆڤۆ دەستی پێکرد ولایەتە یەکگرتووەکان و فەرەنسا شان بەشانی وڵاتەکانیتری ئەورووپی بەیەکەوە کاریان دەکرد بۆ وەستاندنی ئەم ئاریشەیە.

*خودا و دەسەڵات* لەزۆر رووەوە وەك وەڵامێك خۆی دەردەخات بۆ تێگەیشتنێکی زیاتری نێوان ئەورووپا و ولایەتە یەکگرتووەکان، نێوان سیاسەتی ڕاست و چەپ، نێوان ئایین و عەلمانییەت، هەروەها نێوانی هەموو بیروباوەڕە جیاوازەکان. ئەم کتێبە باس لەم هەموو جیاوازییانە دەکات کە بەراوردێك لەگەڵ مرۆڤ بوونی ئاسایی دەکات کە پێمانەوە بەستراون. بەجۆرێك نیشاندراوە کە گوتارێکی ڕاستە و پێویستیشە کاری بۆ بکرێت و بناسرێتەوە. هەوڵەکان بۆ خۆ ڕزگارکردن و نکۆڵی کردن دەبێتە هۆی دروستبوونی شەڕ و ناکۆکی.

تێگەیشتنی سەلمێنراو تەنها ڕێگەچارەی کۆتایی نییە. هەڵەی سیاسی وا بەئاسانی لێینابووردرێت چونکە دەبێ پاڵنەر و ئەگەرەکانی پشت ئەم هەڵانە ڕوونبکرێتەوە. ئەوانەی کە هێز و دەسەڵاتیان لە ژێر دەستدایە دەبێ بەردەوام حیسابیان لەگەڵ بکرێت لەبارەی دوا ئەنجامی بڕیارەکانیانەوە تەنانەت ئامانجیشیان لە باشترینەوە بێت. وڵاتەکان ناتوانن کۆمەکی ئەو سەرکردانە بکەن کە بەشێوەیەکی بەرچاو هەڵە دەکەن تەنانەت هەموو جیهانیش ناتوانێ. بڕوام وایە کە وڵاتە تاك لایەنەکان هەموویان هەڵەن و کارەساتی ١١ی سێپتەمبەر زۆر لەوە

دوورتر بوو لە بەشەرعی کردنی پەیوەستە شەریکەکانی ئەتلەنتی، لە دەستووری هاوپەیمانان و ئەو یاسایانەی کە یارمەتی ئەم شەریکانە دەدات. زۆر لەگەڵ پێشبینییەکانی رۆبن کوك کۆکم کە لە وتاری وازهێنانەکەی ئاماژەیی پێکرد "مێژوو بەم هەڵە لێکدانەوە دیبلۆماسییانە سەرسام دەبێت" کە لەدوای ١١ی سێپتەمبەر و پێش داگیرکردنی عێراقەوە دێنە بەرچاو.

نۆستالژیا لەبارەی ولایەتەکانی ئەمەریکا--پەیوەندییەکانی ئەوروپی لەکاتی جەنگی ساردەوە دەتوانرێ موبالەغەی تێدا بکرێت. هەمیشە نارِازیبوون و ئیرەیی هەستی پێدەکرا. هەروەها، هەرچەندە دەنگۆیەکی قووڵ هەبوو لەوەی کە ئێمە لە سایدێکی جیاوازی ئەتلەنتین، بەڵام لەهەمان سایدی وەڵامدانەوەی مەسەلەکانی مرۆڤی ئەم سەردەمەین. من خۆم لە رازیکردنەکەمدا ئاماژە بەوە دەدەم کە ئەم باوەرِە هەمەلایەنە هەرگیز هێزی خۆی لەدەست نادات و دەبێ دووبارە بەتەندروستییەکی باشتر دروستبکرێتەوە لە رێگای ئەو کەسانە کە خۆمان هەڵیاندەبژێرین بۆ پێشرِەوی کردنمان لەساڵانی داهاتوودا.

مادلین ك. ئۆلبرایت
٢٠٠٦

# پێشەکی

## لەلایەن ولیەم جێی. کلینتۆن
## چل و دووەمین سەرۆکی ئەمەریکا

لەو ماوەیەی کە وەزیری دەرەوە بوو، جیهان فێری ئەوە ببوون کە من ئێستا دەیزانم: مادلین ئۆلبرایت بە باوەڕ بەخۆبوونەوە کارەکانی ئەنجامدەدا هەرگیزیش لە بڕیاردان نەدەترسا چونکە دەیزانی هەموو بڕیارەکان لە بەرژەوەندی وڵاتەکەی کۆتایی دێت. لە *دەسەڵات و دەسەڵاتی ڕەها* ، ئۆلبرایت بە راشکاوییەکی سەیرەوە هەموو وردەکارییەکانی رۆلی نێودەوڵەتی ئەمەریکا لە جیهاندا دەخاتە بەردەست خوێنەرەکانی، ئایین، ئاکارزانی، هەروەها ئەو ولایەتە پارچەپارچەکراوانەی ئێستای جیهان. بەگوێرەی زانیاری خۆمەوە تا ئێستا هیچ وەزیرێکی دەرەوەی پێشوو شاکارێکی هاوشێوەی ئاوای نەنووسیوە. کتێبێکی چاوەڕواننەکراو بوو، رەشنووسێك بوو لەدژی ئامۆژگاری ئەم هاوڕێیانەی کە دوودڵ بوون لەوەی ئەم بابەتانە نابێت بێ هەنگاونان لەسەر پەنجەی پێیەکان باس بکرێت. بەڵام بەهۆی ئەزموونی خۆمەوە، تاکە رێگای خۆدەربازکردن لە هەنگاونانی سەر پەنجەکان ئەوەیە هێشتاکە لەسەر قاچەکان بووەستین. مادلین ئۆلبرایت هەموو بزووتنەوە سیاسییەکانی داهاتوو لەم کتێبەدا بەرجەستە دەکات.

دوای یەکەم گفتوگۆمان لەبارەی ئەم پرۆژەوە، بانگی مادلینم کرد بۆئەوەی زیاتر لەبارەی ئەم کتێبەوە بدوێین، ئەوکات نەمدەزانی لەکوێیە. لەپاشان بەدیارکەوت لە گدانسکی وڵاتی پۆڵەندا بوو، بۆ بەشداریکردن لە یادکردنەوەی بیست و پێنجەم ساڵەی زیندووکردنەوەی یادی هاوکاری کردن، کە بزووتنەوەیەکی دیموکراسییە ببووە هۆی کۆتایی پێ هێنانی جەنگی سارد و هێنانی ئازادی بۆ ناو جەرگەی ئەوروپای رۆژهەڵات. ئەو کاتەی زەنگم بۆی لێدا مادلین لەنێو ئاپۆرایەك دەنگی دەبیستڕا کە لەنێوانیاندا سەرۆکی پێشووی چیك ڤاکلاڤ هاڤێل و سەرۆکی ئێستای ئۆکرانیا و پۆڵەندای تیابوو. تەلەفۆنەکەی چەند جارێك دادەخست لەسەرەتادا بیرم بۆ هیچ نەدەچوو بەڵام توانیم لەرێگای چەند هاورێیەکی کۆنەوە هەواڵی مادلین

بزانم ئەوکات لەخۆئامادەکردنی دانانی تاجەگوڵینەی ڕێز و وەفاداری بوو لەسەر یادکردنەوەی هاوکاری، وە هەروەها بەشداری لە ئاهەنگێکی سێ کاتژمێری ئازادیکرد. یەکێك لە بابەتەکانی ئەم کتێبە کە سەرچاوەیەکە بۆ بەردەوام بوونی مشتومڕ لە ژیانی گشتیدا، هەروەها ئاماژەیەکە بۆ بەستنەوەی پەیوەندی نێوان خودا و دیموکراسی.

واڵت وایتمان خاوەنی کتێبی "ناوەرۆکی دیموکراسی"، کە باس لە توخمەکانی ئایین دەکات، هەموو ئایینە کۆن و نوێکان. من وای بۆدەچم هەموو خەڵك ڕستەی یەکەمی کتێبەکەی وایتمانیان لەباوەش گرتبێ بەڵام ڕستەی دووەم بەلاوە بنێن، هەردووکیشیان جێبەجێ بکات بێ تێگەیشتنی ماناکانیان. لەلایەن خۆیانەوە هەریەکە لە ئایین و دیموکراسی ڕێزی یەکسانی و بەهای هەموو مرۆڤێك دەگرن: هەریەك لەئێمە دەستەوەستاوین لە وێنە ئەندێشەی خودا دروستکاری مرۆڤ، و بە هەریەکەمان مافێکی نەبڕاوەی پێداوین. هەموو ئەم ڕێباز و فەرمایشتانە بێ لەکەوە لەتەك یەکەوە هاتوونە، هەمووشیان هەمەلایەن و گشتگرن. ئەوکاتە کێشەکان سەرهەڵدەدەن لەکاتێکدا ئێمە لێکدانەوەی خۆمان لە شوێنی لێکدانەوەکانی وایتمان دانابوایە، هەروەها بیانووی ئەوەمان بۆ ئەو کەسانە هێنابوایە کەدەیانەوێت شەریك بن لە لێکدانەوە تایبەتییەکانی خۆمان کە تایبەتن بە جیهانەوە وە ئەوانەش شایستەترن لەوانیترەوە. بۆئەوەی عەقیدەیەکی تەواوت هەبێت پێویستە بڕوات بەبوونی ڕاستییەکی ڕەها هەبێ. ئەمەش شتێکیترە بۆ سووربوون لەسەر ئەو مرۆڤە خەوشدارانەی کە دەتوانن بەتەواوەتی خاوەنی مولك بن، یاخود ئێمە ئایدیۆلۆژییەکی سیاسیمان هەبێت کە بەتەواوەتی ڕاست و ڕەوان بێت بەجۆرێك ڕێگای ئەوەمان پێبدات بۆئەوەی کەسێ سزا بدەین کە سەرپێچی یاسای کردبێت یاخود ئازاری کەسانی پێبدەین، زۆری لەو کەسانە بکەین، وەیان ئابڕووی ئەو کەسانە ببەین کە بەشێوەیەکی جیاوازتر بیردەکەنەوە.

بەڕاستی دەستووری ولایەتە یەکگرتووەکان هەندێ شتی تازەی هێناوەتە کایەوە: سیستەمێکی حکوومی بەجۆرێك کە بەرزترین بڕوا و عەقیدە نەوەستاوە لەسەر ئەو پلەوپایە حکوومییانەی کەوا دەوردراو بە سیستەمێکی تازە و مۆدێرنی چاودێری و هاوسەنگییەوە، بەڵکو بەهەموو خەڵکییەوە دەوردراون. لەنێو سنوورێکی تایبەتییەوە دامەزرێنەرەکان شوێنی ئەوانە لەحکوومەت دەگرنەوە کە ناتوانن حکوومەتێکی ئایینی دابمەزرێنن، و یاخود کورتکردنەوەی مافی هەرکەسێك لە خواپەرستنی ئازادەوە. دامەزرێنەرەکان باش لەمێژووەوە تێگەیشتوونە کە دەسەڵاتی سیاسی و ئایینی ژەهراوی دەبێت ئەگەر بێتوو بەیەك چاوەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

ئێمە باش ئەوە دەزانین کە هەندێجار عەقیدە لەلایەن ئەو کەسانەوە قۆرخ دەکرێت کە لەسەر حیسابی کەسانیترەوە بەدوای هێز و دەسەڵاتی خۆیان دەگەڕێن. لە بەلقان، سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ زۆر لەبارەی بەرگریکردنی مەسیحییەکانی ئەوروپی قسەی دەکرد، بەڵام لەڕاستیدا، بەرژەوەندی شەخسی خۆی لەبەکارهێنانی ئایین بوو بۆ بەهێزکردن و پاراستنی کورسی و دەسەڵاتەکەی خۆی. ئوسامە بن لادن واخۆی نیشاندەدا کە بەرگریکاری ئایینی ئیسلامە، بەڵام هەموو ئاواتی کوشتنی کەسانی بێگوناهە، لەناویشیاندا موسڵمانان، ئەم هەموو کردارانە گوایە لە تێکستەکانی قورئاندا هاتووە بەڵام قورئان لەم جۆرە بیروباوەڕانەوە بەدوورە. بەشێوەیەکی هەڵەوە، ئایین بۆتە ئامێرێك بەکاردەهێنرێت بۆ خۆتێهەڵقولان لە کاروباری خەڵك، وە بەدەستهێنانی مەرامە شەخسییەکانی خۆیەوە لەسەر حیسابی کەسانیتر، نەك لەبەرئەوەی هەندێ ڕێبازی رووحانییەوە بەڵکو لەبەرئەوەی ئایین یارمەتی ئەو کەسانە دەدات کە نیازی هاتنە نێو کاروباری خەڵکەوە دەدات.

ئایا ئەوە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بەرهەمهێنەرەکانی سیاسەت پێویستە لەسەریان هەوڵی ئەوە بدەن بۆ پاراستنی ئایین لە جیابوونەوەی لەگەڵ ژیانی ئاساییدا؟ هەروەك مادلین ئۆلبرایت لەم بارەیەوە دەدوێ، وەڵامی ئەم پرسیارە نەخێرێکی زۆر گەورەیە. نەك لەبەرئەوەی کە هەوڵمان نەداوە، بەڵکو ئەگەر هەوڵیشی بۆ بدەین بەدڵنیاییەوە سەرناکەوین. بیروباوەڕە ئایینییەکان، ئەگەر ئەمانە بیروباوەڕن ئایا دەکرێ وەك جووتێ پێڵاو لە پێیان بکرێت دابیکەنرێت. سەرۆکێك یاخود وەزیری دەرەوە پێویستە بڕیاری ئەوە بدەن، بە لەبەرچاوگرتنی هەردوو بیروباوەڕی ئایینی خۆیان، هەروەها کاریگەرییان لەسەر ئەم بڕیارانەی کە لەسەر خەڵکەوەن بە بیروباوەڕی جیاوازەوە. هەروەکو، مادلینیش ئاماژەی پێداوە، بڕیاردان لەسەر ئەم کاریگەرییە کارێکی وائاسان نییە.

لەمیانەی سەردانەکەم بۆ وڵاتی هیند لەساڵی ٢٠٠٠، چەکدارە هیندۆزییەکانی بۆ هەڵڕشتنی تووڕەبوونی خۆیان بڕیاری کوشتنی سی و هەشت سیخیان دابوو لە خوێنی ساردا. ئەگەر ئەم گەشتەم نەکردبوایە، لەوانە بوو قوربانییەکان هێشتاکە زیندوو بانایە من دەڵێم ئەگەر ئەم گەشتەم نەکردبوایە چونکە ترسام لەوەی ئەم توندڕەوە ئیسلامییانە چی دەکەن، نەدەبوایە من وەك سەرۆکی ولایەتە یەکگرتووەکان کاری خۆم رابپەڕاندبوایە. سروشتی ئەمەریکا ئاوایە کە چەندین کەس خۆیان پێناس دەکەن—یاخود بەشێکیان—لەم پەیوەندییەوە، جا هەندێکیان لەگەڵن

هەندێکیشیان لەدژیەوە. ئەمەش بەشـێکە لـەو راسـتییەی کـە پێویسـتە سـەرکردەکانی ولایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەمە پەیڕەوکەن.

کاتێ ئیمامە رادیکالییەکان هەوڵی تێکدانی بیرکردنەوەی کەسانی بێگانـە دەدەن، کاریگـەری نێگەتیفی لەسەر خەڵك دەبێ بەتایبەتی گەنجە خوێنگەرمەکان، نەك هەموو ئەوانەش کەسی هەژار و نەخوێندەواربن، ئەمەش بە پێدانی موژدەی خێرای گەشتی گەرەنتی بۆ بەهەشت لەبڕی ئەوەی کە ئەوانیش دەست لە خەڵکی سیڤیل نەپارێزن و بەهەوایان دابدەن لەناو خوێنی پـڕ لـە بەڕائەتیانـەوە بگەوزێنن، ئەی ئێمە چۆن وەڵامیان بدەینەوە؟ دەتوانین هەوڵی ئەوە بدەین بیـانگرین و بیـانکوژین، بەڵام ناتوانین هەموویان دەستگیر بکەین. دەتوانین دەستەمۆی ئەوەیان بکەین کە واز لە توندوتیـژی بهێنن، بەڵام ئەدی ئەگەر گوتارەکانمان هیچ بناغەیەکی لە ئەزموونی ئەوانەوە نەبێت، نـاتوانین بـە تەواوییەوە سەرکەوین. باشترین و تاکە هەلی ئێمە ئەوە کە هەماهەنگ بـین بـۆ پێکـەوە کـارکردن لەگەڵ جیهانی ئیسلامی ئەوانـەی کـە دەتـوانن هـەوڵی ئـەوە بـدەن بگەنـە هـەمان بیرۆکـە کـە رادیکاڵەکان پێیگەیشتوون، ئەمەش بەهۆی بەکارهێنانی وتارە ئایینیـەکان بەڕێگایـەکی چـەوت و تێکدانی سیمای راستەقینەی ئاینەکە.

باوەڕم بەوە زۆرە کە دەتوانین ئەمە بکەین، نەك بە لاوازکردنـی بیروبـاوەڕە رۆحانییەکانیانـەوە، بـەڵکو بـە پێوانـەکردنی قۆڵایـەکانیان. هەرسـێ عەقیـدەی ئیبراهیمـی پێکچـوونیان زیـاترە لـە جیاوازییەکانیان. هەریەك لەمان بانگەشەی رێزگرتن، چاکەکردن، بێ فیزی و خۆشەویستی دەکات. هیچیشیان بەتەواوەتی ئەنجامیان نەداوە. بەرەنگاربوونەوە بۆ سـەرکردەکانمان بـەهۆی بـەکارهێنانی ئەو ئاکارانەی کە لەهەردوولادا بوونیان هەیە وەکو خـاڵێکی بـەرایی بـۆ زاڵبـوون بەسـەر زۆربـەی تومخەکان و نەهێشتنی ترس. ئەوکات خەڵك لە مرۆڤایەتی خۆی دەڕوانێت و زەحمەتە چـیتر دەسـت بۆ تێکدانی بونیەی یەکتر درێژبکەن. ئەمە زۆر ئاسانترە لەدۆزینەوەی چارەسەرێکی ناوەندی لەنێوان یەکێك و "ئێمە" لەوەی لەنێوان یەکێك و "ئەوان". باوەڕی ئایینی ئێمە دەتوانێ یارمەتیمان بدات لە سڕینەوەی هێلی کۆنی دابەشکراوماندا. هیچ کارێـك لـە کـارێکیتر گـرنگتر نییـە، بـەڵام لـەم کتێبەدا مادلین ئۆلبڕایت روونی کردۆتـەوە، ئەمـەش کارێکـە—کـە چوارسـاڵ و نیـو دوای ١١ی سێپتەمبەر—تازە دەستمان پێکرد

نیویۆرك

فێبڕایەر ٢٠٠٦

## (١)

## دەسەڵات و دەسەڵاتی ڕەها

ئاگاداری هەموو وتارەکانی یەکەم ساتی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی بوومە، بەڵام ئەوەی کە بەڕاستی لەبیرم دەسووڕێتەوە وتارەکەی جۆن کەنێدی بوو لەساڵی ١٩٦١. برایەکەم ناوی (جۆن)ە، ئەو کات قوتابی پۆلی سێیەمی کۆلیژ بوو، هەروەها بووقی لە تیپی پۆلیسی مۆسیقی دێنڤەر دەژەنی، بانگێشت کرابوو بۆ ئەم مارشە سەربازییەی کە بۆ وتاری کردنەوەی یەکەم ئیدارە کەنێدی بوو لە شاری واشنتۆنی پایتەخت. واپێدەچێ هەریەکێکمان بەفرەکەی سەرزەمینی ئەم ڕۆژەمان بیرناچێتەوە، چۆن درەوشانەوەی تیشکی خۆر خوێندنەوەی ئەم پارچە هۆنراوەی ڕۆبێرت فرۆست کە بۆ ئەم بۆنەیەوە ئامادەی کردبوو بەزەحمەتکرد. سەرۆکی نوێش لەبەر هەوای ساردی ئەم ڕۆژە هەناسەکانی بەئاسانی دەبینران، زۆر بەزەحمەت وتارەکەی بۆ تەواوکرا، داوای لێکردین "پرسیار نەکەین" لەبەر ساردی هەواکەی. وتارەکەی لەبارەی گەیاندنی مەشخەڵی ئازادی بوو بۆ نەوەیەکیتر. خۆم ئەم بۆنەیەم لە تەلەفزیۆنەوە بینی — هەربۆیەش شارەزاییەکی باشم لەبارەی هەموو وتارەکانی دەستپێکی یەکەم ساتی سەرۆکایەتییەوە لە جیهان، بەتایبەتی ئەمەریکاوە هەیە تاساڵی ١٩٩٣. لەدواییدا، دووبارە چوار ساڵ دواتر، سەرۆک کلینتۆنم بینی وتارەکەی خۆی لە پایتەختی ولایەتەکانی ئەمەریکاوە پێشکەشکرد. وتارەکەی کۆکراوەی خەڵکێکی زۆر و تێڕوانینی دیمەنی واشنتۆن بوو لە مێژووی ئەم وڵاتە، کە ولایەتە یەکگرتووەکان شانازی بەم ڕۆژەوە دەکات.

وتارەکە هەلێکی باشی بە سەرۆکی ئەمەریکادا کە قسە بۆ زیاتر لە ٦ ملیار خەڵك لەسەرتاسەری جیهان بکات لەنێوانیشیاندا ٣٠٠ ملیۆن هاونیشتیمانی خۆی.

بەپێناسەکردنی ئامانجی وڵاتەکەی سەرۆك ئەرکانی سوپا دەتوانێ مێژوویەك دروستبکات، هەروەها پۆستێکی تایبەتیش بۆخۆی فەراهەم بکات ( یاخود، لەوەیە، ڕۆژێك لەڕۆژان بۆ سەرۆکێکی ئافرەت) لەم چوارچێوەیەدا. لە ٢٠ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥،

خەڵکێکی زۆر لەژێر سەهەندی پایتەختەوە کۆببوونەوە. سەرۆك جۆرج دەبلیو بـۆش وتـارێکی بۆ جیهان و خەڵکی ئەمەریکا خوێندەوە. هەر لە سەرەتای قسەکانیەوە وا پێدەچوو هـەردوولا خۆی و نووسەری وتارەکانی ئامانجی زۆر بەرزیان لە مێشکدابێت. لـە وتارەکەیـدا هـاتبوو،" ئەمە سیاسەتی ولایەتە یەکگرتووەکانە بۆ گەڕان و هاریکاریکردن بۆ گەشەکردنی بزووتنەوەی دیموکراتی لەنێو هەموو نەتەوە و کلتوورێکدا، لەگەڵ بـوونی ئەوپـەڕی ئامـانجی بـۆ کۆتـایی پێهێنانی زوڵم و زۆرداری لە جیهانی ئەمڕۆماندا". بۆش بەردەام بوو لەقسـەکانی دەیـووت، "مێژوو چەندین شەپۆڵی بەرزونزمی یاسایی هەیە، بەڵام هەمیشە ئاراستەی روونی خۆیشـی پاراستووە". سەرۆك بەوە کۆتایی بە وتارەکانی هێنـا کـە " ئەمـەریکا، لـەم سـەدە تـازەی خۆیدا، بانگەشەی ئازادی لەسەرتاسەری جیهاندا دەکات، هەروەها بۆ ئەم خەڵکەی کە تێنووی ئەم ئازادییەن". هەروەها لەدوای قسەکانیدا ئەمەشی وت، لە تەوراتـدا هـاتووە، کـە خـودا هەمان کاری تەرخانکردبووە، بەهەمان گوتارەوە، بۆ موسا پێغەمبەر.

ئەم قسانەی سەرۆك بۆش ئەوەندە کۆنە کەبۆ سەردەمی تریێ رنینەوە دەگەڕێتەوە. ئەمەش بەشێك بوو لە ماوەی سەرۆکایەتییەکەی بۆش، ئەو کاتەی کە وەڵامـی خوێنـاویترین هێرشـی بۆسـەر خـاکی ئەمـەریکا لەمێـژوودا دەدایـەوە بـەجۆرێك ئەمـەریکای تووشـی دوو شـەڕی وێرانکارکرد، هەروەها بەئاگاهێنانەوەی سۆز و بەزەیی بوو لەنێوان هەردوولای ئازادییـەکان و پارێزگارەکـان، ئەمەریکاشـی لـە هاوپەیمانییـەتی درێژخایـەنی ئەوروپییەکانـەوە بـەلاوەنا، لەهـەمان کاتیشـدا بـووە هـۆی لاوازبـوونی پەیوەنـدی لەگـەڵ کۆمـەڵگاکانی عـەرەبی و ئیسلامییەوە، گەیاندنی نییەتی روونـی ئەمـەریکا کـە ملیۆنـەهایان بـە خۆشـگوزەرانییەوە دەبینرێن کەچی ئەوانیتریان لەبارێکی ژیانی زۆر خراپدا گوزەردەکەن.

لەنێو ولایەتە یەکگرتووەکاندا، زۆرێك هەن کە سـەیری سـەرۆك دەکـەن وەك سـەرۆکێکی رادیکـاڵی بەسـەر سیاسـەتی دەرەوە دێتـە بەرچـاو، کـە بـەگوێرەی یـەکێك لـە راڤـەکارە سیاسییەکان، "زیاد لەپێشبینی کردن سەرۆك بەشێوەیەکی لاهوتی کەسـێکی بـێ ئـابڕووە، نەك تەنها یەکلایەنەیە و لەخۆباییە بەڵکو خۆی وەك رزگارکەری جیهانیش نیشاندەدا، کەچـی کەسێکی کوفر کاریش بوو". بەڵام لایەنگرانی سەرۆك وەسفەکان بەپێچەوانەوە لێکدەدەنـەوە، کە سەرکردایەتیکردنی سەرۆك زۆر نموونەیی و پاڵەوانی پێـوە دەبینرێـت، زیـاد لەمـەش بـۆ سـاتێکی ئـاوا مەترسـیدار هـاتووە بـۆ وەرگرتنـی سـەرۆکایەتیکردن، هـەروەها پاراسـتنی ترادیشناڵی ئەمەریکا.

یەکەم غەریزەی سروشتی مرۆڤایەتی خۆم بە چەپڵەرێزانەوە پێشوازیم لەقسەکانی سەرۆك کرد بەتایبەتی لەوکاتەی زەنگی چەسپاندنی ئازادی لێدەدا. باوەڕم زۆر بەمە هەیە کە دیموکراسی لەهەرە باشترین داهێنانەکانی مرۆڤایەتییە: شێوەیەکی بەرز و بە پلەوپایەی حکوومەتە و هەروەها سەرچاوەیەکی بەهێزی هیوا و ئامانجەکانیشە. بەتایبەتیش ئەم دیموکراسییەی کە بۆ پێویستییەکانی سەرکردایەتی کردنی ئەمەریکا دەگونجێ. بۆچی بۆمن نەدەبوو؟ ئەوکاتەی کچێکی بچکۆلانەبووم، سەربازەکانی ئەمەریکا لەئۆقیانووس دەپەڕینەوە بۆ یارمەتیدان و رزگارکردنی ئەورووپا لەچنگی هەڕەشەی ئەدۆلف هیتلەر. لەوکاتەی کە تەواو لەتەمەنی هەرزەکاریدا بووم خەڵکی ئەمەریکا بەخێرهاتنی خێزانەکەی منیان کرد لەوکاتەی کە کۆمۆنیستەکان دەسەڵاتیان لە چیکۆسلۆڤاکیای رەسەنی من وەرگرت. بەپێچەوانەی زۆربەی هاونەوەکانی خۆم ئەوانەی لەجەرگەی ئەورووپا لەدایك بوونە، من ئەم چانسەم بۆ هەڵکەوتووە کە لەنێو شەماڵی دیموکراسییەوە گەورەببم و دەرفەتێکی مەزنی ئاوام هەبووە کەتاهەتا سوپاسگوزار دەبم. من وشەکانی پێشوازی زۆر بەجیددی لە بنەمای پەیکەری ئازادییەوە وەردەگرم، هەروەها بەردەوام ویستوومە ئاوا بیرلە ئەمەریکا بکەمەوە کەوەك سروشتێك بووە بۆ هەموو خەڵکێك لەهەر شوێنێکی ئەم سەرزەمینە بن—بەتایبەتی بۆئەو کەسانەی کە نکۆڵی لە بوونی ئازادی دەکەن بۆ وڵاتەکەیان.

وەك تکایەك لە وتارەکانی سەرۆك بۆشەوە دەبینرێت، هەرچەندە، خۆشم ئەوە دەزانم کە بانگەشەکردن بۆ ئازادی ئاسانترە لە بنیاتنانی دیموکراسییەکی جێگیر. ئازادی سیاسی حەبێکی جادوویی نییە خەڵك شەو قووتی بدات و بەیانی لەخەو هەڵسێت هەموو کێشەکانی چارەسەر کرابێت، هەورەها لە دەرەوەش ئەم ئازادییەت بۆ نایەت. دەربارەی وتەکانی سەرۆك، "ئازادی دیارییەکی خودایە بۆ هەموو کەسێك لەجیهان". سەرۆك بە بۆب ودۆرد دەڵێ، "لەڕاستیدا، من کەسێك بووم کە هێلەکەم دەنووسییەوە، و یاخود دەریمدەبڕی. من نەمدەنووسییەوە، تەنها لە وتارێکدا دەرمبڕیبوو. دەبووە بەشێك لە زاراوە تەکنیکییەکە. باوەڕیشم پێی هەیە. باوەڕیشمان بەوە هەیە کە ئێمە ئەرکێکمان لەسەر شانە بۆ ئازادکردنی خەڵك. هیوامان وابوو کە ئەم ئەرکە بەشێوەیەکی سەربازی جێبەجێ نەکەین، کەچی لەهەمان کاتدا نابێ ئەوەشمان لەیادچێ ئێمەش بۆ ئەرکێك هەوڵدەدەین ئەویش بڵاوبوونەوە و چەسپاندنی ئازادییە لە جیهاندا".

بێگومان ئەمانە هەمووی قسەیەكن ورە بەرزدەكەنەوە، بەڵام دەبێ بەڕاستی مەبەستیان چی بێ؟ سەرۆك دەڵێ ئازادی دیارییەكە بۆ هەموو خەڵكێك، بەڵام ئایا ئەو لەوە دڵنیایە لەوەی كە خودا ئەمەریكای هەڵبژاردبێ بۆ بەخشینی ئەم دیارییە؟ هەتا ئەگەر بۆ گفتوگۆكردن لەسەر ئەم پرسیارە پێویست دەكات ئەوانیتریش بانگهێشت بكەین. ئایا ئەمەریكا باوەڕی بەوە هەیە كە پەیوەندییەكی تایبەتی لەگەڵ خودادا هەیە؟ ئایا ئەمەریكا پەیامێكی پیرۆز و نیگایی لای خوداوە پێیە تا بتوانی ئەم ئازادییە بەرزڕابگرێت و بەیەكسانی بیبەخشێ؟ كام ڕۆڵ، ئەگەر هەبێت، كە پێویست بێ لەسەر بیروباوەڕە ئایینییەكان بیگرنەبەر لەكاتی دەركردنی بڕیارەكانی سیاسەتی دەرەوەی ولایەتە یەكگرتووەكان؟ بەڵام لەوانەیە لەسەرمان پێویست بێ و بپرسین كە بۆچی ئێمە بیر لەو پرسیارە دەكەینەوە، كە دراوەتە پاڵ ئەمەریكا بە جیاكردنەوەی دەستوورییانەی كڵێسە و دەوڵەت. ئەی ئایا ئێمە لەزووەكەوە دركمان بەوە نەكردووە كە هەڵە دەكەین بە تێكەڵكردنی ئایین و سیاسەت؟ بۆ ئەم مەبەستەش بیرم لەمە كردۆتەوە.

هەرچەندە من لە ژیانمدا درەنگ فێری ئەوە بووم—كە كەلەپوور و دابونەریتم جوولەكەییە و لە نێو كاسۆلیكی ڕۆمانیەوە سەرم بەرزكردۆتەوە. وەك منداڵێك دەرسی ئایینیم دەخوێند و نوێژم بۆ حەزرەتی مەریەمی پاكیزە دەكرد، خەیاڵی بوونە راهیبەم دەكرد، (تەنانەت كچێكی كاسۆلیكیش خەون بەمەوە دەبینێ). ئەو كاتەی تەمەنم لە گەشەكردن دابوو، پەروەردەكردنەكانی باوانم و ئەم وانانەی كە لە كڵێسە فێری ببووم كاریگەری تەواویان لەسەر ڕەوشت و ڕێزگرتنم هەبوو.

ئەم پەیامە هانی ئەوەی دەدام كە هەمیشە كارەكانی ژیانی رۆژانەم بەوپەڕی ڕێكوپێكییەوە راپەڕێنم و ڕێزی مافی كەسانی دەوروبەرم بەرزڕاگرم. لە ساڵی دووەمی خوێندنم لە كۆلیژی وێلێسلی، داوام لێكرا وەك مێژوو دەبێ كتێبی پیرۆز بخوێنم، هەروەها فێربوونی چیرۆكی ئیسرائیلی كۆن بەهەمان ئەو ڕێگایەی كە لەبارەی یۆنان و ڕۆم دەخوێندرێت[١].

---

(١) وێلێسی كۆلیژێكی ئافرەتانە. دروشمی ئەم كۆلیژە بریتییە لە " نابێ خزمەت بكرێی بەڵكو دەبێ خزمەت بكەی".

وەك کەسێکی کۆچکەر و کچی گەورە دیبلۆماتکارێکی چیکۆسلۆڤاکی، هەر لەسەرەتاوە خولیای دەنگوباس و رووداوەکانی رۆژانەی جیهانی بووم. هەرگیز کێشەکانی رۆژانەم لە نێو ئاوێنەی ئایینەوە سەیر نەدەکرد، نە ئەوانەی خۆم بەڵکو ئەوانەیتریش. نە منیش هەستم بە ئارامییەکی قووڵی زانیارییەکی ئایینی ئاوا نەدەکرد کە بتوانم لەنێو واناکاندا باسیان بکەم کە ئەوانیش باوەڕیان پێ هەبێت. زۆر رەچاوی باوەڕە رۆحانییەکانم وەك بابەتێك نەدەکرد بۆ قسەکردن بەشێوەیەکی ئاشکرا و رەسمی. ئەمە شتێکی نموونەیی بوو بۆ ئەو نەوانەی کە منی لەهەمان کات و شوێندا تیا دەرکەوتووە. لەوە دڵنیام کەوا هێشتا شوێنی ئاوا هەیە لە ئەمەریکا کە تاوەکو ئێستا هەڵوێستی جیاجیایان لەم رووەوە هەیە. بەڵام توێژەر مایکڵ نۆڤاك ئەمەی بەڕاستی وەرگرتووە، هەمیشە لەسەر ئەم قسەیە سووربوو کە لە سەرەتاکانی ١٩٦٠ دەریدەبڕی،" ئا لەم شوێنەوە کە وەستاوین، تاکە وشە (کە ناتوانرێت بەکاربهێنرێت) لە گفتوگۆیە جدییەکان بێ ئەوەی هەستی کەسێکیتر بریندار نەکەی 'خودا'یە".

ئەستێرەگەشەی ئێمە کە رێگای بۆ زۆربەمان نیشانداوە مۆدێرنیزمە، تاوەکو ئێستاش کەسانێك هەنە بەهاوتای عیلمانییەت هەژماردی دەکەن. ئەم سەرسوڕهێنەرانەی کە ئێمەی ئەمەریکی دەهۆڵیان بۆ دەکوتین کەمتر پەیوەستن بە کتێبی پیرۆزەوە لەوەی مەسەلەکە تەکنەلۆژیا بێت: پێشبڕکێی بۆشایی ئاسمان، دۆزینەوەی زانستی پزیشکی سەردەم، لەدایکبوونی توانای ناوەکی، پێشەکی رەنگەکانی تەلەفزیۆن، هەروەها کازیوەی تەمەنی کۆمپیوتەر. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، شانۆ و فیلمی *میراتی با* سەرکەوتنی زانستی گەورەتر نیشاندا (تیۆری گەشەسەندن) لەسەر داهێنان (وەرگێڕانەکی وشە بۆ وشەی ئافراندنە)[٢].

---

خۆم و هاوڕێکانم نوکتەیەکمان لەم دروشمە دروستکردبوو دەمانووت مانای تەواوی ئەم دروشمە ئەوەیە " نابێ ببینە وەزیر بەڵکو دەبێ ببینە ژنی وەزیران".

(٢) ئەم "سەرکەوتنی زانستە" هەمووی بەجارێك نەهاتۆتە بوون، لەوانەشە بۆ هەمیشەش بەردەوام نەبێت. نەك تا ساڵی ١٩٦٨ بەشێوەیەکی شەرعی و یاساییەوە گەشەسەندن لەزۆربەی بەشەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان فێردەکران، بەڵکو ئێستاکەش جۆرێك لە فشار هەیە لەلایەن هەندێك لە گرووپی کڵێسەکان بۆ خوێندنی 'نەخشەدانانی سیخوڕی' وەك ئەڵتەرناتیڤی تیۆری گەشەسەندن. بیرۆکەی نەخشەدانانی سیخوڕی، هەروەك ئەوەی کە خۆم تێیگەیشتووم، ئەوەیە کە ئاڵۆزی ژیان ئەوە دەسەلمێنێ کەوا دونیا دەبێ لەلایەن

کاتێ بیرمان لە پێغەمبەر موسا دەکردەوە، وێنەی چارلتن هێستۆن مان دەهاتە نێو مێشك، لە تەکنیککاری ڕەنگەوە. بەها ئاینییەکان بەرگەی ئەمە دەگرن، بەڵام حەماسییەتەکە لە چاوەڕوانییەوە دێتە بەرهەم کە چی لە تاقیگە و توێژەرەکانمان بەدیدەکرێت. ئێمەی ئەمەریکی لە مژۆڵە کردارییەکانمان تەنها نین. لەدەرەوە، هەڵبەزین و دابەزینی سیاسییەکان ڕووی سۆشیالیزمی و ناسیۆنالیزمیان گرتووە، هەروەك نەتەوە ئەفریقی و ئاسیاییەکان کەخۆیان لەدەستی داگیرکارەکانیانەوە ئازادکرد و دەستیان کرد بە بنیاتنانەوەی وڵاتەکانیان بۆئەوەی بتوانن خۆیان وەك خاوەنی لەسەری بوەستن.

لەسەرەتای ساڵی هەشتاکاندا، وەك پرۆفیسۆر لە زانکۆی جۆرج تاون دامەزرام. پسپۆڕییەکەم لەبارەی سیاسەتی دەرەوە بوو، نووسینەکانم زۆربەی پشتئەستووربوون بە بۆچوونەکانی هەریەك لە هانس مۆرجێنتو، جۆرج کێنان، وە دین ئاکیسۆن. لەڕوانگەی ئەوانەوە، تاك و گرووپەکان بەو نەتەوانەوە شوناس دەکرێن کە بۆی دەگەڕێنەوە. وڵاتەکان حکوومەتیان هەبوو. لەهەمان کاتدا حکوومەتەکان کاریان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی خۆیان دەکرد، بەلایەنی کەم تادەگاتە ئەو خاڵەی کە خۆیان دیراسەت لەڕوودانی جەنگ هەروەها لەلایەن نێودەوڵەتیشەوە ڕێپێدراوبوو. سیاسەتی دەرەوە هەمیشە بە یاری شەترەنج بەراورد دەکرا، هەردوولا یاساکانی یارییەکە دەزانێ، ئەمەش پێشبڕکێیەك بوو کە لەلایەن لۆژیکەوە کۆنترۆڵ دەکرا، یاریزانەکان وەك پارێزەر قسەیان دەکرد، نەك وەك جوانبێژێك. ئەو کاتەی تەمەنم لەناوەڕاستی هەرزەکارییەوە بوو، سەرکردە رۆژئاواییەکان بەگاڵتەپێکردنەوە بەرژەوەندییە سیاسییەکانیان بەدەست دەهێنا "کۆمیونیزمی بێ خودا"، ئەگینا، نەمدەتوانی وتاری هیچ سەرکردەیەکی دیپلۆماتی ئەمەریکی (تەنانەت ئەگەر کریستیان جێمی کارتەریش دووبارە لەدایك بێتەوە) بهێنمەوە یادی خۆم لەبارەی ڕۆڵی ئاین لە داڕشتنی جیهاندا. ئاین ڕێزگەری سنووری نەتەوەکان نەبوو، لەسەر و لە پشت هەموو هۆیەکانەوە بوو، ئیدیعای قووڵترین سۆز و خۆشەویستی دەکرد، هەروەها ئەگەر لاپەڕەکانی مێژووی هەڵدەینەوە بۆتە هۆی خوێنڕشتنێکی زۆر. دیپلۆماتەکانی

---

هێزێکی سوپەر و نەبڕاوە دوور لە پێشبینییەکانی مرۆڤەوە دروستکرابێت. من خۆم وەك پسپۆڕێك نیشاندەم کەوا هەموو شتێك پێویست بکات لەنێو ژووری وانەوتنەوە بووترێت، بەڵام بڕوای تەواوم بەوە هەیە کە هەر بۆچونێکی ڕوون دەبێ بە زاراوەوە بنەخشێنرێت کە لەلایەن میتۆدی زانستییەوە داڕێژراو بێت و ئەوانەشی کە دانەڕێژراون.

سەردەمی من وافێرکرابوون کە داوەتی کێشە نەکەن، هـەروەها هـیچ بابـەتێکیش بەشـێوەیەکی میراتییەوە وەك ئایین غەدار و ترسناك نەبووە.

ئەمە تێگەیشتنێك بوو کە ڕێنمایی ئۆلبرایتیان دەکرد لەوکاتەی وەك بـاڵیۆزی ئەمـەریکا و وەزیری دەرەوەی سەرۆك کلینتۆن خزمەتی بـە وڵاتەکـەی دەگەیانـد. هـەروەها هاوکارەکانیشـم هەمان هەستیان هەبوو. کاتێ، لـە سـاڵی ١٩٩٣، پرۆفیسـۆر سـامویل هـەنتینتۆن لـەزانکۆی هارڤەرد پێشبینی ئەوەی کرد کە ئەو ماوەیەی دوابەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی سارد هات بـە گەواهیدەرێکی باشی بەریەککەوتنی ئایینی شارستانییەکان دادەنرێت، هەموو شتێکمان کرد تـا خۆمان لەم تیۆرە بەدوور بگرین. ئێمە بۆ داهاتوو بەرنامەی ئەوەمان لە مێشك دابوو کە هەموو نەتەوە و هەرێمەکان، بۆنـدێکی دیموکراسـی لەیـەکترەوە نزیـك بکەینـەوە، نـەوەك جیهـانێکی پارچەپارچەکراو و دووبارەکردنەوەی هەڵەی مێژوویی زەقەوە لەڕووی کلتوور و ئایینەوە.

کاتێ جەنگی بەڵقان دەستی پێکرد، هەردوو سایدی شەڕکەرمان ناچارکرد بـە گرنگیـدان بـە مافی تاکەکەس نەك بە پێشبڕکێ کردن لەسەر مافی تایبەتی گرووپـە ئیسـلامییەکان. لەسـاڵی ١٩٨٨، لەوکاتەی هەردوو باڵیۆزخانەی ولایەتـە یـەکگرتووەکان لـە کینیـا و تانزانیـا لەلایـەن تیرۆرستانەوە تەقێنرانەوە، دەستمان کرد بە بڵاوکردنەوەی پۆستەرات بۆ گەڕان بەدوای زانیـاری و بەخشینی پاداشت، ئەم پۆستەراتانەش بە پێشینەیەکەوە دەست پێدەکران، " ئەمە پەیوەندی بـە ئایینەوە نییە. ئەمە پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە. بە ڕوونی و سادەییەوە ئەمـە پەیوەنـدی بـە تاوانی کوشتنەوە هەیە".

لەکاتی هەوڵە ماراسۆنە ئیدارییەکەوە بۆگەڕان بەدوای بناغەیەکی ئاشتی پتەو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە، خۆم و سـەرۆك کلینتـۆن بەتـەواوی وشـیاری پێداویسـتییە ئایینییـەکانی شـوێنە پیرۆزەکانی قودس بووین. هیواداربووین، هەرچۆنێك بێت، بتوانین بەبەکارهێنانی هاوکێشەیەکی یاسایی ژیرانە بۆ هێورکردنەوەی ئەم حەماسەت و پەیوەستیانەی کـە لـەڕابردووەوە پەیدابوونـە. ئێمە داوامان کرد و چاوەڕوانی ئەوەمان لەهەردوو ساید دەکرد کە زیاتر واقیعبینتر بن و دەسـت بکەن بە ئیمزاکردنی گرێبەستێك کە خۆیان بڕوایان پێی هەیە و لەسەری ڕێکدەکەون.

بەڵام لەدوای ئەم هەموو ڕووداوانە هێشتاکە لەژیاندا ماوین. شەڕەکانی نێوان کاسۆلیکی و پرۆتستانت لەساڵی ١٦٤٨ کە ژیانی سێ یەکی دانیشتوانی مەسیحییەکانی ئەورووپای خستبۆوە مەترسی. شەڕی گەورەی نێوان مەسیحییەکان و موسڵمانەکان لەساڵی ١٨٦٣، لەو کاتەوە وەستا کە پێشوەچوونی عوسمانییە تورکەکان لە دەروازەکانی شاری ڤییەننا وەستێنران. بەش

بەحاڵی خۆم ئەمانە بەکارێکی دوور لە عەقڵەوە دەخوێنمەوە لەکاتێکدا لەسەدەی بیست و یەکەمەوە نزیك بووینەوە، کەچی دەبینین کاسۆلیکی و پرۆتستانتییەکان هێشتاکە لە ئێرلەندای باکوور دەمەقاڵێتیان، هەروەها هیندۆزی و موسڵمانەکانی باشووری ئاسیا تاوەکو ئێستاش گۆشە لەدژی یەکترەوە دەبەستن، بەدڵنیاییەوە، وای بۆدەچم کەئەم پێشبرکێ کردنە دەنگدانەوەی و رەنگدانەوەی زووتری پێوە دەبینرێ لەوەی ئاگادارکردنەوەیەك بێت کە هێشتاکە جەنگەکان بگەڕێنەوە.

هەر لەکاتی هێرشە تیرۆرستییەکان لە ١١ی سێپتەمبەرەوە دەستی پێکرد، تەواو گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە لەوانەیە ئەوە منبم لەماوەی رابڕدوودا زەرەرم پێگەیووە بێئەوەی ئاگاداریم لێی بێت. هەروەکو زۆرێك لە پرۆفێشناڵەکانی سیاسەتی دەرەوە، دەبوایە ئەم ئاوێنانە بگۆڕم کە بەهۆیانەوە جیهانی پێدەبینم، هەروەها تێگەیشتن لەم شتانەی کە واپێدەچوو ببنە راستییەکی نوێ بەڵام لەبناغەدا بەڵگەبوون بۆ کاتێکیتر. ساڵی نۆهەدەکان ببوونە دەساڵی جیهانگیری و دەستکەوتە سەرسوورهێنەرەکانی بواری تەکنەلۆژیا، شۆڕشی زانیاری بووە هۆی گۆڕینی ستایلی ژیانی هەر تاکێك، گۆڕینەوەی شوێنی کارکردنمان، یارمەتیدان بۆ بەرەو پێشوەچوونی لیستی هەموو وشەکان. هەرچەندە، لێرەوە هێزێکیتر هەیە لەکاتی کارکردن. ماوە بڵێین، لە هەموو شوێنێکدا، بزووتنەوە ئیسلامییەکان گەشەدەکەن.

لەبەشی هەرە زۆری ناوەڕاست و باشووری ئەمەریکا، نووسراو و باوەڕەکانی پرۆتستانتی نکۆڵی دەکەن و دژی سەروەریێتی کڵێساکانی کاسۆلیکین. لە چین، دەسەڵات بە ئایدۆلۆژیایەکی تەواوەوە کاردەکات لە بەربەرەکانی کردن بۆ وەستاندنی بزووتنەوە ئایینی و رۆحانییەکان بەگومانی ئەوەی کەئەمانە دەبنە هۆی پەیدابوونی هەڕەشەی سیاسی. ناسنامەی هیندی وەك کۆمەڵگایەکی عیلمانی لەژێر بەرەنگاربوونەوەیە لەلایەن هیندۆزە ناسیۆنالیستەکان. لەسەرتاسەری یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو پەیمانگا ئایینییە خەفەکراوەکانیان دووبارە هاتوونەتەوە مەیدان. لە ئیسرائیل پارتە ئایینییە ئۆرسۆدۆکسەکان بەدوای زیاتری کاریگەردا دەگەرێن بەسەر یاساکان و کۆمەڵگە. ناسیۆنالیزمی عەرەبی عیلمانی، کە جارێك لەجاران بیریان لە بەرجەستە کردنی داهاتوو کردبۆوە، جیگای خۆیان کردۆتەوە لەرێگای ئیسلامەوە و لەودیوی زەوییەکانی عەرەبەوە درێژبوونەتەوە تادەگاتە ئێران، پاکستان، ناوەڕاست و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا و بەشێکی کیشوەری ئەفریقیاشی گرتۆتەوە. نەسرانییەت (مەسیحییەت) لە ئاسیا و ئەفریقیا هێرشی گەورە و لەناکاوی ئەنجامداوە، دە لە یانزە کۆمەڵە هەرە گەورەکانی جیهان

کەوتوونەتە کۆریای باشوور، ئەوەکەیتریش کەوتۆتە نایجیریا. دووبارە هەڵسانەوەی چالاکییەکانی مەسیحی گۆڕانی ئەوەی بەسەرداهاتووە کە ئێمەومانان چۆن بیر لەسیاسەت و کلتووری ولایەتە یەکگرتووەکان بکەینەوە. بەپێچەوانەی بۆچوونەکانی مایکل نۆڤاك کەبەر لە چل ساڵ وای بۆ دەچوو، ئێستا خەڵك هەموو کات قسە دەکات (بیروڕا ئالوگۆڕ دەکات) لەبارەی خوداوە. تەنانەت لە ئەورووپاش ڕێژەی موسڵمانەکان بەخێرایی لە زیادبووندایە، هەروەها پاپای نوێ - بێنەدیکی نورسیا، بڕیاریداوە بۆ دووبارە پڕۆپاگەندەی دانیشتوانی مەسیحی خۆی.

ئایا کەسێك بەتەنها چۆن دەتوانێ مامەڵە لەگەڵ ئەم دیاردەیە بکات؟ بۆ ئەوانەی کە سیاسەتی ولایەتە یەکگرتووەکان دیزاین و جێبەجێی دەکەن، ئەوە مانای چییە؟ ئێمە چۆن دەتوانین بەباشترین شێوە ڕووداوەکانی جیهانێك بەڕێوەببەین لەکاتێکدا پڕیەتی لەئایینی جیاواز لەیەکتر، یاخود لەگەڵ ئەم سیستەمە بیروڕایانە کاربکەین کە لەخاڵە سەرەکییەکاندا لەگەڵ یەکتردا ناکۆك بن؟ چۆن بتوانین مامەڵە لەگەڵ ئەم هەڕەشانەدا بکەین کە لەلایەن توندڕەوەکاندا، لەژێر هەڵگری ناوی خوداوە، هەوڵی چەسپاندنی ئاواتەکانی خۆیان دەدەن لەسەر حیسابی کەسانیتر؟ باش ئەوە دەزانین کە سروشتی ئەم هەموو تاقیکردنەوانە هیچ نوێگەرایی پێوە نابینرێ جگە لە درێژکردنەوەی سەردەمی بت پەرستی نەبێت. ئەمەش تەکنەلۆژیایە کە بۆتە هۆی دروستکردنی ئەم هەموو جیاوازییە. جەنگی ئایینی کە شمشێر، زنجیر، مەنجەنیق و داری ئەستوور بەکاردەهێنرێت بۆ شەڕکردن کە خۆی لەخۆیدا دەکەونە ژێر یەك بابەتەوە. هەروەها جەنگێك کە بەرزترین کوالێتی تەقەمەنی تێدا بەکاردەهێنرێت لەدژی ئامانجەکانی سیڤیلەوە بابەتێکی تەواو جیاوازترە. دەرفەتی بۆمبی ئەتۆمی لەلایەن تیرۆرستانەوە تەقێنرایەوە، ئەمەش دێوەزمەیەکە لەوەیە ڕۆژێك لەڕۆژان ببێتە ڕاستی.

لەساڵی ٢٠٠١ ماوەی خزمەتکردنم لەنێو حکوومەتدا تەواوبوو، دەستبەجێ گەڕامەوە بۆلای خۆشەویستی یەکەمم کەئەویش نیو کلاسی زانکۆیە. لە جۆرج تاونەوە، تەنها یەك کۆرس وانەم دەووتەوە لەکۆی وەرزێکدا، یەك لە دوای یەك لەنێوان قوتابیانی دەرچوو و ئەوانەی خەریکن دەربچن. لەسەرەتای هەر کۆرسێکدا فەلسەفەی من وابوو دەبوایە قوتابییەکانی خۆم وافێرکردبوایە کە ئاشنایەتی تەواویان هەبوایە لەگەڵ سیاسەت هەروەها ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەم بۆ شی دەکردنەوە کە بریتییە لە دەستەمۆکردنی وڵاتانیتر بەئەنجامدانی ئەو کارانەی کەخۆت دەتەوێ. لەم کۆتایەدا، سەرۆکێك و یاخود وەزیری دەرەوە ئامێری وای بەدەستەوەیە بۆ ڕێزکردنی هێزی سەربازی لەکارێکی زەحمەتدا بە ناوبژیوانکردن لە دانووسانەکاندا بۆ کارێکی

ساناتر ئەویش بە بەکارهێنانی زمانی گفتوگۆی ژیرانە. هونەری سیاسەتی دەرەوە بریتییە لە دۆزینەوەی ڕێگای جۆراوجۆر بۆ لێك نزیکتر کردنەوەی بۆچوونە جیاوازەکان و وەبەرهێنانی باشترین ئەنجام. بەو هۆیەشەوە، داواکاری ئەوە دەبین کە بتوانین زۆرترین کاریگەری لەسەر بەرامبەرەکەمانەوە دروستبکەین لەکۆتایدا بەلای بەرژەوەندی یەك لایەنەی خۆمانەوە بشکێتەوە. بۆ ئەو خەڵکەی کە لەبارەی بزنیسەوە کاردەکەن، ئەمە مانای ئەوە دەدات کە " کریارەکانی خۆت بناسە". هەروەها لە پرسەکانی جیهانییەوە، مانای ئەوە دەدات کە هەوڵدە کلتووری وڵاتانی دەرەوە فێربیە، لەوکاتەی کە سۆزە ئاینییەکان دەستیان بەنەخشاندنی جیهانەوە کرد، ئەمەش بەبێ وەرگرتنی ڕێبازە ئاینییەکانەوە نایەتە جێبەجێ کردن هەروەها وروژان و هاندانەکانیش بەتەواوەتی هاتوونەتە هەژماردن.

لە نێو هۆڵی خوێندندا، هەمیشە لەگەڵ هاوڕێ و هاوپۆلەکانمدا گفتوگۆ لەسەر ئەم بیروبۆچوونانە دەکەین کە کاریگەرییە ئاینییەکان لەسەر ڕووداوەکانی ئێستای جیهانەوە دروستی دەکەن. یەکەمجار زۆرێك لەخەڵکان سەریان لەم گێژاوەوە دەرنەدەکرد، نەیاندەزانی بیر لەچییەوە بکەنەوە، لەدواییدا بەرەبەرە خۆیان لەگەڵ ڕووداوەکان دەگونجاند. داواکارییەکانی من تەنها خۆیان لەیەك بابەتەوە نەدەگرتەوە، بەڵکو خۆی بەدەوری زۆر بابەتەوە خولدەکردەوە. ئەمەش ئەزموونی زۆرچاکە، ئاشکراکردنی زۆرێك لە مژوولێ و نیگەرانییەکانە بۆ ئەوانەی کە وەڵام دەدەنەوە.

قوتابییەکانم حەزیان بەیەکسانی کردنی ئاین و ڕەوشت دەکرد هەربۆیەش وەڵامەکانیان لە چوارچێوەی دەستەواژەیەکی ئەدەبییەوە دەدایەوە. خولیای ئەوەبوون بزانن کە ئایا جیهان بۆ دەست لەناو دەست هەوڵی کەمکردنەوەی هەژاری و نەخۆشی نادات و ڕێگە لە جینۆساید ناگرێت، هەروەها یارمەتی پێشکەوتنی وڵاتان نادات لە پێشبڕکێکردنی ئابووری جیهانی. دوای ١١ی سێپتەمبەر ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی ئەمەریکا بەپەرۆش بوون پەیوەندی بکەن بۆخزمەتکردن لەریزی سەربازییەوە و یاخود لە دەزگای هەواڵگری CIA، ئەمەش هەستێك بوو بۆ ناچارکردنێکی بەهێز لە خۆبەخشکردن، بەڵام سەرئەنجام لەزۆربەی ڕووەکاندا ئەم هەستە کۆتایی پێنەهات. جەنگی عێراق گومانێکی گەورەی لەنێو ژیری سیاسەتی ولایەتە یەکگرتووەکان دروستکرد بەوەی کە ئامانجی ئەمەریکا پێشڕەوی کردنی جیهانە، یاخود هەوڵدانێکە بۆئەوەی جیهان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. ئەو قوتابییە دەرەکییانەی کەخۆم وانەم

پێدەووتنەوە بە پێدانی چەند رایەکی تێکهەڵکێشراو ببوونە گرووپ گرووپ. بە پرسیارە راست و هەڵەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست زیاتر دابەشبوون لەوەی تووشی سەرسوڕمان ببنەوە.

هاوڕێیەکانم کە پسپۆڕن لە سیاسەتی دەرەوە، جەختیان دەکردەوە لەسەر ئەو هەڕەشانەی کە لەلایەن توندڕەوە ئایینییەکانەوە چەقیان گرتووە، هەروەها لەگەڵ ئەم ئەگەرانەی کە تیرۆرستان بتوانن چەکی کۆمەڵکوژ بەدەست بێنن. ئەوان ئاگادارکراونەتەوە لەبارەی ئەم بۆشاییەی بەپلەی یەکەم لە تێگەیشتنی نێوان کۆمەڵگا ئیسلامییەکان و رۆژئاوادا.

ئەو بڕیارە ئایینییانەی کە خۆم راوێژم لەگەڵ کردوون زۆر نەرم و لەسەرخۆن لەبارەی پێداویستی پێشەوایانی سیاسی بۆ خۆ رۆشنبیرکردن بە باوەڕە جۆراوجۆرەکان، هەروەها سەیری ئاینین دەکەن زیاتر وەك هۆکار و ناوەندێکی شاراوە بۆ دووبارە ئاشتبوونەوە و پێکەوەکارکردن لەوەی وەك سەرچاوەیەکی ناکۆکی و دووبەرەکی.

چالاکە سیاسییەکان، نەك تەنها دیموکراتییەکان، دەورووژێن لەبارەی کاریگەری مافی ئایینی لەنێو کۆشکی سپی و کۆنگرێسدا، ئەم بابەتەش خاوەن قورسایەکی خۆیەتی لەنێو زیهنی دیپلۆماتەکانی دەرەوە.

کاردانەوەی خۆم لەسەر ناسنامە جۆراوجۆرەکانم بناغە دەگرێت، وەك کچێکی چیکۆسلۆڤاکی، ئەمەریکییەك زۆر بە وڵاتە بەکوڕکراوەکەی خۆیەوە شانازی دەکات، هەروەها بە وەزیرێکی پێشووی دەرەوە. لەوکاتەی کە لەگەشەکردنابووم پاڵەوانی دونیای من تۆماس گاریگ ماسەریك بوو، کە چیکۆسلۆڤاکیای نوێی لەساڵی ١٩١٨ دامەزراند. ماسەریك گەورەترین کاریگەربوو لەسەر بیرکردنەوەی باوکم و -لەرێگای ئەویشەوە- لەسەر من. بەپێچەوانەی هەندێ خەڵك کە مرۆڤایەتی وەك ئەڵتەرناتیڤێك دادەنێن بۆ باوڕهێنان بە خودا، ماسەریك سەیری هەردوو لایەن دەکات وەك پەیوەستییەك بەیەکەوە. بەلای ئەوەوە، باوەڕی ئایینی مانای نیشاندانی رێز دەدات بۆ هەر کەسێك هەروەها ئامادەبوونت بۆ یارمەتیدانی ئەوانیتر. ماسەریك لەگەڵ ئەو باوەڕەدا نییە کە پێویست بکات بۆئەوەی باوەڕت بەخودا بێت دەبێ بەئەدەب بیت، بەڵام ئەو گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکات باوەڕی ئایینی، خۆی لەخۆیدا، بەتەواوەتی هانی ئەوە دەدات بۆ بەتواناترکردنی رەفتارێکی راست. منیش بۆچوونی هاوشێوەم هەیە، ئائەمە گۆڕینی باوەڕە بە گۆڕینی ئایین بۆ سەرچاوەیەکی ناکۆکی و رق لێهەڵگرتن، هەروەها هەر ئەمەشە دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشەی سەخت بۆ ئەمەریکا و جیهان.

گەشەکردنم لەنێو ولایەتە یەکگرتووەکان بووە هۆی گـۆڕینی خـودی مـادلین ئۆلبرایـت. وەك ئافرەتێکی گەنج، مەغزای خۆم وەرگرت—بەڵام بەبێ گاڵتەوە—لەلایـەن وەرگـێراوی لیۆنـاردۆ بێرنسـتێنت: " هـەموو شـتێك بـۆ باشـترینە لـەم دونیایـە باشـترینەدا". ئـەم چـەند سـاڵەی خزمەتکردنم لە حکوومەت پارێزگاریم لە هەڵوێستە پۆزەتیڤەکەی خۆمەوە کردووە. لە ئیـدارەی کلینتۆنەوە زۆر قسەمان لەبارەی سەدەی بیست و یەکەمـەوە دەکـرد، بەتایبەتمەندییـەوە، لـەوە دڵنیا بووین کە ئەمەریکا لەگەڵ هاوپەیمانـەکانی دەیـانتوانی چارەسـەر بـۆ زۆربـەی کێشـەکان بدۆزنەوە. من هێشتاکە هەست بەم ڕێگایانە دەکەم، بـەڵام لـەوە نیگـەرانم کـەوا ئێمـە تـاوەکو ئێستاش چەند هەڵەیەکی ترسناك و  ناپێویست دەکەین کە دەتوانین خۆمانی لێ بەدوور بگرین.

ئێستاکە ڕۆژی ئاوا هەیە کە ئاستەمە بتوانی ڕۆژنامەیەك هەڵگری. وای بۆدەچم حکوومەتی ولایەتە یەکگرتووەکان بەتەواوەتی وەلامی خۆی بۆ تیرۆری نێودەوڵەتی گۆڕیـوە، هـەروەها بۆتـە هۆی رووخانی ناوبانگی ئەمەریکا و گـۆڕینی دروشمـەکان بـۆ سـتراتیژی بـەرزڕاگرتنی ئـازادی. بەخۆشحاڵییەوە دانیپیادەنێم، بەو کێشە زەحمەت و ئاڵۆزییانەی کە ئێستاکە ڕووبەڕووی ئیدارەی بۆش دەبێتەوە. هەمیشە ئەوە دەڵێم ئەو کەسانەی کە هەرگیز بەرزترین کارەکانی حکوومـەتیان وەرنەگرتووە نازانن تاچەند ئەم کارانە زەحمەت و ناخۆشن، هـەروەها ئەوانـەش کـە لـەم کارانـە خانەنشین بوونە حەز دەکەن زۆر بەخێرایی لەبیری خۆیان بسڕنەوە. ڕەخنـەگرەکان ئـەم ئەرکـەیان هەیە کە ببنە دادوەر بۆ پێشکەشکردنی ئایدیای بنیاتنەر. ئەمەش ئامانجی ئەم کتێبەیە. بەشی یەکەم باس لە شوێنگەی ئەمەریکا دەکات لە جیهاندا هەروەها گێڕانی ڕۆڵی ئایینی و ئاکار لـە داڕشتنی سیاسەتی دەرەوەی ولایەتە یەکگرتووەکان، لـە ئێسـتا و لـە ڕابـردوودا. بەشـی دووەم گرنگی دەدات بەم پەیوەندییە پڕ کێشەیەی نێوان کۆمـەڵگا ئیسـلامییەکان و ڕۆژئـاوا. بەشـی سێیەم بۆچوونی من پێشکەش دەکات لەوەی کە چـۆن سیاسـەتی دەرەوەی  ئەمـەریکا و ئـایین بەباشترین شێوە بەیەك بگەن. لەگەڵ پاراستنی سروشتی خۆم، بەشەکانی ئـەم کتێبـە ئامانجیـان لەسەرەتادا لە دروسـتبوونی سیاسـەتێکی پراکتیکالییـەوە دەبێـت—ئـەم کارانـە بکـرێن کـە باشترینیانە. لەگەڵ پاراستنی سروشـتی ئایینـەوە، زۆرجـاران بەیەکـەوە دەکەونـە ژێـر بـاڵێکی تەریبەوە. ئەم کارە بکە کە ڕاستە. یەکگرتنەوەی هەردوولا لەیەك خاڵدا کۆتایی ئامـانجی منـە هەروەك بۆ دانەری سیاسەتی هەر نەتەوەیەك، هەر لە ڕۆژی یەکەمیەوە، دەبێ بەدوای دادوەریـدا بگەڕێت بۆ ئەوەی بتوانێ دادگایەکی عادیلانەی هەردوولا بکات هەم بە کارامەییەوە وە هـەم بـە نموونەییەوە.

(٢)

## "هەموو خەڵك چاویان بڕیوەتە سەرمان"

هەروەك قوتابییەكی ساڵی سێیەم، شەش ساڵ دوای ئەوەی خێزانەكەم گەیشتنە ئەم وڵاتە، كۆرسی یەكەمم دەربارەی مێژووی ولایەتە یەكگرتووەكان وەرگرت. هەر لەم كاتە سادەیەوە، خۆم و هاوپۆلەكانم فێری دیمەنێكی پۆزەتیڤی زیاتری رابردووی ئەمەریكا ببووین بەبەراورد لەگەڵ قوتابیانی ئەمڕۆ: چیرۆكی درێژ لەبارەی ئازادییەوە-خۆشەویستی نێوان پیاو و ژن، زاڵبوون بەسەر بەربەستەكان بەجۆرێك هەموو كێشەیەك بەكۆتاییەكی دڵخۆشكەرەوە دادەپۆشرێ. ئەمە، بۆمن، چیرۆكێكی زۆر سەرنجڕاكێش بوو كەوای كرد ئەم شوێنەی كەتیای دەژیم زیاتر واقیعیتر بێت—كۆلۆرادۆ. ولایەتەكان لەزۆربەی وڵاتە ئەوروپییەكان گەورەتربوو، چیایەكان بەجۆرێك بەرز بوونەتەوە كە ببوونە جێگەی سەرسوڕمانی ئێمەوە كەچۆن یەكەم كەس توانیویەتی بەسەر ئەم چیایانەوە بكەوێت و بیانبڕێت. ئەم مێژووە منی قولابكرد و بۆخۆی كێشكردم، ئەمە یەكێك بوو لەهۆیەكان كە وەك ئەمەریكییەك قەبوول بكرێم. من بەبیرم نایەتەوە كە چەند كاتژمێرێكم بۆ خوێندنی ئایینەوە لە ولایەتە یەكگرتووەكان تەرخانكردبێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە یەكەمجار دەستمان بە چیرۆكی ئەوكەسانە كردووە كە لەئەوروپاوە هاتوونەتەوە، ئەم خەڵكە ئازا و چاونەترسانەی كە گەشتێكی درێژ و ناخۆشیان هەڵبژاردووە بۆگەڕان بەدوای شوێنێك بۆئەوەی بتوانن پراكتیزەی بیروباوەڕی خۆیان بە ئازادانە بكەن، بێئەوەی حكوومەت دەست بخاتە نێو كاروباریانەوە.

نووسین لەنێو دەفتەری یادگاری لەساڵی ١٦٣٠، جۆن وینترۆپ، حاكمی ویلایەتی ماسەشوسێتس وای دەهێنایە بەرچاو كە ئەو كۆمەڵگەیەی كەخۆیی و دواكەوتەكانی بەنیازی دامەزراندنی بوون دەبوونە " وەك شارێك بوو لەسەر بەرزایەك، (لەگەڵ) بەرامبەر چاوی هەموو خەڵك...كەلەسەر ئێمەوە بوو".[(١)]

---

(١) دەستەواژەی وینترۆپ لەلایەن ماتیۆ ٥:١٤ ەوە داڕێژراوە " تۆ رووناكی جیهانی. شارێك كەلەسەر بەرزایەك دروستكرابێت شاردنەوەی ئاستەمە". ئەم نووسینە لە وتارێكی ئایینییەوە كۆپی كراوە، " شێوازێك لەچاكەی مەسیحییەوە". بەرلەوەی پیوریتانییەكان ئینگلەند بەجێبێڵن لەسەر پشتی كەشتییەكە

پیوریتانییەکان لەوبڕوایەدانە ئەگەر خودا زۆرحەزی بکردایە، کۆلۆنی نویێ دەبووە شێوازێك بۆئەوەی چۆن ژیانێکی خۆش بگوزەرێنین. ئەوان بۆ جیهانێکی نویێ هاتوونە بۆئەوەی لەچنگی دادگایی خوداوە هەڵبێن لە کڵێسە گەندەڵەکانی ئەوروپا، وە گەڕان بەدوای پەنابەرییەتی لە هەژاری و چڕی دانیشتوانی وڵاتی ئینگلەند، لەگەڵ ئەوەشدا گوێڕایەل بوون لەمەڕ فەرمانە پیرۆزەکان بۆبڵاوکردنەوەی کتێبی پیرۆز.

پەنابەرییەتی ئەوان ببووە کۆمەڵگایەك کە بناغەی لەسەر تێگەیشتنێکی دڵنیای حەزەکانی خوداوە بنیاتنراوە، پشت دەبەستیێ بە کارەکانی خودا، پەرۆشن بۆ خۆشی وەرگرتن لە میوەجاتی سەر زەوی، بەڵام وریابە زۆر نزیکی کەلوپەل و سامانی دونیایی مەکەوە. بۆ پاراستنی چاکخوازییەکانیان خۆیان لەوکۆمەڵگایە جیادەکردەوە ئەوانەی بیرکردنەوەکانیان ناسازیێ لەگەڵ ئایدیا رەق و وشکەکانیان.

لەکاتی شۆڕشەکەی ئەمەریکا، توخم و رەگەزی پیوریتانییەکان کەمایەتییەکی زۆر بچووکیان پێوە دیار بوو. پرۆتستانتییە ئەڵمانییەکان لە نیویۆرك نیشتەجیێ بوون. ولیەم پێن کۆمەڵگای هاوڕێیەتی خۆی لە پەنسیلڤیانیا دامەزراند. ماریلاند لەلایەن ئەو کاسۆلیکانەوە دامەزراوە کە لەکۆتاییدا لەلایەن پرۆتستانتەکانەوە بەدەرنراون- کەبووە ئاوێنەیەکی هاوشێوەی جەنگی ناوخۆیی ئینگلیزی. بەپێچەوانەی ئەوەی کە دەیڵێن، ئەوان خەریکی بەخاوەن بوونی بەندن (عەبد)-لە تیۆرە هەرە سەرەتاییەکانی ئەوروپی لەبارەی سروشتی جیهانی مافەکانی مرۆڤ. ئەمەریکا، هەر لەئێستاوە بۆتە موگناتیسی کۆچبەرەکان، پڕبووە لە دواکەوتووەکانی لە هەموو جۆرە ئایین باوەڕ و میللەتان. ئەگەر بەشێوەیەکی ژیرانە سەیری بابەتەکە بکەین دەبینین ناکۆکی ئایینی لە ئەوروپا چ هەڵایەکی ناوەتەوە، سەیری ئەم رەنگدانەوەیەی بکە کە چۆن رەگی لەنێو مێژووی دەستبەسەرداگرتنەکانی خۆیان بەسەر وڵاتاندا داکوتاوە. دامەزرێنەرەکان چۆن چۆنی باوەش بۆ زاراوە ئازادییە ئایینییەکان دەکەنەوە. دەستووری نوێی ئەمەریکا ئەمەی دیاریکردووە، لە ماددەی شەش، کە "هیچ تاقیکردنەوەیەکی ئایینی داواناکرێت وەك تایبەتمەندییەك بۆ هەر راسپاردەیەکی نووسینگەیی یاخود گشتی لەژێر ولایەتە یەککگرتووەکان". یاسای مافەکان زۆر دوور دەڕوات، بۆ

---

پێشکەشکراوە. جارێکیان لە ماسەشوسێتس، وینترۆپ و کمیاترەوەوە ئاماژەی بۆکراوە، بۆنموونە، بەرەنگاری ئەم پێشنیارەی دەکرد کە هەندێك لە پیوریتانییەکان ژنەکانیان ناچاردەکرد بە داپۆشینی سەریان.

قەدەغەکردنی هەردوو دامەزراوە فەرمییە ئایینییەکان و هەر پوختەیەك لەمافی خوداپەرستن. هەر لەم روانگەیەوە، نە حکوومەت و نە کڵێسە ناتوانێت کۆنترۆڵ و یاخود ئازاری ئەویتریان بدات.

لەوکاتەی توێژینەوەم لەبارەی ئەم کتێبەوە دەکرد، فیکرەیەکی زۆرم نەدەدایە فەلسەفەی ئایینی دامەزرێنەرەکانی ئەمەریکا، من لەسەرەتادا ئەوانم وەك تیۆرزانێکی سیاسی لەقەلەم دەدا لەوەی وەك  رۆحانی بن. بەڵام هەرچۆنێك بێ، بەشێوەیەکی زۆر قووڵەوە لە ئایینیان دەڕوانی. بۆنموونە، سەرۆکەکانی پێشووتر باوەڕدارێکی زۆر خۆگربوون بەرامبەر بوونەوەرە ئاسمانییەکان، بەڵام لەسەر رێبازی کڵێسەوە مارە نەدەکران. جۆرج واشنتۆن، لەیەکەم وتاری سەرۆکایەتیدا، دانیبەوەدانا کە قەرزێك بۆ ئاسمان لەرێگەی وتنی ئەوەی کە هەر هەنگاوێکی ئەمەریکی " دەبێ بەچەند نیشانەیەکی داهاتووی حکوومەتەوە بناسرێت". بەڵێنی ئەوەی دەدا بە پێدانی قەرز "کە ئەو دامودەزگا سیاسییە نەتەواییانەی کەلەسەر رێبازێکی پاك و بێدەنگی رەفتاری تایبەتەوە دامەزراون". زیاد لەمە گرنگتر، شێوازێکی داهێنا بۆ ئیدارەیەکی داهاتوو لەرێگای ئەم هاوکارییە بەردەوامییەی بۆ بەرگەگرتنی ئایینی. واشنتۆن بانگەشەی هیچ بەرژەوەندییەکی نەدەکرد تەنانەت ئەگەر خەڵکەکە " لە میللەتی موحەممەدی بێ، جوولەکە، یان مەسیحی، یاخود بێ ئایین بێت". تاکە ئاواتی ئەوەبوو کە ئەمانە هەموویان مافی ئەوەیان هەبێت بۆئەوەی پراکتیزەی  ئازادی پەرستن و دەربڕین و بیرکردنەوە بکەین. لەساڵی ١٧٩٠ لەنامەیەکی بۆ کۆمەڵەی هیبرۆی نیوپۆرتدا، واشنتۆن بەدڵنیاییەوە بۆی نووسیبوو، " حکوومەتی ولایەتە یەککگرتووەکان هیچ سزایەك ناداتە  توندڕەوەکان هەروەها هیچ هاوکارییەکی چەوساندنەوەش ناکات".

دامەزرێنەرەکانی ئەمەریکا بەجۆرێك وشیاربوون کە شتێکی زۆر نوێ و سەرسوڕهێنەریان بنیاتناوە- سیستەمێك کە بناغەکەی لەسەر مافەکانی  لێپرسراویەتی تاکەکەسەکان داهێنراوە. ئەمەش چەمك و بیرۆکەیەکە کە کاریگەری لەسەر بیرکردنەوەی سیاسی لە تەواوی جیهاندا هەبوو. ئەمەریکا خۆی وەك دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی بەپلەوپایە لەڕووی رێکخراو و رەوشتەوە دەبینێت بۆ پوکانەوەی ئەریستۆکراسی لە ئەوروپا. بەئازادانە خۆیان بەراورد دەکەن لەگەڵ ئیسرائیلی کۆن وەك خەڵکێك کە لەلایەن خوداوە هەڵبژێراون بۆ بەشداریکردن لە کارکردن لەسەر پلانە ئاسمانییەکان. بێنجامین فرانکلین پێشنیاری ئەوەی کرد کە گەورەترین مۆری وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان وەسفی ئیسرائیل دەکەن کە بەنێو بەشە ئاوی دەریای

سوورەوە تێپەردەبن، وەك پێغەمبەر موسا كە هاوەڵەكانی بەرزدەكاتەوە و سوپاكەی فیرعەونیش خەریكن نقووم دەبن[٢]. تۆماس جیفیرسۆن وای بۆ دەچوو كەمۆرەكە پێویستە منداڵانی ئیسرائیلی بە سەرشێتانە نیشانبدات، " رابەری كردن بەهۆی هەورێك لە رۆژ و كۆڵەكەیەكی ئاگرین لەشەو". بۆ ئەمەریكییەكان لەو كاتدا، بەشێوەیەكی ئاسایی دەبینرا بۆ گونجاندنی ئازادییەكەیان لەگەڵ ئەوانەی كە لەلایەن پێغەمبەر موساوە بەدەستهاتبوون، زەوییە نوێ و پیرۆزەكەی ئەوان لەگەڵ ئەو بەڵێنەی بۆ جووەكان دراوە، هەروەها ئەركەكەیان بۆ رێسای ژیانیان كە " هەموو مرۆڤێك بەیەكسانی دروستكراون" لەگەڵ دروستكردنی مرۆڤ بە ئەندێشەی خودای ئیبراهیم.

لە دەساڵی یەكەمەكانی سەربەخۆیی نەتەوەییدا، بڕوایی ئەمەریكییەكان ئەوەبوو كە وڵاتەكەیان بۆتە وەرگر و نێوەندێكی تایبەتی كارەكانی خودا. لەگەڵ گەڕانەوەی ئابوورییەكی رێكوپێك، بەتاڵان بردنی كۆشكی سپی لەلایەن سوپای بەریتانیاوە لەشەڕی ١٨١٢، ولایەتە یەكگرتووەكان بەجۆرێك چالاك بۆوە كە خەریكە لەبەر زۆری دانیشتوانی بتەقێتەوە. كڕینەوەی لویسیانا، گەشتی لویس و كلارك، پاشكۆی تێكساس، دۆزینەوەی زێر لە كالیفۆرنیا—— هەموو ئەمانە پاڵ بە ئەمەریكییەكانەوە دەنێ بۆ بەردەوامی بەرەو رۆژئاواوە رێبكەن. لەكاتی بەرەو پێشوەچوونیان، هەڵسان بە دامەزراندنی بیرێكی دیموكراتی بۆئەوەی ببێتە شێواز و نموونەیەكی كۆماری. لە ئەدگارەكانی باوەڕ بەخۆبوون، پرۆژەی ئازاد، هەروەها دەرفەتی یەكسان بۆتە ئایینی نەتەوەیی. رۆحی سنوور لەوانەیە رەق و زبر بێت، بەڵام بەهۆی وزە و گەشبینییەوە دووبارە گریانگرتەوە. دوای هەڵسەنگاندنی ئەمەریكییەكان لەسەر كار، پەرستن و هەروەها لەیاریكردن لەساڵی ١٨٣٠ یەكانەوە. ئەلێكس دی تۆكڤێل دەینووسێت و دەڵێ: "ئەمەریكا زەوی سەرسوڕهێنەرەكانە، بەجۆرێك هەموو شتێك لەجولەیەكی نەگۆڕدایە، وە هەموو گۆڕانێكیش خۆی لەخۆیدا بەڵگە و سەلماندنێكە.... بێگومان چوارچێوەی سروشتی وادەكەوێتە بەرچاو كە تواناكانی مرۆڤی پێوە دەبینرێت، و ئەوەی هێشتا نەكراوە مانای

(٢) فرانكلین داكۆكیكارێكی ناسراوی لێبووردەیی ئایینی بوو. لە فلادیلفیا، پارەی بەخشی بەمەبەستی دروستكردنی هۆڵێكی گشتی كە ببێتە هۆكارێكی بەرجەستە كە هەموو جوانبێژێك دەتوانێ بەكاری بێنێ لەهەر ئایین و باوەڕێكدا. دەیووت " هەتا ئەگەر موفتی كۆنستانتیپۆڵ موژدەبەرێكی ناردبوایە بۆ بانگەوازكردنی موحەممەدیزمی بۆلای ئێمە، مینبەرێكی لەم هۆڵە دەدۆزییەوە بۆ وتارەكانی.

ئەوەیە تاوەکو ئێستا هەوڵی بۆ جێبەجێکردنی نەدراوە". مێژوونووس جۆرج بانکرۆفت کە هاوەڵی دی تۆکڤێڵە بەتەمەن لەو گەورەترە، دەڵێ دەربڕینی ویستی گشتی کە لەلایەن دیموکراسییەتی ئەمەریکاوە کارێکی مەحاڵە کەچی گونجاوە لەگەڵ مەبەستی خوداوە. " ماڵی کردنی سنوور" مانای درێژکردنەوەی گەیشتنە بۆ شارستانییەت. هەڵکشان بەرەو رۆژئاوا بۆتە فەرمانێك، لە قسەکانی رۆژنامەنووس جۆن ل.ئۆسولڤیان، بۆ بەدیهێنانی "داهاتووی روونی" ئەمەریکا[٣].

بێگومان، هیچ کەسێك بەهەمان شێوەی ئەویتر کارە پیرۆزەکان تەفسیر ناکات. هەندێ لە سەرکردە ئایینییە بەرەگەز ئەمەریکییەکان هۆشدارییان داوەتە دواکەوتووەکانی خۆیان بەوەی چاوەڕێی هیچ پاداشتێك لە ژیانی کۆتاییدا نەکەن هەتا ئەم داب و نەریتە بێ ئەدەبییانەی پیاوە سپی پێستەکان رەتکەنەوە یان بگەڕێنەوە بۆ شێوازە نەریتەکان. مانای وایە وازهێنان لە ئەلکهول و چەك، پشت دەبەستێتە سەر تیروکەوان، وە پاراستنی باوەڕە رۆحانییەکانی باب و باپیرانیان. لەنێو ترادیشنالیسەکاندا رێد جاکێت، کە یەکێك بوو لەسەرکردەکانی سێنیکا کە سکالایان لەدژی موژدەبەری گاورەکان تۆمارکرد بەوەی سەرقاڵی بەگاورکردن بوون لەنێو خەڵکی هیندەوە: " برای بەرێز تۆ دەڵێی تەنها یەك رێگا هەیە بۆ پەرستنی رۆحی پیرۆز و خزمەتکردنی. ئەگەر تەنها یەك ئایین هەیە، ئەی بۆچی ئێوەی خەڵکی سپی پێست زۆر لەم بابەتەوە جیاوازن؟... ئێمەش ئایینمان هەیە...فێرمان دەکات چۆن سوپاسگوزاری ئەم هەموو نیعمەتە بین کە پێمان بەخشراوە، یەکترمان خۆشبووێت و یەکگرتوو بین. هەرگیز دەمەقاڵێ لەسەر ئایین نەکەین. برای بەرێز ئێمە خۆزگەی رووخانی ئایینەکەی تۆ ناخوازین یان لێتی بسەنین. ئێمە حەزدەکەین خۆشی لەئایینی یەکتر وەربگرین".

مامەڵە شەرمنانەکەی ئەمەریکییە رەسەنەکان بۆتە هۆی گەڕان بەدوای رۆح لەنێو خەڵکە تێکەیشتووەکان، بەڵام ئەمە کۆیلایەتییە کە ئەم وڵاتەی پارچەپارچە کردووە. خاوەن کۆیلەکان و ئەوانەی هەڵیدەوشێننە وەك یەکن لە پاڕانەوەی ناوی خودا لەکاتی داواکردنی دۆزەکەیان.

---

(٣) لەبارەی ئۆ سۆلڤیا (لە پێداچوونەوەی دیموکراسی)، داواکاری ئەمەریکا بۆ ئۆریگیۆن هەر لەو کاتدا سەلمێنرابوو " بەهۆی مافی داهاتووە روونەکەمان بۆ بڵاوبوونەوە و هەبوونی تەواوی کیشوەرەکان کە گرنگیدانی خودایی مەزنترین تاقیکردنەوەی لیبرالی و فیدرالی حکوومی زاتی بەئێمە بەخشی کەبووە جێگای باوەڕەی ئێمەوە".

باشوورییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کۆیلایەتی لەلایەن کتێبی پیرۆزەوە گەمارۆدراوە، نەیارەکانیان سوورن لەسەرئەوەی کەوا کۆیلایەتی شتێکی قیزەوەنە. لەنێو کۆنگرێسدا، ئەم بابەتە لەلایەن جۆن کالهونەوە وەرگیراوە، خاوەن باخچەی کۆیلەکان بوو لە باشووری کارۆلینە، وە لەلایەن چارلس سۆمنەری ماساشوسێتییەوە، لەکاتی خۆیی و ئێستاکە ویلایەتەکی لیبڕال بوو.

زیاتر لەوەی هەوڵدان بۆ گونجاندنی کۆیلایەتی لەگەڵ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، کالهون وێرا بەڕاشکاوانە باوەڕی ئەمەریکا ڕابگەیەنێ. ئەو سووربوو لەسەرئەوەی "هەموو مرۆڤ دروست نەکراوە". " بەگوێرەی کتێبی پیرۆزەوە، تەنها دووان، پیاوێك و ئافرەتێك، دروستکراون، هەریەکێکیشیان تەواوکەری ئەوەیتریانە. هەموو ئەوانیتر لەئەنجامی لەدایك بوونەوە دروست بوونە، بەشێوەیەك لەشێوەکان... ئازادن یاخود یەکسان". بەڵام سومنەر، لە ئایاری ١٨٥٦ مینبەری کۆنگرێسی بۆ ماوەی دوو ڕۆژی تەواو وەرگرت بۆ پێشکەشکردنی سیمینارێك لەبارەی یاسادانەرێکی کۆیلایەتی دەیووت:

> *ئەم سیناتۆرە چەندە کەم زانیارییە لەبارەی خۆی و یاخود توانای (ڕەتکەرەوەی کۆیلایەتی) کە دەیچەوسێنێتەوە! ئەو تەنها پیاوێکە کە دەبێ بمرێ، کەچی بەرەنگاری ڕێسا نەمرەکان دەبێتەوە. لەگەڵ بوونی هێزێکی دیاریکراو کەچی ڕووبەڕووی کارە لەبن نەهاتووەکان دەبێتەوە، و دەبێ هەر بشمرێ. ئەو لەبەرامبەر بەتالیۆنە بەهێزەکانەوە دەوەستێ لەوەی لەگەڵ ئەم کەتیبە بچووکەی کە لەلایەن مرۆڤێکەوە پێشرەوی دەکرێ—دڵی مرۆڤ هەر لەکاتی لەدایکبوونیەوە پڕیەتی لە هێز و توانای لەڕادەبەدەر بۆیە دژایەتی هەموو سروشتی پێدەکات و ئەوانەی تیاشیدایە، دژایەتی خودای پێدەکات. با لێیگەڕێین مل بۆ ئەم هەموانە کەچ بکات!*

لەگەڵ ئەم هەموو دە ساڵییەی بڵاوبوونەوەی دەنگە دەنگ و شەڕ و گەشەکردنی ئابوورییەوە، ڕازیکردنێك هەیە گوایە خودا بەچاودێرییەوە ڕێنمایی داهاتووی ئەمەریکای کردووە. ئەم باوەڕە تا نزیکبوونەوەی سەدەی بیستەمیش هەر لەنێو زیهنی خەڵکدا مایەوە بۆیە توانا و بەرزخوازییەکانی ئەم وڵاتە ئەوپەڕی سنوورەکانی بەزاند، تا گەیشتە ئۆقیانووسی هێمنەوە. ولیەم میکنیلی لەساڵی ١٨٩٨ لەکاتی سەرکەوتنی ئیدارەکەی لە فیلیپین بۆ گرووپێك لە پیاوە ئایینییەکانی میتۆدیستی وتی:

*راستییەکە ئەوەیە من فیلیپینم نە دەویست، لەوکاتەی کە بۆ ئێمە هاتن، وەك دیارییەك لەلایەن خوداکانەوە، نەمدەزانی چیان لەگەڵدا بکەم... شەوانە تا نیوەی شەو بەنێو مەمەڕی کۆشکی سپییەوە ڕێمدەکرد، شەرم لەوە ناکەم کە پێتان بڵێم، ئەی پیاوە بەڕێزەکان، لەسەر ئەژنۆکانمدا داچەمامەوە و لەبەر خودای باڵادەست دەپاڕامەوە بۆ ڕێنمایی و ڕووناکی... شەوێك ئەم ڕووناکییەم بۆهات... هیچ شتێکمان بۆ نەماوە تەنها گرتنی هەموویان نەبێ، بۆ پەروەردە و ڕۆشنبیرکردنی فیلیپینییەکان و بەرزکردنەوەی مەعنەویات و بەشارستانی و بەخشینی سەرکەوتن پێیانەوە.*

مێژوو زۆر لەوە جیاوازتر دەبوو ئەگەر ئێمە بەڕوونی گوێمان لەخودا نەگرتبایە دەبوایە ئەوا گوێبگرین کە خودا دەیڵێت. میکنیلی حەزی بە فراوان بوونی دەسەڵاتی ئەمەریکا دەکرد وەك بەشێك لە پلانی ئاسمانی، بەڵام هەرچەندە شەڕی دژ بە ئیسپانیا خێرا و سەرکەوتوو بوو، کەچی کۆنترۆڵکردن بەسەر فیلیپین زەحمەت و لەسەرخۆبوو. زۆرێك لە فیلیپینییەکان، هەتا ئەوانەی کە لەزووەکەوە بوونەتە مەسیحی لەلایەن کاسۆلیکییە ئیسپانییەکانەوە، نەك بە باوەشێکی کراوەوە بەڵکو بە باوەشێکی زۆر بەرووحم و بەبەزەییەوە پێشوازییان لە ئازادیخوازەکان کرد. یاخیبووێك بۆماوەی چوارساڵ لە داگیرکردنی ئەمەریکییەکانەوە تووڕەبوو، هەروەها سەرلێشێواو بوو بەرامبەر ئەم هەموو ژمارە زۆرەی ئەمەریکییەکانەوە. یەکێك لە ڕۆژنامە ناسراوەکان بە مانشێتێکی گەورە نووسیبووی، "چەندە نامۆیە کە فیلیپینییەکان—یاخود زۆرێك لەوان—زۆر بەتوندی دژایەتی دەسەڵاتدارییەتی خۆمان دەکەن. پێویستە بزانن کە ئەمە باشترین سەلماندنە بۆ حاڵەتەکانی پێشووتر... لەگەڵ ئەوەشدا شەڕەکەیان بەردەوام بوو. حاڵەتەکە لەهەموو تێڕوانینێکدا زۆر خەمناك بوو ". هەرلەو کاتەی ئەم بەرگریکردنە کۆتایی پێهات زیاتر لە ١٠٠,٠٠٠ لە دوورگە نشینەکان مردن.

ئایا ئەمەیان دەچێتە قاڵبی ئیمپریالیزمیەوە؟ نەك لەبەر ئەوانەی کە زۆرتر لێپرسراویەتی سیاسییان هەڵگرتووە. لەکاتی هەڵمەتی بوونی جێگری سەرۆك میکنیلی، تیۆدۆر ڕۆزڤێلت لە یوتا بە هاندەرێکی وت، " هێشتا هیچ ئیمپریالیستێك لەو ولاتانە نییە کەمن بینیومە". یەکێك لە سیناتۆرە دیارەکانی کۆماری، هێنری کابۆت لۆج، ئەم ڕوونکردنەوەی پێشکەشکرد: "لەو بڕوایەدا نیمە کە شتێك هەبێت بەناوی 'ئیمپیریالیزم'، بەڵام من تەواو لەگەڵ ئەم

بیرۆکەیەم کەشتیك بوونی هەیە بەناوی 'فراوانبوون'، وە ولایەتە یەکگرتووەکانیش پێویستە کۆنترۆلی ئەم شوێنە دوورانە بکات کە پشت بەئەوەوە دەبەستن".

هەرچییەك ناوی دەنرێ، سەرەرۆیی موژدەبەر لەگەڵ پاداشتەکانی دونیاوە تێکەڵ بووە. لەگەڵ ئاوابوونی سەدەی بیستەم، سیناتۆرێکی گەنج لە ویلایەتی ئیندیانا، بەناوی ئەلبێرت جێریمیا بێڤریج، کە بۆوە وتارێکی فەرمی بەناوبانگ، "مارشی بەرزکردنەوەی ئالا" کە چەند جارێکیش لە بۆنە گشتییەکان لەنێو مەمەڕی کۆنگرێسەوە دووبارەی کردۆتەوە. " فیلیپین تاهەتایی هەر هی خۆمانە"، سیناتۆرکە زۆر دڵخۆش بوو بەوەی کە دەیووت، "لە پشت ئەمانەوە راستەوخۆ رووبەڕووی بازارگای بێ کۆتایی چینییەکان دەبینەوە. هەرگیز پاشەکشێ لەم شوێنە ناکەین... واز لەهیچ هەلێکی رۆژهەلات ناهێنین. دەست لە هیچ بەشێکی ئەم پەیامەی خۆمان هەڵناگرین کە لەژێر راسپاردەکانی خوداوە جێبەجێی دەکەین بۆ بەشارستانیکردنی هەموو جیهان". و هەرچیەکیش دەوترێ، بێڤریج لە بەرزخوازی ولاتەکەی کەم ناکاتەوە. لە وتاردان بەردەوامە و دەلێ: " زۆری شەڕی داهاتوو دەبێتە هۆی دروستبوونی ململانێی بازرگانی. ئەم هێزەی کە فەرمانڕوایی ئۆقیانووسی هێمن دەکات، هەمان ئەو هێزەیە کە دەتوانێ فەرمانڕەوایی هەموو جیهان بکات. بەمانەوەمان لە فیلیپین، ئەم هێزە دەتوانێ تاهەتایە بۆ کۆماری ئەمەریکا بمێنێتەوە".

هەندێ هەلۆێست هەبوون بۆ ئەو کات زۆر نموونەیی بوون بەلام نابێ بۆ ئێمە جێی سەرسوڕمان بێ. کەچی دوای ئەمانەش، ئەو کات سەردەمی دۆزینەوەی شتی نوێ و حەماسەت بوو. بەریتانییەکان ئەم کارەیان وەرگرت کە کیپلینگ (Kipling) ئاماژەی پێکردبوو بەوەی کە " بەرپرسیاریەتی مرۆڤی سپی" بۆ بلاوکردنەوەی مەسیحییەت و بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیرییە لە نیمچە کیشوەری هیندی و ئەفەریقیا. فەرەنسییەکانیش هەلسان بە بلاوکردنەوەی سوودی کلتووری خۆیان لەنێو ئەفەریقی و عەرەبەکان. ئیسپانییەکان، بەلجیکییەکان، پورتوگالییەکان و هۆلەندییەکان هەموویان بوونە خاوەنی مولکی پشت دەریاوە. بەوەرگرتنی فیلیپین ولایەتە یەکگرتووەکان راگەیاندنی ئەوەیدا بە هاتنە نێو ریزی گەورە هێزی جیهانەوە.

هەرچەندە زۆربەی ئەمەریکییەکان پێشوازییان لەم پلەوپایە گەورەیەی ولاتەکەیان کرد، بەلام هەندێکیان ئەمە بە دووروانە لەقەلەم دەدەن، کە بناغەی لە هەلە خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز گرتووە، و هەروەها بەهەلە تێگەیشتنی خەون و هیواکانی ئەمەریکایە.

*مێژوونووس چارلس فرانسیس ئادەمس، نەوەی سەرۆکی دووەم بەبێ ڕێزییەوە تیبینی ئەوە دەکات:*

*پیاوە ئاپینییەکان زۆر پابەندن بە ئەرکەکانیانەوە، ئێمەش پەیامێکمان هەیە، ئەویش بانگکردنێکی روونی خودای بالأدەستە. دەیانەوێ بچنە دەرەوە، وە بوونی ئەم نەتەوە گەورەیە (ناردنە دەرەوە) و نیعمەتی ئازادی و کتێبی پیرۆز بۆ گەلەکانی دونیا، ئەوانەی کە چاوەڕێی ئێمە دەکەن، وەك پێغەمبەر مەسیحی ئەوانەوە، -- ئەوە لەسەرمانەوە پێویستە لەبیری نەکەین بردنی هەندێ گوللەی تەقەکردنە بۆئەوەی پارێزگاری لەو گەلە بەرز و بە پلەوپایانە بکەین،-- دەرکردنی هەموو ئەو گورگانەی کە لەنێو پێستی مەڕەکانە نێو مێگەلەکانمان خۆیان حەشارداوە. لەوەیە خۆشیان لێوەرگرتبێ—بەلأم ئێمە نا. نەخێر، ئەم بیرکردنەوانە ' رەشبینن'، تۆ پێویستە باوەڕت زیاتر بەخەڵکی ئەمەریکاوە هەبێ!—بۆئەوەی!—من ماندوو نەکات.*

پێکهێنانی چەند کۆمەڵەیەکی دژایەتیکردنی ئیمپیریالیزمی لە چەندین شاری ولایەتە یەکگرتووەکان، بەلأم ئەمەریکییەکان هێشتا بیرۆکەی ئەم پەیامەیان لەنێو مێشکدا گەشەدەکات، بەشێکی لەبەرئەوەی ئەم بیرۆکەیە لەزۆرێك لە بەلەمە جەنگی و بازرگانییەکانەوە بەرجەستە دەبێ. لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی ئەمەریکییە باوەڕدارەکان بانگەوازێك دەکەن بۆ دابەشکردنی ئیمان و باوەڕەکانیان لەگەڵ ئەو خەڵکانەی کە لەزەوییە دوورەکانەوە دەژین. لەسەرەتای سالأنی (١٩٠٠)ەوە دەیان هەزار موژدەبەری گاورەکان هاتنە بوون و بلأوەیان کرد بەسەر ولأتەکانی بێگانەوە. ئەوان لەنێو تایەفەی گاوری زۆر ئەسڵەوە هاتوون، لەگەڵ نوێنەرایەتیکردنی زۆر قورسەوە لە بزووتنەوەیەك کە لە ولایەتە یەکگرتووەکانەوە دەستی پێکردووە. کلێسەی پێغەمبەر عیسای پیرۆز لە کۆتاییدا ئاماژەی بە ناوی مۆرمۆنس کردووە. موژدەبەرەکان هەردووکیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە هەواڵی خۆش بۆ کتێبی پیرۆز وە کاریگەری دیموکراتیزەکردنی بەها و کلتووری ئەمەریکی. موژدەبەرەکان لە پێشەوەی هەموو زانا و پسپۆرەکانەوە دەهاتن بۆ فێربوونی داب و نەریتی ئەم گەلانە و فێربوونی زمانیان. لەنامەکانیان بۆ ولأتەکەیاندا ئەوە دەورووشێنێ کە گرنگیدانی هاوەڵە ئەبرەشییەکان لەم ولأتانەدا بەجۆرێکە کە هیچ ئەمەریکییەك لە پێشدا ئەم بیرکردنەوەی نەکردووە. بۆ یەکەم جارە، خەڵك لەشوێنەکانی وەك نیویۆرك، نیبراسکا، وە باکووری کارۆلینا دەست بکەن بە فشارخستنە سەر واشنتۆن بۆ دانپیانان بە مافی مرۆڤ ( وە پاراستنی گۆڕینی

ئایین)، هەروەها هاوکاریکردنێکی بەرزی رەوشتی بازرگانی ( بۆ قەدەغەکردن لە قۆرغکردنی کرێکارەکان)، وە بەدواداچوون لەئەدەبی سیاسەتی دەرەوە (بۆ پرۆتستۆکردنی بازرگانیکردنی ماددەی بێهۆشکەری چینی)یەوە.

جیاکردنەوەی کلێسە لە دەوڵەت دەوەستێتە سەر سێ "نا": نەبوونی تاقیکردنەوەی ئایینی لە هیچ ئیش و کارێکی گشتییەوە، نەبوونی ئایینێکی دیاریکراو لە دەوڵەت، و هەروەها نەبوونی هیچ پوختەیەك لە مافی ئازادی ئایین. ئەم سێ رێبازە زۆر گرنگ و پێویستە بۆ دیموکراتییەتی ئەمەریکا و بۆ پاراستنی ناسنامەی ئەمەریکا وەك نەتەوەیەك، وادانێین ئەوان هەرگیز پێشێل نەکراون. دەربڕینی ئەم ئاواتە، پێویستە ئەوە بزانین کە جیابوونەوەیەك لەم چەشنەوە مانای ئەوە ناگەیەنێ وەك دوورکەوتنەوەی خودا لە ژیانی مەدەنی، لە پارە و پوول، پارەی ئاسن، سرودە نیشتیمانییەکان، وە یاخود وتارە رەسمییەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان. ئەم راستییە رەنگدانەوەی لەسەر هەردوو قووڵایی رەگی ئایینی ئەمەریکی و یاسای نێودەوڵەتی سیاسەتی پراکتیکییەوە دەبێت: ئایین لەوەیە لە حکوومەت جیاببێتەوە، بەڵام لەنزیکەوە پەیوەندی هەیە بەوەی کە چۆن سەرکردەکان دادگایی بکرێن. هەروەك ماکیەڤێڵی لەساڵی ١٥٠٥ نووسیویەتی و دەڵێ، " شازادە... پێویستە هەموو بەزەیەکی پێوە دیاربێ، بڕوا، پاکی و راست و دروستی، مرۆڤایەتی، وە ئایین. هیچ شتێکیتر پێویست ناکات جێگای ئەمانە بگرێتەوە."(٤)

هەرلە سەرەتاوە لە جۆرج واشنتۆنەوە تادەگاتە سەرۆکی ئێستا، هەر سەرۆکێك شیاوبووە لەکاتی پێشکەشکردنی وتاری دەست بەکاربوونی سەرۆکایەتییەکەی بەباسکردنی خودا لەنێو دەقە نووسراوەکەی یاخود لەیەکێکیتر. زۆربەیان ئەم دەستکەوت و سوپاسگوزارییە دەردەبڕن کە بەدەستیان هێناوە. هەندێکیان ئاماژە بەوە دەکەن کە خودا یارمەتی بەردەوامی ولایەتە یەکگرتووەکان دەکات لەبەرئەوەی بەدرێژایی ماوەی سەرکردایەتییان سیاسەتەکەیان عادیلانە و رەوشت باش بووە. بەشێکیشیان پێشڕەوی ئەم نەتەوەیە دەکەن لە نوێژکردن لەکاتی ئاریشە و قەیرانە ناوخۆییەکاندا هەندێکیان فاکتەر دەدۆزنەوە بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی سروشتی باوەڕ

(٤) هەندێ شت دەڵێ لەبارەی بارودۆخی کلێسەی کاسۆلیکی لەسەردەمی مەکیاڤێلی کە نووسەر ئامۆژگارییەکانی خۆی پێشکەش بە شازادە سیزار بۆرگیا کرد، کە باوکی دەبێتە پۆپ ئەلیکسەندەری شەشەم.

ئایینییەکانیان لە نێو کۆبوونەوە گشتییەکاندا. سەرۆك کولیدج باسی ئەوە دەکات کەوا مەسیحییەتی ئەمەریکا وەك بەڵگەیەکی نییەتی باشەیە. ("ئەم تیپانەی کە ئەمەریکا رەوانەیان کردوون، هەڵگری چەك نەبوون بەڵکو هەڵگری خاچ بوون") و بانگەشەی بوونە مەسیحییەتی مرۆڤایەتی دەکات وەك ئامانجێکی نەتەوەیی ("وڵاتێکی بەرز بەجۆرێك کە (ئەمەریکا) بەدوای ئەمەکداری هەموو مرۆڤدا دەگەڕێت ئەمەش بۆ مرۆڤایەتی نییە بەڵکو بۆ خودایە").

تاکەکان، نەوەك نەتەوەکان، وایان پێ دەووترێت کەبە وێنە ئەندێشەی خوداوە دروست بکرێن، بەڵام وێنە ئەندێشەی ئەمەریکا هەمیشە بەو هەستانە کاریگەر دەبێت—هەندێ جار بێهێز و هەندێ جاریش بەهێز—کە بۆتە ئامێری ئاسمانەوە. هەروەك سەرۆك رۆناڵد ریگان ئاماژەی بەو دا دەیووت: "ئەگەر تۆ باوەڕەکەت بۆ داهاتوویەکی گەورەتر بەلاوەنا، ناتوانی پێناسەی ئەمەریکا بکەیت—کە ئێمە خەڵکێك بووین بڕوامان بە زەوییەکی باوەرپێکراوەوە هەبوو، ئێمە خەڵکێك بووین بڕوامان بەوە بوو کە لەلایەن خوداوە هەڵبژێراوین بۆ دروستکردنی جیهانێکی گەورەتر". ریگان دەستنیشانی ئەوەی نەکردووە کەئەم جیهانە چۆن چۆنی دروست بکرێت، بەڵام ئەو وەڵامەی کە زۆربەی سەرکردە ئەمەریکییەکان دەیدەنەوە "ئازادی"یە.

لەکتێبی پیرۆزی مەسیحییەکاندا پادشای ئاسمان لەگەڵ تۆوی خەردەڵ و خەمیرە بەراوردکراوە، شتی بچووکیان لێوە گەشەدەکەن. لایەنگرانی کتێبی پیرۆزی ئەمەریکییەکان باوەڕێکی هاوشێوەی ئەوەیان نیشاندا لەنێو نموونە دیموکراتییەکاندا. پێش لە مردنی، جیفیرسۆن ئەمەی نووسی کە سیستەمی دیموکراتی بەنێو جیهانەوە بڵاودەبێتەوە "بە زوویی دەگاتە هەندێ شوێن، درەنگتر بۆ هەندێکیتر، بەڵام لەکۆتاییدا دەگاتە هەموو شوێنێك". لەسەرەتادا ئەمەریکییەکان لەوە دڵنیا بوون کە پاداشتەکانی دیموکراسی زۆر روون و ئاشکرایە بەجۆرێك کە ئەوانیتر دەتوانی پەروەردەی ئەمە بکەن بێ ئەوەی پێویستیان بە هاندان هەبێت لەلایەن ولایەتە یەکگرتووەکان.

بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەم وڵاتە کەوتە حاڵەتێکی دوودڵی زۆر بەقووڵی گیری خواردبوو بەهۆی بوونی هەندێ ئاریشەی ئەملاوئەولا. دواى ئەمانە، جۆرج واشنتۆن هۆشداریدا لەدژی چوونە نێو هاوپەیمانییەکی بەردەوام، جۆن کوینسی ئادەم ئەمەی راگەیاند کە ئەمەریکا پێویستە ببێتە خوازیارێکی باشی ئازادی بۆ هەموو لایەك، هەروەها ببێتە

بەرگریکاری ئازادییەکەی خۆی. بەڵام سەدەی بیستەم کۆمەڵێك لە پرس و پێداویستی نوێی لەگەڵ خۆی هێنا. لەسەرەتادا خەڵوز دواتر نەوت ئینجا هەوا بووە سەرچاوەی وزە، پەڕینەوە لەوبەری ئۆقیانووسەوە بۆتە شتێکی رۆتین، لەدواییدا فڕۆکە داهێنرا. جیهان بەرەو بچووکتر دەبێتەوە، کەچی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا فراوانتر دەبێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا بۆ فیلیپنییەکان، ولایەتە یەکگرتووەکان دەستی کرد بە دەستتێوەردان بەنێو ئەم وڵاتە، بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە ئابوورییەکان و زیاتر کۆنترۆڵکردنی لە کوبا، مەکسیك، هایتی، نیکاراگوا و کۆماری دۆمینیکان. ئەمەریکاش خۆی بەبێ توانایی بینییەوە - لەگەڵ بوونی تێکۆشانی زۆر—بۆپاراستنی ئاسایشی خۆی لەوکاتانەی خۆی بەبێ لایەنی دەگرت لە ناکۆکییەکانی وڵاتی ئەوروپی. رووبەڕووبوونەوە بەهۆی پێداویستییەکانی راکێشانی ئەمەریکا لەنێو ژوورەکانیان، کە زیاتر لە هەزاران میلیان بڕیوە بەسەر دەریاکان، ئەمە شتێکی ئاساییە بۆ سەرکردە ئەمەریکییەکان بۆ ناساندنی مەترسییەکان بەروونترین زاراوەوە.

"پێویستە شەڕ بۆ دیموکراسی بکەین" ئەمە قسەی (وودرۆ ویلسن)ە لەپەیامە جەنگییەکەی لەساڵی ١٩١٧، "بۆ مافی ئەوانەی کە سەردادەنوێنن بۆ دەسەڵات بۆئەوەی دەنگێکیان بۆ حکوومەتەکەی خۆیان هەبێ ، بۆ مافی نەتەوە بچووکەکان و سەربەخۆییان، بۆ سەروەرییەکی تەواوی مافەکانی نەتەوە ئازادەکان بۆ هێنانی ئاشتی و ئاسایش بۆ هەموو نەتەوەکان و بۆئەوەی جیهان لەکۆتاییدا لەژێر چەتری ئازادییەوە بژی". دوابەدوای شەڕەکە، ستایشی سەربازەکانی ئەمەریکای کرد بۆ سەرکەوتنەکانیان: "ئەمانە پیاوی جوان رەفتارن. ئەمانە نەڕۆیشتینە بۆ ئەوەی هێز و توانای ولایەتە یەکگرتووەکان بسەلمێنن. ئەمانە رۆیشتوون بۆئەوەی هێز و توانای یاسا و دادوەری بسەلمێنن، وە هەموو جیهان ئەوانیان وەك جوان رەفتار قەبوول فەرموونە، و هەروەها دەستکەوتە گەورە و ناسراوەکانیان وایان لەهەموو جیهان کرد کە باوەڕ بە ئەمەریکا بهێنن هەروەك ئەوەی باوەر بە هیچ نەتەوەیەکیتر نەهێنن بۆ رێکخستنەوە لەنێو جیهانی ئەمڕۆدا".

لەوانەیە ئەم داخوازییانە بێ ئومێدی پێوە ببینرێت، بەڵام بۆ خەڵکی زۆربەی نەتەوە بچووکەکانی ئەم کات، بەڕاست دەرچووە. لەوکاتەی سەرکردە ئەوروپییەکان بەپەرۆشییەوە دەستکەوتەکانی دوای شەڕیان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و شوێنەکانیترەوە دابەش دەکرد، ویلسۆن داکۆکی لە دیموکراسی و مافی هەموو نەتەوەیەك دەکرد بۆ کۆنترۆڵکردنی داهاتووی خۆیان. بەشێوەیەکی گشتی هەرلەبەر کاریگەرییەکەیەوە بوو، چیکۆسلۆڤاکیای سەربەخۆ

لەدایك بوو، لەگەڵ دامەزراندنی پەیمانگا وەك نموونەی پەیمانگاكانی ئەمەریكا بوو. وەك منداڵێك، وافێركرابووم بیرلە ویلسن بكەمەوە وەك پاڵەوانێك كە بووە هۆی رەنگدانەوەی نموونەی وڵاتێك جیا لەئەوانیتر، نەتەوەیەك لەگەڵ ئەم هێزە مەزنەوە باوەڕی وایە كە دەبێ جیهان نەك لەڕێگای شمشێرەوە فەرمانڕەوایی بكرێ بەڵكو دەبێ لەژێر یاساوە بێت. ویلسن پیاوێكی شەڕانی و عیناد بوو بەڵام سیاسییەكی باش نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ویلسن هەوڵی زۆریدا بۆ بەرزكردنەوەی ناوبانگی ئەمەریكا وەك منارەیەكی ئازادی و عادیلانە. ئەمەش بۆتە كارێكی ئاسایی بۆ گاڵتە پێكردنی پلانە نموونەیەكەی لەنێو كۆمەڵەی نەتەوەكان، بەڵام هۆشدارییەكەی—كە جەنگی جیهانی دووەم دەبوایە ببێ ئەگەر ئەمەریكا شكستی هێنابوایە لەپەیوەندی كردنی بە كۆمەڵەی نەتەوەكان—بەخەمناكییەوە بۆ بینین سەلماندراوە.

جەنگی دووەم لە دوو رووەوە دەستی پێكرد، دوابەدوای جەنگی ساردەوە هات لەدژی كۆمۆنیزمەكان، و هەروەها قایم كردنی خۆڕاگری ئەمەریكا لە بەرگریكردنی دیموكراسی لە جیهان. ئەم رۆلەش بەروانگەیەكی لەبیرنەكراو لە وتارەكەی جۆن كەنێدی بەرجەستە دەبێ لەكاتی وەرگرتنی پۆستی سەرۆكایەتی وڵات بەڵێنی ئەوەیدا بۆ " پێدانی هەر نرخێك، بەرگەگرتنی هەر بەرپرسیارییەتێك، رووبەڕووبوونەوەی هەر ناخۆشییەك، هاوكاریكردنی هەر هاوپەیمانێك، دژ وەستانی هەر نەیارێك، بۆ دڵنیایی بوون لەزیندوو راگرتن و سەركەوتنی ئازادی". ئەو هۆنراوەیەی كە رۆبێرت فرۆست ئامادەی كردبوو بۆئەم بۆنە رەسمییەی، بەڵام نەیتوانی بیخوێنێتەوە، رێزی لە ئەركی ئەمەریكا دەگرت:

*دەبینین كەچۆن بەجیددییەوە ئەم گەلە شاڵاو دەنێن*
*هەوڵدان بۆ فەراهەمكردنی سەروەری وڵاتیان.*
*ئەوان هەموویان منداڵی ژێر پەروەردەی ئێمەنە بەجۆرێك لەجۆرەكان*
*بۆ كاتی ئێستا و بەرەزامەندی خۆیانەوە،*
*بۆ فێركردنیان لەمانای دیموكراسی .*
*ئایا دەڵێین " سیستەمێكی نوێیە لە چەرخەكان؟"*
*ئەگەر ئەمڕۆ هیچ رێكخستنێكی پێوە نەبینرێ،*
*ئەمە سەرئاڵۆزییەكە كە ئەوە هی خۆمانە بۆ دەست پێكردن*
*ئینجا پێویستە بەشداری بكەین لەهاندان.*

هەندێ کەس، بەدڵنیاییەوە، لێرەولەوێ هەن گفتوگۆ لەسەرئەوە دەکەن کە هەر گوتارێکی پەیامی ئەمەریکی لەجیاتی رەوشت یاخود دیموکراسییەوە دەربچێت بێ مانای مەترسیدارە. لەوبەری دەریاکانەوە، ئەمە زۆر بەباشی روونکراوەتەوە کە ئەمەریکا داواکاری بەرزی خۆی هەیە. ئەمەش لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی قەبووڵ نەکراوە. هەرچەندە کارەکانی ئەمەریکا بناغەیان لەسەر حیسابی شکۆدارییەوە بووە نەك لەسەر حیسابی نەتەوەکانیترەوە. سەرکردەی هەموو وڵاتەکان شانازی بەخۆیانەوە دەکەن، هەروەها بە بەشێك لە ئیش و کاری خۆیانەوە وەسفدەکەن. گومانبراوەکان دەڵێن، جیاوازی لەگەڵ ئەمەریکییەکان ئەوەیە، ئارەزوو و خولیایان لەبارەی بڕواهێنان بۆ گوتارەکانیانە.

بەرامبەر ئەم بۆچوونە پێچەوانەوە، ئەمەریکا لەهەموو شتێکەوە بەدەر نییە، بەڵکو نەتەوەیەکە لەنێو چەندین نەتەوەوە—بەڵام گەورەتر و بەهێزتر. ئەمەریکییەکان لەوەیە خۆیان وا نیشان دەن یاخود وا باوەڕ بکەن بەپێچەوانەی ئەوانیتر، گفتوگۆیەکە کاری خۆی دەکات، بەڵام وڵاتەکەمان وەڵامی ئەم مەترسییانە و ئەم دەرفەتانە دەداتەوە بەهەمان شێوە و بەهەمان ئاستی بەرژەوەندی کەسی پراکتیکی هەروەك کەسانیتر وادەکەن. ئامانجی هەموو سیاسەتێکی دەرەوەی هەر حکوومەتێك بۆ پاراستنی ئابووری خەڵکەکەی خۆیەتی و باشترکردنی ئاسایشی سروشتییە. سەرکردەکانمان مەیلیان بۆ خۆگۆڕین هەبوو بۆ تەسك کردنەوەی بەرژەوەندییەکان لەڕێگای وتارەکانیان لەبارەی بەها گشتییەکان و رەنگدانەوەی ئارەزووەکانیان بۆ خۆنیشاندانێکی باشتر لەوەی کە هەن، و هەروەها بۆ بەردەوام بوونی ئەم ئەفسانەیەی کە ئەمەریکایان بە سپێشیاڵ داناوە. نزیکتر لە نیشتیمان، جۆرج کێنان ئەم هۆشدارییەیدا کەئەمەریکییەکان وا خۆیان دەبینن " وەك سەنتەری رووناککردنەوەی سیاسەت و وەك مامۆستای بەشێکی گەورەی بەجێماوەکانی جیهان ئەوانەی کەمزانن و ئەوانەی کەس ئارەزوو ناکرێن".

ئارەزووی تایبەتی خۆم وتنی: "بانك"ە بەوانەی گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکەن کە ئەمەریکا هەڵاوێردن نییە. دەتوانم ئاماژە بە راگەیاندنی سەربەخۆیی، دەستوور، راگەیاندنی مافی مرۆڤ، وتاری گێتسبێرگ، رۆڵی ولایەتە یەکگرتووەکان لە هەردوو جەنگی جیهانییەوە، و نموونەی ئەوەی کە ئەمەریکا وڵاتێکی فرەرەگەزە، وڵاتێکی فرەنەتەوەی دیموکراسییە، و پرسیاری ئەوە دەکەم: کام دەوڵەتە دەتوانێ خۆی بەراورد بکات؟ هەندێکیان وەك ئەمەریکا گەورەنە، هەندێکیان وەك ئەو ئازادن، و هەندێکیشیان ئەدگاری سەرنج راکێشیان هەیە، بەڵام

هیچ کامێکیان هەمان ئەم کاریگەرییە پۆزەتیڤەی لەسەر مێژووی جیهانەوە نییە وە هیچکام لەوان نەبوونەتە هاوواتای ئەو دەرفەت و ئازادییە.

ئایا ئەوە ئەو مانایە دەدات کە من یەکێکم لەنێو ئەوانەی کە باوەڕیان وایە ولایەتە یەکگرتووەکان خاوەن پەیامێکە بۆ بڵاوکردنەوەی ئازادی بەسەر هەموو جیهاندا؟ نەخێر. من دڵخۆش نیم بەو ئایدیەوە، وەك ئەوەی ئەگەر ئامانجی ولاتەکەم لەلایەن هێزی دەرەکییەوە پێناس کرابێ—خودا، چاودێری ئاسمان، سروشت، یاخود مێژوو. هەرچەندە منیش بەتەواوی بڕوام بەو ڕێبازە هەیە کە پێشبینی زۆر بۆ ئەوانە دەکەم کە زۆریان پێدراوە. ولایەتە یەکگرتووەکان دەوڵەتێکە لە زۆری سەرچاوە و گرنگی کارامەییەکانی، توانا بێ هاوتایەکانی. ئێمە لێپرسراوییەتەکمان لەسەر شانە بۆ پێشڕەوی کردن، بەڵام ئێمە ئەم ئەرکەمان بەجێهێناوە پێویستە ئەوە لەمێشکی خۆمانەوە هەڵگرین کە ئازادی، بەلایەنی کەمەوە لەڕووی تواناوە سەربەستە، دیارییەکی خوداییە، نەوەك هی خۆمان بێ، و هەروەها بێلایەنیشە. دەکرێ بۆهەموو ئامانجێك بەکاربهێنرێت، باشە یاخود خراپە. دیموکراسی، بەپێچەوانەی ئەوەوە، دروستکراوەی مرۆڤە، مەبەستەکەشی ئەوەیە ئاراستەکردنی ڕاستەوخۆی ئازادی بۆئەو کەناڵانەی کە ڕێز لە مافەکانی هەموان دەگرێت. ئەمەریکا، وەك بەتواناترین دیموکراسی لەجیهان، پێویستە یارمەتی ئەوانە بدات کە ئارەزووی دامەزراندن و بەهێزکردنی پەیمانگا سەربەستەکانن. بەکردنی ئەمانەوە، ئێمە پێویستە ئەوەمان لەبیربێت کە گەورەکردنی دیموکراسی خۆی لە خۆیدا سیاسەتە، نەوەك پەیام، وە سیاسەتەکان لەسەر ئەرزی دیپلۆماسییەتەوە تاقی دەکرێنەوە، سیاسەتی پراکتیکی و ڕێزگرتن لە هاوکێشە نێودەوڵەتییەکان. کێشەکەمان هیچ سوودی نابێت ئەگەر بێتو تەواو لەڕاستی خۆمان دڵنیابین لەکاتێکدا ئێمەش وەك مرۆڤ هەڵە دەکەین. ئەمەریکا لەوەیە هەڵاوێردن بێ، ئێمە ناتوانین ئەم هەڵاوێردنانە داوابکەین بۆئەوەی پێمان بدەن. ئێمە لەسەرووی یاساوە نین، و هیچ هاندانێکی خوداییشمان نییە بۆ بڵاوکردنەوەی دیموکراسی، هەروەك چۆن ئەم پەیامە نیشتمانییەمان نییە بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت. بەکورتی، مافی داواکردنمان هەیە لەوەی خودا ڕەحمەتی خۆی بەسەر ئەمەریکادا بڕێژێ—بەڵام بێ ڕژد کردن.

(٣)

## نیەتە باشەکان لە ڕێگا لادەدەن
## ڤێتنام و شا

لە ساڵی پەنجایەکانی سەدەی رابردوو پەیوەندیم بەزانکۆوە کرد، لەکاتێکی ( ئێستاشی لەگەڵ دابێ بەقوتابییەکانم دەڵێم) دۆزینەوەی ئاگر و داهێنانی ئامێری بلاك بێری ( Black Berry)ی تەلەفۆنی گیرفان ( لاسلکی). بەلای زۆربەی ئەمەریکییەکانەوە ئەمە کارێکی زۆر ئەخلاقی بوو. لەوکاتەی باوکم خەریکی نووسینی کتێبەکەی بوو لەسەر مەترسییەکانی کۆمۆنیزم، بۆمن زۆر ئاستەم بوو کەسانی باش و جوان رەفتار لەکەسانی شەڕانگێز لەم جیهانەدا جیابکەمەوە. هەندێ بابەتی زۆر سادە هەبوو، بەتایبەتی نەك هەر لە ولایەتە یەککگرتووەکان، ئەوکاتەی جێگری سەرۆك نیکسۆن دووپاتی ئەوەی دەکردەوە " ئێمە لەسایدی خواوەین". دوای چەند هەفتەیەك لەکۆلیژ دەرچووم، نیکسۆن رووبەڕووی سەرۆك وەزیرانی یەکێتی سۆڤیەتی، نیکیتا خرۆشۆڤ بۆوە، بەناو " گفتوگۆی ناندین (مەتبەخ)" لەپێشانگایەکی ئامێری مۆدێرنی ماڵی لەمۆسکۆ. جێگری سەرۆك باس لەوەی دەکرد کە سیستەمی ولایەتە یەککگرتووەکان لەپێشەنگ بوو لە نیشانکردنی باشترین جۆری ئامێری بەکارهێنانی ماڵی ئەمەریکی. لەساڵی ١٩٦١، لەلایەن بەڵگەی بەرجەستەی دابەشبوونی ئەخلاقی، ئەم دابەشبوونە تەکنەلۆژییە گونجاوبوو، لەگەڵ دروستکردنی دیوارەکەی بەرلین (یاخود، وەك دەسەڵاتدارییەتی ئەڵمانیای رۆژهەڵات وابەپەسەندی دەزانی ناوی بنێن "دیواری پاراستن لەدژی فاشستەکان"). بەپێچەوانەی کۆمۆنیستەکان، جیهانی ئازاد پێویستی بەدانانی بەربەست نییە بۆ پاراستنی خەڵکەکەی لە مەترسی هەڵاتن. رۆژئاوا، شان بەشانی پێشەنگی ولایەتە یەککگرتووەکان، بەڕوونییەوە جەنگی ئایدیاکانی بردەوە.

لەدواییدا ڤێتنام هات.

بەشداربوونی ئەمەریکا لەجەنگی باشووری ئاسیا، درێژەی زۆری کێشا لە سەرەتای ساڵانی شەستەکان تا بەهاری ١٩٧٣ . ئەمە ناکۆکییەك بوو بەجۆرێك هیچ هاندانێك نەبوو بۆ

بەشەکانی سوپای ئەمەریکا کە بتوانن سەرکەوتن بەدەست بێنن. لەناوەرۆکی کۆمۆنیزمدا دژوارییەکی زۆر لەم هەرێمەدا دەسەلمێنێ کە ناسیۆنالیزم و هەڵوێستی نەیارەکانی ئیمپریالی لەلایەن سەرکردە کاریزماتییەکانەوە قۆرخ دەکران وەك (هۆش کی مین)ی باکووری ڤێتنام. باوەڕ و گەشبینی دوو ئەدگاری گەورەن بۆ بەشداریکردن لە بەرزکردنەوەی ئەمەریکا و ئاراستەکردنی ستراتیژییەکەی بەئاراستەیەکی هەڵە لە ڤێتنام.

سەرکردە ئەمەریکییەکان بێ توانان لە تێگەیشتنێکی تەواو کە چۆن ئەم دەوڵەتە بچووکە کۆمۆنیزمە بەرگەی ئەم هێزەی گرتبوو کە لەدژی ئەوەوە بەڕەڵاکرابوو. کلتوورە ناوخۆیەکەیان بەهەڵە خوێندبۆوە، هەروەها باوەڕێکی زۆری گەندەڵ لەنێو مێشکیاندا خولی دەخواردەوە، وە بەکارهێنانی بەرزکردنەوەی هەنگاو بەهەنگاوی ستراتیژی سەربازی کە تووشبوونی وڵاتەکەمان تێیدا قووڵ چوبۆوە بەبێ ئەوەی جیاوازییەکی یەکلاییکەرەوە بکەن لە گۆڕەپانی جەنگدا. لە شەقامی رای گشتی جیهانییەوە هێز و توانای ئەمەریکا بە کەمئەندامی دێتە باسکردن، لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمەڵکوژی لە مای لای و راکردنی مندالانی ڤێتنامی لەترسی ناپاڵم وای لە ولایەتە یەکگرتووەکان کرد وەك ئەوکەسانە دەربکەوێ کە هێزیان لەدژی لاوازان بەکاردێنن لەوەی وەك پاڵەوانی ئازادی.

تابلێی کارێکی سەرسورهێنەرە کە چۆن ئەو رەخنانەی کە لەکاتی شەڕی ڤێتنامەوە دەبیسران هاوتەریبی ئەم رەخنانەن کە ئێستاکە دەبیسرێن لەبارەی جیاوازی جۆری جەنگ، داگیرکردنی عێراق لەلایەن ولایەتە یەکگرتووەکانەوە. لەساڵی ١٩٦٥، هانس مۆرگێنساو، ئەو کاتەی لە والیزلی بووم نووسینە کلاسیکییەکانی لەبارەی مێژوو و سیاسەتی دەرەوەم خۆێندبۆوە، سکاڵای ئەوەی دەکرد، "لەوکاتەی کە کارێکی نۆرمەڵە بەوەی کە سیاسەتی دەرەوە و سەربازی لەسەر هەواڵگرییەوە بناغەی دانراوە-کە ئەمەش، هەڵسەنگاندنێکی بابەتییە بۆ راستییەکان—پرۆسەکەش لێرەوە دەستی بەگۆڕان دەکات: سیاسەتێکی نوێ بڕیاری لەسەر دراوە، و هەروەها هەواڵگریش پێویستە راستییەکان پێشکەشبکات بۆ سەلماندنی بابەتەکە". لە یالی، جۆن کێری ئەوکاتەی کە لەتەمەنی بیست و دوو ساڵی دابوو هاوڕێیە پارتەکەی خۆی ئاگادارکردەوە لە "مەترسییەکی گەورەی پێشبینی کردووە لەبارەی پۆلیس، داواکاری گشتی، دادوەر، دەستەی دادوەری، هەموویان لەکاتێکدا، و دواتریش، پاساوهێنانەوەی رێگای حوکم کردنمان بۆ قووڵتر و قووڵتری بۆشاییەکی ئەرکەکانمان کە نەتەوەکانیتر نە تێدەگەن و نە یارمەتیشی دەدەن". گەورە کۆنگریسمان بەڕێز مۆریس یۆدال

لە ئەریزۆنە، رای زۆربەیانی تۆمارکرد لەوکاتەی زۆر بەقسە لەڕوویەوە ئەوەی راگەیاند کە ڤێتنام "جەنگێکی هەڵە بوو لەشوێنێکی هەڵە وە لە کاتێکی هەڵە".

بەدڵنیاییەوە ئەم ناکۆکیيە بووە هۆی دابەشبوونی ئەمەریکا. هەرچەندە ریتشارد نیکسۆن بانگەوازی ئەوەی دەکرد کە"زۆرینەی بێ دەنگ"ی خەڵکی ولایەتە یەکگرتووەکان پشتگیریيان لەم جەنگە دەکرد، بەڵام ملیۆنان خەڵکی ئەم وڵاتە دژی وەستان، لەسەر حیسابی ئەخلاقی ئەم زەوییانە. سەرکردە ئایینییە دیارەکان—وەك ولیەم سلۆن کۆفن لە (یاڵی) وە رابی ئەبراهەم جوشو هیشل لەکۆلیژی خواناسی (لاهوتی) جوولەکە—لەنێو ئەمانە بوون کە دەنگی خۆیان بەرزکردەوە و لەدژی وەستان. مارتن لۆسەر کینگ ئیدانەی ئەم شەڕەی کرد بە لەدەستدانی پارە و کات و سەرچاوەی پێویست بۆ رووبەڕووبوونەوەی هەژاری لەجیهاندا، و داوای لە ئەمەریکییە ئەفریقییەکان کرد بە بەرگەگرتنی بەشێکی ناشەرعی لەم مەترسییانە (risks)، لاوازکردنی رێبازی نا توندوتیژی و، کوشتنی ڤێتنامییە بێ گوناهەکان. هەروەها کینگ قسەی لەبارەی ئەم زیانەش کرد کە بە هەڵوێست و پێگەی ئەمەریکا کەوت لە ئەوروپا و شوێنەکانیتر: " هەموو رۆژێك شەڕ بەردەوامی هەیە کەچی رق و کینە تادێ لەنێو دڵی ڤێتنامییەکان و دڵی هێزی سروشتی مرۆڤایەتی زیاتر دەبێ. ئەمەریکییەکان بەجۆرێك زۆری لە خەڵك دەکەن تەنانەت هاورێکانیشیان دەکەنە دوژمنی خۆیان. وێنەی ئەمەریکا هەرگیز وەك وێنەیەکی شۆرش، ئازادی، دیموکراسی دووبارە نابێتەوە، بەڵکو وێنەی توندوتیژی و هەیمەنەی سەربازی وەرگرتووە".

نەیارەکانی شەڕ هاوبەش (شەریك)ێکیان لە بزووتنەوەی مافەکانی مەدەنی ئەمەریکییە ئەفریقییەکان هەبوو. هەردوو دۆزەکە زۆر بەپەرۆشییەوە لەسەر منبەری شوێنە پیرۆزەکان، حەوشی زانکۆکان، شەقامەکانەوە بەرزڕاگیران. ئەم بزووتنەوانە شتیتریان بەرهەمهێنا: هەڵمەتی پشتگیریکردن لە دەنگی ئافرەت، پاراستنی ژینگە، شەرکردن لەدژی برسییەتی لەجیهان، وەستاندنی فرۆشتنی چەك بە رژێمەکان، وە زیادکردنی رێزگرتنی مافی مرۆڤ. ئەم چالاکییە لەوەوە پێکهاتبوو کە ئەمەریکا خۆی بێبەری کرد لە ئایدیەی ئەوەی کە ئەمەریکا وڵاتێکی هەڵاوێردنە، زیاتر لەوەی کە نەتەوەیەکە بۆ خەون و هیوایەکانی خۆیەوە دەژی.

خۆپیشاندەرەکان ئەوە دەردەخەن کە رۆح و ئازایەتی راستی ئەمەریکا لەلایەن ئەو سەرکردانەوە رووخێنرا کە پشتیان تەواو بە هێزەوە بەستبوو، و پراکتیزەکردنی ستاندەری دوولایەنە کە پەیوەندی بە مافی مرۆڤەوە هەیە، و هەروەها کەم گرنگیپێدان بەڕای گشتی

جیهانی. رەخنەگرەکان هەستیان بەئازار دەکرد لەوکاتەی ریشاڵە دڕاوە ئەخلاقییەکەی ئیدارەی نیکسۆن بەدیارکەوت کە بووە هۆی ئەوەی وازهێنانی یەکەمجار جێگری سەرۆك، دواتر نیکسۆن خۆیشی. خۆپیشاندەرەکان ستایشی ئەوەشیان دەکرد لەکاتێکدا پشکنەرەکانی کۆنگریس هاوشەریکی خۆیان نشاندا لەنێو دەزگای هەواڵگری CIA لە پاڵپشتی کردنی دەسەڵاتدارییەتی حکوومەت و جێبەجێکردنی تیرۆرکردنە سیاسییەکان.

ئەزموونی تراژیدی لە ڤێتنام نەبووە هۆی کەمکردنەوەی ئەرك و چالاکی ئەمەریکا لە شەڕکردن دژی کۆمۆنیزم، بەڵام چەند پرسیارێکی وروژاند سەبارەت بە چۆنیەتی بەشداریکردن لەگەڵ شەڕەکە. هەروەها داواکارییەکیشی دروستکرد بۆ زیاترکردنی سەرکردەی دڵسۆز. ئەوکاتەی جیمی کارتەر، حاکمی ولایەتی جۆرجیا بوو ناوبانگییەکی زۆر کەمی هەبوو، خۆی هەڵبژارد بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ساڵی ١٩٧٦، بەرلە هەڵبژاردن پەیمانی بە هەوادارانی و خەڵکی ئەمەریکادا کە هەرگیز درۆ لەگەڵ ئەم خەڵکە ناکات و هەروەها حکوومەتێکیشیان پێبدات وەك خۆیان باش و بەسوود بێ. ئەمە پەیامێکی راستی ئەو سەردەمە بوو لەئەنجامدا کارتەر بەسەرۆك هەڵبژێردرا. زۆر خۆشحاڵ بووم بەوەی کە سەرۆکی نوێ زبیغنیو برزیزینسکی هەڵبژارد وەك راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، کە تیۆرزانێکی بەناوبانگی مەسەلە نێودەوڵەتییەکان بوو، و هەروەها پرۆفیسۆری من بوو لەزانکۆی کۆڵۆمبیا، لەوکاتەی قوتابی خوێندنی باڵا بووم. هەرچەندە ئەوکات کۆڵۆمبیا ببووە سەنتەری پرۆتستۆکردنی دژی شەڕ، نە من و نە برزیزنسکی هەرگیز پەیوەندیمان پێوە نەکردبوون. لەسەرئەوە رازی بووە کە شەڕەکە ببووە هۆی خراپ بەڕێوەبردنی وڵات، بەڵام ئێمە نەبووینە بەشێك لەم هەڵوێستە بێ مەبەسەی کە زۆرێك لە سەرکردە پرۆتستۆکارەکان دەریان دەبڕی لەبەرامبەر مەترسییەکانی کۆمۆنیزمدا. تەواو باوەڕمان بە ئامانجەکانی ئەمەریکا هێنابوو بۆ جەنگی سارد وە بیریشمان دەکردەوە کە ئەمە کارێکی ئاستەم نییە بۆ پێشوەچوونی نزیکبوونەوەیەکی باشتر بۆ دەست هێنانیان. ئەوکاتەی برزیزنسکی کارێکی لەنێو ستافەکەی خۆیدا پێشکەش کردم، من پەیوەندیم بە ئیدارەکەیەوە کرد کە هەوڵی دۆزینەوەی بالانسێکی راستی دەدا لەنێوان دوو داواکاری ئەخلاقییەوە: شەڕکردنی کۆمۆنیزم بەشێوەیەکی کاریگەرەوە، وە یاخود پیشاندانی رەزامەندی بۆ هاوکاریکردنی رێبازە دیموکراتییەکان و مافەکانی مرۆڤ.

لەم نێوەندەدا بۆچوونێکمان بۆ ماوەتەوە کە هاتۆتە رادەی کوڵان لەسەر ئاستی جەنگی ساردەوە لەبارەی چۆنیەتی رووبەڕووبوونەوەی کۆمۆنیزم بەشێوەیەکی ئاقڵ و ژیرانە. یەکێك لەسایدەکانی ئەم بۆچوونە گفتوگۆی ئەوەی دەکرد کە ئەمەریکا پاساوی دەهێنا لە بەکارهێنانی زۆربەی رێگاکان بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو هەڕەشانەی کە لەلایەن گرووپە سۆڤیەتییەکانەوە کێشرابوون. ئەگەر ئەم رێگایانە هاوکاریکردن بێ لەدژی دیکتاتۆرییە کۆمۆنیزمەکان، با ئەمە ببێ، ئەمەش هێشتا گونجاوتر بوو بۆ شۆڕشگێڕانی مارکسیزم بۆ وەرگرتنی هێز، خنکاندنی ئازادی، وە بەجێ نەهێشتنی هیچ هیوایەك بۆ چاکسازی کۆتایی. سایدەکەیتری ئەم بۆچوونە مکوڕبوونە، کە ئەمەریکا دەیتوانی بەباشترین رێگا بەسەر کۆمۆنیزمدا زاڵبێت ئەویش لەرێگای یارمەتیدان و پشتیوانی رێسا مرۆڤایەتییەکان. لەم رووەوە ئەمەریکا هیچ شتێکی نەدەهاتە پێش تا لێیەوە بترسێ ئەگەر ئەمەریکا خۆی بەتوندی لە سایدی ئەم خەڵکە بووبایە کە ململانێ دەکەن بۆ باشترکردنی ژیانی خۆیان. ئیدارەی کارتەر گەرا بەدوای کۆکردنەوەی ئەدگارە چاکەکانی هەر ئاریشە و وتووێژێك. ئەم داواکارییە هاتنی چەند زاراوەیەك و جیاوازی ناوەخۆیی لەگەڵ بوو. برزیزنسکی هیچ بیرۆکەیەکی هەڵەی لەبارەی ململانێی ئێمە و یەکێتی سۆڤیەتەوە نەبوو. بڕوای بە کرێملن نەدەکرد، هەستی بەوە دەکرد کە ئێمە بەهۆی کردار و سیاسەتی خۆمانەوە دەبێ رەق بین. کارتەر زیاتر ئایدیاڵی بوو، دەیویست ئەمەریکا وێنەیەکی نەشێواو و بەرەوشت پێشکەشی هەموو جیهان بکات. هەردووکیان دەبێ رازی بن، هەرچەندە، ئێمە زیاتر سەرکەوتووتر دەبووین لە رووبوڕوونەوەمان لەگەڵ کۆمۆنیزمدا ئەگەر بێتو ئێمە رێزمان بۆ مافەکانی مرۆڤ نیشان دابوایە و دانانی ئایدییەکی فێندەمێنتاڵی لە سیاسەتی دەرەوەمان.

دوای چوار مانگ لە وەرگرتنی ئۆفیسی سەرۆکایەتی، لە وتاری بەرایی لەنۆتردامەدا، سەرۆك کارتەر بەرنامەی نوێی ئێمەی راڤەکرد. لەگەڵ رەتکردنەوەی " پەندی ئەخلاقی سادەیەوە" وتی ئەمەریکا باوەڕی زۆری هەبوو بە رێگاکانی دیموکراسی کە هیچیتر هەڵناخلەتێ بەتاکتیکی نەشیاو چ لەناوەوە، یاخود لە دەرەوەی وڵات:

*باوەرمان بەداهاتوومانەوە هەیە، ئێستا ئێمە ئازادین لەو ترسە زۆرەی کۆمۆنیزمدا بەجۆریك رۆژێك وای لەئێمە کرد باوەش بۆهەر دیکتاتۆرییەك بکەینەوە کە ئێمەی بەرەو ئەم ترسەوە دەبرد. ماوەی چەندین ساڵە، خۆمان ئامادەکردووە بۆ وەرگرتن و بەکارهێنانی رێبازە بەخەوش و تاکتیکەکانی نەیارەکانمانەوە، هەندێ جاریش وازمان*

*له بەهاکانی خۆمانەوە هێناوە لەبەرخاتری ئەوانەوە. ئێمە شەڕمان لەگەڵ ئاگر دەکرد بەئاگرەوە بەنیازی دامرکاندنی، هەرگیز بیرمان لەوە نەدەکردەوە کە ئەم ئاگرە بەهۆی ئاوەوە باشتر دەکوژێتەوە. ئەم تێگەیشتنە لەکارکەوت و دەرنەچوو، ڤێتنام باشترین نموونەیە بۆ هەژاریی زیرەك و بەرەوشتەکەیان. بەڵام لەنێو بێ ئومێدیدا، رێگای گەڕانەوەمان دۆزییەوە بۆ رێباز و بەهای خۆمان، هەروەها دووبارە باوەڕی لەدەست چووی خۆمان بەدەست هێناوە.*

وتارەکەی سەرۆك وەك پەرەسەندنێکی زۆر گرنگەوە لەلایەن ئەم گرووپەوە پێشوازی لێکرا کە لە ماوەی جەنگی ڤێتنامەوە پشتگیرییان لەمافی مرۆڤ و ئاشتییەوە دەکرد. زۆر خۆشحاڵ بوون لەوکاتەی، کە بۆ یەکەم جارە، جێگرێکی وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری مافەکانی مرۆڤ دەستنیشان دەکرێ. وەك راسپاردنی کۆنگرێس، ئیدارەکە دەستی کرد بەدەرکردنی راپۆرتی ساڵانەی خۆی لەبارەی پڕاکتیزەکردنی مافەکانی مرۆڤ لەو وڵاتانەی کە یارمەتی ولایەتە یەکگرتووەکانی پێدەگات. خۆبەستنەوەی نوێ هاتە ئاراوە لەسەر راهێنانی سەربازی و فرۆشتنی چەکی سوپا بەهاوڕێیانە، بەڵکو حکوومەتە دەسەڵاتدارییەکان وەك ئەو وڵاتانە: فیلیپین، ئەرژەنتین، سیلڤادۆر، گواتیمالا و نیکاراگوا هەرچەندە، یەك دیکتاتۆر، لە هەموو ئەم گەمارۆیانە رابکات: شای ئێران.

موحەممەد رەزا پەهلەوی لەساڵی ١٩٥٣بووە هاوپەیمانی ئەمەریکا، ئەم ساڵەی کە دەزگای هەواڵگری CIA لەهەوڵێکی کۆدەتادا شای ئێرانی لەشوێن سەرۆك وەزیرانی هەڵبژێراو دانا، بەڵام دژی رۆژئاوا دانا. لەوکاتەی کورسی دەسەڵاتی وەرگرت شا خۆی وەك حاکمێکی توند و نوێخوازێکی پەرۆشەوە دەسەلماند. "شۆڕشە سپی یەکەی" لەلایەن رۆژئاواوە بەباش وەرگیرا لەچاککردنی پەروەردە، بنیاتنانی رێگاوبان، باشترکردنی چاودێری تەندروستی، و فراوانکردنی دەرفەت بۆ ئافرەتان. ئیدارەی نیکسۆن رەزامەندی نیشاندا بەفرۆشتنی هەموو جۆرە چەکێك بە ئێران جگە لە چەکی ناوەکی نەبێ کە حکوومەتەکەی نیازی فرۆشتنی هەبێت، بەو چاوەڕوانییەی لەبەرامبەر ئەوەوە رژێمێك کە خزمەت بەوە بکات وەك پاراستنی سەقامگیری دژی کۆمۆنیزمەکان.

بۆ سەرۆك کارتەر، شای ئێران ئەزموونێکی زووی بوو. سیاسەتی دەرەوە تەنها لەسەر بناغەی مافەکانی مرۆڤ بنیاتنراوە کە خۆی لێ لادەدات وەك دیکتاتۆرییەك، کە پۆلیسەکانی لەسەر ئازاردانی نهێنییەوە لێ راهاتوون. لەبڕی ئەوەوە، ئیدارە شای لەباوەش گرت. ئێران،

لەگەڵ پاراستنی نەوتی یەدەگ و پایەی ستراتیژییەتی بەدرێژایی بەشی باکووری کەنداوی فارسەوە، زۆر بەگەورەیی تەماشا دەکرێت وەك شایانێك بۆ ترس. ئەمەش مەسەلەیەکە بەجۆرێك هەردوو سەرۆك و برزیزینسکی لەسەر ئەوە رێککەوتن کە ولایەتە یەکگرتووەکان رێگایان بە سایدی ریالیستیکی خۆیدا بۆ سەرکەوتن بەسەر زیاتری غەریزەی ئایدیالیستیکی خۆی. لەکۆتاییدا ئێمەومانان دەستمان ختسۆتە نێو یارییەك کە کۆی یارییەکە دەکاتە سفر و کەوتۆتە سەر بەرزترین مەترسییەکان. واشنتۆن و مۆسکۆ بەرامبەر یەکتر دانیشتوون لەسەر مێزی یاری شەترەنجی جیهانییەوە. جیهان لەم کاتییەوە بۆ دوو بەش دابەش بوو، یاخود بەوجۆرەی کە خۆمان بۆی دەچین. کاتێکی دیاریکراوی دەوێ بۆئەوەی زلهێزەکان بتوانن ئەوانە بناسنەوە کە پیاوێکی ریشداری عەبا درێژ لەتەنیشتیانەوە دانیشتووە ئەم هەنگاوانە دەنێ کە تایبەتە بەخۆیەوە.

هیچکەس گرنگی بەمە نەدەدا لەوەی کە سالآنی شەستەکان لەوکاتەی سەرکردەیەکی ئایینی نەناسراو، ئایەتوولآ رۆح الله خومەینی، لەشاری خوی بەدەریانا لەبەر نارەزایی گرتنی دژی "پووکانەوە و رووخانی" رژێمی شا. خەڵکێکی کەم تێبینی ئەوەیان دەکرد لەوکاتەی ئایەتوولڵای دوورخراو دەستی کرد بە پەیوەندی کردن لەگەڵ هاوولآتیانی ئێرانی، لەرێگای بەکارهێنانی کاسێتی دەنگی کە لە فەرەنساوە بەقاچاغ دەهێنرایە ئێران. زۆر لە دوودڵییەکەی دەرنەدەخست، لەوکاتەی لە نۆڤێمبەری ساڵی ١٩٧٧، کورەکەی خومەینی لەلایەن هێزی ئاسایشی شاوە کوژرا.

ساڵی داهاتوو، لەوکاتەی شا یاسای هاوسەرگیری راگەیاند، سەربازەکانی شا دەستیانکرد بە تەقەکردن لە خۆپیشاندانێکی قەرەباڵغی بێ چەك، لەئەنجامدا ٩٠٠ کەس بوونە قوربانی. لەکۆتاییدا، ولایەتە یەکگرتووەکان شای لە هاوکاری کردنی بەردەوامی خۆی دڵنیاکردەوە لەگەڵ ئەوە بەکاریشی دەهێنا، بەبێ سوود، بۆ گەشەپێدانی ریفۆرم کە لەوەیە ببێتە رازیکردنی نەیارەکانی و گەرانەوەی هێمنی بۆ ناوچەکە.

چەند ساڵێك دواتر، لەنێو کلآسی خوێندندا، توانیم وەسفی ئەو رووداوانە بەنموونەوە بکەم لەوەی کە چی روودەدات ئەگەر بێتو حکوومەتەکەمان دابەشبوو. بریاردەرە سەرەکییەکانی نێو کۆشکی سپی، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، وەزارەتی دەرەوە، و هەروەها باڵوێزخانەی ولایەتە یەکگرتووەکان لە تەهران هەموویان سەرچاوەی زانیاری جیاوازیان هەبوو، تێگەیشتنی جیاوازیان هەبوو لەوەی لەمەودوا چی روودەدات، وە تەنانەت ئایدیای

جیاوازیشیان هەبوو سەبارەت بەوەی کە چی بکرێ باشە. بەنزیکەییەوە لەکۆتاییدا، باڵوێزەکە گەیشتە ئەم قەناعەتە بەوەی کەوا باشترە شا لەسەر حوکم بمێنێتەوە. وەزارەتی دەرەوە لەواشنتۆن خەریکی دۆزینەوەی ڕێگایەك بوو بۆ کۆتایی پێهێنان بە شاهایەتی و دانانی، لە جێگای ئەوەوە، هاوپەیمانییەکی میانڕەو. برزیزنسکی لەو بڕوایەدابوو کە شا، ئەگەر پێویستی کرد، دەبوایە هێزی سەربازی بەکاربێنێ بۆ دامرکاندنی خۆپیشاندەران. لەهەمان کاتدا، CIA پێویست بوو تا رادەیەکی کەمێك رۆلی خۆی بینیبایە. لەیەکێك لە کۆبوونەوە یەکلایکەرەوەکاندا، ستانسفیلد تورنەر، کە لەدواییدا بووە بەرێوەبەری ئاژانس، پرسیاری راپۆرتی لێکرا لەبارەی خۆپیشاندانەکەی ئێرانی لەدژی شا. وەڵامی دایەوە بەوەی کە هیچ راپۆرتەکی لانییە: شا رێگای بە CIA نەدەدا بۆئەوەی قسە لەگەڵ هیچ نەیارێکی سیاسی ئەم رژێمە بکات. لەئەنجامدا هیچ هەنگاوێکی برایانە لەلایەن ولایەتە یەکگرتووەکانەوە بۆ خومەینی نەهاوێشترا، وە هەموو تێکۆشانێك لەلایەن هاریکاری خومەینییەوە بۆ پەیوەندی کردنی بە لێپرسراوانی ئەمەریکا رەتکرانەوە. لەسەر ئاستی هەرە بەرزی حکوومەتی ئەمەریکا، یاخیبووەکانی ئێرانی هەموویان نەناسراو بوون-باندێك لە کۆنەپەرستی ئایینییەوە بوون، کە ئەندام و ئامانجەکانیان شاراوەبوو.

رووبەڕووی شۆڕشێکی ئێرانی بووینەوە، ئەمەش لەبەر هۆیەکی زۆر سادەوە کە هەرگیز شتی ئاوامان بەخۆوە نەبینیبوو. وەك هێزێکی سیاسییەوە، ئیسلام واپێدەچێ بچووك ببێتەوە لەوەی بەرزببێتەوە. هەموو کەسێك لەم هەرێمە خۆی سەرقاڵ کردبووە بە کێشەی پراکتیکی ئابووری و مۆدێرنەوە. شۆڕشی ئێران بناغەی لەسەر کاردانەوەیەکی توندی ئایینی بوو لەدژی ئەمەریکا و رۆژئاوا؟ لەوەی کە دەمارگیرییەکی کەمی لەدواوە بێ، ئەوانەی کە هاوکاری ئەمجۆرە شتانە دەکەن؟

پسپۆڕانمان بێ ئومێدبوون لەگرتنی نەیاری بەرامبەر شا، یاخود دواکەوتە دڵسۆزەکانی کە سەرکردە موسڵمانەکان بەیەکەوە لەخۆ کۆبکاتەوە، هەتا لەنێوان مەتیریالزمی بەربڵاوەوەی کۆتایی سەدەی بیستەمەوەشدا. دروستکەرە سیاسییەکان درکیان بەهەڵەکانی خۆیانەوە کرد بەو گریمانەیەی کە دەبوو شۆڕشگێڕەکان رازیکرابوونایە بەلادانی شا لەسەر کورسی و دانانی حکوومەتێکی دیموکراتی لەجێگای ئەوەوە. هەر لەزووەکەوە فێری ئەوە بووینە کە راپەڕینەکەی ئێرانی تەنها کۆدەتایەك نەبوو، یان "گۆڕینی رژێم نەبوو" یاخود هەتا شەڕی ناوەخۆش نەبوو، بەڵکو بوومەلەرزەیەکی سیاسی راست بوو، هەروەك شۆڕشەکانی فەڕەنسا و

رووسیا. دوای ئەوەی لەکۆتاییدا شا  لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ کورسی دەسەڵاتی بەجێهێشت، ئایەتوولا خومەینی دەسەڵاتی وڵاتی وەرگرت و پێکهاتەی هێزی ئاسایشی کۆنی تێکشکاند. بەندی و پاسەوانی زیندان رۆڵیان گۆردرا. وێنەیەکی نوێی جیهانی دروست بوو وەك راستییەکی رەسمی، لەوەش سەرسوڕهێنەرتر، ئەم راستییە هیچی بۆ نەکرا نە لەبەرامبەر کۆمۆنیزم و نە لەبەرامبەر دیموکراسییەوە. ئەمەش راستییەك بوو کە گرنگی نەدەدا نە بە پێویستەکانی ئابووری کۆمەڵگا و نە بەمافە سیاسییەکانی تاك،  بەڵکو لەبڕی ئەمانە راستی بناغە دەگرێت لەسەر لێکدانەوەیەکی تەسك و نەرمی ویستی خواوە.

لەوکاتەوە ولایەتە یەککگرتووەکان تاکە زلهێزی جیهان نەبوو بۆ کەمکردنەوەی بەها و گرنگی ئایین. سەرکردەکانی یەکێتی سۆڤیەت بڕوایان وابوو بەپچڕانی پەیوەندی نێوان واشنتۆن و تەهران وەك دەرفەتێکی ستراتیژی، لەبەرئەوەی هەست بەدوودڵی دەکەن هەر لەسەردەمی قەیسەرەکانەوە لەئاستی ئەو دانیشتوانە ناکارامەیانەی کە بەدرێژایی سنووری باشوور،  ئێستا ئەم هەلەیان بۆ رێکەوتووە بە داگیرکردنی ئەفغانستان (کە لە دیسەمبەری ١٩٧٩) بەبێ ئەوەی دوودڵی پێوە دیاربێ کە ئێران هەر بنکەیەکی سەربازی دابنێ ئەوا ئەمەریکا وەڵامی دەدایەوە. هەرچەندە سەرکردە سۆڤیەتییەکان کێشەی بچووکیان هەبوو لەبارەی حکوومەتێکی بێ دەسەڵات، هەروەها بێ ئومێدبوون لە پێشبینیکردنی ئەم توڕەبوونەی کە داگیرکردن دەبێتە هۆی دروستکردنی لەنێوان موسڵمانەکان نەك هەرتەنها لە ئەفغانستان بەڵکو لەسەرتاسەری باشووری ئاسیا و نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە. ئەم دوژمنداریە، بەنەوبە، دەستی بە دەرفەتێکی ستراتیژی کرد بۆ ولایەتە یەککگرتووەکان. ئێستا ئێران ناوچەیەکی قەدەغەکراوە، رووی خۆمان بۆ دراوسێیەکیتری ئەفغانستان وەرگێڕا ئەویش پاکستانە. بەدواکەوتنی لۆژیکی پێشبڕکێ لەهەموو شوێنێکدا (دوژمنی دوژمنم دۆستمە)، یارمەتییەکی زۆری ئەو موسڵمانانەماندا لەڕێگای پاکستانەوە ئەوانەی کە بڕیاریاندابوو بجەنگن لەدژی سۆڤیەتییە گومڕایەکان.

برزیزنسکی وای بۆ دەچوو کە ئەمە کارێکی پێویستە بەوەی رووسیا پارەیەکی زۆر بدات بۆئەم داگیرکردنە (جەنگە)، کە خۆی وای دەبینێ وەك پەرینەوەی هێڵی مەترسی لەڕێگای بەرێوەبردنی جەنگی ساردەوە. لەسەردانەکەی بۆ ناوچە سنوورییەکانی پاکستان بۆ ئەو جەنگاوەرە موسڵمانانەی کە لەوێوە کۆببوونەوە رایگەیاند "خودا لە سایدی ئێوە دایە". دە ساڵێکی خایاند، بەڵام ئەفغانییەکان، لەگەڵ هاوپەیمانەکانیان، لەکۆتاییدا داگیرکەرەکانیان

بەدەرنا و، وڵاتەکەیان وەرگرتەوە. بەپێچەوانەی ئێران، ململانێ لە ئەفغانستان واپێدەچوو سەرکەوتنێکی بێسنووری ولایەتە یەکگرتووەکان بێ. بێگومان، ئەوەمان نەدەزانی کە لەدواییدا ئەم چەند جەنگاوەرە موسڵمانە کە زۆر بەکاریگەرییەوە شەڕیان لەدژی دوژمنەکانی هەردوولامانەوە دەکرد رۆژێك دابێ تووڕەبوونەکەیان لەدژی ئێمەوە سەرهەڵبدات.

ئەزموونەکانی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ڤێتنام و ئێران لەسالآنی حەفتاکان، چەند وانەیەکی پێشکەشکرد کە ئەمەریکییەکان کاری وایان دەکرد بۆ یادکردنەوەی ئەمڕۆکە. یەکەم وانە ئەوەیە کە دەبێ ئێمە زۆر بەرزتر بیر لەخۆمانەوە بکەینەوە بەر لەو کەسانەی کە بیرمان لێدەکەنەوە. ئێمە دواتر توانیمان لەوە تێبگەین کە بۆچی ژمارەیەکی زۆری ڤێتنامییەکان لەدژی بوونی ئەمەریکییەکان لە وڵاتیان شەڕیان دەکرد. کاتێ تەلەفزیۆنمان بەکار دەخست لەساڵانی ١٩٧٩ وە ١٩٨٠ دەمانبینی خەڵکانێکی زۆری ئێرانی بەدەم هاوارەوە دەیان وت " مردن بۆ ولایەتە یەکگرتووەکان"، رووبەڕووی شالاوێکی رق لێبوونەوە ببووینەوە کە نەماندەتوانی لەوەوە تێبگەین. لەدوای ئەمەوە ئێران چیتر نەبووە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا. هیچ سەربازێکمان بۆئەم شوێنە نەنارد، هەروەك ئەوەی هیچ بۆمبێکیشمان دانەباراند. ئێمە وا هەستمان بەخۆمانەوە دەکرد کە بەرگریکاری ئازادی بووینە، ئەم کوڕە چاکانە کە هەرگیز ئەزیەتدانی ئەم وڵاتە دوورەیان لا ئامانج نەبووە. تووڕەبوونەکەی خەڵکی ئێرانی دوورە لە ئەقڵەوە، ئەمە دەبێ گەمژەیی پێوە دیاربێت. چۆن خەڵکێکی ئاقل و تێگەیشتوو ئاماژە بە مامە سام دەکات وەك " ئەهریمەنی گەورە"؟

ئەم پرسیارە راستەوخۆ دەمانباتە سەر وانەی دووەم: گرنگی ئایین. لەروانگەی موسڵمانەکانی ئێرانەوە، ولایەتە یەکگرتووەکان گیانی بەگیانی دیکتاتۆرییەتە کە دەیەوێت خۆیشی لەبەها ئیسلامییەکانی بەدوور بگرێت. هەربۆیەش ئەم شۆڕشە ئایینییە ئاراستەیەکی دژایەتیکردن بوو بۆ هەردوولایان شا و ئەمەریکا. چونکە ئێمە گرنگی نەریت و باوەڕی موسڵمانە ئێرانییەکانمان بەکەم زانیبوو، دوژمنمان دروستکرد کەچی مەبەستمان لەدروستکردنیان نەبوو. هەتا جەنگی ڤێتنام، لەسەرەتادا تێکۆشانێك بوو لەسەر ئایدیۆلۆژیای سیاسی و ناسیۆنالیزم، کە پێکهاتەیەکی ئایینی لەخۆ دەگرت. لەدەرەوە، دۆزی نەیارە کۆمۆنیستییەکان کۆتایی پێهات چونکە حکوومەتەکەی سایگۆن بووزایەکانی کپ و دەمکوت کردبوو، زۆرترین دەزگای ناکۆمۆنیسی لەم وڵاتەدایە. مکوڕبوون لە مافی پیشاندانی ئالای ئایینی لەئاهەنگی لەدایکبوونی بووزا، جەنگاوەرە دەرباییەکان ئاژاوەیان نایەوە، و هاندانی

سەربازەکان بۆ تەقەکردن، کاردانەوەیەك کە کاری ئاژاوەیی زۆری بەدواوەبوو. کۆمەڵێك لەپیاوی ئایینی عەمامە زەرد لەبەردەم وێنەگرانی ئاژانسی نێودەوڵەتییەوە کوشت، بەو یارمەتییەی کە رای ناوخۆ و جیهانی لەدژی سیاسەتی ئەمەریکا بگۆڕێت. سەرۆك دایەم، کە ئێمە یارمەتی حکوومەتەکەیمان دا، یاسای هاوسەرگیری راگەیاند دەستیکرد بە گرتنی سەرکردە بووزایەکان. ژن برای دایم بەئاشکرا لەبەردەم کەسە نزیکەکانی ئەم کارەساتەی بە " ئاهەنگی گۆشت برژاندن" وەسفکرد. ئەمەش رێگایەکی زۆر رەق بوو بۆ سەرکەوتن بەسەر دڵ و مێشکی خەڵکی ڤێتنام.

نووسەرێکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەساڵی ١٩٧٧، بێرنارد لویس، دەنوسێت، " رۆژئاواییەکان، لەگەڵ بوونی کەمێك لە هەڵاویردن، کۆتایی هێنا بە پێدانی پێگەیەکی ناوەندی بەئایین لەنێو نیگەرانییەکەی خۆیان، هەر لەبەر ئەوەشەوە ئامادە نەبوون بۆ درکاندنی کە کەسیتر جگە لەخۆیان نەبێ ناتوانن ئەم کارە بکەن. بۆ ئەقڵێکی مۆدێرن و پێشکەوتوو، ئەمە کارێکی رێگە پێنەدراوە بەوەی خەڵك لەسەر جیاوازی بچووکی ئایینییەوە شەڕ بکەن و بمرن". هەروەها وانەیەکی دژواربوو فێری ئیدارەی کارتەری کرد. دوای شۆڕشەکەی ئێران، سەرۆك فەرمانیدا بە سازدانی کۆمەڵێك راپۆرتی کورت لە کۆشکی سپی لەلایەن زانا و پسپۆڕەکانەوە لەبارەی رێباز و سیاسەتی ئیسلام. هەوڵەکان چڕکرانەوە دوای ئەوەی باڵوێزەکەمان لەتەهران دەستی بەسەرداگیرا و دیپلۆماتکارەکان بە دیل گیران. راپۆڕتە کورتەکان تارِادەیەکی کەم جیاوازی دروستکرد، هەرچۆنێك بێت، بەڵام چونکە لەوکاتەوە جەماوەری (شەعبیەتی) ئیدارەکە بەرەو نزمی دەچوو کە بووە هۆی هەرەسهێنان لەدووبارە هەڵبژاردنەوەی.

وانەی سێیەم ئەوەیە کە خەڵکانی زیرەك و نییەت پاك دەتوانن گریمانەی وا ئاکار بەرز دابنێن کە ئەم کارانە دوورن لەراستی. تێکەوتنی ولایەتە یەکگرتووەکان لە ڤێتنامەوە دەستیکرد بە مەبەستە دڵسۆزەکان و کەمی نیگەرانی خۆیان، بۆیە دەیویست خەڵکی باشووری ڤێتنامی سوپاسگوزار لەچنگی بەندایەتی کۆمۆنیزمییەکان رزگار بکەن. کاتێ شەڕەکە بووە جێی بیزارکەری دەوروبەر، هەستەکان بەوجۆرە گەشەیان دەکرد کە گونجاوترین رێگا ئەوەبوو پاشەکشێ بکەین. جارێکیان ئەمە روویدا و، چالاکەکان ئاهەنگیان دەگێڕا. بەڵام زۆربەیان رووگرژبوون لەوکاتەی حکوومەتە گەندەڵ و یارمەتیدەرە رۆژئاواییەکان لە باشووری ڤێتنام و کەمبۆدیای دراوسێ لەسەر کورسی دەسەڵات لەلایەن رژێمەکان لابران کە

یەکەمجار حوکمی تاکڕەویان چەسپاند و دواتر گۆڕەپانی کوشتاریان بە سەرکردایەتی پۆڵ پۆت دروستکرد. بوونی ئەمەریکا لە ڤیێتنام وەك دێوەزمەیەکی لاشەکانەوە دادەنرا، گەڕان و تێکدانی پەیامەکان، ناپالْم، چاوەڕوانکردنە بێ کۆتاییەکانی سەرکەوتن کە هەرگیز نایەنە دی. ئەمەریکا لەدەرەوەی ڤیێتنام  وەك دێوەزمەیەکە بۆ ملیۆنان خەڵك ئەوانەی لەنێو بەلەم و چی کە لە سەرەوە دەژین. بوونی ئەمەریکا لە ڤیێتنام وەك دێوەزمەیەکی لاشەکانەوە دادەنرا، گەڕان و تێکدانی پەیامەکان، ناپالْم، چاوەڕوانکردنە بێ کۆتاییەکانی سەرکەوتن کە هەرگیز نایەنە دی. ئەمەریکا لەدەرەوەی ڤیێتنام  وەك دێوەزمەیەکە بۆ ملیۆنان خەڵك ئەوانەی لەنێو بەلەم و چیا کەلە سەرەوە دەژین.

لە ئێران، سیناریۆیەکی هاوشێوە ئاشکرا کرا. شا سەرکردەیەکی توندوتیژ و جێگای متمانە نەبوو کە بەشێوەیەکی زۆر نامرۆڤانەوە نەیارەکانی خۆی دەمکوت دەکرد. ئەوکاتەی دەسەڵاتی شا دەستی بە خلیسکان کرد، چالاکەکانی مافی مرۆڤ هەڵسان بە تاوانبارکردنی دووڕوویی ئیدارەکەی کارتەر لەیارمەتیدانی بەردەوامی شا. زۆربەیان دڵشادبوون بە نەمانی شاهایەتی شا، بەڵام لەڕووی بابەتییەوە، ئەوەندەی کە پەیوەندی بە مافی مرۆڤەوە هەیە پراکتیزەکردنی حکوومەتی ئێرانی سەرکەوتوو زۆر خراپتر بوو لە پراکتیزەکردنی حکوومەتەکەی شا.  لەساڵەکانی سەرەتای تەمەنی ئەم حکوومەتەدا هەزاران خەڵك بە تۆمەتی هەڵگەڕانەوە سیاسی و "تاوانی ئەخلاقییەوە" لەسێدارەدران. "پاسەوانە باوەڕەکانی (شۆڕش)"ی ئایین جێگای پۆلیسی نهێنی شایان گرتەوە کە زۆر لەمان دڵڕەقتر بوون. سەدان هەزار ئێرانی، تەنانەت ئەوانەی بۆماوەیەکی درێژیش بەرهەڵستی شایان دەکرد، هیچ دەرفەتێکی وایان لەبەردەست نەما تەنها بەدواکەوتنی شا نەبێ  لە وڵات دوورخرانەوە. ئیمرۆکە، زیاتر لە چارەگە سەدەیەك تێدەپەڕێت بەسەر ئەم شۆڕشە، دەسەڵات لە ئێران تاوەکو ئێستا لەژێر دەستی گرووپێکی بچووکی مەلای هەڵنەبژێردراوە.

جیمی کارتەر، وەك هەر سەرۆکێکی پێش خۆیی و دوای خۆیشی، بەوجۆرە بیریان دەکردەوە کە جوانڕەوشتی دەبێ سەنتەری ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی ولایەتە یەکگرتووەکان بێت. کار و ئەرکەکانی لەبارەی مافەکانی مرۆڤەوە وایان لێکردم شانازی بەخۆمەوە بکەم بەخزمەتکردن لە ئیدارەکەیدا. هەروەها رۆلی خۆیشی بینی لە باوەرپێکراوەی (مصداقیەت) سەرکردایەتی ئەمەریکا و لە فراوانبوونی بێ کۆتایی دیموکراسییەت لە ئەمەریکای لاتینی، ئاسیا، ئەفریقیا، هەروەها جەرگەی ئەوروپا. رازیبوونی سەرۆك وای لە

مەسەلەی بەها دیموکراتییەکان کرد ببێتە بەشێك لە دانوساندن لەسەر سیاسەتی دەرەوە، هەتاوەکو هەندێ جار بڕیارەکانی کۆتایی قورساییەکی زیاتر دەبەخشنە فاکتەرەکانیتر، هەروەك مەسەلەکەی ئێران. ئەزموونی ئێمە لەم شوێنەدا وامان پێنیشاندەدا کە بڕیاردان سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە چەندە ئاڵۆز و زەحمەتە. بۆ پاراستنی هێلی دژوار لەدژی سەرچاوەیەکی شەڕانگێزەوە (کۆمۆنیزمی یەکێتی سۆڤیەت) شان بەشانی سەرچاوەی دووەمەوە وەستان ئەویش (شای سەرکورتکەرە)، لەئەنجامی ئەو یارمەتییەوە بۆ بەرزکردنەوە و ڕێگا خۆشکردن بۆ سەرچاوەی سێیەم کە ئەویش (ئایەتوڵا خومەینی)ە.

هەرچەندە من ئەوکات بڕیاردەرێکی گەورەی سیاسی نەبووم، ئەو هەستە بێ ئومێدانەم بەبیردێتەوە کە ئێمە هەرهەمووومان هەستمان بەوە دەکرد گریمانەکانمان هەڵە بوون، هەڵبژاردنەکانمان تەسك بوونەوە، هەروەها بارودۆخەکانیشمان لەدەرەوەی کۆنترۆڵی ئێمەوە دابوون. هەندێك لەرەخنەگرەکان دەیانوت دەبوایە ئێمە یەکەمجار بەها دیموکراتییەکانمان چەسپاندووایە و زووتر دەستبەرداری شا بووباینایە. هەندێکیتریان بەوە رازیبوون کەوا دەبوایە ئێمە یەکەمجار ئاسایشمان چەسپاندبوایە دواتر هاوکاری شا بکەین، بە هێزی سەربازی گەر پێویستی کردبوایە. لەتێگەیشتنی دوای ئەم ڕووداوانەوە، کارێکی ئاسانە بەدەستنیشانکردنی ئەم هەڵانەی کە ئایا فەرامۆشکردنە یاخود ئەرك و راسپاردەیە. ئەمە ئەستەمترە بۆ تێگەیشتن بەروونی بەرلەوەی هیچ بڕیارێك بدرێت، لەکاتێکدا ئەنجامەکان هێشتاکە جێی گومانن هەروەها بکەرەکانیش دەستی خۆیان ئاشکرا نەکردووە کە ئاخۆ چیان تێدا حەشارداوە. لەم بارودۆخانەدا، پێویستیمان بە ڕێنمایی هەیە، بەڵام بۆ ئەمە-بۆ کێ، بۆ چی، ئێمە ئاراستەی بکەین؟

(٤)

# پرسی ویژدان

ئۆپۆزسیۆنی مارتن لوسەر کینگ جونیۆر لەشەڕی ڤیێتنامەوە چی بۆ نەماوە جگە لە بەشێکی کەم نەبێ لە کار و میراتەکانی. پابەند بوونی بە یاسا و نەرمڕەوی، داوای دووبارە خوێندنەوەیەکی ئەخلاقی دەکرد لەبارەی بنەمای کۆمەڵگەی ئەمەریکی و سیاسەتەکەی لەهەردوو رووەوە ناوەخۆیی و دەرەکی. لە روخساری بێشوماری کلێسای قەرەباڵغ و هۆڵی کۆبوونەوەکان، دەنگە بەرزەفڕەکەی بروسکئاسا بەرەنگار دەبۆوە:

*ترسنۆکی پرسیار دەکات—ئایا ئەمە ئارامە (ئەمانە)؟ بەرژەوەندی پرسیار دەکات—ئایا ئەمە سیاسییە؟ غروری پرسیار دەکات - ئایا ئەمە جەماوەرییە؟ بەڵام ویژدان پرسیار دەکات—ئایا ئەمە راستییە؟ رۆژێك دادێ یەکێك پۆستێك وەردەگرێ کە نە ئارامە، نە سیاسییە، نە جەماوەریشە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم پۆستە وەردەگرێ چونکە راستییە.*

وتارەکەی دوکتۆر کینگ قایلکەرە (مقنع)، هەرچەندە، کاریگەری بەجێدەهێڵێ لەوکاتەی بڕیاردەرەکان لەدەورەی مێزەکە کۆدەبنەوە، لەپێشیانەوە چەند دەفرێك هەیە کە هەڵبژاردنەکان زۆر بەروونییەوە وەسفکراوە "ئارام"، "سیاسی"، "جەماوەری"، و هەروەها " راستی"- هەروەك قاپی تاکەکەس لە خوانێکی چێشتخانەوە.

هەروەك نموونەکەی ڤیێتنام و ئێران، ئەمە مەسەلەیەکی دەگمەنە. بۆ دەرکردنی بڕیارێکی ژیرانە. پێویستە سەرکردەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان بە زانیارییەکی باش دەستپێبکەن. ئەو کاتەی وەزیری دەرەوە بووم، هەموو رۆژێك کردبوومە بەرنامەی خۆم رۆژنامەیەکم لە نێو

ناندین (مەتبەخ) بەدەم کوپە قاوەکەمەوە دەخوێندەوە. لەوکاتەی دەگەیشتمە نووسینگەی خۆم کە لەنهۆمی حەوتەمی وەزارەتی دەرەوە بوو، پاکەتێك لە زانیاری کە لەلایەن ئۆفیسی هەواڵگری و توێژینەوەی وەزارەتەوە ئامادە کرابوون لەسەر مێزەکەمەوە دادەنران. شیکردنەوەی ئۆفیسکە لەسەر دەقی مێژوو و دیپلۆماسی حاڵەتە تایبەتییەکان باش دەبینران: کێ دەیکات بۆ کێ، بۆچی، لەکەیەوە. دواتر دەستمکرد بەخوێندنەوەی کورتە راپۆرتی رۆژانەی سەرۆك. ئەمەیان دۆکیومێنتێکی بەرزە پۆلینکراوبوو بەڵام لەچاو رۆژەکانیتر سەرنجراکێش نەبوو. لەوکاتەی دەمخوێندەوە، نوێنەری CIA ئامادەبوو و سەیریکردم، لەحاڵەتی ئەوەی کە ئەگەر هەر پرسیار یاخود داواکارییەکی تایبەتم هەبێت.

کورتە راپۆرتی رۆژانەی سەرۆك زۆر کورت بوو، خوێندمەوە بۆئەوەی لەوە دڵنیابم کە چی بەسەرۆك رادەگەیەنرێت. دواتر بەپەرۆشەوە کۆپیەکی درێژترم خوێندەوە لەهەمان بابەت پێی دەوترا راپۆرتی رۆژانەی هەواڵگری نیشتمانی ( نەتەوەیی). لەپاشاندا راپۆرتێکم بەدەست گەیشت لەبارەی هەڕەشەی تیرۆرستی چاوەروانکراو. لەناوەندی ئەم راپۆرتەدا، هەمیشە یەکێك لە پێکهاتەکان ون دەبوو: دڵنیایی. ئەگەر بێتو هەواڵگری ئامێری تەلەفزیۆن بوایە، ئەوا دەبووە شێوازی رەش و سپی سەرەتایی بۆ پێشوازی هەژاری، هەربۆیە وێنەکان رەساسی بوون هەروەها شێوەی وێنەکان لەسەر شاشەکە رەنگ بەفری نادیار بوو. دەتوانی ئەم شێوەیە بگۆڕی بەهۆی دەسکەکان هەرچۆنێك کە خۆت بتەوێت، بەڵام ئەگەرنا بوەستە، لەو شتانەی کە دەیانبینی پشتیان پێدەبەستی زیاتر لەوانەی کە پێشبینیان دەکەیت یاخود هیوای ئەوە دەخوازی بۆ بینینی ئەوانەی کە بەڕاستی بوونیان هەیە.

هێشتاکە تیمی سیاسەتی دەرەوەی ئیدارەی کلینتۆن لەسەریان پێویست بوو بڕیاری زۆرتر دەربکەن، کە ئایا ئێمە جێگای باوەڕین لەوەی زۆر دەزانین یاخود نا، رووداوەکان چاوەڕوان ناکەن. هەتا بڕیارە بچووکەکانیش بەشێوەیەك لەشێوەکان گرنگی خۆیان هەیە، چونکە ئەگەر دەستمانکرد بە جوولەکردن بۆ ئاراستەیەکی دیاریکراو، ئەوا گەڕانەوە و پەشیمان بوونەوە زەحمەت دەبێ. بڕیارەکان پێویستە یەك لەسەر یەکەوە بنیاتبنرێن ئێمە ئاگاداری ئەم بڕیارانەین هەروەها هەڵبژاردنەکانیشمان قورستر دەکات. ئەرکی یەکەمان پاراستنی خەڵکی ئەمەریکا بوو. هەروەها هەریەکێکمان سوێندی ئەوەمان خوارد کە بەرگری لە دەستوور بکەین و بەدڵسۆزییەوە لەسەر ئەرکی ئەو پۆستانەی کە هەیتمان جێبەجێی بکەین. بەڵام کەی ویژدانمان رۆلی خۆی بدیتبا؟ ئایا ئێمە لێپرسراوییەتەکی ئەخلاقیمان هەبوو؟

دین ئاکیسۆن پیاوێکی زۆر زیرەك بوو بەڵام کەسێکیش بوو دوور لە بەزەیی وەك وەزیری دەرەوە لە ئیدارەی سەرۆك ترۆمان خزمەتی دەکرد. لەساڵی ١٩٦٥، ئەمەی نووسی "مامەڵەیەکی باش لەگەڵ کێشەکان بەهۆی پێداویستی بەرجەستەیی دێتە بوون بە حیسابکردنی نەتەوەکان وەك تاکەکان وە جێبەجێکردنی رەوشتی نەتەوەیی خۆمان بەسەریانەوە، بۆ نموونە، سیستەمی زێڕین—تەنانەت لە پراکتیزەکردندا تاکەکان بەکەمی بەکاریدەهێنن. راستییەکەی ئەوەیە نەتەوەکان ناکرێ وەك تاکەکان سەیر بکرێن، مەبەست و ئەنجامی کردارەکانیان بەتەواوەتی جیاوازە".

دوای بیست ساڵ، جۆرج کێنان گفتوگۆی ئەوەی دەکرد "بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی بۆئەوەی حکوومەتێك پابەندی خۆیەوە بێت بناغە لەسەر هەموو ئەوانە ئاسایشی سەربازییەکەی، راست و دروستی ژیانی سیاسییەکەی، و هەروەها خۆشگوزەرانی خەڵکەکەی دەگرێت. ئەم پێداویستییانەش ئەدگاری ئەخلاقییان نییە، ئەم پێویستییانەش خۆبەدوورگرتنی ئاستەمە بۆ بوونی نەتەوەیی هەر بۆیە بابەت نییە بۆ پۆلێنکردنیان بە 'چاکە' یان بە 'خراپە'".

هەردوو گوتاری ئاکیسۆن و کێنان دەربڕینی کلاسیکی قوتابخانەیەکی فیکرین لە سیاسەتی دەرەوە، لەلایەن ئەکادیمییەکانەوە ئاماژە بەوە دەکرێت کەوەك " قوتابخانەی ریالیزمەوە" ریالیستییەکان ئاگاداری ئەوە دەکەنەوە کە لە دژی ئەوەن گرنگی بە رەچاوە ئەخلاقییەکانەوە بدرێت چونکە هەندێك لەو رەچاوگرتنانە لەوەیە ببنە هۆی لەدەستدانی روانگەی ئەوەی رەفتاری حکوومەت پێویستە چۆن بێت لەنێو زیهنی ئێمەوە. کاتێ من قوتابخانەی فیکریم لەکۆلێژ خوێند، بەهەمان شێوە ئەوەش فێرکرام کە رەچاوی نەتەوەکان وەك "ئاکتەری عەقڵانی"یەوە بکەم بۆئەوەی بەوجۆرە رەفتار بکەن کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە بگونجێت. ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە جەماوەری خۆی لەدەستدا، دوای ئەوەی رۆژێك بە "مقنع"ەوە رەچاوکرا. بەدڵنیاییەوە، لەجیهانێکی بەکەموکورییەوە، سیاسەتێکی دەرەوەی خۆبەخشی تەواو نایەتە ئەنجام، بەڵام بۆ گفتوگۆکردن لەوەی کە هۆ و ئەنجامی کارەکان لەلایەن وڵاتەوە "زۆر جیاوازە" بۆ هەموو ئەو تاکانەی کە پشتیان بە ئاراستەکانیترەوە دەبەستن. دوای ئەوانەش، ئەنجامی سیاسەتی نەتەوەکان لە بڕیارەکان و کردارەکانی تاکەکانەوە دەردەچێت.

بەگوێرەی ئەم جەختکردنەوانەی کینان، یەکێ لەوەیە بڵێ کە بەرژەوەندییەکانی تاکی ئێمە بەدەستهێنانی خواردن و جێگای حەوانەوە و پاراستنیانە لەدژی هەڕەشەکانی دەرەکی.

ئەم دووانەش، "پێویستییەکن کە خۆبەدوورگرتنیان ئاستەمە" ئەدگاری ئەخلاقییان نییە. بەڵام بۆ پاراستنی ئەم بەرژەوەندییانە پێویستە لەسەرمان کاربکەین، و کاتێکیش کارمانکرد، ئەوا دەرگا بۆ دادپەروەری ئەخلاقی والاّ دەکەین. پێداویستییەکانمان نابێتە هۆی بەشەرعی کردنی رێگاکانمان. ئەمەش راستە لەسەر ئاستی تاکەکان و نەتەوەکان. ئەمە رێگایەکە بۆمن بۆئەوەی خۆم لە دراوسێکانم بپارێزم بە دانانی ئاگادارکەرەوەیەك لە خانووەکەم، بەڵام بە لێدانی باریەیەك[1] لەسەری ئەو تەواو شتێکیترە. ئەمە شتێکە کە حکوومەتێك بە دابینکردنی سوپایەك بۆ پاراستنی سنوورەکانی کەچی ئەمەش تەواو شتێکیترە کەئەم حکوومەتە سوپاکە بنێرێت بۆ قڕکردنی دانیشتوانی وڵاتەکانی دراوسێی. بە جێبەجێکردنی تاقیکردنەوەیەکی هاوشێوە لەسەر ئەوەی کە چۆن ئێمە وەڵامی ئەم هەموو پێویستییانەی کەسانیتر بدەینەوە. هەرەسهێنانی رۆژئاوا لە وەرگرتنی ژمارەیەکی زۆرتری پەنابەرە جوولەکەکان لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمەوە بەزەحمەت پۆلێن دەکرێت وەك بێ لایەنەکی ئەخلاقی.

ئەو کاتەی لە حکوومەت خزمەتم دەکرد نە بەتەواوی واقیعی بووم و نە بەتەواوی ئایدیالستی بووم، بەڵکو تێکەڵەی هەردوولا بووم. ئەم حکوومەتەم وەك پرۆژەیەکی پراکتیکی دەبینی بۆ هەڵسوڕاندنی ئەم جیهانە پڕ لەمەترسی و ژاوەژاوەیە، هەرچەندە بیرۆکەی واقیعی منیان وەك کەسێکی رەق لەقەڵەم دەدا. لەوە تێناگەم کە چۆن دەتوانین بەبێ رێبازە رەوشتییەکان (ئەخلاقییەکان) ئاڕاستەی رووگەیەکی سەقامگیر بگرین بۆئەوەی یارمەتیمان بدات لە رێنمایی کردن. ئەمە چ مانا دەدات؟ بەبۆچوونی من، رەوشتایەتی بەهۆی کاریگەری کردارەکانی ژیانەوە پێوانە دەکرێت. هەرلەبەر ئەم هۆیانەوەیە من هەمیشە وەك وەزیری دەرەوەی وڵات دەچوومە ئەم دیوی سنوورە رۆتینییە کۆبوونەوە دیپلۆماسییەکانەوە. دەمویست لەم خەڵکە ببیستم و ببینم ئەوانەی کە کارتێکراوبوون بەهۆی ئەم بڕیارانەی کە حکوومەت دەریدەکردن.

بۆ ئەم مەبەستە، سەردانی ئەو پەناهەندانەم کرد، کە بەهۆی نەخۆشییەکانی HIV, AIDS دەناڵێنن، ئەم خێزانانەی کە بەخێوکەرەکانیان ئەندامەکانی لەشیان بەهۆی کێڵگە مینرێژکراوەکان لەدەستداوە، ئەو خەڵکەی کە ململانێ دەکەن بۆ سارێژکردنەوەی برینەکانیان ئەوانەی کە بەهۆی بۆمبی تیرۆرستانەوە پێککراون، ئەم بێوەژنانەی کە خۆشەویستەکانیان بەهۆی ئەتنیکییەوە (ethnicity) مردوونە، هەروەها ئەم دایکانەی کەوا بوونەتە هۆی

---

(١) پارچە ئاسنێکە بۆ کردنەوەی سندووق بەکاردێت.

لەدەستدانی هۆیەکانی شیرپێدانی منداڵەکانیان. ئەوەم بەبیرە، بەتایبەتی ئەم کچە سێ ساڵانییەی سیراڵیۆنم هەڵگرتبوو. ناوی مامونە بوو، جلێکی سووری پۆشیبوو، زۆر بەکەیفخۆشییەوە بەدەستێکی یاری لەگەڵ ئوتۆمبێلێکی منداڵانەی بچکۆلانە دەکرد. سەربازێك بەهۆی چەقۆیە حەربییەکەیەوە دەستەکەیتری لەبنرا قوتکردبوو. لەهەمانکاتدا، منیش نەوەیەکم هەبوو لەهەمان تەمەندا. نەمدەتوانی لەوە تێبگەم کە ئایا هیچ کەسێك جورئەتی ئەوە دەکات چەقۆ لەدژی منداڵێکی ئاوا بەکاربێنێ. ئایا کەسێك هەیە ئەم کچە هەڕەشەی لێ کردبێ؟ دەبێ ئەم کچە دوژمنی کێ بێت؟

لەهەرکاتێکدا، خۆزگەی ئەوەم دەخواست بمتوانیبایە هەموو ئەمەریکا لەگەڵ خۆم هەڵگرتبایە. دەرفەتی ئەوەم بدابانێ بۆ دیتنی ئەو بارودۆخە شکێنراوەی کە زۆربەی ئەم خەڵکە تیایدا دەژین، دڵنیابووم لەوەی کە دەمانتوانی وەڵامی ئەم خەڵکە بەبەخشندەیەوە بدەینەوە. بەدڵنیاییەوە نەمدەتوانی هەموو ئەمەریکا بە فڕۆکەکەی خۆم بگوازمەوە، هەروەها نەشمدەویست بناغەی دڵی برینداری سیاسەتی دەرەوەی خۆمان نیشانبدەم. هەربۆیە هەر ئەوکاتەی گەڕامەوە ئەمەریکا، دەستبەجێ دەستمکرد بە هەژمارکردنی هەموو ئەو هۆکارە پراکتیکییانەی کە ئەمەریکییەکان پێویستە هەڵوەستەی لەسەر وەرگرن: چونکە بەرژەوەندیمان لە سەقامگیرییەوە هەیە، بڵاوبوونەوەی سەرکەوتنی بازاڕ و ئابوورمان، بەهێزکردنی حوکمی یاسامان، فراوانکردنی کاریگەریمان، ڕۆشەنکردنەوەی ناوبانگیمان. بەڵام تاوەکو ئێستا ئەم گوتارانە دەردەبڕم، هەست دەکەم ئەوان دەبوایە زیاد لەپێویست کاریان کردبوایە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە بۆچی، من ئەم چیرۆکە سەرنجڕاکێشەی خۆم لەبارەی ئیبراهیم لینکۆڵن باسدەکەم: کاتێ هێشتا پارێزەرێکی گەنج بوو لەم دادگایە بۆ ئەم دادگایە دەڕۆیشت بۆ گەڕان بەدوای کڕیارەکان، تووشی بەرازێك بوو ململانێی دەکرد خۆی دەربازبکات لەو زۆڵکاوەی کە تێی کەوتووە. لینکۆڵن بۆ ساتێك وەستا، کەوتە نێو گێژاوی بیرکردنەوە لەنێوان هەڵبژاردنی سۆزێك بۆ بەرازەکە و بیرکردنەوە لەبارەی ئەوەی کە ئایا ئەم قوڕە چی لەجلوبەرگی دەکات ئەگەر بێتو خۆی نزیك بکاتەوە لەم زەڵکاوە. بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن. دوای ڕۆیشتنی نزیکەی دوو میل، گەڕایەوە نەیدەتوانی لەبیرکردنەوەی ئەم ئاژەڵە و ئاریشەکەیەوە بوەستێ. گەیشتە سەر دیمەنەکە، هەندێ تەختەداری درێژی شۆڕکردەوە خوارێ تابگاتە بەرازەکە، کاتێ گەیشتە بەرازەکە ئینجا بە تێچووی جلەکانیەوە تەختەکانی ڕادەکێشا. کاتێ پرسیار دەکرا بۆچی ئەم هەموو کارەی لەپێناو بەرازێك کرد، لینکۆڵن بە

دڵفراوانییەوە وەڵامی دەدایەوە، "من ئەم کارەم بۆ بەرازەکە نەکردووە، بەڵکو بۆ خۆمم کرد - بۆ دەرهێنانی ئەم ئازارەی لەنێو مێشکمدا گەڵاڵەی دەخواردەوە.

بۆ رازیبوون لەو رێسایەی کەوا مەسەلەکانی ئەخلاقی پێویستە بچنە نێو بڕیارەکانی نێو دادگا لەبارەی سیاسەتی دەرەوە ئەوەیە بە دانانی مەسەلەیەك بۆ رووبەڕووبوونەوەی دوو پرسیار. چۆن دەتوانین بگەینە ئەم بڕیارەی کە ئەخلاق چییە؟ و چەندە کێش پێویستە بەڕووی ئەخلاقەوە بلکێنین، بەشێوەیەکی روونتر گرنگی بەرژەوەندی کەسی؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، پڕۆفیسۆر مایکل والزەر، لە پرینستۆن، پێشنیازی چوار ئەرکی کردووە، بە لەچاوگرتنی رێکخستنی رۆچونەوەی گرنگیان. لە روانگەی والزەرەوە، یەکەم پێشینەی (اولویات) وڵات پاراستنی ژیان و سەربەستی خەڵکەکەیەتی، ئەگەر لەم بوارەوە سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، ئەوا ناتوانێ خۆی بگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە یارمەتی خەڵکانیتر بدات. دووەم پێشینەی وڵات ئەوەیە ئازاری خەڵکەکەی نەدات. سێیەم پێشینە، ئەگەر شیاوبێت، یارمەتیدانی خەڵکە بۆ رزگاربوونیان لە کارەساتی سروشتی و ئینسانی. چوارەم پێشینە یارمەتیدانی ئەوانەیە کە بەنیازی پاڵپشتیکردنن بۆ بنیاتنانی سیستەمێکی سیاسی باشتر و کەمتر کپکردن.

رێگایەکیتر بۆ بەخشینی هەمان چەمك ئەوەیە بە پێناسەکردنی ئەخلاقی ئەم کردارانەی کە دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی تۆڕێك بۆ زیادکردنی ئەرکە چاکەکان. وەك ژیان، سەربەستی، دادوەری، سەرکەوتن، تەندروستی، و هەروەها سەلامەتی مێشك - بەرهەڵستییەك بۆ مردن، دەمکوتکردن، بێ یاسایی، هەژاری، نەخۆشی، هەروەها ترس. بۆنموونە، بۆ کۆتایی پێهێنان بە شەڕی ناوەخۆ، بە پێشکەشکردنی لێبوردنی گشتی بۆ ئەندامانی ئەم میلیشیایەی کە لەدەرەوەی یاسادایە لەبەرامبەر چەکدانان و خۆبەدەستەوەدانی سوپاکە. لەژێر ئەم رێکخستنەوە پێویستیان بە وەرگرتنی چەند پێشینەیەك هەیە لەسەر نموونەکانی دادوەری. ئەمەش پراگماتیکییە. تاقیکردنەوەکە ئەوەیە کە ئایا ئەگەر کارێك ئەخلاقی نەبێت مانای وانییە کە ئیتر لەگەڵ رێسا رەقەکان ناگونجێت، بەڵام ئاکامە ئەخلاقییەکەی بەدەست دێنێ (تا ئەو رادەیە کە دەتوانین بەدەستیان بێنین).

لەهەندێ مەسەلەدا، رێگای راست هەمیشە روونە، بەڵام لەهەندێکیاندا، دەتوانم بڵێم لە زۆربەیاندا، ئەخلاقی رێژەیی هەڵبژێردراوە جۆراوجۆرەکان کارێکی گرانە بۆ وەسف کردنیان بەشێوەیەکی چڕوپڕ.

هەندێجار، بڕیاردان تەنها لەبەر بوونی زانیاری ناتەواو نییە بەڵكو لەبەر داخوازی دژیەكەوە دەبێ یاخود لەبەر نەبوونی دڵنیابوونی تەواو، وە یان لەبەر راستی تەواوەیە كە دەبێتە هۆی بچووك بوونەوە بۆ نیوە راستییەك لەوكاتەی كە بەجیددی تاقیدەكرێتەوە. هەرچەندە چاكە و خراپە بوونیان هەیە، حەزدەكەن بەیەكەوە تێكەڵ بكرێن لەوەی لێكتر جیابكرێنەوە. ئەم راستییە، بابەتێكی گرنگی فەلسەفە، دراما، ئەدەب، هونەر، هەروەها فێركردنی منداڵیەتی منە[٢]، لەلایەن سەركردە سیاسی و رەوانبێژییەكانەوە پشتگوێ دەخرێت. ئەمەش نەریتێكی خۆنیشاندانە، هەرچەندە، كاتی قسە دەوەستێ و كردار دەستپێدەكات. ئەو كاتەی بۆشایی نێوان لەوەی خۆمان نیازمانە و لەوەی جێبەجێی دەكەین بتوانرێ ببێتە بەڵگەیەك و ببێتە ئاڵۆزییەك لەنێوان راست و هەڵە. بۆنموونە، لەساڵی ١٩٩١، دوای جەنگی كەنداوی فارس، ئیدارەی سەرۆك بۆشی یەكەم وای بۆدەچوو كە سەددام حسێن پێویستە لەلایەن خەڵكەكەی خۆیەوە لەدەسەڵات لابدرێ. ئەمەش رووی نەدا. لەئاكامدا لەجێگای ئەمەوە ئابلوقەی ئابووری " كاتی" لە سەری چەسپێنرا هەموو شەش مانگ درێژمان دەكردەوە تا نزیكەی دە ساڵی خایاند. ئابلوقەكە دەرمان و خواردنی نەدەگرتەوە، بەڵام ئابووری عێراق ئازاری پێدەگەیەنرا و خەڵكانی بێ گوناە باجەكەیان دەدا. سەددام سوودی لەم بارودۆخە وەردەگرت بۆ بەهێزكردنی پرۆپاگەندەكانی خۆی. لەرێگای رژاندنی ئاشكرای فرمێسكە تیمساحەكانی خۆیەوە بۆ بەگەندەڵكردنی هەوڵەكانی نێودەوڵەتی لە یارمەتیدانی خەڵكی عێراقی لەبەرنامەی نەوت بەرامبەر خۆراك. ئەگەر ئەم ئابلوقەیە هەڵگیرابوایە سەددام دووبارە سوپا سەربازییەكەی بنیات دەنا و جارێكیتر دەبووە سەرچاوەی هەڕەشەی بەردەوامی ئەم ناوچەیە.

لە ماوەی ساڵانی خزمەتكردنم لە نوسینگەكەمدا؛ عێراق كەوتبووە نێوان دوو هەڵبژاردەی شەڕانییەوە: هەموو هەوڵی خۆمان لەپێناو كەمكردنەوەی ئەو ئازارانە دەبەخشی كە هۆكاری دروستبوونیان بۆ ئێمە دەگەڕایەوە لەو ئەڵتەرناتیڤەی كە ئێمە هەڵمانبژاردبوو. بەداخەوە لەپرۆسەی هەوڵەكان بۆ راڤەكردنی سیاسەتەكەمان، شتێكم وت بووە هۆی جێگای سەرسوڕمان لەبەرامبەر زۆرانێك كەمن چۆن دەتوانم كتێبێكی وا لەم چەشنە بنووسم. رۆژنامەنووسێك پرسیاری ئەوەی لێكردم لەوەی كە ئایا مانەوەی ئەم سزا ئابوورییە بەوجۆرە گرنگە بۆپاساو هێنانەوە كە لە

(٢) لەبارەی ئەم فێركردنە ( پارەگرافی ١٧٠٧)، مرۆڤ لەنێو خۆیەوە دابەش بووە. لەئاكامدا، هەموو ژیان مرۆڤ، هەردوو تاك و كۆمەڵ، خۆیان وانیشاندەدەن بینە ململانێیەك و دراماتیكییەكەوە، لەنێوان چاكە و خراپە، لەنێوان رووناكی و تاریكی.

ئەنجامیدا بۆتە هۆی مردنی ژمارەیەکی زۆری منداڵانی بێ تاوانی عێراقی. لەسەرەتادا دوودڵی دایگرتم، بەڵام دواتر هەر وەڵامم دایەوە، " ئەمە هەڵبژاردنێکی زەحمەتە، بەڵام باجەکەی——بەبۆچوونی ئێمەوە باجەکە شایانیەتی". پێویستە بموتبایە" بەدڵنیاییەوە نەخێر——بەشێوەیەکی روونتر ئەوەی لەتوانامانداییێت ئەنجامی دەدەین بۆدابینکردنی پێداویستییەکان لەکڕینی خواردن و دەرمان لەگەڵ ئەوەشدا عێراق خاوەن سەرمایەکی زۆری خۆیەتی". لەبەرئەوەی دەمم خێراتر کاری خۆی دەکات لەوەی لە عەقڵم، بۆیە هەمیشە بە خوێنسارد و شەڕانی دەردەکەوم. ئەم حوکمکردنە بۆ خەڵکانیتر جێدەهێڵم، لەگەڵ رەچاوکردنی کارکردنم و خزمەتکردنم بەشێوەیەکی گشتی، کە ئایا ئەم دوو سیفەتە لەگەڵ سروشتی من دەگونجێن. بەڵام من دان بە تاوانی خۆم دادەنێم لە داخستنی مێشك و هەڵبژاردنی وشەی ترسێنەر.

دووەم کێشەی (Dilemma)ی ئەخلاقی جینۆساید بوو لە رواندا، وڵاتێك کە بەهۆی ململانێی دوو ئەتنیکەوە وێرانکرابوو - هوتویەکان و تۆتسیەکان. لەئابی ١٩٩٣ نەتەوە یەکگرتووەکان شاندێکی ئاشتیپارێزیان ناردە ئەم شوێنە بەمەبەستی چاودێریکردنی ئاگربەستی نێوان ئەم دوو گرووپە. تەواوی شاندەکە رووبەڕووی کێشە بوونەوە لەبەرئەوەی کەیسێکی زۆر زەحمەت لەم ناوچەیە هەبوو. کۆتایی جەنگی سارد بووە هۆی بەرهەمهێنانی بەرزبوونەوەی ژمارەی ئاشتیپارێزانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەنزیکەی ١٨٠٠٠ ەوە بۆ زیاتر لە٨٠٠٠٠ لەماوەی کەمتر لە (٢) ساڵدا. بەشێوەیەکی زۆر خراپ ئەم سیستەمە درێژکرایەوە. زیاتر لە دوانزە ئۆپەراسیۆن——لەگەڵ چوار ئۆپەراسیۆنیتر لە ئەفەریقیا——لەژێر جێبەجێکردندان. فەرماندەی نەتەوە یەکگرتووەکان توانای تەنها نیوەی ئەم ژمارەیەی کە داواکراوبوون لەریزی سەربازییەوە تۆماربکرێن هەبوو. زۆربەی ئەوانەی ناویان تۆمارکردبوو پەرۆشی (رغبە)یەکی کەمیان لەم ئەرکە هەبوو. لەدوایدا ماندێتی شاندی UN بەوجۆرە نەخشێنرا وەك ئەو کاتەی شاندی UN چۆن لەسۆماڵ بەکارەساتەوە کۆتاییان پێهات. ئەم وانەیەی کە UN لەم کارەساتەوە وەریگرت ئەوەیە خۆی بەدوور بگرێت لەوەرگرتنی لایەنەکانی هەر شەڕێکی ناوخۆیی. هەربۆیەش ئۆپەراسیۆنی رواندا فەرمانی پێدرا بە بێلایەنی بمێنێتەوە. بەو مانایەی سەرکەوتنی رواندا بەتەواوی دەوەستێتە سەر پەرۆشی پارتەکانی بۆ هاوکاریکردن و بەرهەمهێنانی هەموو پێویستییەکانیان. لەڕاستیدا لایەنی هۆتو پلانی شەڕێکی قڕکردنی گشتی داڕشتبوو.

کاتێ شەڕەکە هەڵگیرسا، دەستبەجێ هێزەکانی ئەوروپی و نەتەوە یەکگرتووەکان هاتنە نێو مەسەلەکە——بۆ رزگارکردنی هاووڵاتی خۆیان. زۆر لەسەرەخۆوە کاریان دەکرد تا کاتەکە دواکەوت

له یارمەتیدانی خەڵکانی رواندی، ئەوانەی کە بەهۆی دوو مانگ شەڕی نەوەستاو هەموویان سەربڕان. لەژیاننامەی خۆمدا، بەدرێژی گفتوگۆی ئەوە دەکەم، کە بۆچی و چۆن ئەم هەمووە رووپاندا، کەچی دەرئەنجامەکەی نە بەرگری لێدەکرێت و نە نکۆڵیشی لێدەکرێت. هێزە باڵادەستەکان نسکۆیان لەبینینی رۆڵی خۆیان هێنا، ئەنجامەکەش بووە هۆی کوشتنی بەکۆمەڵ. بەرەنگاربوونەوەی ئەخلاقی لەوێ کۆتایی پێنەهات. و کاتێ کوشتن و بڕین دامرکان، نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاریدا بە پێشڕەویکردنی هەڵمەتێکی مرۆڤانە بۆ رزگارکردنی ئەم پەناهەندانەی کە ماڵ و حاڵیان لە رواندا جێهێشتووە بەرەو وڵاتەکانی دراوسێ هەڵاتوون. ئاریشەی ئەم پەناهەندانە زۆر بەروونی لەتەلەفزیۆنی CNN وێنەی گیراوە. زۆر بە هێواشی رێدەکەن، میل دوای میل، ترس بە رووخساریانەوە دیارە، پێویستییەکانی ژیانیان بە کۆڵیانەوە هەڵگرتووە، هەروەها منداڵەکانیشیان بە باوەشەوە گرتووە. ئەم دیمەنە دراماتیکییە سۆزی خەڵکیان دەورووژاند، بەڵام بەباشی لە راپۆرتەکان بڵاونەکرابوونەوە لەڕاستیدا لەنێوان پەنابەرەکان زۆرانێك هەبوون بەشداریانکردبوو لەم جینۆسایدە - خەڵکەکە هەڵدەهات لەتۆڵەی ئەوەیە تاوانەکانیان بوونەتە هۆی تووڕەبوونیان. نووسینگەی بەرزی کۆمیسیۆنی UN بۆ کاروباری پەنابەران کاری خۆیان بەباشی ئەنجامداوە لەچاودێریکردنی رێبواران. زۆرێك لە گیانەکان رزگارکران. بەڵام ئامادەبوونی کوژەرەکان لەنێو کەمپەکان دواتر پێشڕەوی توندوتیژی داهاتوو دەکات، هەروەها بەشدارکردنیان لە شەڕێکیماڵوێرانی کۆماری کۆنگۆی دیموکراتی دراوسێ. نەك بەمەشەوە تەنانەت حەوانەوەی پەنابەرەکان پاك و بێگەردە.

هەر لەهەمان ساڵدا، سەرکردە دیموکراتییەکان رەخنەیان لەسەرۆك کلینتۆن دەگرت بەهۆی سیاسەتی ناردنەوەی کۆچبەرەکان بۆ هایتی ئەوانەی کە لەسەر دەریاکەوە گیریان خواردبوو هەوڵیاندەدا خۆیان بگەیەننە ولایەتە یەکگرتووەکان. ئەم هەموو رەخنە نییەت باشانە ئەوە دەردەبڕن کەوا ئەم سیاسەتە سیایەتێکی بێ ئەخلاق و رەگەزپەرستییە، بەگەڕانەوەی ئەم خەڵکە بێ کەس و لێقەوماوە بۆ وڵاتێك کە ئەوکات حکوومەتێکی سەربازی نایاسایی و زۆردار فەرمانڕەوایی دەکرد. ئەنجامەکەشی بەجۆرەی لێکەوتەوە کە ژمارەیەکی زۆری هایتییەکان لەڕێگەی دەریاچەیەکی نایاسایی و بەلەمە جەنجاڕییەکانەوە لەدورگەکەیانەوە هەڵدەهاتن. دواجار هەندێك لەم بەلەمانە سەراوژێر دەکەوتن و سەدان خەڵك نقوومی نێو دەریاچەکە دەبوون.

هەروەك ئەم حاڵەتانە شیدەکرێنەوە، هەوڵەکان بۆ گەڕان بەدوای رەوتی ئەخلاقی لەسیاسەتی دەرەوە لەلایەن ئەنجامە نەویستراوەکانەوە بایەخیان کەم پێدەدرێت. بۆبەدەستهێنانی ئەنجامە

ئەخلاقییەکان، کاربەدەستان ئارەزووی هەردوو شت دەکەن گەڕان بەدوای راستی، هەروەها توانای پێشبینیکردنی رووداوەکان. بەشێوەیەکی نموونەیی، پێویستە ویژدانی قەدیس و حکوومەتی فەیلەسووف و پێشبینی پێغەمبەرێکیان هەبێ. لەڕاستیدا، تابتوانین بەرەو گەشەسەندن دەچین لەگەڵ رەچاوگرتنی کەموکوڕییەکانی لە هەرسێ تایبەتمەندییەکان.

بێگومان دژوارترین بڕیارە سیاسییەکان ئەوانەن کە حوکم بە بەکارهێنانی هێز دەکەن. کاتێ لە پۆستەکەی خۆمدابووم، سەردانی زۆرێك لە سوپای ئەمەریکام کرد کەوا خزمەتیان بە نیشتیمانەکەی خۆیان دەکرد لە ژمارەیەکی زۆر خاکی بێگانان. لە هەریەك لەم سەردانانە، هەوڵمدەدا بێجگە لە سوپاسکردنی سەرباز و دەریاوان و فڕۆکەوانە ئەمەریکییەکان و گەیاندنی سڵاوی هاووڵاتییە ئەمەریکییەکان بۆیان، زۆرترین کاربکەم کە ببێتە مایەی رەزامەندی ئەم سەربازانە، لەگەڵیان دادەنیشتم و نانم لەگەڵیان دەخوارد، گوێم لە چیرۆك و بەسەرهاتەکانیان دەگرت، هەوڵم دەدا پرسیارەکانیان وەڵام بدەمەوە و رووخسارەکانیان بخوێنمەوە. چونکە دەمزانی هەر هەڵەکردن و بەکەم زانینی کارەکانیان لەسایەی منەوە دەبێتەوە هۆی تێکشکاندنی ژیانیان و لەدەستدانی ئەو شتانەی کە هەرگیز لەلایەن خۆشەویستانیانەوە قەرەبوو ناکرێنەوە.

لە وەزارەتی دەرەوە، زۆرجار لەنێو پەنجەرەی نووسینگەکەم سەیری رێزی نیشانەی بەردە سپییەکانی گۆڕستانی ئارلینگتۆنی نیشتیمانم دەکرد و هەروەها ئاپۆرای گەشتیارانی یادگارییەکانی شەڕەکانمان لەگەڵ کۆریا و ڤێتنام. نەمدەتوانی واز لە پرسیارکردنی خۆم بهێنم: ئایا چ کاتێ زۆر پێویستە لەسەرمان بەرەو شەڕکردن بڕۆین؟ ئایا لەم جۆرە بارودۆخانە هەڵبژاردنێترمان لەبەردەستدا نییە؟ ئەی هەستم چۆن دەبێ گەر خۆشم سەربازێك بوومایە؟ بڕوام وابوو، ئەگەر تەمەنم بچووکتربوایە، ئامادە دەکرام بۆ خزمەتکردن لە ریزی سەربازی و هەروەها لەو کاتەشەوە تووشی ترس و تۆقینیی زۆر دەهاتم. ئەمەش دەربڕینێکی بێ مانایە، بەڵام راستە: فەرمانکردن بە سوپا بۆ دەستپێکردنی شەڕ دژوارترین بڕیارە کە سەرۆکێك دەریبکات یاخود وەزیرێکی دەرەوە راییگەیەنێت. خۆشبەختانە، بەکارهێنانی هێز وابەئاسانی بیانووی بۆ نادۆزرێتەوە. بەداخەوە هەندێجار هەیە ئەم بیانوویانە دەربازیان نابێت.

لە کاردانەوەی رای جیهانی رابمێنە ئەگەر بهاتایە، سەرۆك بوش ئێوارەی ١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١ پێش خەڵکەکەی بکەوتبوایە و راگەیاندبوایە، "بەرگری لەکاری خراپە مەکەن: بەڵام هەرکەسێ زلەیەکی لە روومەتی لای راستییەوە دای لایەکەیتریشی بۆ ئامادە بکە". لەگەڵ ئەمەشدا چ شتێك سروشتیتر دەبوو بۆ سەرۆکێکی مەسیحی باوەڕدار لەوەی ئاماژە بە رێنمایی ئەو

ساتەی کێشەکانەوە بکات بۆئەوەی هێمنی بنوێنن؟ ئایا چ شتێ لـەوە زیـاتر لۆژیکیتربـوو لـەوەی گەورە جێبەجێکاری ئەمەریکی (کە سەرۆك بۆشە)، داوا لە هاووڵاتیانی خۆیەوە بکات بـۆ ئـەوەی بەدوای ئامۆژگارییەکانی فەیلەسووفی سیاسییە پەسەندکراوەکەی خۆیانەوە—عیسای مەسـیح— بکەون، هـەروەها پێشـنیاری لێخۆشـبوون بـۆ ئەوانـە بکـەن کـە هێلـی سـوور لـەدژی ولایەتـە یەکگرتووەکانەوە دەبەزێنن؟ لەجێگای ئەمانە، سەرۆك بۆش پێچەوانەکەی ئەنجامدا، هێرشی کـردە سەر تیرۆرستان بەمەبەستی ریشەکێشکردنیان و دەستگیرکردنی داواکراوەکان. ئایا ئەمە دووڕوویـی نەبوو؟ ئایا حکوومەت گوناهێك ئەنجامدەدات، بە شەڕکردن لەدژی خراپـە و بـەکارهێنانی هێـزی سەربازی کە سـەرئەنجام کوشـتنی بێتاوانـانی لێدەکەوێتـەوە؟ و ئایـا حکوومەتـەکان بـووراون لـە فەرمانەکانی کتێبی پیرۆز؟

لە بووری پراکتیکیدا ولاتەکان کـرداری سـەربازی لـەدەرەوەی ئـەم رێبازانـەوە ئەنجامـدەدەن، هەنـدێجار لەلایـەن نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە چـاودێری دەکـرێن، هەنـدێجاریش نـەخێر. لەگـەڵ ئەمانەشدا، پێوەرەکان هەر لەنێو بەڵگەنامەکانەوە دەمێننـەوە، هـەروەك ئـەم یاسـایانەی لـەدژی کوشتنەوە دەمێننەوە تەنانەت هێشتاکەش کوشتن و تۆقاندن هەر بەردەوامە.

هەرچەندە زۆربەی ئـەو یاسـایانەی کـە سـنوورێك بـۆ بـەکارهێنانی هێـز دادەنـێن لەنەریتـە ئایینییەکان بوونیان هەیە، ئەم یاسایانەش بەجۆرە دژوار نییە بۆ ئـەو کەسـانەی کـەوا بانگەشـەی باوەڕی ئـایینی دەکـەن. لەبـەهاری سـاڵی ٢٠٠٤، وتـارێکم لەسـەر ئـایین و سیاسـەتی دەرەوەی ئەمەریکا بۆ ئامادەبوانی کۆلێژی لاهوتی لە یالْ پێشکەشکرد. سەرنووسـەری گۆڤـاری کۆلێژەکـە هەندێ تویێژەری داوەتکردبوو، نامەیەکی لەلایەن ستانلی هاورواس بەدەست گەیشت، ئـەو کەسـەی کە لەلایەن گۆڤاری *تایم* ەوە بە "باشترین لاهوتی ئەمەریکا" دادەنرێت.

هاورواس هەندێ بابەتی نووسی وەك نارەزایەك نـەك بـەو زۆرییـەی لەسـەر وتارەکـەم بـەڵکو لەسەر ئەو بەرژەوەندییەی بۆ وتاردانم بۆ قوتابییە ئایینییەکان بوو. نووسـیبووی تۆمـارکردنم لـەنێو حکوومـەت "هـەموو شـت بـوو جگـە لـە رێزگـرتن" هـەروەها " بـوونم بـە مەسـیحی... تومارکردنەکەمی زەحمەت کرد نەك مەحاڵ، بـوونم بـە وەزیـری دەرەوەی ئەمـەریکا". بـەگوێرەی هاورواس، مەزهەبی ئاشتەوایی و میـانڕەوی بەشـێکی بنەڕەتییـە بـۆ بـوون بـە مەسـیحی. وای بۆدەچێ کە ئەو ئەمەریکییانەی شەڕیان کردووە یاخود پشتگیری کردەی سەربازی دەکـەن هـەرگیز مافی بوون بە مەسـیحییان نییـە. لەلۆژیکەکـەی تێگەیشـتووم بـەڵام قەبووڵیشـی ناکـەم. هـیچ چیرۆکێك کاریگەرتر نییە لە نموونەکەی پێغەمبەر مەسیح لەوکاتەی دەمرێـت لەهـەمان کاتیشـدا

لەکوژەرەکانیەوە خۆش دەبێ. بەڵام هەموو بڕگەکانی ڕێبازی " جەنگی داد" ئەوەیە کە کردە سەربازییەکان هەندێجار بۆ هۆکارە ئەخلاقییەکانەوە پێویستن. هاورواس ئەم ڕێبازە ڕەتدەکاتەوە چونکە، دەڵێ، ئەم ڕێبازە بۆ پاساوهێنانەوەی چەندین شەڕ بەکاردێت، لەم ڕووەوە هاورواس ڕاست دەکات. بەڵام ڕێبازێکی باشی ئاوا نابێ عەیبدار بکرێ لەبەرئەوەی بەهەڵە بەکاردێت. هاورواس هەست بەوجۆرە بیردەکاتەوە کە زۆر گرنگ نییە ئەوەی لەشەڕەکان دەباتەوە لێرە و لەوێ لەسەر ئەم زەوییە، چونکە لەکۆتاییدا ئێمە هەمووومان لەژێر دەستی پەروەردگاردانە، بەڵام لەبەرئەوەی کردە سەربازییەکانی پێشووتری ئەمەریکی توانی ئازادی خۆی وەربگرێ.

کاتێ لە پۆستەکەمدابووم هەموو جارێ لەکڵێسە گوێم لەوە دەبوو کە " کەسانی پیرۆز دروستکەری ئاشتینە"، ئەم قسەیەم بەقووڵی لەنێو دڵمدا جێگای خۆی کردبوو. تەواو ڕێز لە ئاشتی و کەسایەتی غاندی و کویکەرز و ئەو کەسانەی کە پشتگیری لە بەرگریکردنی دوور لەتوندوتیژی دەکەن دەگرم، بەڵام کاتێ سەیری هیتلەر و زنجیرەیەك هەڵمەتی پاککردنەوەی نەژادی و جینۆساید دەکەم، بەوە ڕازی نابم کە میانڕەوی و هەڵمەتی ناتوندوتیژی هەمیشە باشترین بواری ئەخلاقییە بۆ پاراستنی ئاشتی لەناوچەکە. لەهەندێ بارودۆخەکاندا، ئامانجەکان وەرنەگیراون. لێرەوە بۆچوونەکانم ڕەنگدانەوەی دابونەریتەکەمن. چاکە و خراپەکانی بەرگریکردنی چەکداری زۆر بە چڕوپڕی لە کۆماری چیکۆسلۆڤاکیا لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانییەوە گفتوگۆیان لەبارەیەوە کراوە. ئەوەبوو سەرۆك مەساریك زۆر بە حەماسەتەوە ئەوەی ڕاگەیاند کەوا مانای مێژوو و دیموکراسییەتی چیکۆسلۆڤاکیا دەبێ لەنێو ژیانی عیسای مەسیحەوە بدۆزرێتەوە، نەوەك ژیانی قەیسەڕ. هەروەها کتێبێکیشی نووسیوە بەناوی : "جەنگ گەورەترینی خراپییەکان نییە. بەڵکو ژیان بەسەربردن بەناپاکی، بوونی بەندە، بە بەندەکردن، ئەمانە هەمووی شتگەلێکن زۆر لە جەنگ خراپترن". لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا، بە ڕۆماننووس جۆن گاڵسوێرتی وت: " ئێستاکە پیر بوومە، ئەگەر یەکێك هێرشی بکردایە سەرم، بەم دەستە پیر و بێ هێزانەم گاشە بەردێکم هەڵدەگرت و بەسەریدا دەمکێشا." هەندێجار تاکە ڕێگای بەدەستهێنانی ئاشتی، شەڕکردنە لەپێناوی.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە وەرگرتنی بڕیارێك بۆ دەستپێکردنی بەکارهێنانی هێز پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی قووڵ نییە. توندوتیژی دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بەو کەسانەی کە بەکاری دێنن و هەروەها ئەو کەسانەش کە لەدژیانەوە بەکاردێت. هەندێجار کارەساتی لێدەکەوێتەوە کەچی ئەنجامەکەشی بەمجۆرە دیارنییە. هەروەك مارك توەین زۆر بە غەمبارییەوە دەڵێ نوێژی جەنگ "War Prayer"[٤] بەبیرمان دێنێتەوە کە دوعاکردن بۆ سەرکەوتن لەکاتی جەنگ مانای

داواکردنی هاتنی ترس و تۆقینەرە بۆسەر بێ گوناهەکانی لایەنی بەرامبەر. ئـەرکی سـەرکردایەتی بەجێنەهێشتنی گۆڕەپانی جەنگە و دانانی باشترین هەڵبژاردە لەگەڵ زەحمەتی ئەنجامـدانی و ترسـی ئەوەی کە هەڵە نەکات. لەماوەی ئەم چەند ساڵەی رابردوودا، ولایەتە یەکگرتووەکان لە ئەفغانستان و عێراق رووبەڕووی پرسیاری " جەنگی داد" بۆوە. منیش وەك وەزیـری دەرەوەی وڵات لـە بـەلقان تووشی هەمان بەرەنگاربوونەوە بوومەوە. لەسەرەتای ساڵانی ١٩٩٠، دیکتاتۆری سربی، سـلۆبۆدان میلیسۆڤیچ دەستپێشخەری سێ جەنگی سەرنەکەوتووی لەگەڵ سلۆڤینیا و کرواتیا و بۆسنیە کـرد. لەساڵی ١٩٩٩ تووڕەبوونی خۆی بـە نەتـەوەی ئـەلبانی، زۆرینـەی نێـو کۆسـۆڤۆ هەڵڕشـت، کـە هەرێمەکە لە وڵاتی سربیا. بۆماوەی ساڵێکی تەواو هەموو هەوڵێکم خستەگەڕ بۆ فەراهـەمکردنی دەسـتکەوتێکی دیبلۆماسـی کەتیایـدا ریـزی هـەردوولا بگیرێـت. لەکۆتاییـدا ئەلبانییـەکان پێشنیارەکەی ئێمەیان قەبووڵکرد، بـەڵام میلۆسـۆڤیچ رەتـی کـردەوە لـەبری ئەمـەوە هەڵسا بـە بەرەڵاکردنی سوپاکەی بەنێو گیانی خەڵکی سیڤیلی کۆسۆڤۆ. مەبەسـتی میلۆسـۆڤیچ راگواسـتنی ئەلبانییەکان بوو لە کۆسۆڤۆ لەرێگای کوشتنی سەرکردەکان و سووتاندنی لادێکان و بڵاوکردنـەوەی تیرۆر لەناوچەکە. تاکە ئامانجی "چارەسەرکردنی" کێشەی کۆسۆڤۆیە بۆهەتاهەتایە.

هەتا ئەو کاتەی ئـەم هەرێمـە بەشـێك بـوو لـە وڵاتـی سـربیا، تاوانـەکانی میلۆسـۆڤیچ وەك دوژمنکـاری نێودەوڵـەتی حیسـاب نـەدەکرا. هـیچ ئەنـدامێکی NATO (پـەیمانی بـاکووری ئەتلەسی) رووبەڕووی هیچ هێرشێك نەببۆوە بۆیە هاوپەیمانانیش داوای هیچ مافێکی بـەرگریکردنی خودیان نەدەکرد. سربیا هەڕەشەی لەهیچ وڵاتێکەوە نەکردووە بۆ ئەوەی داگیربیکـات، بۆیـە هـیچ پاساوێك نییە بۆئەوەی هێرش و زەربەیەکی بەرایی لێبدرێت. ئێمە ئەرکێکمان لەسەر شانە ئـەویش بەرگریکردن و پاراسـتنی کەسـانی کـەمتوانا و بـێ دەسـەڵاتە. ئەنجوومـەنی ئاسـایش بڕیـارێکی پەسەندکرد بە کشانەوەی دەستبەجێی سوپای سربی، بەڵام دیبلۆماتکاری رووسی لەنێو ئەنجوومەنی ئاسایش، کە لە مێژوودا پەیوەندییەکی سۆزداری باشی هەیە لەگەڵ سلۆڤییەکان، بەڵێنیاندا مـافی ڤیتۆ لەدژی هەر بڕیارێکەوە بەکاربێنن کە دەبێتە هۆی وەستاندنی ئەم سوپایە.

ئەم رووداوە ئیدارەی کلینتۆن و ناتۆی لەگـەڵ هەڵبـژاردنێکی زۆر زەحمـەت بەجێهێشـت. یـان ئەوەتا رێگا بە ڤیتۆیە پڕ لەهەڕەشەکەی رووسـیا بـدەین و بمانوەسـتێنێ لەهەڵوێسـت وەرگـرتن، و یاخود هێز لەدەرەوەی وەرگرتنی رووخسەتی راشـکاوانەی ئەنجوومـەنی ئاسایشـەوە بـەکاربێنین بـۆ رزگارکردنی خەڵکی کۆسۆڤۆ. منیش زۆر بەتوندی هەوڵم دەدا سەرکەوتوانە پشـت بـە هەڵبـژاردنی دووەمەوە ببەسـتین. هۆکارەکانیشـم بەشـێکیان سـتراتیژین: ئـەوروپا هـەرگیز ئـەمن و ئاسـایش

بەخۆیەوە نابینێ هەتاوەکو بەلقان بەجۆرە ناسەقامگیربێ، هەروەها بەلقانیش هەرگیز سەقامگیری بەخۆیەوە نابینێ هەتاوەکو میلۆسۆڤیچ لەسەر دەسەلات بێ. هەرچۆنێك بێ هاندانە سەرەکییەکەم ئەخلاقی پێوە دیاربوو: نامەوێ خەلکی بێ گوناە ببینم بەناهەق بکوژرێ. بوونی NATO لە ئەورووپا یارمەتیمان دەدا بۆ نەهێشتنی پاکتاوی رەگەزی لەم کیشوەرە، وە هیوام وایە بە ئەنجامدانی ئەم کارە بتوانین کارە دژ بەمرۆڤایەتییەکانی شوێنەکانیتریش کۆتایی پێبهێنین. هەلۆێستمان نابێ لەسەر ئەمن و ئاسایشمان بناغە بگرێ بەلکو دەبێ لەسەر راستییەوە بناغە بگرێت.

لەبەر نەبوونی ماندێتییەکی دیاریکراوی UN بۆ ئەنجامدانی کردەی سەربازی، بۆیە زۆر هەولماندا بۆ نیشاندانی عەدالەتی دۆزەکەمان. یەکەم: ئیدارەی کلینتۆن سەرجەم پالپشتییەکانی NATO ی بەدەستهێنا. دووەم بەردەوام لە پەیوەندیدا بووم لەگەل سکرتێری گشتی UN کۆفی عەنان بەجۆرێك کە ئەو خۆیشی بەرەسمی ئەوەی راگەیاند کە کردە سەربازییەکانی سربی جێگای قەبوولکردن نییە. سێیەم لەکاتی شەرەکە ئامانجەکانی NATO کەوتنە ژێر چاودێریکردنی شارەزایانی سەربازی ئەوانەی هەریەك لەم ئامانجانەیان لەگەل پێوەرەکانی پەیماننامەی جنێڤ بەراورد دەکرد. لەهەموو حالەتەکاندا بریاری دادگایی لەوکاتە دەردەچێ کە ئایا بەهای ئامانجەکە زیاترە لە مەترسییە شاراوەکانی سەر خەلکی مەدەنی.

کاتێ جەنگ گەشەی سەند، ئێمەش فشارە سەربازییەکانی خۆمان لە بەلگراد زیادکرد، لەکاتێکدا هێشتاکە راهێنان دەکەین بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی قوربانیان. سێ ئامانجی سیڤیل (بالوێزی چینی، و شەمەندەفەری گەشتیاران، و کاروانی کۆچبەران) بەهەلە دەکەونە شالاوی هێرشکردن. چاوەروان دەکرێ ژمارەی قوربانیان بەهۆی بۆردوومانەکە بگاتە ٥٠٠ تا ٢،٠٠٠ هاوولاتی. سربییەکان، پێش ئەوەی ناچاربکرێن لە کارە نامرۆڤانەکانیان وەستێنرێن، نزیکەی ١٠،٠٠٠ ئەلبانیان لەکۆسۆڤۆ کوشت، هەروەها سەدان هەزار کەسیتریشان لەمال و حالی خۆیان دەربەدەرکرد. لەماوەی جەنگەکە، ئێمە بەردەوام بووین لەهەولە دیبلۆماسییەکانماندا بۆ بەرقەراربوونی ئاشتی و ئاسایش لەناوچەکەدا. لەکۆتاییدا ئەم هەولدانانە سەرکەوتن. میلۆسۆڤیچ ناچارکرا دەست لە کردەی سەربازی هەلگرێت و سوپاکەی لە کۆسۆڤۆ بکشێنێتەوە، رێگا بەم خێزانە دەرکراوانە بدرێ بگەرێنەوە مالەکانیان و هێزی ئاشتی پارێز، کە NATO پێشرەوی دەکرد، بێتە ناوچەکە، هەروەها UN یش تێچووی دووبارە بنیاتنانەوەی ولاتەکە لە ئەستۆ بگرێت.

تۆوەکانی ناکۆکی و دووبەرەکی، هەروەك لەشەڕەکانی پێشووتری دابەشبوونی یوگوسلافیا بڵاوبۆوە، لەنێو مێژووی ئایینی هەرێمەکە چێنران. بۆ پاساوهێنانەوە لە باروودۆخی سرِبیا، میلۆسۆڤیج پێی ڕاگەیاندم کەوا خەڵکەکەی چەند سەدەیە بەربەستێکن لە بەرگریکردنی "مەسیحییەکانی ئەوروپا". چیرۆکی نیشتمانی داستانی سرِبیا هەروەك لە جەنگی کۆسۆڤۆ ناوبانگی دەرکرد، شەڕی لەدژی عوسمانییە تورکەکان لە گۆڕەپانی باڵندەی رەش لەساڵی ۱۳۸۹ هەڵگیرساند. بەگوێرەی ئەم ئەفسانەیە، پێغەمبەر ئیلیا لە رۆژە یەکلاکەرەوەکاندا خۆی بە ئەمیری سرِبی لازەر نیشانداوە. ئیلیا دوو هەڵبژاردنی پێشکەشکرد یان رازیبوونت بە سەرکەوتن لەجەنگەگە (هەروا مانەوەت وەك ئیمپراتۆری سەر زەمین)، یاخود شکست هێنانت (بەجۆرێك لە بەهەشت قەرەبوو دەکرێیتەوە). بەڵام ئەمیر سەرکەوتنی بەردەوامی بەهەشتی هەڵبژارد. ئەمەشیان بۆتە چیرۆکێکی سروش ئاسا، یەکێك دەتوانێ رۆڵێك لە دەرکردنی بڕیارە نەبەزەکانی سرِبیا بۆ بەرگەگرتنی نازییەکان لەجەنگی جیهانی دووەم بمێنێ[*]. کێشەکە لێرە ئەوەیە هەندێ سرِبی ئەم کۆنە قینەی تۆڵەسەندنەوەی شکستیان لەکۆسۆڤۆ هەر لەدڵدا ماوە ئەوە بۆ نزیکەی ٦٠٠ ساڵ دەچێ، کە لەلایەن هەستێکی توندوتیژی بیری ناسیۆنالیزمی و پەیوەندییە تایبەتییەکانیان لەگەڵ پەروەردگار هاندەدرێن.

*کاتێ جەنگی کۆسۆڤۆ لەبەردەوامی خۆی دابوو، ڤالکاف هاڤێل بەمجۆرە ئەم جەنگەی شی دەکردەوە. ئەگەر یەکێك بڵێ هەموو جەنگێك ئەخلاقی خۆی پێوەدیارە، و یاخود بۆ هۆکارێکی ئەخلاقییە و ئەنجام دەدرێت، ئەم بۆچوونە بۆئەم جەنگە راستە و لەسەر ئەم جەنگە جێبەجێ دەبێت. کۆسۆڤۆ (بەپێچەوانەی کوەیت) هیچ بیرە نەوتێکی*

---

(*) کاتێ سەرکردەکانی خەڵکی مەدەنی سرِبی هاریکارییان هەڵبژارد لەلایەن سوپاکەیانەوە لەسەر دەسەڵات لابران. لەپەخشی رادیۆییدا، بتریرك ئۆرسۆدۆکسی سرِبی بڕیاری بەرگەگرتنی بۆ خەڵکەکە روون دەکردەوە: " لەم رۆژانەی کە بەسەر نەتەوەکەمان رادەبورێن پرسی چارەنووس خۆی خۆی دەناسێنێ. لە بەرەبەیانی ئەم رۆژەدا وەڵامەکەی خۆی بەدەست گەیشت. ئێمە پادشایەتی ئاسمانمان هەڵبژارد—پادشایەتی راستی و داد و هێزی نیشتیمانی و ئازادی. ئەم بیرۆکە نەمرەیە لەنێو دڵی هەموو سرِبییەکەوە هەڵگیراوە، لەنێو هەموو مەزارەکانی کڵێسەکانمانەوە پارێزگاری لێدەکرێت و هەروەها لەسەر رووی ئاڵاکەمانەوە نووسراوەتەوە.". بۆ وەڵامدانەوەی ئەم هەڵبژاردنە ئازایە، نازییەکان وڵاتی سرِبیایان داگیرکرد—بەڵام لەلایەن پارتیزانە سرِبییەکانەوە رووبەڕووی شەڕێکی زۆر توند بوونەوە.

*لێنییە بۆ ئەوەی چاوی ببڕێتیێ، و هیچ ئەندامێکی نەتەوەکان لەنێو ئەم هاوپەیمانییە هیچ داوایەکی هەرێمەکانیان نییە، میلۆسۆڤیچ هەرشەی لە ئەمن و ئاسایشی هەرێمەکانی ئەم ئەندامانەی هاوپەیمانی ناکات. کەچی هێشتاکە هاوپەیمانەکان لە جەنگدانە. بە دوودڵییەوە شەڕەکە بۆ چارەنووسی ئەوانیترەوە دەکەن. شەڕەکات لەبەرئەوەی هیچ کەسێکی پاك و دڵسۆز ناتوانێ دەستەوەستان بوەستێ و سەیری فەرمانەکانی حکوومەت بکات لە کوشتنی کەسانی بێگوناه... ئەم جەنگەش وا لە مافەکانی مرۆڤ دەکات لەسەروەی مافەکانی دەوڵەتەوە بێت.*

زۆربەمان لەسەرئەوە رازین کەوا ئـەخلاق ( رەوشـت)، هەرچـەندە زەحمەتـە بتـوانی پێناسـەی بکەیت، زۆر پێویستە بۆئەوەی ئێمە بتوانین لەگەڵ یـەکتریان بگـونجێنین. زۆر هەسـت بـە ئـارامی دەکەین کاتێ دەبینین ویژدان خۆی وەك راسپاردەیەکی سەرەتایی خزمــەت بــە هــەموو کردارەکـانی هەردوولا نەتەوەکان و تاکەکانەوە دەکات. بەڵام ئەی دەربارەی ئایین؟ پێتوایە ئایین تاکە بـەهێزترین کاریگەرە لەسەر نەخشـاندنی ویـژدانی مرۆڤـەکان، وە هــەروەها هێشـتاکە وەك سەرچـاوەی رق و ناکۆکی هەژمار دەکرێـت. هــەروەك گەواهیــدەری بارودۆخــەکانی بــەلْقان و شــوێنەکانیتر بــووین، پرسیارێك لێرە خۆی قوت دەکاتەوە، ئایا ئایین هێشتاکە شتێکە کە ئێمەی مرۆڤ پێویستە زیاترمان هەبێ تێبگەین؟

(٥)

## عەقیدە و دیبلۆماسی

ئەم جیهانە دەبێتە باشترینی جیهانەکان ئەگەر ئایین بوونی نەبێ!! ئەمەش هەروەك جۆن ئادەمس لەنامەیەکدا بۆ تۆماس جێفەرسۆنی نووسیبوو. ئەم دەربڕینە، لەلایەن بێ باوەڕەکانەوە بەباشی ناسراوە و بەجیاوازییەوە بەدیار دەکەوێ. ئەمەش هەموو نووسینەکەیە:

*بیستەم جارە لەخوێندنەوەی کۆتاییم دەگەمە خاڵی لوتکە، " ئەم جیهانە دەبێتە باشترینی جیهانەکان ئەگەر ئایین بوونی نەبێ!!" بەڵام لەم سەرسوڕمانەدا، تووشی دەمارگیری دەبم... ئەم جیهانە بەبێ بوونی ئایین دەبێتە دۆزەخ.*

لەگۆرانییەکەی بەناوی imagine " بێنە بەرچاوت" جۆن لینۆن ناچارمان دەکات بەوەی خەو بە جیهانێکی دوور لە ڕێبازی ئایینییەکانەوە ببینین. لەبارەی زۆرێك لە بێ باوەڕەکان ئایین بەلایانەوە چارەسەری هیچ شتێ ناکات. بۆ چەندین سەدە دەچێ، خەڵك یەکتر بەناوی خوداوە بێزار دەکەن. خوێندنەوەکان وا ئاماژە دەکەن کە ئەو جەنگانەی تیایدا پێکهاتەی ئایینی لەخۆی دەگرێ زۆر درێژتر و وەحشیانەتر کۆتاییان دێت بەبەراورد لەگەڵ ناکۆکییەکانیتر. هەروەك نووسەری ستوونی لیبراڵی ئای. ئێف. ستۆون تێبینی ئەوەی کردووە، " لەماوەی رابردوودا ژمارەیەکی زۆر سەر بەناوی خوداوە براون، ناوی خودا بە بەرائەتەوە تێکەڵ بە زۆرێك لە جەنگەکان کراوە. شەڕکردن لە وەرزش و تاڵانکردن هەرگیز خراپتر نییە لەو شەڕکردنەی لەبەرئەوەی لایەنی تیۆری عەقیدەی یەکێك لەگەڵ عەقیدەی ئەوەیتریان ناگونجێ".

هەڵەی ئەمجۆرە لۆژیکەیە، هەرچەندە ئێمە دەزانین کەوا جیهان چۆن بەبۆنەی ئەم ململانێی ئایینییەوە تووشی سەرئێشە و شەڕ و شۆڕ هاتووە، کەچی ناشزانین ئایا ژیان بەسەربردن لە جیهانێکی بێ ئایین چۆن دەبێ. هەرچۆنێك بێ، بەڵگەی ئەوەمان لە لینین و ستالین و ماو زێدۆنگ دەست کەوتووە هەروەها خۆشم گفتوگۆی ئەوە دەکەم کە نازییەکان، ئەوانەی بانگی مەسیحییەتی بێ گیان دەکەن بەجۆرێك نکۆڵی و ناو زڕاندن لە ڕەگ و ڕیشەی جووەکان لەسەر

ئەم عەقیدەیە دەکەن. زۆر ئاسانە لۆمەی ئایین بکەیت—یاخود باشتر بلێین، ئەوەی خەڵك بەناوی ئایینەوە ئەنجامی دەدەن—لەگەڵ بوونی هەموو کێشەکانمان بەلاّم کارێکی زۆر سادەیە بەکردنی. ئایین خۆی لەخۆیدا هێزێکی زۆر بەتوانایە، بەلاّم کاریگەرییەکەی بەتەواوەتی پشت بەوە دەبەستێ کەچۆن سروش بۆ خەڵکەکە دێنێ. ئەو بەرەنگاربوونەوەی کە تووشی سیاسەتدانەرەکانەوە دێت فریودانێکی شاراوەی یەککرتنەوەی عەقیدەکەیە، لەکاتێکدا توانای ئەوەی تێدایە دەست بە دابەشبوون بکات. ئەمەش ئەوەمان لێ داوادەکات کە ئەو مەسەلە رۆحانییەی تێدا دەبینینەوە کە شایەنی دیراسەت کردنن. زۆرجاران زانای لاهوتی کاسۆلیکی بریان هەیهەر بەمجۆرە تێبنی دەکات " گریمانەیەك هەیە کەوا پێویست ناکات تۆ لە ئایین تێبگەیت تا لەرێگای ئەوەوە لەم دونیایە فراوانە تێبگەیت. تۆ لەسەرتە لە بوارەکانی سیاسەت و ئابووری و یاسا و ستراتیژییەتەوە تێبگەیت، بەلاّم لەسەرت پێویست نییە لە ئایینەوە تێبگەی. ئەگەر تۆ سەیری کتێبە ستانداردەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە بکەیت یاخود سەیری ئەو رێگایە بکەی کە ئێمە وەزارەتی دەرەوەی خۆمان پێ رێکخستووە و پەیرەوی دەکەین، لەهیچ شوێنێك مامەڵە لەگەڵ تێگەیشتنێکی پێشکەوتوانەی ئایین وەك هێزێکی گشتی لە جیهان ناکەین".

بۆ پێشبینی کردنی رووداوەکان لەبری وەلاّمدانەوەیان، دیپلۆماتە ئەمەریکییەکان پێویستیان بەوەرگرتنی ئامۆژگارییەکانی هەیهەرە، هەروەها بیرکردنەوەی زیاتر لەبارەی رۆڵی ئایین لە سیاسەتی دەرەوە و ئەزموونەکان. پێویستە گەشە بەو توانایە بدەن بۆ ناسینەوەی ئەوەی کە ئایا لەکوێ و چۆن باوەڕە ئایینییەکان لە ناکۆکییەکان بەشداریی دەکەن، وەکەی رێبازە ئایینییەکان بۆ کەمکردنەوەی ناکۆکییە ئایینییەکانەوە بەکاردێت. هەروەها لەسەریان پێویستە بە دووبارە ئاراستەکردنەوەی دەزگاکانی سیاسەتی دەرەوەی ولایەتە یەککرتووەکان بۆ وەرگرتنی تەواوی حیساباتەکانی هێزی گەورەی ئایین بۆ کاریگەری ئەوەی کە چۆن خەڵك بیردەکەنەوە و هەست دەکەن و مامەڵە دەکەن. هێماکانی ئەمجۆرە کاریگەرییە هەموو لەدەوروبەرماندانە لە چوارچێوەی ژیانی خەڵکەکە بەلاّم بە عەقیدەی جیاوازەوە. هەربۆیەش بۆ روونکرنەوەی زیاتری باسەکەم، سێ بەسەرهات دەخەمەڕوو.

لەساڵی ١٩٨١، سەردانی ولاّتی پۆڵەندام کرد، ئەم کاتە ساڵی دووەمی ئەو راپەڕینە بوو کە لەلایەن بزووتنەوەی هاوکاری لەدژی حکوومەتی کۆمۆنیستییەوە ئەنجامیان دابوو. بۆماوەیەکی زۆر دیراسەم لەبارەی ئەورووپای ناوەڕاست و رۆژهەلاّت کرد، چەند دەیە ساڵێك

بوو، بەڵام هەندێ گۆڕانی کەم روویان دابوو. ئێستاکە تەواوی ئەم هەرێمە لەخەوێکی زۆر قووڵەوە هۆشیاربوونەتەوە. گەورەترین بەش ئەوەبوو کەوا پاپا یۆحنا پۆڵسی دووەم بۆ یەکەمجار گەڕایەوە وڵاتی پۆڵەندا--خاکی دایکی. لەپێشدا کارۆل وتیلا، مامۆستا و قەشە و کاهینی کراکۆف، پاپا نموونەی ئەوەی دەهێنایەوە کە ئایین چ رۆلێکی گرنگی لەمێژووی پۆڵەندا بینیوە. لەکاتێکدا سەرکردە کۆمۆنیستەکان لە وارشۆ ئەوەیان دەخوێندنەوە کە پۆڵس ئەنجامی دەدان، قەشەی کلێسەکانی هەموو کونجێکی ئەم وڵاتە قسەیان لەبارەی ئەوە دەکرد کە پاپا باوەڕی پێ هەبوو. حکوومەت، زۆر لە هاتنی پاپا دەترسا، بۆیە یادداشتێکی بۆ مامۆستایانی قوتابخانەکان نارد تیایدا ئاماژەی بەوە کردبوو کەوا پاپا یۆحنا پۆڵس وەك " دوژمنی ئێمە" ناساندووە، هەروەها هۆشداریدا بە " کارامەیی نائاسایەکان و هەستە گاڵتەجارییەکانیەوە". دەسەڵات هەڵەیەکی تەکتیکی کرد ئەویش بە رێگادانی بەرپرسانی کلێساکان بە رێکخستنی ئەم سەردانەی پاپا، هەروەها پێدانی هەلێك بۆ دانانی خشتەی زنجیرەیەك پەیوەندی راستەوخۆ لەنێوان "پاپای خەڵکەکە" و "خەڵکی پاپاکە".

یەکێك لەناونیشانەکانی قەشەی رۆمانی 'بۆنتیفیکۆس ماکسیمۆس'ە، یاخود دروستکەری گەورەترین پرد. پاپا یۆحنا پۆڵسی دووەم لە وڵاتی پۆڵەندا یارمەتی بنیاتنانی پردێکی دا کە لەکۆتاییدا بووە هۆی چارەسەرکردنی پەیوەندییەکانی نێوان ئەورووپای رۆژئاوا و ئەورووپای رۆژهەڵات. لەبری بەکارهێنانی بەرد، وشەی هەڵبژێردراویان بۆ نیشاندانی بەتاڵی ناوەڕۆکی سیستەمی شیوعیەت بەکاردەهێنا، ئەگەر خەڵك هەڵسن بە راپەڕاندنی لێپرسراوییەتەکەیان بۆ بەردەوامی ژیان بەگوێرەی رێبازە ئەخلاقییەکان، پێویستە لەسەرەتادا مافی ئەنجامدانی ئەم کارەیان هەبێ. تاوانەکانی خۆی بە راشکاوانە باس بکات بەوەی کەوا رژێمی تاکڕەوی ناتوانێ بەردەوام بێ ئەگەر پۆڵەندییەکان ئەم ئازایەتییەیان هەبێ بە رەتکردنەوەی بیرکردنەوەکانیان. لەسەرووی هەمووشیانەوە، نەوەکانی نیشتیمانی خۆی ناچارکرد بەوەی کە هەست بە ترس نەکەن—داوایەکی سادەیە بەڵام کاریگەرییەکی گەورەیە. لەسەرەتادا، بەڵام دواتر بووە هۆی کۆکردنەوەی هێز، گوێگرانی پاپا هێزیان لەیەکترەوە وەردەگرت. چیتر بۆ گرووپی بچووکتر جیانابنەوە، دەستبەسەرداگرتنی کۆمۆنیستەکان بە بیرۆکە ترسناك و دوورەپەرێزەکانەوە رووبەڕووی هاوواتەکەی خۆیەوە بۆوە. گوێگرەکان لەنێو ئەم ئاپۆڕایە وەستاون و جارێکیتریش یەك لەدوای یەك شانازی بەو ئەدگارانە دەکەن کە ئەوانی کردۆتە پۆڵەندی—باوەڕهێنانیان بە پەروەردگار و خۆشحاڵی ئامادەبوونیان بۆ

ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو مەترسییەك ئەمەش لەپێناو ئازادییە. سەردانەكانی پاپا بوونە هۆی پڕشنگكردنی شۆڕشی گیان، دواجار پۆڵەندای ئازادكرد، دیواری گەورەی بەرلینی رووخاند و یەكگرتنەوەی ئەوروپا و گۆڕانی رووخساری جیهانی.

پاپا یارمەتی خەڵكی پۆڵەندایدا بە زاڵبوونیان بەسەر ترس و نیگەرانییەكانیاندا .بۆب سیپڵ، كە بەیەكەوە لە وەزارەتی دەرەوە خزمەتمان دەكرد هەروەها وەك یەكەم بالیۆزی ئەمەریكا لە ئازادی ئایینی نێودەوڵەتییەوە كاری دەكرد، دووەم بەسەرهات دەگێڕێتەوە، ئەمەیان دەربارەی زاڵبوونە بەسەر رق. ئەم بەسەرهاتە پەیوەندی بە ماری هەیە، ئافرەتێكی گەنجی لوبنانی، چاوی بەسەرۆكی روانینی جیهانی (World Vision)، و دەستەی گەشەسەندن و حەوانەوەی مەسیحی كەوت. لە ساڵانی ١٩٨٠ی سەدەی رابردوو، لوبنان بووە شانۆی دیمەنی تێكدراو و شەڕی ناوخۆی تایفە جیاوازەكانەوە. ماری لە لادێیەك دەژیا كە زۆربەی دانیشتوانەكەی مەسیحی بوون، كاتێ میلیشیا ئیسلامییەكان ئەم لادێیەیان داگیركرد، هەموو دانیشتوانەكە هەڵاتن. ماری لەكاتی هەڵاتنیدا بەسەر دارێكەوە هەڵخلیسكا بەسەر دەم كەوت. ئەوكاتەی هەڵسایەوە، كوڕە لاوێك كە تەمەنی لە بیست ساڵ تێپەڕی نەدەكرد تفەنگێكی لەسەر سەری دانا و داوای لێكرد، " رەتی مەسیحی بوونت دەكەی یان بتكوژم". ماری هیچ جوولەی نەكرد و وەڵامی داواكەی نەداوە. وتی: "من بە مەسیحی لەدایك بوومە و بەمەسیحیش دەمرم". لەم كاتە دەمانچەكە تەقەی لێوەهات و گولەیەك لە لوولەكەیەوە دەرچوو بە مل و بڕبڕەی پشتی ماری كەوت. زۆر بەبێ بەزەییانە، چەكدارەكە بە حەربەی سەر تفەنگەكەی خاچێكی لەسەر سنگی ماری حەفركرد و بۆ مردن بەجێیهێشت.

لەڕۆژی دواتر، میلیشیاكان گەڕانەوە و خۆیان بۆ داگیركردنی لادێیەكە ئامادەكرد. ئەوكاتەی میلیشیاكان لاشەی مردووەكانیان دەگواستەوە، هەندێكیان تووشی ماری بوون لەسەر ئەرزەكە كەوتووە هێشتاكە لەژیاندا مابوو بەڵام نەیدەتوانی لەجێی خۆی بجولێت چونكە تووشی شەلەلی جەستەیی ببوو. لەجیاتی ئەوەی لەباری ببەن و بیكوژن، بەسەرسوڕمانییەوە میلیشیاكان بەسەر نەقالەیەكی دار و پارچەیەك قوماشەوە گواستیانەوە بۆ نەخۆشخانە. سیپڵ بەردەوام دەبێ لەگێڕانەوە:

*من خۆم لەبەرامبەر ماری دوە دانیشتبووم و قسەم لەگەڵی دەكرد، پێموت: "ماری بەڕاستی ئەمە هیچ مانایەك نادات. ئەم چەكدارانە هەوڵی كوشتنی تۆیان دا كەچی بۆچی بۆ رۆژی دواتر تۆیان گەیاندە نەخۆشخانە؟"*

ماری وتی، "دەزانی هەندێجار کەسانی خراپ کاری باش دەکەن".

منیش وتم: "ماری هەستت چۆنە بەرامبەر ئەو کەسەی کە تەقەی بەرامبەرتەوە کردووی؟ تۆ وەك ئافرەتێکی عەرەبی لە خاکێکدای کە لەیەك کاتدا دووجار داگیرکراوە، ئیسرائیلییەکان لەلای باشوورەوە، سوورییەکانیش لەهەموو شوێنێکی ئەم خاکە. تۆش لەسەر کورسییەوە ژیان بەسەر دەبەی و جەستەکەت بۆتە بارمتەی ئەم کورسییە، ئەم ماوەی ژیانت کە ماوە دەبێ گوێڕایەلی فەرمانەکانی بیت. ها هەستت بەرامبەر ئەم کوڕە چۆنە کە تەقەکەی لێکردووی نەگۆڕاوە؟"

*وتی: " لێی خۆش بووم".*

*" ماری چۆن لەم جیهانە پڕ لە زوڵمە لەکەسێکی ئاوا خۆش دەبی؟"*

*"باشە، دەزانی بۆچی لێ خۆشبوومە؟ چونکە پەروەردگار لەمن خۆشبووە. ئەمەش وەڵامێکی سادەی پرسیارەکەتە".*

لەڕوانگەی (سیپلێ)ەوە، لەم بەسەرهاتە دوو وانە هەیە دەبێ لێیەوە فێربین. یەکەم: هێشتا هەندێ خەڵك هەنە ئامادەن بمرن و بکوژرێن لەپێناو عەقیدەکەیان. بەڵام بە بۆچوونی من ئەم بیرکردنەوەیە ڕاستبوو بەڵام بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا نەك بۆ جیهانی ئیمڕۆکە. وانەی دووەم ئایین بەباشترین شێوە فێری لێبوردن و ئاشتەواییت دەکات، نەك هەر تەنها لەو کردارە ئاسانانەوە بەڵکو لەهەموو کردارە زەحمەتەکانیشەوە ( دەمەوێ ئەوەش زیاد بکەم، ماری کەسێکە خاوەنی گەورەترین گیانی لێبوردەیە بەبەراورد لەگەڵ ئەوانیتر، بە منیشەوە).

بەسەرهاتی سێیەم تایبەتە بە منداڵێکی خاوەن دوو چاوی غەمبار کە لە نیوڕۆیەکی گەرمی دیسەمبەری ساڵی ١٩٩٧ بینیومە کە لەیەکەم سەردانم بۆ کیشوەری ئەفریقیا بوو وەك وەزیری دەرەوەی ولایەتە یەکگرتوەکان. منداڵەکە پێدەچوو تەمەنی لە دەوری پێنج ساڵان بێ، بە دەنگێکی پڕ لەسۆزەوە دەئاخافت. پێی وتم دوو هەفتە پێش ئێستا ئەو لادێیەی خێزانەکەی تیا دەژیا کەوتە بەر هێرشکردن. لەکاتی هێرشکردنەکە دایکم منی فڕێدایە سەر ئەرزەکە و خۆی کردە زرێ (درع) بەسەر گیانی منەوە. دیاربوو کاتێ بارودۆخەکە هێمن بۆوە دایکم بەسەر منەوە گیانی لەدەستدابوو. لاشەی ئافرەتانیتر بەدەورمانەوە کەڵەکەی کردبوو هەموویان لەگیان دەرچووبوون، ژمارەیان گەلێك زۆربوو خوێن جۆگەڵەی بەستبوو. دواتر منداڵەکە گوێی لەدەنگی منداڵێکی ساوا دەبێ لەنێو لاشەی مردووەکان دەگریێ، کاتێ سەیری کرد بینی خوشکە بچووکەکەیەتی. هەڵسا منداڵە بچووکەکەی لە ئامێزی خۆی توند

گرت و ڕۆیشت. بۆ چەندین کاتژمێر ڕێی کرد بەسەر گرد و گاشەبەردەوە سەردەکەوت لەملاشەوە منداڵەکە هەر هاواری دەکرد و دەگریا. لەکۆتاییدا گەیشتنە شوێنێك کە منداڵەکە بە ئەزموونی خۆی کە دەبێ ئەمە شوێنێکی ئەمین و هێمن بێت دەتوانن تیایدا بپارێزرێن.

ئەم شوێنە ناوی گولو بوو، شارۆچکەیەك بوو لەبەشێکی دووری ئۆغەندای باکوور. کۆمەڵەی ڕوانینی جیهانی (World Vision) ئەم کەمپە بەڕێوەی دەبەن و نەخۆشخانەیان لێ کردووە—پەناگەیەکە بۆ لادێیە ناوخۆییەکان، ئەوانەی لەلایەن گرووپە میلیشای نایاسایەکانەوە هەڕەشەیان لێدەکرێت و شاربەدەر دەکرێن. دە ساڵ پێش ئێستا نزیکەی ٨،٠٠٠ منداڵ لەم ناوەیە فڕێنران واپێدەچێ زۆربەیان مردبن. ئەو کوڕانەی لەژیان ماون و هەڵنەهاتوون وایان لێدەکەن بێنە ڕیزی یاخیبووەکان خزمەت بکەن، هەروەها کچەکانیش وەك خزمەتکار بەکاریان دێنن یان دەیانکەنە "خێزانی" خۆیان.

لێپرسراوانی کەمپەکە گلەیی لە سەرکردە یاخیبووەکانەوە دەکەن بەوەی کە ئایینیان لەگەڵ هەندێ شتی سەیر تێکەڵکردووە. تراژیدیاکە خۆی لەساڵی ١٩٨٦ەوە دەستی پێکرد کاتێ گۆڕانکاری لەحکوومەت هەڕەشەی لە خێڵی باڵادەستی ناوچەکە کرد کە، ئەکولو بوو. ترس خۆی هاندەرێکی بەهێزە، ئەکولو لە سزای ئەم هەڵانە دەترسا کاتێ لەسەر دەسەڵات بوون و ئەنجامیان داوە. ڕزگارکەرێکی بەتوانا گەیشتە ناوچەکە کە تەمەنی لەدەروی سی ساڵی دەبوو، ناوی ئەلیس ئوما، بوو. دەیووت من توانام هەیە پەیوەندی لەگەڵ گیانەکان (ڕۆح) بکەم—کارێکی دەگمەنە بەڵام پێش ناچی هیچ زانیارییەکی ئاوای لا دەست کەوێ. ئەلیس بە هاوڕێکانی وت: لەلایەن ئەفسەری خوالێخۆشبووی سوپای ئیتاڵییەوە ڕاسپێردراوم بە ڕێکخستنی سوپایەکی بەهێز بەمەبستی وەرگرتنەوەی پایتەختی ئۆغەندا، کامپالا. کاتێ سەرکەوتنەکە بەدەست هات، گیانەکان فەرمانیاندا بەوەی ئەکولو دەبێ خۆیان پاك بکەنەوە لەڕێگای گەڕان بەدوای لێخۆشبوون. هەڵمەتی پیرۆزی ئۆما دەستی پێکرد بەڵام نەبوونی کاریگەری سوپا بۆ گونجاندنی سروشە هێزە لەڕادەبەدەرەکەی. دوای چەند سەرکەوتنێکی سەرەتایی، بزووتنەوەیەکە—کە بە دار و بەرد و هەندێ شتومەکی سیحرییەوە چەکدارکرابوون، تێکشکا و لەناوچوو. ئوما، کەچیتر بیری لە ئەفسەرە ئیتاڵییەکە نەکردەوە، خۆی وەك پەناهەندەیەك لە سنووری کینیا بینییەوە.

لەوەبوو کۆتایی هاتبوایە گەر جۆزیف کۆنی، برازای ئوما، بڕیاری ئەوەی نەدابایە بە بەرزکردنەوەی دۆزی ئەم جەنگە پیرۆزە. گرووپە بچووکە یاخیبووەکان یەکیانگرتەوە و ناوینان

سوپای بەرگریکاری خودا (س.پ.خ). لە ساڵی ١٩٨٧ ەوە س.پ.خ چەند هێرشـێکی بۆسـەر دانیشتوانی لادێیەکانی ئەم ناوچەیە ئەنجامدا، هەروەها ئامانجیشیان حکوومەتەکانی ناوخۆیی و کۆمەڵە خێرخوازییەکان بوو. چونکە کۆنی بەزەحمەت دەیتوانی هەرزەکارێك کۆنترۆڵ بکات و وای لێبکات خزمەت لە ریـزی سـوپاکە بکـات، ناچـار هەڵدەسـتان منـداڵیان دەفرانـد وەك رێگایەك بۆ زیادکردنی ژمارەی سوپاکەیان. هەرکەسێکیان گرتبایە دوو هەڵبژاردنی دەدایێ یا ئەوەتا دێت ئامادەیی خۆی دەردەبڕێت و گوێڕایەلیان دەبێـت و لەگـەڵ ئـەوان کاردەکـات یـا ئەوەتا رووبەڕووی کوشتن دەبێتەوە، هەروەها گوێڕایەلییەکەش ئەوەیە دەبێ ئەوەی رووبـەڕووی ئەم سوپایەیان بۆیە بیکوژن تەنانەت مەگەر ئەندامەکانی خۆشـیانەوە بـێ. دیسـیپلینی ئـەم سوپایە بەهۆی لێدان و قامچی و برینەوەی ئەندامانی جەستە بەڕێوەدەچـوو، هـەروەها پشـت دەبەسترا بە خوێندنەوەی دوارۆژی سەرکردەکان لە پەیمانی کۆن (تەوڕات). ئامـانجی سـەرەکی س.پ.خ رووخانـدنی دەسـەڵاتی حکوومـەتی ئۆغەنـدی و هـەروەها جێگرتنـەوەی لەلایـەن دەسەڵاتێك کە بناغەی لەسەر دە وەسیەتەکە وەستا بـێ‍ـــیاخود دە کـۆ یـەك. یازدەمیـان لەلایەن (کۆنی)ەوە زیاد کرا کە ئەویش سنووردانان بوو بۆ بزووتنەوە نەیارەکانە، ئەویش " تۆ بۆت نییە سواری پایسکل بیت".

ئەم سوپایە بەهۆی بەرهەمهێنانی ترسەوە توانی بەردەوامی بداتە خۆی هەروەها بۆماوەی بیست ساڵ توانی ترس و تـۆقین لـەنێو دڵـی خـەڵك بچـێنێ. حکوومـەتی ئۆغەنـدی تـوانی ئاراسـتەی خـۆی لـەنێوان هەوڵـەکانی بـۆ بەرقـەراربوونی ئاشـتی لەگـەڵ ئـەم سـوپایە و لەلایەکیتریشەوە هەوڵەکانی بۆ لەناوبردنیان بگۆڕی، بەڵام لێپرسراوەکان نەقسـیان هـەبوو لـە سەرچاوەکانی پاراستنی ئەو خەڵکەی کە لەو ناوچانەی کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی یاخیبووەکان دەژیـان. ئـەم ئەرکـەش بـۆ کۆمەڵـەی روانینـی جیهـانی (World Vision) و گرووپـە هاوشێوەکانیتر بەجێماوە ئەوانەی کە سەرچـاوە و کۆمەکـەکانیان سـنووردارە، هـەروەك خـۆم لەماوەی گەشتەکەمدا بۆ کەمپی گولو بینیمن. دەورووبەرەکەش ئەم وێنانەی بەبیردەهێنامەوە کە لە جەنگی کریمین بینیبـووم. نەخۆشـخانەی کەمپەکـە بـۆنی دیتـۆڵ و پاشمـاوەی مرۆڤـی لێدەهات، دڵۆپ دڵۆپ دەتکایـەوە، مێشـوولەش ئـەم نـاوەی داپۆشـیبوو. سـەدان نـەخۆش لەهۆڵەکە پاڵ کەوتبوون زۆربەیان منداڵ بوون، هەندێکیان بە پارچـە قوماشـێك نێوچـاوانیان داپۆشرابوو، هەندێکتر بە لەفاف برینیان بۆ بەسترابوو، ئاوای تێـدابوو ئەنـدامێکی جەسـتەی پەڕیبوو. چاوم بە گرووپێکی کچی هەرزەکار کەوت بەیەکەوە لەسەر دۆشەکەکان دانیشتبوون و

قژی یەکتریان شانە دەکرد و دەهۆنییەوە. واپێدەچوون قوتابی قۆنـاغی ناوەنـدی بـوون، کەچـی هەندێکیان دایك بوون، باوکی منداڵەکانیان لەلایەن س.پ.خ ناچارکرابوون لەگەڵیان کاربکەن. یەکێکیان کۆڵی دڵی خۆی هەڵڕشت و وتی، تەنانەت ئەگەر تۆ منداڵ بیت تیشێرتێکی میکی ماوست لەبەردابوایە، ئەوان ئامادەبوون تۆیان بدابا بەشوو بە پیاوێك کە تەمەنی وەك تەمەنی باوکم بایە".

کاتێ ویستم ئەم شوێنە جێبێڵم، کورە گەنجێك هەڵسایەوە مەلۆتکەیەکی لەباوەش گرتبوو. "ئەم کچەیە، منداڵێکی تازە پێگەیشتوو بۆئێمەی هێنا، پێدەچـێ خوشـکی بـێ.. ناویشـی چاریتی یە". کاتێ سەرپۆشی هەتیوە بچووکەکەم هەڵدایـەوە، پێیـانوتم، ئـەم کچـە بـەناوی یەکێك لە قوربانیانی ئەم هێرشانە ناونراوە. زۆرانێك لەمجۆرە قوربانیانە هەیە. ئێرە شـوێنێکە بە ئازار و ئەشکەنجەوە پڕکراوتەوە بەڵام سـاتێ خۆشیشـی تێدایـە. نەخۆشـەکان پێدەکـەنن و گۆرانی دەڵێن و یاری بەیەکەوە دەکەن لەهەمان کاتیشـدا چـاودێری یـەکتریش دەکـەن. ئـەو پزیشکە ئیتاڵییەی کە سەرپەرشتی ئەم نەخۆشخانەی گولو دەکرد بۆ ماوەی بیست ساڵ دەبوو لەم شوێنە کاریـدەکرد. چ جیاوازییـەکی زۆر هەیـە لـەنێوان ئـەو عەقیدەیـەی کـە لەلایـەن خۆشەویستی و یارمەتیدانی ئەم نەخۆشانەوە بەدیدەکرێت هەروەها لەگەڵ ئەو عـەقیدەیەی کـە لەلایەن س.پ.خ پەیڕەو دەکرێت(*).

یەکێك لەم وانانەی لەم بەسەرهات و چیرۆکانەوە لەبەرچاوە و زیاتر لە باوەڕە ئایینییەکەوە بەدی دەکرێت ئەوەیە کە ئێمە پەیوەندی خزمایـەتی لەگـەڵ یـەکتردا دەبەسـتین و پارێزگـاری لێدەکەین.

لەگەڵ ئەوەی ماوەی نێوانمان زۆر دوورە بەڵام هەموو لە یەك وێنـەی خوداییـەوە دروسـت بووینە. ئەمەش وامان لێدەکات لێپرسراویەتی دراوسێکان هەڵبگرین. ئەم ڕێسایانەش دەبێتە هۆی بەخشینی بنەمایەکی پتـەوی ئایینەکـە هـەروەها بناغەیـەکی بـەڕێز بـۆ ڕێکخسـتنی ئەگەرەکانی کۆمەڵگای عیلمـانی. ئـەوەی ئـەم مەسـەلانە ئاڵۆزدەکـات ئەوەیـە کـە ئـایین بـەجۆرێك تەفسـیردەکرێت کەدەبێتـە هـۆی بـەلاوەنانی ژمارەیـەکی زۆری خەڵکەکـە لـە

(*) لە ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٥ دادگای دادی نێودەوڵەتی کە تایبەتە بە تاوانبارانی جەنگ فەرمانی دەستگیرکردنی جۆزیف کۆنی و چوار لە سەرکردەکانی س.پ.خ دەرکرد بە تۆمەتی ئەنجامدانی تاوان لەدژی مرۆڤایەتی. دادگا هیچ توانایەکی سەربەخۆی نەبوو بۆ ناچارکردن و چەسپاندنی ئەم فەرمانانە.

بانگەشەکردنی خزمایەتی. ئەوانەی کە بەڕاستی بە عەقیدەی ئایینەوە پڕبوونە--- وەك پاپا یۆحەنا پۆڵسی دووەم و ماری بۆب سیپڵ ، هەروەها فیداکارانی گولو—لەوەیە جەخت بکەن لەسەر ئەوەی " ئێمە هەمووماں منداڵی پەروەردگارین"، بەڵام کەسانیتر هەنە بەدوای ئەم باوەڕە کەوتوونە بۆ کۆتاییەکی وتوێژخوازتر ئەویش بەوەی کە " من لەسەر راستم ، تۆ هەڵەی، بڕۆ بۆ دۆزەخ".

کاتێ لەیەکێك لەو نەدوەیەکان لەگەڵ نووسەر و بیرمەندی جوولەکە ئیلی ویزڵ، رزگارکەری هۆلۆکۆست بەدیارکەوتم، ئەوەی بەبیرهاتەوە کە چۆن گرووپێکی توێژەران پرسیاریان لێکراوە لەبارەی ناونانی غەمبارترین کارەکتەری نێو کتێبی پیرۆز. هەندێك ئەڵێن پێغەمبەر ئەیوبە لەبەر بەرگەگرتنی زۆری میحنەتەکانی. هەندێکیتر دەڵێن پێغەمبەر موسایە لەبەرئەوەی بێبەشکرا لە چوونە ژوورەوەی بۆسەر زەوی بەڵێندراو ( **الارض الموعودة**)، هەندێکیتر دەڵێن پاکیزە مەریەمە لەبەرئەوەی شاهێدی مردنی کوڕە تاقانەکەی بووە. بەڵام باشترین وەڵام، کە ئیلی ویزڵ پێشنیازی بۆکردووە، لەوەیە خودای گەورە غەمبارترین کارەکتەری نێو کتێبی پیرۆزبێت ئەمەش لەبەرئەوەیە مرۆڤەکان هەرچی کوشتن و بڕین و تالانکردن و شەڕکردنە بەناوی ئەوەوە دەکەن.

هەر لەبەرئەم هۆیەوەیە زۆربەی پەیڕەکەرانی سیاسەتی دەرەوە—بەمنیشەوە—بەدوای ئەم رێگەچارەیە دادەگەڕێن بۆ جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەتی گشتییەوە، بۆ رزگارکردنی لۆژیك لەو باوەڕانەی کە سنووری لۆژیك دەبەزێنن. کارێکی زەحمەتە بەوەی پارچە زەوییەك لەنێوان دوو گرووپدا دابەش بکەیت لەسەر ئەساسی یاسایی و یەکسانی ئابوورییەوە، بەڵام زۆر زەحمەتترە ئەگەر یەکێکیان یان هەردوو داخوازییەکە بەوەی کە زەوییەکە لەلایەن خوداوە پێیان ببەخشرابوایە. بەڵام هاندانە ئایینییەکان وابەئاسانی ون نابن چونکە باسنەکراون، تەنها بۆساتێك دووبارە سەرهەڵدەدەنەوە. هەروەك رەنگدانەوەی ئەزموونمان لە وڵاتی ئێران، ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەمیشە بەتەواوەتی لەم باسەوە تێنەگەیشتووە. بۆ پێشڕەویکردنی جیهان، پێویستە لەسەر دانەرانی سیاسەتی ئەمەریکا تادەتوانن لە ئایین فێربن، دواتر زانیارییەکان لەگەڵ ستراتیژییەکەیان یەکدەگرێتەوە. برایان هەیهەر ئەم بەرەنگاربوونەوەیە لەگەڵ نەشتەرگەری مێشکی بەراوردکردووە—ئەرکێکی زۆر پێویستە، بەڵام چارەنووسسازە ئەگەر بەباشی ئەنجام نەدرێت.

لەهەموو ناکۆکییەکان، ئاشتبوونەوە کارێکی ئاسایی دەبێ گەر نەیارەکان دەست لەم کارە نامرۆڤانە هەڵبگرن. بۆیەش ئەمە تەکنیکێکی نوێی دانوساندنە بەداواکردنی هەر لایەنێك بۆئەوەی خۆی لەشوێنی ئەویتر دابنێ. زۆرجاران حاڵەتەکە بەم شێوەیە زەحمەت نییە کەوا دەردەکەوێت. لەڕاستیدا نەیارەکان لەسەر هەمان خەڵات و مەسەلەوە شەڕدەکەن دەتوانن ئەزیەتی هاوبەش بەدەست بێنن. بۆماوەی چەندین سەدەیە، پرۆتستانت و کاسۆلیکییەکان ململانێ لەسەر سەرکەوتنی رێبازە ئایینییەکەی خۆیان لە ئەوروپا دەکەن. ئەمەش خاڵێکی پێکچوونە لەنێوانیاندا، دەیانەوێ هەر یەك لەلای خۆی ببێتە ژمارە یەك. بۆماوەیەکی دووردرێژ موسڵمان و مەسیحی و جوولەکەکان ململانێ لەسەر بەدەستهێنانی شاری قودس دەکەن، ئەمەش خۆی لەخۆیدا خاڵێکی پێکچوونی نێوانیانە—دەیانەوێ هەمان شوێن داگیربکەن. لەبەشەکانی ئاسیا و ئەوروپا موسڵمان و مەسیحییەکان لەپێناو ئایینەکەیان شەڕ لەگەڵ یەکتردەکەن، بەڵام ئازادی تەواویان هەیە بۆ پەرستن و بەشداریکردن لە مەراسیمە ئایینی و نەریتە پیرۆزەکانیان بەبێ هەستکردن بە ترس. کاتێ خەڵکانێك بەدوای هەمان ئامانجدا دەکەوێ، هەر لایەنێك پێویستە لەوە تێبگات کەچی هانی لایەنەکەیتردەدات. بۆ چارەسەرکردنی جیاوازییەکانیان، تەنها پێویستیان بە هاوکێشەیەك هەیە بۆ دابەشکردنی ئەوەی کە دەیانەوێ—ئەرکێکی زەحمەتە، بەڵام دەتوانرێ بەشێوەیەکی عەقڵانییەوە مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکە بکرێ.

نەك هەموو ناکۆکییەك رێگا بەخۆی دەدا ئەمجۆرە دانوسانانە وەرگرێت. لە جەنگی جیهانی دووەم، مەحمور و هاوپەیمانان لەسەر بۆچوونێکی جیاوازی داهاتوو کردیانە شەڕ. ئیمرۆکە ناتوانی بەهۆی کەرەستەکانی ترساندن و تۆقین خۆت لەگەڵ ئارەزووکانی شەڕکردنی تۆڵەسەندنەوەی گرووپی تیرۆرستی ئەلقاعیدە بگونجێنی. هەندێك جیاوازی هەیە زۆر گەورەترە لەوەی تۆ بتوانی لێکیان نزیك کەیەوە. لەزۆربەی بارودۆخەکان، ئاشتبوونەوە زۆر باشتر و پەسەندترە لە بەردەوامبوونی جەنگ وخاڵی سڕبوون. بەڵام پرسیارەکە لێرە ئەوەیە چۆن ئاشتبوونەوە بەدەست دێت؟

کاتێ بەشداربوانی هەر ناکۆکییەك بانگەشەی بوون بەپیاوی باوەڕدارەکان، لەوەیە دانوستکارێك خۆزگە بەبوونی هەندێ باوەڕ و موسداقیەت بخوزاێ بۆئەوەی بتوانێ بەرەنگاربوونەوەی خۆی بسەلمێنێ. ئەگەر جەنگاوەرەکان گفتوگۆ لەسەر رەوشتی مەسەلەکانیان بکەن، ئەی چۆن رەوشتایەتی رەنگدانەوەی لەسەر کارەکانیان دەبێ؟ ئایا ئەوان خۆیان رێگا بە

ئایینەکەیان دەدەن بۆئەوەی رێنماییان بکەن یاخود وەك خالێکی گفتوگۆ لەپێناو پێشوەچوونی بەرژەوەندییەکان بەکاری بێنن؟ ئایا عەقیدەکەیان هەستی لێپرسراویەتی لەنێو مێشکیان چەسپاندووە یاخود هەستێك وایان لێبکات مافی ئەوەیان هەبێ بەرگری لە مافی کەسانانیتر بکەن؟

ئەگەر ئەمڕۆکە وەزیری دەرەوە دەبووم، چیتر لەسەر ئەساسی رێسا ئایینییەکانەوە بەدوای گفتوگۆی ناوبژیکارانە نەدەکەوتم لەوەی ئەوەندەی هەوڵی دانوساندنی رێککەوتنە بازرگانییە ئالۆزەکان و پەیماننامەکانی چەك داماڵینم دەکرد. لەهەر بارودۆخێکدا، پرسیارم لەو خەڵکانە دەکرد کە لەمن زیاتر شارەزاییان هەیە بۆ دەستپێکردنی پڕۆسەی ناساندنی مەسەلە ئەساسییەکان، گەڕان بەدوای گریمانەکان، پێشنیازکردنی بواری کارکردن. لەوەیە دەستیێوەردانی من یاخود هی سەرۆك زۆر پێویست بێت بۆ تەواوکردنی ئەم پەیماننامەیە. ئەو کاتەی وەزیری دەرەوە بووم نووسینگەیەکی تەواوم هەبوو لە شارەزایانی ئابووری، و هەروەها لەگەڵ بوونی کادیرێکی زۆر لە بوارەکانی رێگە گرتن تەشەنە نەکردن لە بڵاوبونەوەی چەك، کاری سەرەکی دەست کەوتنی نازناوێك بوو ئەویش " قەشایەتییە". لەگەڵ هەڵاوێردن ( استثناء) بۆ باڵوێز سیپل، هیچ شارەزاییەکی هاوشێوەم نەبوو بۆ ئاوێتەبوونی رێسا ئایینییەکان لەگەڵ هەوڵەکانم لەنێو بواری دیبلۆماسیدا. ئەم زانیارییانە زۆر پێویستن لە سروشتی دونیای ئەمڕۆدا.

ئەگەر کاری دیبلۆماسییەت رازیکردن و قەناعەت هێنانی کەسانیتربێ بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کەخۆمان خۆزگەی بۆ دەخوازین، سیاسەتی دەرەوە داوامان لێدەکات لەوە تێبگەین کەوا بۆچی ئەم خەڵکە ئەم کارانە ئەنجام دەدەن کە خۆزگەی بۆ دەخوازن. خۆشبەختانە، داخوازنامەی دەستووری ولایەتە یەکگرتووەکان جیاکردنەوەی دەوڵەتە لە کڵێسە جەخت ناکاتەوە لەسەرئەوەی کە دەوڵەت بێ ئاگابێت بەرامبەر کڵێسە و مزگەوت و کڵێسەی جوولەکە و پاگودە و مەعبەدەکان. لەداهاتوودا هیچ ئەمەریکییەك وەك باڵوێز بۆ وڵاتێك کە هەستە ئایینییەکانی تێیدا زۆر بەهێزە دیاری ناکرێت تاوەکو خۆیشی تێگەیشتنێکی تەواوی لەبارەی ئەم ئایینەوە نەبێ وە نەتوانێ بەتەواوی پەیڕەوی بکات لەم وڵاتە. هەر باڵوێزێك و نوێنەرێك کە بۆ هەر وڵاتێکەوە دەستنیشان دەکرێ پێویستە لەسەری پەیوەندییەکی قووڵ لەگەڵ سەرکردە ئایینییە لۆکاڵییەکان دابمەزرێنێ. لەسەر وەزارەتی دەرەوە پێویستە کۆمەڵێکی تایبەت بۆ مەسەلە ئایینییەکان بەکاربێنێت و بیاننێرن بۆ هەردوولا واشتنۆن و باڵوێزخانە هەستیارەکانی جیهانی.

لەساڵی ١٩٩٤ ناوەندی دیراساتی ستراتیژی و نێودەوڵەتی کتێبێکی بەناوی "
*Religion, the Missing Dimension of Statecraft*" دەرکرد. ئەم کتێبە حاڵەتێکی دروستدەکرد ئەمەش بۆ ناسینەوەی ڕۆڵ و کاریگەری ئایین لەسەر مامەڵەی سیاسی و بەکارهێنانی کەرەستە ڕۆحانییەکان بۆ یارمەتیدان لەچارەسەرکردنی ناکۆکییەکان. دۆگلاس جۆنستۆن، هاودانەری ئەم کتێبە، شێوەی ناوەندی نێودەوڵەتی بۆ ئایین و دیبلۆماسی نەخشاندووە، بەجۆرێك بەردەوام بووە لەسەر ئەوەی کە ناوی دەنێ " دیبلۆماسی لەسەر بنەمای باوەڕ"، هەروەها گێڕانی ڕۆڵێکی ناوبژیکارانەی گرنگ لە سودان و دامەزراندنی پەیوەندییەکی بەسوود لە کشمیر و پاکستان و ئێران. جۆنستۆن، کە ئەفسەرێکی پێشووی دەریاوانی و گەورە لێپرسراوی وەزارەتی بەرگری بووە، باوەڕی وایە هەرکەسێك کە کاریگەری لەسەر بارودۆخەکانی دەوروبەری هەبێ خراپ نییە، و هەروەها ئەوانەی کە خراپن مانای وانییە هەموو کات خراپن. گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکات کەوا نێوانکەری بنەمای-باوەڕ ڕێگای زۆری هەیە بۆ کەمکردنەوەی دیبلۆماسی تەقلیدی، ئەوانیش، نوێژ و ڕۆژی و لێخۆشبوون و تۆبەکردن و سروشی کتێبە ئاسمانییەکانە.

ناوەندی نێودەوڵەتی بۆ ئایین و دیبلۆماسی تاکە لایەن نییە لەم هەوڵدانانە. دوای ئەوەی بۆب سیپل وەزارەتی بەرگری بەجێهێشت، هەڵسا بە دامەزراندنی پەیمانگایەك بۆ بەڵێندانی جیهانی، بەجۆرێك کاردەکات بۆ سەلماندنی کەش و هەوا بۆ فەراهەمکردنی ئازادی ئایینی لەو نەتەوانەی کە خەریکی تازەگۆڕانن وەك ئۆزبەکستان و لاوس. دروشمی ئەم پەیمانگایە ئەوەیە " بەباشترین و قووڵترین ئاست عەقیدەکەی خۆت بناسە، بەڵام تا ئەو ئاستەی عەقیدەی دراوسێکەت بزانە کە ڕێزی لێدەگری".

کاتێ لە پۆستەکەم بووم، هەلی ئەوەم بۆ ڕێکەوت لەنزیکەوە کار لەگەڵ کۆمەڵەی سانت ئیگیدیۆ بکەم، بزووتنەوەیەکی عیلمانی بوو لەسالانی (١٩٦٠)ی سەدەی ڕابردوو لە ڕۆما دەستی بەکارەکانی کرد، هەروەها لەلایەن ئەنجوومەنی ڤاتیکانی دووەمی پاپا یۆحنای (بیست و سێیەم)ەوە نیگایان بۆ دەهات. دوای چەند ساڵێك، کۆمەڵەی سانت ئیگیدیۆ بەسەرکەوتوانە دەستیان کرد بەدانوساندنەکان بۆ کۆتایی هێنانی شەڕی درێژی ناوەخۆی خوێناوی لە وڵاتی مۆزەمبیق. هەروەها ڕۆڵێکی بنیاتنەری دەگێڕا لەشوێنەکانیتریش، وەك کۆسۆڤۆ، جەزائیر، بوروندی و کۆنغۆ. کۆمەڵەکە سەیری نوێژ و خزمەتی هەژاران و هاریکاری نێوان ئایینەکان و

هەوڵی یەکگرتنەوەی هەموو کڵێسە مەسیحییەکان و دیالۆگ بۆ دانانی بەردی بنیاتنانی هاریکارییەکانی نێوان ئایینەکان و چارەسەرکردنی کێشەکان دەکرد.

ژمارەیەکی زۆری ڕێکخراوەکانی بنەمای باوەڕ و نوێنەرایەتیکردنی هەموو ئایینە سەرەکییەکان لەکارکردنـدا. کاریگەرییان زیاتر دەبێ کاتێ بەیەکەوە کاردەکەن و سەرچاوەکانیان بەش دەکەن هەروەها دۆزینەوەی شوێنەکان بۆ راهێنانی پسپۆڕی. هەندێکیان زۆر دەستڕەنگینن لە نێوەندکردن، و هەندێکیتریشیان زۆر چالاکن بۆ یارمەتیدانی جەنگاوەرە کۆنەکان بۆ گونجاندنیان لەگەڵ ژیانی شارستانیەتی. هێشتاکە هەندێکیتر هەن جەخت لەسەر پاراستن و مامەڵەکردنی کێشەکان دەکەن بەرلەوەی توندوتیژی لێبکەوێتەوە. زۆربەیان پسپۆڕن لە گەشەسەندنی ئابووری و بنیاتنانی دیموکراسی، کەچی هەردووکیشیان سیاسەتێکن دژی جەنگ. بەیەکەوە ئەم چالاکانە زیاتر دەبنە خاوەن سەرچاوە و کارمەندی کارامە و گرنگیدان و ئەزموون و تەرخانکردن و سەرکەوتنی ئاشتبوونەوە لەسەر هەر حکوومەتێکدا.

بەناوبانگترین نموونەی دروستکردنی ئاشتی بنەمای باوەڕ لەلایەن سەرۆك جیمی کارتەرەوە ڕێکخرا لە کەمپی دیڤید لەساڵی ١٩٧٨. زۆربەی چاودێران وای بۆدەچن کەوا ڕێککەوتننامەی ئاشتی نێوان میسر و ئیسرائیل هەرگیز واژوو نەدەکرا مەگەر توانای سەرۆك کارتەر نەبوایە لە تێگەیشتنی قووڵی قەناعەتە ئایینییەکانەوە لەنێوان سەرۆك سادات و سەرۆك وەزیران بیغن. بەم دواییانە پرسیارم لە سەرۆکی پێشووتر کرد کە ئایا سیاسییەکان چۆن دەڕواننە ئایین وەك بەشێك لە مەتەڵی سیاسەتی دەرەوە. پێی وتم ئەمە مەحاڵ نییە بە جیاکردنەوەی ئەوەی کە خەڵك هەستی پێدەکەن لەگەڵ ئەوەی کە بڕوایان پێی هەیە لە چوارچێوەیەکی ڕۆحانییەوە بەڵکو ئەوەی کە دەیکەن لە بوارێکی سیاسەتی گشتییە. وتی"ئەمە هەڵێکە، چونکە توخمە ئەساسییەکانی عەقیدەی ئایینە سەرەکییەکان زۆر هاوشێوەی یەکترن، تەوازوعی، داد، وە ئاشتی". دەڵێ لە بواری دیبلۆماسی دوور لە رەسمیات زۆرجار لەمامەڵەکردن لە سەنتەری کارتەر پرسیاری لێدەکرێت، یەکێك لە بوارەکان کە خۆی تێدا لێکۆڵینەوەی لەسەری دەکات ئەوەیە کە ئایا پارتەکان هەموویان نوێنەرایەتی هەمان عەقیدە دەکەن؟ وەڵامی دایەوە وتی: کارێکی زۆر ئاسانترە بەوەی کە مامەڵە لەگەڵ خەڵکانێك بکەی کە عەقیدەکەیان تەواو جیاوازە لەوەی مامەڵە لەگەڵ ئەوانە بکەی کە لەهەمان ئایین بەشدارن بەڵام رازی نین بەڵکو یەکتر رەتدەکەنەوە لەسەر چۆنیەتی تەفسیرکردنی بڕگەکانی ئەم ئایینە. کارتەر وتی: وەك تەعمیدکەرێکی بێ لایەن، گفتوگۆکردن لەگەڵ

تەعمیدکەرێکی کاسۆلیکی زۆر ئاسانترە لەوەی لەگەڵ یـەکێکی فەندەمێنتالیسـتی بکـەیت، لەگـەڵ کاسـۆلیکییەکە زۆر ئاسـانتربوو بـە وەرگرتنـی جیاوازییـەکان و هەسـت نـەکردن بـە ناچارکردنی گفتوگۆ لەگەڵیاندا.

کاتێ هەمان بابەتم لەگەڵ سەرۆك بیل کلینتۆن کردەوە، جەختی لەسەر دوو خـاڵ کـردەوە: یەکەم، سەرکردە ئایینییەکان لەتوانایاندا هەیە گرنگی بە هەڵمەتی بەرقەراربوونی ئاشتی بدەن چ لەپێش، چ لەکاتی و چ لەدوای دانوسانەکانەوە بێت، هەروەها کاریگەریان لەرێگای وتـار و دایلۆگەکانیان وادەکات دەستکەوتن و پاراستنی ئاشـتی ئاسـانتر بێـت. دووەم، رازیکـردن و قەناعەت پێکردنی خەڵکەکە بە عەقیـدەی جیـاوازەوە بـۆ ئـەوەی بەیەکـەوە هاریکـاربن، و هەروەها داواکارن بۆ جیاکردنەوەی ئەم مەسەلانەی کە وتووێژی زیاتر لە کتێبـە پیرۆزەکانـەوە هەڵدەگرێت و ئەوانەشی وتوویژ هەڵناگرن. لەپاشان وتی: " ئەگـەر تـۆ مامەڵـە لەگـەڵ ئـەو کەسانە بکەیت کە بانگەشەی پابەندن بە عەقیدەکەی خۆیانەوە دەکەن، دەبێ باوەڕیشـیان بـە بوونی دروستکارێك ( پەروەردگار) هەبێ. ئەگەر باوەڕیان بەبوونی پەروەردگار هێنا ئەوا دەبێ باوەڕیش بەوە بێنن کە ئەم پەروەردگارە هەموو خەڵکی دروستکردووە. ئەمەش وایان لێدەکات لە حاڵەتێکی تایبەتەوە ببێتە جیهانی. هەرکاتێك هەستمان بە بـوونی هاوبەشـی مرۆڤایـەتی یەکترکرد، زۆر زەحمەتە یەکێك بتوانێ یەکێکیتر بکوژێت، لەدواییـدا مسـاوەمەکردن ئاسـانتر دەبێ چونکە خۆیان دان بەوە دادەنێن کە مامەڵە لەگەڵ کەسانی وەك خۆیانەوە دەکەن، نـەك لەگەڵ جۆرێك لە شەیتان یاخود جۆرە دروستکراوێکی دوور لە رەگەزی مرۆڤایەتی".

دیبلۆماسی بنەمای باوەڕ کەرەستەیەکی بەسوودە بـۆ بـەکارهێنانی لـەبواری سیاسـەتی دەرەوە. هەرچەندە گفتوگۆ لەسەر ئەوە ناکەم کە ئەم کەرەستەیە دەتوانێ جێگەی دیبلۆماسی تەقلیدی بگرێتەوە. زۆرجاران پاڵەوانانی درامای سیاسـی زۆر بـەهێزترن لـەو تکایانـەی کـە لەسەر ئەساسێکی ئـایینی و ئەخلاقییـەوە دروسـت دەبـن. بـەڵام ئەگـەر پێشـبینی پـەرجو (موعجیزە) نەکەین، شتێکی کەم لە دروستبوونی هەڵمەتەکان لەدەست دەدرێ. بڵاوبوونەوەی هەستی ئایینی بەردەوام دەبێ لە کاریگەرییەکانی بەسەر رووداوەکانی جیهان. سیاسەتمەدارانی ئەمەریکا ناتوانن خۆیان لەم بابەتە بەدووربگرن، بەپێچەوانەوە دەبـێ پێشوازیشـی لێبکـەن. ئایین لە باشترین حاڵەتەکەی خۆیدا هۆکارە بۆ بەهێزکردنی ناوەرۆکی بەهاکان کە زۆر پێویستن بۆ خەڵك بە جیاوازی کلتـوور و رۆشـنبیرییان بۆئـەوەی بتـوانن بەیەکـەوە بـژین، پێویسـتە لەسەرمان سوود لە باشترین ئاستی ئەم ئەگەرانە وەربگرین.

(٦)

## شەیتان و مادلین ئۆلبرایت

لەنێوان ساڵانی١٩٨١ تا ١٩٩٣ لەدەرەوەی حکوومەت کاری هەمیشەیی خۆم دەکرد وەك پرۆفیسۆری زانکۆ، و کاتێکیش داوام لێکرا وەك راوێـژکاری کاندیـدە دیموکراتییـەکان کـارم دەکرد، ئەو کاندیدانەی کە تووشی گەورەترین رق لێبوونەوەی جەماوەری هاتبوون تا ئەوکاتەی بیل کلینتۆن لەم نێوەندەدا بەدیارکەوت. لەکۆتایی ئەم ماوەیەدا، گەڕامەوە نێو حکوومەت بۆ دۆزینەوەی ئەو جیهانـەی کـە لەلایـەن یـەکێتی سـۆڤیەتەوە شـێوەکەی گـۆڕا، بـۆ دووبـارە یەکگرتنەوەی ئەورووپا و سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە هەڵمەتی رەشەبای بیابـان. ئـەم ماوەیـە بۆمن کاتێکی زۆر نـامۆ و نائاسـایی بـوو. رووداوەکـانی جیهـانی زۆرن، نـەمانی دیـواری گەورەی بەرلین و جوولانەوەی ملیۆنان خەڵك بەئازادی. وادەردەکەوت بۆمن کە باشترین کاتـە بۆئەوەی هەوڵبدەم بۆ دووبارە دەست پێکردنەوەی پەیوەندی دوولایەنـەی حیـزب و سیاسـەتی دەرەوە. لەدوای ئەمانەشدا، موحافیزکاران و لیبڕالیزمەکان دەمەقاڵێی ئەوەیان بوو چۆن شـەڕ لەگەڵ کۆمۆنیزمدا بکەن، لەگەڵ ئەوەی ئەم هەڕەشەیە نـەما، ئایـا چ مەسـەلەیترمان مـاوە لێیەوە نارازیبین؟

بۆئەم باسانە وەڵامێکی زۆر هەیە. کـاتێ لـەنیویۆرك لـە پۆسـتەکەی خـۆم وەك بـاڵوێزی وڵاتەکەم لە نەتەوە یەکگرتووەکان دامەزرام. زۆر بەخێرایی درکم بەوەکرد کە سیاسـەتەکەمان بەرامبەر ئەم دامەزراوەیە لەنێوان جەرگەی دابەشبوونێکی نوێدایە. لەلایەکەوە بـەکارهێنانی نەتەوە یەکگرتووەکان بـوو بـۆ هێرشـکردنە سـەر کێشـەکانی جیهـانی، لەلایەکەیتریشـەوە، دۆزینەوەی بزووتنەوەیەکی مەسیحی موحافیزکاری گەشەکردنی هێزبوو. بەدڵنیاییـەوە دەزانم، کەوا تۆڕێکی فراوانی رادیـۆ و تەلـەفزیۆنی بـاڵ راسـتی مەسـیحی بەدرێـژایی ئـەم وڵاتـەدا بڵاوبۆتەوە. بەڵام ئەوەی منی سەرسامکرد، رادەی رێکخستنی سیاسی ئەم بزووتنەوەیە بوو لە

وەڵامی هێرشە چاوەڕوانکراوەکانی بۆسەر بەهای تەقلیدە خێزانییەکان. دوای تێپەڕبوونی چارەکی کۆتایی سەدەی رابردوو، دادگای باڵا تەفسیری دەستووری کرد بە پاراستنی مافی ئافرەتان بۆ لەباربردنی جەنینەکانیان، پەروەردەی سێکسی هێنرایە نێو پۆلەکانی خوێندن، نوێژکردن لەنێو شوێنە گشتییەکان قەدەغەکرا، رێگا بە فێمینیستەکان درا بۆ هەڵمەتی هەموارکردنی یەکسان بوونی مافەکان لەگەڵ پیاوان، نێربازی و مێ بازی زۆر ئاسایی و کراوە بێت لەژیانی رۆژانەیان، هەروەها هۆلیوود دەتوانێ فیلمی " رابواردن" بەرهەم بێنێ کە دیمەنی سێکس و توندوتیژی تێدا بێت. هەروەها دەربارەی گۆرانی میللی، ئەو باوانانەی کە سەماکانی ئێلڤز و پەرچەمەکانی بیتڵی لیڤەرپوڵ بێزاریان دەکات پێویستە مامەڵە لەگەڵ ئەو دروستکراوانە بکەن کە لە ساتی گۆرانی وتن و سەماکردنیان ئاگر لە گیتارەکەیان بەردەدەن.

هەندێك لەم خولیایانە پەیوەندییان بە مافی تاکەوە هەبووە، ئەوانیتر پەیوەندییان بەئاراستەی کلتووری میللییەوە هەبووە، ئەمانەش توخمی جیاوازن، بەڵام لەڕاستیدا هەموو ئەم خولیایانە هەمووی وەك هەڕەشەکردنە بۆسەر مافی مەسیحییەکان. کاردانەوەی خۆم ئەوەبوو بە لەئامێزگرتنی ئەم هەموو گۆڕانکارییەی لەکاتی ئەنجامدانی کارەکانم بە باشترین شێوە و کەمتەرخەمیم بۆ ئەوانیتر. من خۆم لەدژی جیاوازی نێربازی و مێ بازییەوە دەوەستم و قەناعەتیشم بەوە هەیە کە زینای نێوان رەگەزی جیاواز مەترسی زۆر زیاترە لە زینای نێوان هاوڕەگەزەکان بۆسەر دامەزراوەی خێزان. بڕوام وایە بوونی پەروەردەی سێکسی لەنێوان قۆناغەکانی خوێندن قەدەغەی روودانی زۆر کێشە دەکات لەوەی دروستیان بکات. من پاڵپشتی لە *Reo v Wade* دەکەم چونکە پێموایە ئافرەت مافی هەڵبژاردنی خۆی هەیە، و کرداری لەباربردنە نایاساییەکان زۆرجاران ژیانی ئافرەتەکە دەخاتە مەترسییەوە. بەبۆچوونی من، بیرکردنەوەی سەرۆك کلینتۆن بەمئامانجەوە بووە: کرداری لەباربردن پێویستە سەلامەت و یاسایی دەگمەن بێت، پێویستە لەسەرمان هەموو رێگایەك بگرینە بەر بۆ هاندانی گەشەکردن و گەورەکردن وەك ئەڵتەرناتیڤی لەباربردن و کەمکردنەوەی دووگیانە نەویستراوەکان لەرێگای راوێژکردن و ئامۆژگاری و سەلماندنی بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکانەوە. وەك تەلەفزیۆن و رادیۆ و فیلمی سینەمایەکان، لەدژی هەر "بیرکردنەوەیەکی مەرج" دامە، بەڵام زۆریش لە کاری توندوتیژ و بازارییەوە دەترسم. هەست بە ریسواکردنەکی زۆر دەکەم لەوەی کە ئەم دیمەنەی ئەمەریکا نیشانی خەڵکی جیهان دەدات کاریگەری خراپی دەبێ، زۆری لەلایەن ئەم بەرنامە بێ سوود و بێ مانایانەیە کە لە فیلمە بازرگانییەکانەوە دەردەکەون. من وەك دایك و وەك

داپیرە، بەوە فریودەدرێم بە بەکارهێنانە دەستەیەك سابون کە دەمی ئەم ئەکتەرانە بنوسێنم، چاودێرییەکی توندیان لەسەر دابنێم، کەچی سزادانەکانیان بەپێی پێویست نییە لەبەرامبەر دەرکردنی هەر بەرنامەیەکی نێگەتیف بەسەر زیهنی خەڵکەکە، مانعیشم نییە بەوەی بە کەسێکی بێ هیوا و شەرمن بانگ بکرێم.

لەگەڵ ئەم باکگراوەند و ئەقڵە پڕ لە ژاوەژاوەیە، کچەکانم بەشێوەیەکی زۆر باش پەروەردە کردوون، لەگەڵ ئەمەشدا کارەکانیشم زۆر بە سەرکەوتوانە رادەپەڕاند. هەر شتێك بێزاری کردبامایە، ئەوا کەناڵێکی ترم دەگرتە بەر یاخود بە شێوازێکیتر هەوڵی چارەسەرکردنیم دەدا. ئەندامانی مەسیحی باڵی راست زۆر وریای خۆیانن. وەك موحافیزکارە دیندارەکان لە پێش رووداني شۆڕشی ئێرانی، لەو بڕوایەدابوون کە کیانیان لەژێر مەترسی و هێرش کردندایە، بۆیە ناچارکران منداڵەکانیان بە قووڵترین بیروباوەڕی خۆیانەوە پەروەردە بکەن. زۆربەیان وەرگری بیرۆکەی نوێن بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی ئەوەی  کە هێزە شەڕانگێزەکان پیلان لەدژیانەوە دەگێڕن بەجۆرێك پێویستیان بە یەکگرتنەوە و کاردانەوە هەیە. یەکێك لەم سەرکردە مەسیحییە موحافیزکارانە وەسفی ئەم خەڵکە دەکات دەڵێ" تەنها خەڵکی سادەن... هەوڵی گەورەکردنی منداڵەکانیان دەدەن... کارێکی باش ئەنجامدەدەن...خۆیان لەگەڵ ئەو فشارانە دەگونجێنن کە بەسەریانەوەن. نیگەرانن لەبارەی فێربوونی منداڵەکانیان لەنێو کلاسە سێکسییە دڵنیاییەکان. نیگەرانن بەرامبەر ئەم هەموو کێشەی مادده بێهۆشکەرە کۆکراوەنەی کەلە ولاتەکەیان بلاوبۆتەوە. نیگەرانن بەرامبەر ئەو پەتایەی کە لە ئەنجامی کاری سێکسییەوە بلاودەبێتەوە. نیگەرانن بەتایبەتی لەبارەی کلتۆورێك کە بڕوایان پێی هەیە و ئێستاکە لە بەرەنگاربوونەوەدایە".

سیناتۆر (جێسی هێڵمس)ی باکووری کارۆلین هەمان مەسەلە گشتییەکانی خستەڕوو بەڵام بەزمانێکی راشکاوانەتر. نووسیبووی، " بەتایبەتی لە بیست و پێنج ساڵی رابردوودا، حکوومەتی فیدراڵی تەنانەت هەوڵی نەدەدا بۆ شاردنەوەی دوژمنایەتی خۆی بەرامبەر ئایین، بەڵام ئێستاکە چەندین کڵێساکانمان تووشی ئاشوب هاتوونە، بۆیە هێرشەکە لەدژی خێزانە وەك قەڵایەکی رکابەری دەوڵەتی تۆتالیتاری ئەنجامدەدرێ. میلیشیا بێ باوەڕەکان و سۆشیالیستەکان زۆر دووربوون لە سەپاندنی بۆچوونیان لەبارەی ژیان و مرۆڤ لەسەر هەموو دام و دەزگاکانی ئەمەریکا". هەروەك هێڵمس رایگەیاند، ئەنجامی هەموو ئەمانە بووە، " قوتابخانە بێ باوەڕەکان، تاوانی توندوتیژی، ماڵی ترسێنەر، موخەدەرات، لەباربردن، فیلمی

رووت و سێکسی، بەڵێن و هەستی قۆشمەچیەتی و بێ ئومێدی رۆحانی، کەچی ئەمانە هەرگیز لە مێژووی وڵاتەکە روویان نەداوە.

کاتێ ئەرکەکانم لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگرت، مەسیحی باڵ راست هێزێکی سیاسی بەرزبوو. سیناتۆر هێڵمس جێگری سەرۆکی دەستەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجوومەنی پیران بوو. هاوپەیمانی مەسیحی کە لەلایەن بابە پات رۆبێرتسۆنەوە سەرکردایەتی دەکرا بووە هێزێکی گەورەی نێو پارتی کۆماری. گەورەترین رێکخراوی ئافرەتانی وڵات رێکخراوێکی نیشتیمانی عیلمانی نییە بۆ خودی ئافرەتان بەڵکو ئافرەتە پەیوەندیدارەکانی ئەمەریکا مەسیحییە موحافیزکارەکانیان دامەزراند. ئەم بزووتنەوەیە لائیحەیەکی بەرزکردۆتەوە کە ناوی چەند برگەیەکی تێدا دەستنیشانکردووە بۆ رکابەریەتی نێودەولەتییانە بەجۆرێك کاردانەوەی مەسەلە ناوخۆیەکانیانەوە بداتەوە: وەك لەباربردن، هەرەشەکان بۆسەر سەروەری ئەمەریکا، "خیانەتکردن" لە بەها خێزانییەکان. بە بۆچوونی مەسیحی باڵ راست لەنێو ولایەتە یەکگرتووەکان "حکوومەتی گەورە" دوژمنی هەموو کارێکی باشە بوو، و هەروەها لە گۆرەپانی جیهانییەوە، حکوومەتی نێودەولەتی ( لەروانگەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە) رۆلێکی شەرانگێز دەبینێ.

لەساڵی ١٩٩١ پات رۆبێرتسۆن پر فرۆشترین کتێبی نووسی ( *The New World Order*) *سیستەمی نوێی جیهانی*، لەم کتێبەدا باسی لە کودەتایەکی دەکرد بۆ جێگرتنی " دیکتاتۆری شەیتانی" کە لەسەر هەموومانەوە لێپرساوبێ.

بەگوێرەی رۆبێرتسۆن، کودەتایەکە لەساڵی ١٧٧٦ لەدایك بووە و هەر لەوکاتیشەوە بەدیار کەوت. لیستی ناوی پیلانگێرەکان، یان ئەوەتا ناسراوبوون وەیاخود نەناسراو، لەگەڵ فەرمانی کۆنی نەوە ئازادەکان، پێشرەوانی شۆرشی فەرەنسی، کارل مارکس و مارگرێت سەنگار (یەکەم سەرۆکی باوکێتی بەرنامەدانراو)، ئەدۆلف هیتلەر، خێزانی رۆکفیلەر، هێنری کیسەنجەر، کۆمیتەی سێ لایەنە، دانەرانی ئەدەبی نوێ، بەرێوەبەرانی دەزگاکانی دارایی جیهانی، دیزاینەرەکانی پارەی دۆلاری ئەمەریکی، زبیگنیو برزێزنسکی، و هەروەها ئەندامانی ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە (کە خزمەت بە بۆردەکەیانەوە دەکەم).

کاتێ ئەم دیکتاتۆرە دەسەلاتی هاتە دەست هەولی کۆنترۆلکردنی هەموو لایەنەکانی ژیانمان دەدا. هەموو چالاکییەکانی مرۆڤایەتی لەرێگەی مانگە دەستکردەکانەوە دەخرێتە ژێر چاودێریکردن. هەموو پیاو و ئافرەت و منداڵێك دەبێ ناسنامەی نێودەولەتی لە گیرفان

هەڵبگرێ. ئازادی ئایینی دەبێ هەڵبوەشێنرێتەوە، و هەروەها مافی هەڵگرتنی چەکی تایبەتی کۆتایی پێدێت. هەرکەسێك وتارێك یاخود قسەیەکی ناڕاست و دروستی سیاسی بکات دەبێ لە دادگایەکی جینایەتەوە دادگایی بکرێت، لەوەیە لەڕێگای یاسای ئیسلامییەوە بێت. هیچ شتێ نەدەکرِدرێت وەنە دەفرۆشرێت بێ وەرگرتنی ڕەزامەندی دەسەڵاتە جیهانییەکانەوە. منداڵەکان دەبێ لەکاتی لەدایك بوونیانەوە فێربکرێن گوێڕایەڵی سەرکردە شەڕانگێزەکانیان بن، هەروەها سوپای ئەمەریکا پێویستە لەلایەن ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە فەرمانی بەسەردابسەپێنرێن بۆ داگیرکردنی ئیسرائیل. ڕۆبێرتسۆن وتی: "دوو سەد ساڵ پێش ئێستاکە، زاراوەی ' سیستەمێکی نوێی جیهانی' کۆدی ئەو کەسانە بوو کە ئارەزووی ڕووخاندنی عەقیدەی مەسیحیان هەبوو... خۆزگەی شوێنگرتنەوەی ئەمە دەخوازن لەگەڵ دیکتاتۆرییەتێکی سۆشیالی جیهانی ناوخۆییەوە". ڕۆبێرتسۆن وتوویەتی بەشێوەیەکی سروشتی، بارەگای سەرەکی ئەم دیکتاتۆرە جیهانییە دەبێ لەناو نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بێت.

کاتێ ڕۆڵی باڵوێزی وڵاتیان لەنێو UN پێسپاردم، باشترین ڕێگا بۆ بێدەنگکردنی ئەم ڕەخنەگرانە کاراترکردنی ئەم ڕێکخراوەیە بوو. لەوە تێنەدەگەیشتم بەشێکی زۆری ئەم ڕەخنەگرانە بەرژەوەندییان لەگەڵ بەرزبوونەوەی توانستی UN نەبوو. بە بۆچوونی ئەوان، من کەمترم لەوەی ببمە دیپلۆماتکارێك کە پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا بکەم—بەمانایەکیتر- من تەنها پارێزەرێکی شەیتان بووم. بەنێو وڵاتاندا گەشتم دەکرد بۆ پێناسکردنی پلانەکانم بۆ چاکسازی UN، زۆرجار خۆم وەك بەرگریکارێك دەبینییەوە بۆ ڕەواندنەوەی ئەم هەڵە لێك تێگەیشتنەی ڕەخنەگران و ئەوانەی پرسیار لەبارەی داهاتووی UN دەکەن. منیش دەموت، نەخێر، UN توانای سەپاندنی باجی داهاتی جیهانی نییە، دەسەڵاتی فەرمانکردنی بەسەر هیچ وڵاتێکەوە نییە بۆ بەرپابوونی جەنگ، بەرنامەی دەستبەسەرداگرتنی چەك و تەقەمەنییەکانمانی نییە، هەوڵی بەرپاکردنی کودەتای نییە بۆ هەڵوەشاندنەوەی سەرمایەی تایبەت، نیازی بەگەڕخستنی کۆمەڵێك هەلیکۆپتەری ڕەشی نییە بۆ ئەوەی بەشەو بەسەر ئاسمانی شارەکانی ئەمەریکا بفڕن، و هەروەها هەرگیز بیری لە دەستبەسەرداگرتنی جیهان نەکردۆتەوە.

ئەو بیرۆکەیەی کە گوایە UN هەوڵیداوە یاخود هەوڵدەدات بۆ دەستبەسەرداگرتنی ولایەتە یەکگرتووەکان بەڕاستی بیرۆکەیەکی گاڵتەجاریانەیە. دەسەڵاتی UN بەتەواوی بریتییە لە توانای ئەندامەکانی، بەمەش خزمەتکارییە نەوەك گەورەیی. لەبەرئەوەی UN

خاوەنی هیچ  هێزێکی سەربازی بەخۆی نییە، هیچ دەسەڵاتێکی دەستگیرکردنی نییە، و هەروەها مافی باج وەرگرتن و ماندێتی ڕێکخستن و توانی بەتاڵ کردنەوەی پەیماننامەکانی نییە. کۆبوونەوە گشتییەکەی دەسەڵاتێکی کەمی هەیە. ئەنجوومەنی ئاسایش، بەلایەنی کەم دەسەڵاتی تیۆری هەیە بۆ فەرمانکردن بەسەر کردارەکان، بەڵام ناتوانێ بەبێ ڕەزامەندی هەر پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی هیچ هەنگاوێکی پڕاکتیکی بنێ. جا من دەپرسم مەترسی ئەم ڕێکخراوەیە (UN) لەکوێیە؟

لەم نێوەندەشدا، بەرنامەی خۆراکی جیهانی UN ساڵانە خواردنی بۆ نزیکەی ٩٠ ملیۆن خەڵك دابیندەکات، کۆمیسیاری باڵای UN تایبەت بە مەسەلەی پەنابەران پارێزگاری لە ژیانی بێ ماڵ و حاڵەکانی جیهان دەکات، ڕێکخراوی منداڵانی جیهانی UN دەستی بەهەڵمەتی کۆتایی پێهێنانی ژنهێنانی  بەزۆری منداڵ کردووە. ڕێکخراوی UNAIDS هەڵمەتێکی جیهانی دەستپێکردووە بۆ زاڵبوون بەسەر HIV/AIDS، و هەروەها سندووقی UN بۆ دانیشتوان، یارمەتی ڕێکخستنەوەی خێزانەکان و مانەوەی دایکان و گەشەکردنی منداڵ بەتەندروستییەکی باش  لە زۆربەی شوێنە هەژار و کەم دەرامەتییەکانی سەر زەمین دەدات. باوەڕناکەم قۆشمەچییەکی کارامە بتوانێ دیمەنێکی شەرمەزارتر نیشانبدات. هەوڵێکی زۆرمدا بۆ پاککردنەوەی ئەم کۆمەڵەیە لەنێو لیستی UN.

ئەمانە سنوور بەزاندنی کۆمەڵەی گشتی UNە بەجۆرێك سەرنجی ڕەخنەگرتن لەلای موحافیزکارەکانەوە بۆلای خۆی ڕادەکێشێ، بەڵام ئەگەربێتو هەڵێکی گونجاو هەبێ بۆ وروژاندنی سۆزی مەسیحییە باڵ ڕاستەکان، ئەوا کۆنفرانسی چوارەمی جیهانی بوو کە لە پەکینی پایتەختی چین لەساڵی ١٩٩٥ سازدرا. کۆنفرانسێکیتری UN هەبوو لەسەر چاکترکردنی بارودۆخی ئافرەتان، کە شیوعیەتی چینی میوانداری کردبوو، تیایدا خانمی یەکەمی وڵات هیلاری کلینتۆن و باڵوێز مادلین ئۆڵبڕایت بەشدارییان تێداکردبوو.

لەم هەفتانەی کە تیایدا ئەم کۆبوونەوانەیان تێپەڕدەکرد، زانایانی کۆڵەمنی (columnists) و پێشکەشکارانی بەرنامەی تەلەفزیۆنی داوایان دەکرد بەوەی کە پێویستە شاندی ئەمەریکا هەوڵی دووبارە پێناسکردنەوەی ئەرکی دایکایەتی و باوکایەتی و خێزان و جێندەر بدەن، هەروەها گەڕان بەدوای یەکسانی نێوان پیاو و ئافرەت لەهەموو نووسینگە و شوێنی کارکردنێکەوە، هەروەها ئەم کۆنفرانسە داوا لەدایك و باوکان دەکات بۆ دانانی سەعاتی یەکسان بۆ منداڵەکانیان و چاودێریکردنیان. ڕاپۆرتێك لەلایەن کۆڕگەی جیهانی

سەربەخۆیی موحافیزکارەکانەوە دەگێڕدرا، ئەوەی خستۆتەڕوو کەوا پلانی ئێمە بۆ فرۆشتنی رای گشتی جیهانە لەسەر یەکسانی یاسایی نێودەوڵەتی "پێنج جێندەرەکان" (رەگەزی جیاوازی نێر و مێ، هاورەگەزی نێر و مێ، نێرەموك)، لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەشمان پێدەسەپێنرێ کەوا بیر لە پاڵپشتکردنی جێندەری شەشەم دەکەینەوە، ئەمەش زۆر شوومە بۆ روودانی وەك (هەموو رەگەزێکی شەهوانی). هەروەك راپۆرتەکە رایگەیاندبوو، ئەنجامەکەی ئەوەی کە " تێگەیشتنمان بۆ زەواج و یاسای تایبەتی بەخشراو بۆ مندالآنی لەدایکبووی ئەم زەواجە لەلایەن ئەخلاقی سەپێنراوی فێمنیستە رادیکاڵەکانەوە سەراوگێرکراون". جایمس دۆبسۆن، ئەو کەسەی کە پەخشی رادیۆیەکەی دەگاتە زیاتر لە ملیۆنان گوێبیستی نێو وڵاتەکانەوە، ناوی لەم کۆنفرانسە نابوو "گەورەترین هەڕەشە بۆسەر خێزان کە تاوەکو ئێستاکە لەمێژووی جیهان روویدابێ".

لەگەڵ بوونی رێکخراوی ئافرەتانی ئەمەریکا، "هیلاری رۆدهام کلینتۆن، بەگەشتێکی ئاسمانی چووە 'کۆنفرانسی ئافرەتان' کەتیایدا سەرنشینی فرۆکەکە پڕ بوون لە ئافرەتانی مالوس (ئەو ئافرەتەی لەرووی سێکسییەوە سەرنجی ئافرەتانیتر رادەکێشێ. و) و فێمینیستە رادیکاڵەکان". لەراستیدا منیش لەو گەشتە لەگەڵی بووم. لەگەڵ ئەمەشدا، پێشینەی (اولویات)ی یەکەمی ئێمە و زۆربەی شاندەکە سۆز و سەرنجی رەخنەگرە موحافیزکارەکان نەبوو، بە راشکاوانە بڵێین: بەتایبەتی لیبراڵە هاوکارەکانمان. زۆر بە دوای مافی ئافرەت و کچان گەڕاین تا دەستمان کەوت بۆئەوەی داهات و مافی یەکسانیان شانبەشانی پیاوان هەبێ لەبواری پەروەردە و خوێندن و تەندروستی، و هەروەها بەشداریکردن لە ژیانی ئابووری کۆمەڵگاکانیان و ژیان بەسەربردنی ئازادانە دوور لەبوونی هەڕەشەی توندوتیژی. بۆ دامەزراندنی رێککەوتنی گشتی لەسەر ئامانجەکانیان. لەسەرووی ئەمانەشەوە نوێنەرانی کاسۆلیکی و موسڵمانانمان دڵنیاکردەوە لەداواکردنیان بۆ رازیبوون لەسەر ئەو سیاسەتانەی کە پێچەوانەی بیروباوەڕ و ئەخلاقی ئایینییەکانیانەوە دەوەستێ—وەك قەناعەت پێهێنانیان لەسەر بەجیهانیکردنی مافی یاسایی لەباربردن. کۆنفرانسی پەکین تەنها کۆنفرانسێك بوو و بەس، بەڵام وەڵام و چارەسەری بۆ نیوەی دانیشتوانی سەر زەوی دروستکرد، کە زۆربەیان رووبەڕووی ریسوایی و توندوتیژی جیاوازی رەگەزی ببوونەوە لەو ژینگەیەی کەتیایدا دەژیان. زۆر شانازی بەخۆم دەکەم کەلەم گەشتەدا سەرۆکایەتی شاندی وڵاتم کرد. جایمس دۆبسۆن، بەپەرۆشییەکی کەمەوە، وەسفی کارەکەی دەکرد بە " کاغەزی پوولەکەی شەیتان".

پێش ئەوەی وەك باڵیۆزی وڵاتەكەم لە UN كاربكەم، وای بۆدەچووم، ئەخلاق لە مەسەلە جیهانییەكانەوە بەدەوری كێشەی شەڕ و ئاشتییەوە، سەربەخۆیی و ستەمكاری، پێشكەوتن و هەژاری دەسوڕێتەوە. لەساڵانی نۆهەتی ١٩٩٠سەدەی رابردوو دۆزەكان بە دەرەجە یەك وەك كەسی وتایبەتەوە سەیردەكران—لەبارچون، قەدەغەی سكپڕی، رۆڵی جێندەری، مافەكانی منداڵان، و هەروەها ئاراستەكانی سێكسی—خۆی لەنێو قۆناغێكی نێودەوڵەتییەوە دۆزییەوە. لەنێو ئەم پرۆسەیەدا چالاككەرانی ئەمەریكی لەهەردوولا باڵی چەپ و راست دەستیانكرد بەتاوانباركردنی یەكتر و هەوڵدان بۆ سەپاندنی بەها ئەخلاقییەكانی خۆیان بەسەر هەرتاكێكی ئەمەریكی بەمەش هۆیەك بوو بۆ ناشرینكردن و زڕاندنی ناوبانگی وڵات لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. هەروەك بەشێوەیكی گشتی لەنێو دونیای سیاسەتدا بەم شێوەیەیە، پاڵپشتیكردنی توندی لایەنێك یارمەتی بەشەرعی كردنی بابەتەكانی توندڕەوەكانی لایەنەكەیتری دەدا. لێرەوەش باڵی راستی سیاسی هۆشداری دایە فێمینستە سۆسیالە عیلمانییەكان بۆ خۆ بەرێوەبردن، لەلایەكیتریشەوە باڵی چەپی سیاسی هۆشداریدا بە مەسیحییە فێندەمێنتالیستەكان بۆ رەخساندنی مامەڵەكردن لەگەڵ ئاریشەی راستەقینەی جیهانییەوە.

هەردوو باڵی راست و چەپ هەوڵیاندەدا بۆ پەیداكردنی هاوپەیمانییەتەكان. موحافیزكارەكان هەڵسان بە پەیوەندیكردن بەهێزەكان لەیەك كاتدا بە موسڵمانەكان و هێزەكانی ڤاتیكان، هەروەها لیبراڵییەكان دەستیانكرد بەرێكخستنی پەیوەندی لەگەڵ ئەوروپییە رۆشنبیرەكان و چالاككەرەكانی جیهانی سێیەم. بۆ هەر گرووپێك سەرسامییەكی خۆی تێدایە. موحافیزكارەكان پەرۆشن بۆدەستكەوتنی لایەنی موسڵمانەكان لە ئیدانەكردنی لەباربردن، و هەروەها نێربازی بەمەش ئەم كارانە لەدەوری جیاوازییەكانیان دەخولێتەوە كە پەیوەستە بە رێكخستنی زەواج و فرە ژنی. لیبراڵییەكان پەرۆشن بۆ رەخنەگرتنی ئاشكرای هەندێ كرداری رەتكراو وەك خەتەنەكردنی ئافرەتان هەندێجار هاوپەیمانان پێشبینی ئەو كارە لە وڵاتە نوستووەكان بە كەم وەردەگیرێن، پێشنیازی ئەوە دەكەن لەبری ئەمەوە تەركیز بكەنە سەر دادگەری ئابووری.

گفتوگۆكانی نێوان باڵی راست و چەپ بەهۆی جوێندان و زێدەرۆیی و تەكتیكەوە گەرمی بەخۆیەوە بینییەوە. من بەشبەحاڵی خۆم لەزۆرێك لەپۆستەكانی موحافیزكارەكان نارازیم. كاتێ لە حكوومەت خزمەتم دەكرد، هەوڵی زۆرم دەدا بۆ پێشكەشكردنی زیاتری پارە و

یارمەتی بۆ فێربوونی تەواوی زانیاری لەبارەی AIDS/HIV بەرنامەکانی تەندروستی منداڵ و دایك، و هەروەها پلانی خێزانی نێودەڵەتی دەدا. من لێرەوە بەرهەڵستی ئەو قەیدانە دەکەم کە سەرۆك بۆش هەیەتی لەوەتەی دانانی ئەم پرۆگرام و هەوڵانەی لەلایەن موحافیزکارە دیندارەکان—جا کاسۆلیکی بێ، پرۆتستانتی، یاخود موسڵمان—بۆ هان نەدان بۆ دابەشکردنی کۆندۆم. هەرچەندە من خۆم هەڵە لە ئەندامانی مەسیحییە باڵ راستەکان نابینمەوە بۆ دەربرینی بۆچوونی ئەخلاقی، هەر لەوکاتەی زۆربەی کارمەندانی سیاسەتی گشتی--بە منیشەوە—هەمان شت ئەنجامدەدەین. دەربڕینی رێسا ئەخلاقییەکان ئەوەیە کە بزووتنەوەکان هەوڵی دامەزراندنی هاوکێشە نێودەوڵەتییەکانی دەدات ئەوانەی لەبواری بزنسەوە کاردەکەن. ئەمەش بە وردی وادەگەیەنێ کە چۆن نەیاری سەربازی، بەندایەتی، چەتەیی، ئازاردان، مامەڵەی توندی ئایینی، و هەروەها جیاوازی رادیکاڵی بوونەتە نایاسایی. لەگەڵ ئەوەشدا کەچۆن مامەڵەی خراپ لەدژی ئافرەتان، بەتایبەتی توندوتیژییەکانی ناوەخۆیی وەك "زەوتکردنی مارەیی"، "تاوانی شەرەف"، هەلاتن، و هەروەها کوشتنی مێیینە لەوەیە رۆژێك بێت کەم ببێتەوە. ئەمەش مەسەلەیەك نییە کە ئێمە لەپاڵیەوە بمانەوێ بۆچوونی خۆمان بەسەر ئەوانیتر بسەپێنین، بەلاّم تەنها بۆ قەناعەت هێنانی ژمارەیەکی زۆری خەڵکە لە کۆمەڵێك شوێن بەوەی کە سیاسەتی ئێمە راستە. ئەمەدە رازیکردنە نەك سەپاندن.

هەردوولا باڵی چەپی سیاسی و باڵی راستی مەسیحی رازین لەسەر ئەوەی "بەهای ئەخلاقی" ناوەندی سیاسەتی دەرەوەی ولاّت نزیك بێتەوە. هەریەك لەوان نیشتیمانپەروەر و خاوەن هیوای بەرزن بۆ ئەمەریکا، لەگەڵ ئەمەشدا هەردووکیشیان بەم سیاسەتەوە رازین، بەلاّم بە هۆکاری جیاواز. کۆتایی باسەکە بە کۆپلە هۆنراوەیەکی ئۆلیڤەر ویندڵ هۆڵمز دێنم:

*بەرنامەیەی خودا دەستپێکی هیوا بەخش دادەرێژێ*
*بەلاّم مرۆڤ هەڵەکەی خۆی لەرێگای گۆرانی وتنەوە تێکدەشکێنێ*
*بڕوامان وایە کەئەمە چیرۆکی کۆتایی بە شکۆمەندی خودا دێنێ*
*کەچی، لە کاتی ئێستادا، لایەنەکەیتر دەباتەوە.*

باڵی راست بەجۆرێك سەیری ولایەتە یەکگرتووەکان دەکات، بەلایەنی کەم بەشێوەیەکی نموونەییەوە، وەك لایەنێکی خاوەن ئەخلاقێکی بەرز بەبەراورد لەگەڵ هەموو بەشەکانیتری جیهان. بەبۆچوونی ریتشارد لاند، بیرمەند و جێبەجێکاری کۆمەڵەی باشووری مەعمەدانی (Baptist)، پەندێکی هەیە و دەڵێ، " ئێمە هیچ کاتێك نەتەوەیەك نەبووینە و ناشبینە

نەتەوەیەك بە مانا سادە و ساكارییەكەی خۆیەوە. ئێمە لەزۆر رووەوە تاكین. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كە ئێمە نەتەوەیەكین خودای پەروەردگار هەڵیبژاردبین یاخود جێنشینی ئیسرائیل بین. ئەوە ناگەیەنێ كە خودای پەروەردگار پەیوەندییەكی باشی لەگەڵ خەڵكی ئەمەریكیدا هەیە. یاخود، مانای ئەوە ناگەیەنێ نەتەوەكەمان هێشتاكە دڵ و گیانی ئەژدادی پیوریتانییەكانیان لەنێو دڵیانەوە ماوە وەك، 'شارێكی سەر بەرزە گردێكەوە' ببیننەوە".

بەگوێرەی لایەنانی باڵ راست، خەوشەكانی ئەمەریكا بەشێوەیەكی سەرەتایی لەبواری هەڵسوكەوتی كەسییەوە لەمانە خۆی دەبینێتەوە: دیمەنی رووتی سێكسی، كاری سێكسی لەگەڵ هاورەگەز، و هەروەها دووركەوتنەوە لەبەهاكانی نەریت و كلێسەوە. حەزدەكەن رەخنەكانی رۆڵی نێودەوڵەتی ئەمەریكا ببینن، بەتایبەتی ئەم رۆڵانەی كە لەژێر ئیدارەی سەرۆك جۆرج دەبلیو بۆشەوە دەردەچن بەوەی كە یارمەتی پێشكەش بە دوژمنەكان دەكات و دڵنەوایش بۆ هێزە شەڕانگێزەكان دەبەخشێ. بە بڕوای من هاوچوونێك لەنێوان فەندەمێنتاڵی ئایینی و نیشتیمانپەروەرە براوەكان هەیە بەجۆرێك هەموو مێژوو لەهاوێنەی تەسكی ئەمەریكییەوە سەیردەكەن. هەردوو ئەدگار لەرێگای خولیای دڵنەوایی و برسی وەلامە راست و دروستەكان لەسەر دروستكردنی ئارامی و وێنەیەكی دیاری جیهان هاندەدرێت.

هەمان تێنویەتی دڵنیابوون لەوەیە لە لایەنەكەیتری چەپكەوە بدۆزرێتەوە لەنێو ئەو خەڵكەی كەوا تەركیز دەكەنە سەر ئەو خەوش و كوفرەكان كە لەنێو مێژووی ئەمەریكادا هەن. بەلایەنی، رای گشتی جیهانییەوە، جەنگی سارد پێشبڕكێیەكی نادیاری ئەخلاقی بوو بۆ راكێشانی دەسەلاتەكان لەنێوان هەردوو لایەندا لەرێگای دووڕوویی و سەربازگەری و دەستێوەردانی توندی لەكاروباری یەكترەوە لەوەی ململانێیەكی پێوستی ئەخلاقی بێ بۆ زاڵبوون بەسەر هەیمەنەی كۆمۆنیزمی. ئەمەش لەوەیە لەبەرئەوە بێ كەوا من خەڵكی شوێنێكم تیایدا كۆمۆنیزمی بالادەستە، و هەروەها ئاراستەیەك دەدۆزمەوە بۆ دەستنیشانكردنی هەڵەكانی سیاسەتەكانی ئەمەریكا. هەڵەكان بەدڵنیاییەوە ئەنجامدەدرێن. بەلام سەركەوتنی ئەخلاقی رۆژئاوا بەبەراورد لەگەڵ یەكێتی سۆڤیەت بەجیدییەوە نابێ ببێتە جێگای پرسیاركردن. من وای بۆدەچم كە ئەمە كارێكە بەم شێوەیە ئاسانە لە هەڵوەستە وەرگرتنی باڵی چەپ لە جیهانگیری و بەكارهێنانی هێز. بەزەییم لەگەڵ پەیوەندی ئایینی باڵ چەپەوە پیادێتەوە لەبارەی ئەم بۆشاییە گەورەیەی نێوان چینی دەوڵەمەند و هەژارەكان. من بڕوام وایە راستییەك هەیە كەدەبێ هەموو كەس بیزانێ ئەویش بۆچوونیانە بۆ ئەمەریكا كە

کۆمەڵگایەکی سنووردراوە بۆ دوورخستنەوەی چاوەکانی خاوەن پێداویستی لەوەی کە وڵاتێك بێ لەسەر بەرزەگردێکەوە بنیاتنرابێ.

بەتایبەتی، لە هەڵبژاردنە تاڵە نەتەوەییەکانی ساڵانی ٢٠٠٠-٢٠٠٤، پێشکەشکارانی دەزگا راگەیاندنەکان زیاتر رۆڵی ئایینیان لە فراواکردنی دابەشبوونە سیاسی و کلتوورییەکانی لەنێو ئەمەریکا دیاری دەکرد. بیرکردنەوە نەریتییەکان پێشنیاری ئەوەدەکەن کەوا ئەم دابەشبوونانە بەردەوام لەگەشەکردندانە. ئەگەر ئەمە روویدات، ئەوا تاگەورە دەبم پێناسکردنی ئەمەریکا زیاتر زەحمەتتر دەبێ. من هەر ئێستاکە زۆر لە گفتوگۆیە سادەیەی دابەشبوونی نێوان بەناو ولایەتی "سوور" و ولایەتی "شین" تووڕەبوومە، هەروەك ئەوەی ئەمەریکییەکان بەڵێنی دڵسۆزی خۆیان بۆ ئەم سێ رەنگەی ئاڵایە لەهەمان کاتدا دەرنەبڕیوە. زۆر داخ لەوە دەخۆین کەوا کلتۆرێکی سیاسیمان گەورە کردووە کە پاداشت و یارمەتی توندڕەوکان دەکات، کلتوورێك بەجۆرێك باوەڕە دۆگماییەکان وەك چاکە و کردنەوەی ئەقڵە لاوازەکان تێبینی دەکاَت، وادەکات هێرشە ئابڕوبەرەکان گفتوگۆیە کراوەکان لەئەرز بدات. ئایا زیاترمان لەوە هەیە؟ پێویستیمان بە ژەمە دەرمانی یەکگرتنەوە هەیە. لەسەرمان پێویستە پێشبینییەکانی جۆن وینترۆپ بەبیرخۆمان بێنینەوە، " هەموو جیهان چاویان بڕیوەتە سەر ئێمە" هەروەها بە پرسیارکردنی ئەوەی کە، " ئایا ئێمە چ جۆرە ئەمەریکایەکمان دەوێ بۆئەوەی سەیری جیهان بکات؟"

# (٧)

## " لەبەرئەوەی ئەمە راستە"

ئەمەریکییەکان خۆیان بە خەڵکانی بەخشەندە حیساب دەکەن، ئەمەش راستە چونکە زۆربەی رێکخراوە نێودەوڵەتییە خێرخوازییەکان بۆ جێبەجێکردنی کار و بەرنامەکانیان پشت بە ئەمەریکییەکان دەبەستن. بەڵام حکوومەتی ئەمەریکا رەزیلە، لە مەرتەبەی پێش کۆتایی دێت لەنێوان ئەم بیست و دوو دەوڵەتە پیشەسازییەی کە پشکی سامان و داهاتەکانیان بۆ گەشەکردنی وڵات خەرج دەکەن. لەساڵی ٢٠٠٢ لەو لوتکەیەی کە لەسەر هەژاری جیهان بەسترابوو، سەرۆك بۆش رێککەوتننامەی مونتێری پشتڕاستکردەوە بەوەی کە لەسەر دەوڵەتان پێویستە رێژەی ٠,٧٪ ی داهاتیان تەرخان بکەن بۆ یارمەتیدانی دەوڵەتەکانیتری خاوەن پێویستی. تاوەکو ئێستاکە پێنج دەوڵەتی ئەورووپی پابەندن بەم رێککەوتنە و بەشە داهاتی دیاریکراوی خۆیان دەنێرن بۆ وڵاتە هەژارەکان هەروەها شەش دەوڵەتیتریش خشتەی کاتی خۆیان داناوە بۆ پابەندبوونیان(*). لەگەڵ زیادبوونی ئەم بڕەیە، ئێستاکە ئەو پارەیەی کە ولایەتە یەکگرتووەکان دەیبەخشێ دەگاتە ١٦،٠٪ یاخود ساڵانە ٤٠ ملیار دۆلار.

---

(*) ئەم پێنج دەوڵەتەی کە رێژەی ٠.٧٪ی داهاتەکەیان دەبەخشن ئەوانیش: سوید، نەرویج، دانیمارك، هۆڵەندا، و هەروەها لۆکسۆمبۆرگ. کەچی بەریتانیا، فنلەندا، ئیسپانیا، فەرەنسا، ئیرلەندا، و هەروەها بەلژیکا، بەرنامەیان داڕشتووە بۆئەوەی بەشداربن لەم رێککەوتنەیە. ئابووریناس، جێفری ساچ ئیشارەت بەوە دەدا کە" هەرچەندە ئەمەریکا ساڵانە ئەم رێژەیە بە وڵاتە هەژارەکان دەبەخشێ، بەڵام لەلایەکیترەوە کەرتە تایبەتییەکان بۆشایی لەنێوانیان دروستدەکات. بەڵام لەڕاستیدا، رێکخراوی هاریکاری ئابووری و گەشەپێدان ئەوەی خەملاندووە کەوا دامەزراوە تایبەتی و رێکخراوە ناحکوومییەکان ساڵانە ٦ ملیار دۆلار وەك یارمەتی نێودەوڵەتی دەبەخشن کەدەکاتە ٠،٠٥٪ی بەرهەمی نەتەوەیی ئەمەریکیی (ب.ن.ئ) لەم رووەشەوە، کۆی

ئەمەش هەمیشە بەمجۆرە نییە. دوابەدوای جەنگی جیهانی دووەم، ئەمەریکا دەستیکرد بە گۆڕینی ڕەوتی مێژوو ئەویش بە یارمەتیدانی ئەوروپای پارچە پارچەکراوی بەهۆی شەڕی جیهانی دووەمەوە بۆ ئەوەی دووبارە خۆی بنیاتبنێتەوە. پلانی مارشاڵ نموونەیەکی کلاسیکی بوو بەوەی " کاری باش بە هەوڵدانی باش بەدەست دێت". ئەوروپا دەستیکرد بەبنیاتنانەوە، ئەمەریکاش سوودی لە هاوکاری بەهێز و گەشەکردووی ئەوروپای ڕۆژئاوا وەرگرت. ئەمە تەنها دەستپێکێك بوو. لەساڵی ١٩٤٩ سەرۆك ترۆمان هەڵسا بە داڕشتنی بەرنامەیەك بۆ یارمەتیدانی ئەو دەوڵەتانەی کە بەڕاستی پێویستیان بە یارمەتیدان هەیە، گرنگ نییە لەچ شوێنێکی ئەم زەمینە بن. وتی، " ئامانجمان دەبێ یارمەتیدانی نەتەوە ئازادەکانی جیهان بێ، لەڕێگای هەوڵەکانی خۆیانەوە، بۆ بەرهەمهێنانی زیاتری خواردەمەنی، پۆشاك، خانووبەرە، و هەروەها هێز و توانا. بەمەش تەنها بەیارمەتیدانی بەدبەختترین ئەندامەکانی بۆئەوەی مرۆڤایەتی بتوانێ ژیانێکی خۆش بەدەستبێنێ کەمایەی خۆشی و ڕازیکردنی هەموولایەك بێ."

دەستپێکەکەی ترۆمان لەلایەن سەرۆك جۆن کەنێدیییەوە بایەخی زۆری پێدرا و بەردەوام بوو، کە خۆی ئاژانسی ولایەتە یەکگرتووەکانی دامەزراند بۆ پێشکەوتنی نێودەوڵەتی و دەستەی ئاشتی و هاوپەیمانییەتی بۆ گەشەکردن. لە ئاهەنگی دەستبەکاربوونیدا، جۆن کەنێدی بەڵێنی پابەندنبوونی ئەمەریکای بەهەموو جیهاندا دەرکرد بەوەی کە" ئەمەریکا ئامادەیە یارمەتی هەموو نەتەوەیەك بکات ئەوانەی لە ژێر کوخ و لادێیەکانی ئەم جیهانە دەژین بۆ شکاندنی پەیماننامەکانی ڕەزیلی بەکۆمەڵ و هەژاری... گەورەترین هەوڵەکانمان بۆ یارمەتیدانیانە، لەهەر کاتێکدا بێ--- نەك لەبەرئەوەی کەوا کۆمۆنیستەکان ئەم هاوکارییە دەکەن، نەك لەبەرئەوەی ئەمەریکا پێویستی بە دەنگی ئێوەیە، بەڵکو لەبەرئەوەیە چونکە ئەمە ڕاستە".

یارمەتییە دەرەکییەکان لەسەرەتاوە لەلایەن هەردوو پارتە سەرەکییە سیاسییەکان پاڵپشتی لێدەکرا، بەڵام هەرزوو ڕەخنەگرەکان دەستیان بە قسەکردنکرد. زاراوەی بەرنامەی " بەلاش" پێچەوانەبۆوە بۆ پشت بەخۆبەستنی بەهای ئەمەریکی. بەمەش خێرکردن بە مانا

---

یارمەتییە نێودەوڵەتییەکانی ئەمەریکا دەگاتە نزیکەی ٢١،٠٪ی (ب.ن.ئ)—کەچی هێشتاکە لەنزمترین مەرتەبەی دەوڵەتە کۆمەك بەخشەکاندایە."

فراوانییەکەی، تەنها بۆ هەژارە شایستەکانە، کەچی هەموو هەژارێك شایستەی ئەم یارمەتییە نییە. لەهەر حاڵەتێکدابێ خێرکردن دەبێ سەرەتا لە نزیکەکانەوە دەست پێبکرێ. بۆچی ئەو پارە تەرخانکراوەی کەبۆ یارمەتیدانی خەڵکانی دەرەوە دانراوە لەکاتێکدا هەمان پارە بەکاردەهێنرا بۆ ناساندنی پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەمەریکا؟ هیچ سیاسییەك ئەم نیگەرانییانەی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارنەهێناوە زیاتر لە رۆناڵد ریگان نەبێ. لەساڵی ١٩٦٤ لە وتاری دەستکردنی بە کاری خۆی وەك رەمزێکی پارێزگاران، ریگان داوای ئەوەی کرد کەوا یارمەتییەکانی ئەمەریکا بۆتە هۆی "کڕینی یەختێکی دوو ملیۆن دۆلاری بۆ (سەرکردەی ئەسیوبی) هیلا سیلاسی... پۆشاکێك بۆ مردوونێژەکانی یۆنان، هێنانی ژنی زیادە بۆ لێپرسراوانی حکوومەتی کینیا، و هەروەها هەزران تەلەفزیۆن بۆ شوێنێکی بێ کارەبا". ریگان جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کەوا یارمەتییەکانی ئەمەریکا بۆتە هۆی فراوانبوونی بیۆرۆکراسە دەرەکییەکان، بەمەش نووسینگەی حکوومەت نزیکترین شتە بۆ ژیانی هەتا هەتایی کە لەسەر ئەم زەمینە دەیبینین. هەروەها "وتاری گەورە" هەمیشە نابێتە هۆی گرتنی راستییەکان، بەڵام هیچ کەسێکی باشتر نییە بۆ گۆڕینی نیوەی راستییەکان بۆ خورافیاتێکی بەردەوام. هەروەك سەرۆك، کە بەردەوام یارمەتییە دەرەکییەکانی زیاد دەکرد بەڵام هیچ شتێکی رەسمیشی نەدەکرد بۆ دەستبەرداربوونی ئەم کاریگەرییانەی پێیەوە ناسراوە. هەر لەوکاتیشەوە ئەم ستیریۆتایپە بەباشی دروستکراوە: ئەم بەرنامانە هیچ شتێکی بەسەرکەوتوویی ئەنجامنەداوە، هانی پشت بەخۆبەستنی دەدا، هەروەها پارەیەکی زۆری باجدەرەکانی ئەمەریکای لەدەستدا.

ئەمەیان راستە بەوەی هەندێ لەو پرۆژە یارمەتییانە زۆر بە خراپی بەڕێوە دەبردرێن، هەندێکیتریش ئامانجیان رازیکردنی حکوومەتەکانە بۆلای باڵی راستی پێشبڕکێی نێوان رۆژئاوا و رۆژهەڵات لەوەی باشترکردنی ژیانی ئەو کەسانە بێ کە بێبەشن لەهەموو پێداویستییە سەرەتاییەکانی ژیان. ئەو یارمەتییەی کە تۆمار نەکراوە زۆر باشترە لەوانەی کە لە راگەیاندنەکانەوە بانگەشەی بۆ دەکات. لەنێوان ساڵانی ١٩٦٠ و تا ناوەڕاستی ساڵانی ١٩٩٠ی سەدەی رابردوو ئەو کەسانەی پێویستیان بە یارمەتی هەبوو لە وڵاتە هەژارەکان لەنێوان تەمەنی بیست ساڵی دابوو. هەروەها رێژەی مردنی منداڵان بۆ نیوەی رێژەی سەرەتایی خۆی کەمبۆوە. ئەم کوتانە هەرزانە بووە هۆی رزگارکردنی ژیانی دەیان ملیۆن کەس. نەخۆشی پێست بەرەو نەمانچوو و شەلەلیش لەسەر لێواری نەماندابوو. کۆمەکییە دەرەکییەکان بووە

هۆی یارمەتیدانی زۆربەی نەتەوەکانی کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەمەریکای لاتینی و ئەفریقیا بۆئەوەی لەهەموو لایەنەکانی ژیان گەشە بەخۆیان بدەن، لەگەڵ تێپەڕاندنی نزیکەی سەدان ملیۆن خەڵك لە سنووری هەژاری.

ئەم هەموو دەستکەوتانە دەبوایە کاریگەرییان زۆربێ، بەڵام لەڕاستیدا نەیانبوو. لەوسالانەی کە لەحکوومەت کارم دەکرد، کۆمەکە دەرەکییەکان بەجۆرێك زۆربوو ببووە کارێکی میللی وەك کێچ بەربڵاوبێوە. نەدەتوانرا زاراوە "کۆمەکی دەرەکی" بەناداری وەك خیانەتکردن بەکاربهێنرێت. بووە هۆی دوورخستنەوەی ئەم دەستەواژەیە لەنێو فەرهەنگی وشەکانم لەجیاتی ئەو زاراوەی " پاڵپشتی ئاسایشی نەتەوەییان" دانا. ئەمە لەوەیە بەرگریکردنەکە کەمبکاتەوە بەڵام زۆریش نییە. لەگەڵ کەمبوونەوەی بەردەوامی بودجە و هەڕەشەکان لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتی، ئەندامانی کۆنگرێس خۆشحاڵ نین بە کۆکردنەوەی پارە بۆ پرۆژەکانی دەرەوەی ئەمەریکا. سەرۆکی کۆمیتەی فەرعی کۆنگرێس کە لێپرسراوە بەرامبەر خەرجکردنی پارەی ئەم پرۆگرامە پێی ڕاگەیاندم کەوا هیچ جارێك دەنگی بۆ یاسای کۆمەکی دەرەوە نەداوە، مانای وایە هەرگیز دەنگیشی بۆنادات. سەرکردە دیارەکانی کۆماری زۆر بەشانازییەوە قسەدەکەن و هیچ حەزێکیان نییە بە سەردانیکردنی وڵاتانی دەرەکی. زۆربەی هەڵبژێردراوەکان قەناعەتیان بەوە هەیە کەوا کۆمەکی دەرەکی " بەلاش" نزیکەی سەدا ٢٠٪ بودجەی فیدراڵی بۆخۆی قوتداوە، لەبری ئەوەی سەدا ١٪ ببات. من وەك وەزیری دەرەوەی وڵات، زۆر بە ڕاشکاوانە هەستم بە شەرمەزارییەکی زۆر دەکرد کاتێ سەردانی کلینك و خێمەی پەنابەران و دراوسێیە هەژارەکانی شوێنە دوورەکان دەکرد، لەگەڵ گەشەکردنی بەرچاوی ئابووری ئەمەریکی ئەوسا، تاکە یارمەتی خێرا پێشکەشکردنی دەفتەر و پێنووسی ڕەنگاوڕەنگی بوو بەسەر منداڵانی ئەم شوێنانە.

لەکۆتایی سالانی ١٩٩٠ وتارەکانی پارتی کۆماری زۆر چاوەڕوانکراوبوون بەجۆرێك هەرگیز پێشبینی شتێکی جیاوازم نەدەکرد. بەڵام لەپڕێکا ئەوەی پێشبینیم نەکرد روویدا. لەنێوان ئەم پرسیارانەی لەیەکێك لە دانیشتنەکان کە ئاڕاستەمیان کرد، شتێکی نوێم بەرگوێ کەوت—ئێمەیان تاوانبارکردووە بەوەی کە حکوومەتەکەمان یارمەتییەکی کەمی خەڵکانی دەرەوەی ئەمەریکایان داوە. من لەوە لێڕاهاتبووم کەوا گوێم لە لیبراڵییەکان بێ کاتێ مەترسی خۆیان بەرامبەر لەناوچوونەکانی بەهۆی نەخۆشی HIV/AIDS دەربڕن، لەکاتێکدا موحافیزکارەکان پێشبینی ئەوەدەکەن قوربانییەکان تەنها خۆیان هەیە بۆئەوەی

لۆمەی بکەن. بەڵام لەماوەی ساڵانی کۆتایی پۆستەکەم، تا ئەوکات مەسیحییە باڵ راستەکان دەهاتن رەزامەندی خۆیان دەردەبڕی بەوەی وەستاندنی  ئەم نەخۆشییانە کارێکی ئەخلاقی زۆر بەرزە. چەند ساڵێك بەر لەئێستا جێسی هێڵمز هاتەلام دانی بەوەنا کەوا، " واهەست دەکەم AIDS نەخۆشییەکە توانای بڵاوبوونەوەی زۆری هەیە بەهۆی کەمتەرخەمی کرداری سێکسی و بەکارهێنانی مادده بێهۆشکەرەکان، بەمەش ئەم نەخۆشییە لەنێوان خاڵکانی پلەوپایەی بەرزەوە دەمێنێتەوە، من هەڵە بووم".

چی روودەدات؟ وەڵامەکە ئەوەیە کە ئایین دەبێتە هاوشانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا لەسەر رێگایەکی نوێ. کاتێ لەپۆستەکەم بووم، کۆمارییەکان بە " ساویلکە" یاخود "خێرخواز" بانگیان دەکردم. یەکێك لە ئەکادیمیا بەرهەڵستکارەکان بەپێکەنینەوە ئەوەیان دەووتەوە کە ئیدارەکەی کلینتۆن مامەڵە لەگەڵ "سیاسەتی دەرەوە وەك خزمەتگوزارییەکی کۆمەڵایەتی دەکات". کەچی ئێستاکە سیناتۆری کۆماری سام براون باکی کەنساسی، کە موحافیزکارێکە دەڵێ، لەسەر ولایەتە یەکگرتووەکان "پێویستە بە ژیرانە و بە سادەییەوە هەنگاوە سیاسییەکان بهاوێژێ، نەك لەبەر بەرژەوەندی ئابووری و ستراتیژی خۆمانەوە بەڵکو لەبەرئەوەی کە چ شتێ ئەخلاقییەن دەخوازێ".

ئایدۆلۆژیای باڵی راست و چەپ بەپێچەوانەی هەموو مەسەلەیەکی نێودەوڵەتییەوە وەستاون، ئەمەش راست نییە. بەتایبەتی لە مەسەلە مرۆڤایەتییەکان، بەجۆرێك موحافیزکارە دیندارەکان بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان رەچاوکردووە، هەروەها هەردوو مەسەلەکان پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە. هەردوولا تەنها بەرژەوەندییە پڕاکتیکییەکانیان ناناسنەوە بەڵکو ئەرکە ئەخلاقییەکەش بۆیارمەتیدانی ئەوانەی کە بەجیددیەوە خاوەن پێداویستین. و هەردووکیان باوەڕیان وایە کە چیرۆکی سامریە باشەکە، کە لەلایەن سەرۆك بۆشەوە لەیەکەم وتاری دەستبەکاربوونیەوە باس لێوەکرابوو، بەلایەنی کەمەوە دەبێ لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا دەنگدانەوەیەك هەبێ. ئەمەش تەنها کارێکی سەرنجڕاکێش نەبوو، بەڵکو هەلێکی مێژوویی بوو.

لەماوەی ئەم چەند ساڵەی رابردوودا گوێمان زۆر لە "تەوری شەڕانگێزی" بووە. ئەوانەی توێژینەوەیان لەبارەی کاری شەڕانگێزی دەکرد ئەم تەورەیان لە نێو هەژاری و کەمتەرخەمی و نەخۆشییەوە دەدۆزییەوە و هەروەها دیاریکردنی بازنەی نائومێدی بەجۆرێك لەنێوان دوو تا سێ ملیار مرۆڤ کە کەوتوونەتە نێو داوەکەوە. ساڵانە نزیکەی ٣٠،٠٠٠ منداڵ لەبەر نەخۆشی و برسییەتی دەمرن، ئەمەش ئەگەربێتو بەراوردی بکەین دەکاتە دە هێرشی ٩/١١ لەهەر

بیست و چوار کاتژمێردا. ملیاران خەڵك ئێستاکەش لەژێر سایەی حکوومەتەکانیان دەژین کە بەسادەترین مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤەوە ئاشنانین. ئاریشەی هەژاری و چەوساندنەوە پێویستە هۆکارێك بەس بێت بۆ ئەمەریکییەکان تاوەکو ریزەکانی خۆیان رێك بخەنەوە، ئەگەربێتو لەهەندێ مەسەلەوە یەکیشیان نەگرتەوە، بەڵام پێویستە لە خاڵە میحوەرییەکان یەکگربن. لیستی پرۆژە هاریکارییەکان زۆرن، بەڵام من لێرەوە پێشنیاری دەستپێکردنی سێ یانیان دەکەم.

یەکەمیان پاڵپشتیکردنە بۆ رێسا و پراکتیزەی ئازادی ئایینی.

دە ساڵ پێش ئێستاکە، هاوپەیمانییەکی نێوان چالاککەرانی مەسیحی و یەهوودییەکان لە ولایەتە یەکگرتووەکان دەستیانکرد بە هەڵمەتێك لەدژی چەوساندنەوەی ئایینی لە ولاتانی دەرەکی. بۆ وەلامدانەوەی ئەم هەڵمەتە کۆنگرێس رەزامەندی خۆی دەربڕی و بەم بۆنەیەوە یاسایەکی دارشت کە سەرۆك کلینتۆن واژووی لەسەر کرد، یاساکەش پێی دەووترا یاسای ئازادی ئایینی نێودەوڵەتی. ئەم یاسایە هەڵسا بە دروستکردنی لێژنەیەکی سەربەخۆی ولایەتە یەکگرتووەکان لەسەر ئازادی ئایینی نێودەوڵەتی و هەروەها داواشی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا کرد بەوەی کە ساڵانە راپۆرتێك لەسەر بارودۆخی ئازادی ئایینی لە ولاتانی جیهانی ئامادەبکات. برگەکانی ئەم یاسایە پێناسەی هەموو شێوەکانی چەوسانەوەی ئایینی و ئیدانەی بەشێکیانی دەکات بەمەش بەشێکی زۆر پێویستی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکایە، لەگەڵ ئەمەشدا والە دیپلۆماتە ئەمەریکییەکان دەکات بۆئەوەی زیاتر هەست بە ئارامی بکەن بۆ پراکتیزە و باسکردنی ئەم مەسەلەیە بکەن.

شتێکی سروشتییە بەوەی ئەمەریکییەکان گرنگی بە ئازادی ئایین بدەن، نەك تەنها لەبەرئەوەی ئەم رێسایە لەسەنتەری دیموکراسیەتماندایە، بەڵکو ئەزموونێکی باشە بۆ بریاردان لەسەر حکوومەتەکانیتر. ئەگەر حکوومەتێك رێزی کەرامەتی هاوولاتیانی خۆی نەگرت، مانای وایە رێزی کەسانیتری لا گرنگ نییە. ئەو ولاتانەی کەوا چەوسانەوەی ئایینی تێیدا بەرچاوە (وەك کۆریای باکوور، ئێران، بۆرما و سودان) و هەروەها -بەرێکەوت نییە- ئەمانە سەرچاوەی مەترسییەکانن وەك تیرۆریزم و بلاوبوونەوەی چەکی بەکۆمەڵ کوژی. ئەو بریارەی کە لە ساڵی ٢٠٠١ەوە لەلایەن حکوومەتی تاڵیبانەوە دەرچوو بە رووخاندنی هەردوو پەیکەری دێرینی بووزا لەناوەراستی ئەفغانستان هەمان شەرمەزاری بوو بەرامبەر بە رای گشتی جیهان بە دالدەدانی و میوانداریتی رێکخراوی تیرۆیستی ئەلقاعیدە. چین ولاتێکیترە بەوەی

سەرکەوتوو نەبووە لەسەر تێبینی کردنی ئازادی ئایین، بەڵام ئەم نەتەوەیە، سەرەڕای قەبارە و کاریگەرییەکەی، هەندێ زەحمەتی خستۆتە بەردەم دانەرانی سیاسی ئەمەریکا.

ئەو ساڵانەی لەپۆستەکەم خزمەتم دەکرد ئەندامانی کۆنگرێس سکاڵایان لای من تۆماردەرکرد بەوەی کە مەسیحییە چینییەکان ڕێگایان پێنادرێ ئەرکی ئایین پەرستنی خۆیان لەو کڵێسانە ئەنجامبدەن کە خۆیان حەزی پێدەکەن بەڵکو تەنها لەو کڵێسایانە ڕێگایان پێدەدرێ کە حکوومەت بە یاسای بۆیانی دیاریکردوون. بەڵێنی ئەوەم پێدان بە باسکردنی ئەم مەسەلەیە لەگەڵ بەرپرسانی پەکین، بەڵێ بەڵێنەکەم بەجێگەیاند خۆم لەگەڵ هەردوولا کۆبوونەوەم کرد لەگەڵ بەرپرسان هەروەها پیاوانی ئایینی نێو کڵێساکان(*)(*). بەڵام ئەرکەکانم لەوێ کۆتایی پێنەهات. چونکە هەندێ مەسەلەیتریشم پێشکەشکرد وەك خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ بووزییە تبتییەکان و ئەندامانی فاولۆن گۆنگ، کە ئەمەش ڕێکخراوێکی تەندروستی رۆحانییە. هەروەها وڵاتی چین م ناچارکرد بەوەی ڕێگا بەهاووڵاتیانی خۆی بدات بۆئەوەی لەلایەنی سیاسییەوە خۆیان ڕێکبخەن و یەکێتییەکی کرێکارانی سەربەخۆیان هەبێ. لەگەڵ ئەمانەشدا دیاریکردنی چارەنووسی بەندکراوە سیاسییەکان، داوام لێکردن بۆ پۆڵێنکردن سیاسەتی کۆنترۆڵکردنی دانیشتوانەکەی و دۆزینەوەی زنجیرە مامەڵەیەکی سیاسی و سەربازی بە ئاراستەی ئەخلاقی—وەك بەرنامە ئەتۆمییەکانی کۆریای باکوور، پەیوەندی ئاشتییانە لەگەڵ تایوان، دیکتاتۆرییەتی سەربازی برۆما، پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە گۆڕینی ژینگە و کەش و هەوا، و هەروەها پاراستنی ئاشتی نێودەوڵەتی. دوای چەند ساڵێتر ئەم مەسەلانە و زیاتریش هەر لە ئەجینداى ئەمەریکا و چین مابوونەوە. لەگەڵ بوونی ئەم لیستە درێژەیە، هەمیشە ئەو هەڵە هەیە کەوا مەسەلەکانی تایبەت بە ئازادی ئایینی زەرەرمەندبوونە، جا ئەگەر کاریگەرییان هەبووبێ لەسەر مەسیحییەکان یاخود ئەوانیتر. و پێویستیش نییە رووبدەن. بۆمن سەرسامی نییە ئەگەر بێتو گەشەکردنی ئایینی لە وڵاتی چین

---

(*) لە مانگی فێبرایەری ١٩٩٨، سەرۆك کلینتۆن شاندێکی لە گەورە بەپرسانی ئاییندارانی ئەمەریکای نارد بۆ وڵاتی چین بۆ دڵنیابوون لە رەوشی گرنگیدان بە ئازادی ئایینی. شاندەکە پێکهاتبوو لە: ئارسەر سشنێر لە ولایەتی نیویۆرك، ئەسقەفی کاسۆلیکی رۆمانی تیۆدۆرمیك کاریك، وە دۆناڵد ئەرگیو کاهنی دەستەکانی خواوەند و سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتیمانی ئینجیلی.

لـەم چـارەگە سـەدەیەی داهـاتوو بگۆڕێـت و دەشـبێتە زەحمـەتترین بـەڕێوەبردن دەربـارەی سەرکردەکانی وڵاتی چین.

ئەوانەی پەرۆشی ئەوەن بۆ بەرزرکردنەوەی ئاستی ئازادی ئایینی دەبێ ئەوەش بزانن کـەوا رێگای راست و هەڵە هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەیە. گۆڕانی هەتاهـەتایی لـە رازیکردنـەوە دەستدەکەوێت لەوەی لە داواکردنـە راشـکاوەکانەوە بێـت. لـە لاوس، پـەیمانگای کـارگێڕی جیهانی کە لەلایەن بۆب سیپلّ ەوە سەرپەرشتی دەکرێ رێگایەکی هەنگاو بەهـەنگاوی لـەنێو وڵاتە هەژارەکان گرتۆتەبەر لەگەڵ ستایلی حکوومەتی سـۆڤیەتی، زۆرینـەی بودیسـتییەکان، بەبێ نەریتی دیموکراتی. جەختکردنەوە لەسەرگرنگی ئازادی ئایینی لەو وڵاتانەی کە نقـوومی کێشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی بوونە. هێشتاکە گەشەی بەردەوام و بەرچاوی تێدا بەدیدەکری. هەروەها بەندییەکانی ویژدان هاتوونەتە ئازادکردن. کاربەدەستانیش راهێنراون لەسـەر ئـەوەی کە چۆن رێزی ئازادی ئایین پەرستن بگرن. سـەنتەرەکانی دیراسـات کراونەتـەوە بـۆ هانـدانی هاریکارییەکان لەنێوان ئایینە جیاوازەکان. لەلادێیەك، کاربەدەستێکی حکوومەت کە هەزاران مەسیحی ناچاردەکرد بۆئەوەی وازهێنـانی ئـایینی خۆیـان رابگەیـەنن، پـێش ئـەوەی بمـرێ، چاودێری تایبەتی لەو کڵێسەیە وەردەگرت کەپێشتر هەوڵی داخستنی دەدا.

دووەم بوار بۆ هاریکاری لەسەرتاسەری چەپکی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا پێویسـتە ململانێ هەبێ بۆ هێورکردنەوەی ئاریشەی هەژاری جیهانی. لەکۆتایی ساڵانی ١٩٩٠ زۆربەی لقەکانی ئایینی چوونە پاڵ ئیدارەی کلینتـۆن بـۆ پاڵپشـتیکردنی پلانێـك بـۆ رەشـکردنەوەی زۆربەی قەرزەکانی سەر وڵاتە هەژارەکانی جیهان. هەرچەندە کەموکوڕی هەبوو لە ئامانجەکان بۆیە دەستکەوتەکانیش پەرت و بڵاوبوونەوە. رێکخراوە لیبراڵییەکان ئەوانەی کە بۆماوەیـەکی زۆرە هەڵمەتی کەمکردنەوەی قەرزەکانیان دەکرد، لەپڕێکا خۆیان لەگەڵ سیاسییە بەهێزەکانی نێو مەسیحی باڵ راست دۆزییەوە ئەوانەی هەڵسان بە دابەشکردنی شانۆی بۆنۆ، چالاککەر و ئەستێرەی رۆکی. لایەنگرانی کەمکردنـەوەی قـەرزەکان بەرادەیـەك زیـرەکن بـۆ داپۆشـینی دەستپێکەکانیان لە نیشانەکانی کتێبی پیرۆزەوە بۆ پەنجا ساڵەیەوە "یۆبیلی زێرین" لەوکاتەی خودا فەرمانی بە ئیسرائیلییەکان کرد بـە لێخۆشـبوونی قـەرزەکان و " گەڕانـەوەی هـەموو شتەکان بۆ خاوەنەکانیان". ئەم هەنگاوە سەرەتایە دوابەدوای هەنگاوەکانیترەوە دێت، لەساڵی ٢٠٠٥ بڕیارێك دەرچوو بە رەشکردنەوەی قـەرزی هـەژدە دەوڵـەتی زۆر هـەژار کـە قـەرزاری سندووقی نەقدی نێودەوڵەتی و بانکی جیهانی بوون.

لەگەڵ ئەمانەشدا پێشکەوتنی کەمکردنەوەی قەرزەکان و هەوڵەکان بۆ زاڵبوون بەسەر ئاریشەی هەژاری هێشتاکە کەموکوڕی لە خێرایی جێبەجێکردنیەوە دەبینرێت. هۆکارێك هەیە ئەویش زۆر سەختە بتوانین ئەم خوراڤییەتە بکوژین. زۆربەی ئەوانەی بەخۆیان دەڵێن پسپۆڕ و زانا بەردەوام گفتوگۆی ئەوەدەکەن کە کۆمەککردنی دەرەکی کارێکی زیادەیە و دەبێتە هۆی ڕۆچوونی ئابووری وڵات، هەروەها چارەسەرییەکانی "حکوومەتی گەورە" هیچ کاریگەرییەکی نییە، چونکە هەژاری بۆتە بەشێکی بەردەوام و دانەبڕاوی ژیانی مرۆڤایەتی. ئەگەر بەدرێژی وەریبگرین، ئەم بیرکردنەوەیە زۆر بەئاسانی وەردەگیرێت. چەندین دەساڵی کۆمەککردن نەیتوانیوە هەژاری بنبڕبکات، ئەوەتا لەماوەی ساڵانی ڕابردوودا لە بیابانی باشووری ئەفریقیا بارودۆخەکان بەرەو خراپتر دەچن. بۆچی؟ لە هۆکارەکانی ئەم ئەنجامە ئەوەیە: ناکۆکی ئەتنیکی هەیە، شێوازەکانی ئابووری بەرەو نەمان چوونە، فاکتەرەکانی دیمۆگرافی وەك گەشەکردنی زۆری ژمارەی دانیشتوان و نەخۆشی و بەکارهێنانی سەرچاوە سروشتییەکان بەبێ سوود لێوەرگرتن. هەندێك خەڵك ئاماژە بە نەبوونی حکوومەتێکی دیموکراتی لەو ناوچەیە دەکەن، زەقترین نموونەش ڕژێمە گەندەڵییەکەی ڕۆبێرت مۆگابییە لەزیمبابۆیی. ئەوانەی لە باڵی ڕاستن لۆمەی سیاسەتی ئابووری و بازرگانی وڵات دەکەن بەوەی کە ئەم سیاسەتە لەدژی چینی هەژاران (هەژارەکانی وڵات دایە) و تەنها یارمەتی چینی دەوڵەمەندەکان دەدات. بەڵام بە بڕوای من هەموو فاکتەرێك کاریگەری خۆی هەیە بۆ لەدایکبوونی ئەم هەژارییە، بۆیە دەبێ هەموو هۆکارەکان بە پێویست وەربگیرێن.

شەڕکردن لەگەڵ هەژاری، بەدڵنیاییەوە، تەنها مەسەلەکە پێشکەشکردنی پارەی زۆرنییە بە چینی هەژاران. ئەگەر سەیری مێژوو بکەین، دەبینین باڵی چەپ بڕوایەکی زۆری وەك یارمەتی پێشکەش بە حکوومەتە دەرەکییەکان کردووە لەکاتێکدا باڵی ڕاست تەنها بیرۆکەی عەیبداری پێشکەش دەکرد بەمەش دەبووە هۆی لەناوچوونی ئابووری ئەم کۆمەڵگایە. هەردوولا زۆر بە ئاڵۆزی گەشەیان کردووە. پسپۆڕانی ئەم بوارە فێری زۆر شت بوونە لەبارەی ئەوەی کەچۆن بتوانن ڕێگایەکی کاریگەر بەکاربێنن بۆ کۆمەککردن بە ئاڕاستەکردنی زۆربەی پارە نەقدییەکان لەڕێگای دەزگا ناحکوومییەکان، جەختکردنەوە لەسەر هەڵەکانی بەردەم ئافرەتان، دووپاتکردنەوە لەسەر چارەسەرییەکان، گرنگیدان بە بواری ژینگە، هەروەها دۆزینەوەی ڕێگایەك بۆ بەشداریکردنی خەڵکە هەژارەکان لە بواری ئابووریدا. هەروەها زۆر پێویستە لەسەر دەوڵەتە پێشکەوتووەکان بۆ کۆتایی پێهێنان بە دووڕوویی پاڵپشتیکردنی

بـازاڕی ئـازاد لەکاتێکـدا بـڕە پارەیـەکی زۆر خـەرج دەکـەن لـە پاڵپشـتی کشـتوکاڵی بـۆ جووتیارەکانی خۆیان بەمەش کارەکە مەحاڵ دەکات بـۆ جووتیارەکـانی دەوڵەتـە هـەژارەکان بۆئەوەی بتوانن پێشبڕکێ بکەن.

ڕێگایەکیتر بۆ یارمەتیدانی هەژاران هەیە ئەویش بە پێشکەشکردنی یاسای پاراستن. ئـەو لێژنە ئاست بەرزەی بۆ بەتواناکردنی یاسای هەژارەکان کە من و ئابووریناسی پیرۆڤی هێرناندۆ دی سوتو سەرۆکایەتیمان دەکرد، بەدوای ڕێگا چارەکان دەگـەڕێ بـۆ ئەنجامـدانیان. زۆربـەی هەژاران خاوەنی سـەرمایەکی تایبـەتن وەك زەوی، خانووبـەرە، بابـەتی خواردەمـەنی، بـەڵام ناتوانن بەپێی پێویسـت بـەکاری بێـنن و سـوودی لێـوەربگرن لەبەرئـەوەی ئـەم سـەرمایانە کەموکوڕییان لە ناونیشانی یاسـاییەوە هەیـە. لـە هەنـدێ وڵاتـدا، نزیکـەی سـەدا ٩٠٪ ی سەرمایەکان لەدەرەوەی یاساوە خاوەندارییان کراوە. ئەمەش مانـای وایـە ئـەم خەڵکانـە زۆر بەئاسـانی ڕووبـەڕووی فریـودان و دزی و بێبەشـکردن لـە سـامانەکانیان و بـەکارهێنانی مولکەکانیان دەبنەوە لە بەدەستهێنانی قازانج و کارپێکردنیان لەبواری وەبـەرهێنان و بـژێوی ژیان. ئەم کارەش زەرەر بەخۆیان و کۆمەڵگاکەیان دەگەینێ لەبەرئەوەی حکوومـەت نـاتوانێ هیچ یاسایەکی باجیان لەسەر دابنێ بەمەش هیچ خزمەتگوزارییەکی بنەڕەتی لەم حکوومەتە بەدیناکرێت. ئەنجامەکەشی وەك قوماشێکی کۆمەڵایەتییـە کـە بـە نەچـنراوی دەمێنێتـەوە، هەروەها دەبێتەهۆی دواکەوتنی ئابووری و ناکۆکی ناوخۆیی. من خـۆم لەلایـەنێك حـەز بـە درێژکردنەوەی یاسای پاراستنی هـەژاران دەکـەم لەبەرئـەوەی بـەرەنگاری هـەموو پلیتێکـی ئایدیۆلۆژی دەبێتەوە. ئەمەش دوولایەنەیە—تێکەڵکردنێکە لە" کۆمەڵگایەکی خاوەنیەتی" و دەسەڵاتی خەڵك".

سەرۆك بۆش لەیەکێك لە وتارەکانی ڕایگەیاند، " ئێمـە شـەڕ لـەدژی هـەژاری دەکـەین چونکە بوونی هیوا وەلامێکە بۆ تیرۆریزم". لە یۆلیۆی ساڵی ٢٠٠٥ بۆش بەشداریکرد لەگـەڵ سەرکردەکانی هەر هەشت وڵاتە پیشەسازییە گەورەکەی جیهان بەو بەڵێنەی کـەوا ئەمـەریکا ئامادەیە لەماوەی پێنج ساڵی داهاتوودا کۆمەکەکانی بۆ وڵاتانی کیشـوەری ئـەفریقیا بکاتـە دووئەوەندەی پێشووتر، بۆنموونە لە ٢٥ ملیار دۆلارەوە دەیکاتـە ٥٠ ملیـار دۆلار. دوای دوو مانگ بووقی ئەمەریکا دەنگی دڵنیاییەکی کەمتری دەدایەوە. باڵیۆزی ئەمەریکا لـە UN، جۆن بلتۆن، سەرسوڕمانی خۆی نیشاندا بەوەی حکوومەتەکەی بە دووری دەزانێ لەبەدیهێنانی ئامانجی نێودەوڵەتی بۆ کەمبوونەوەی ڕێژەی هەژاری بۆ نیوە لەساڵی ٢٠١٥. دوای هەفتەیەك

لەسەر ئالۆزبوون و هێمای تێکەڵاو، سەرۆك بۆش وتی ولایەتە یەکگرتووەکان بە پراکتیکی پاڵپشتی لەم ئامانجەی نێودەوڵەتی دەکرد و کاریشی لەسەر دەکات بۆ نیشاندانی دڵسۆزی خۆی. پێویستە لەسەرمان ئەم بەڵێنە و بەڵێنی زیاتریش بەجێ بگەیەنین، نەك هەرتەنها لەبەرئەوەی هیوامان وابێ ئیتر لە وڵاتێکی ئارامتر دەژین، بەڵام لەبەرئەوەی—هەروەك جۆن کەنێیدی وتی—ئەمە راستە.

بەندی سێیەم کە من زۆرجاران لەسەرووی هەموو ئەجینداکانەوە دایدەنێم، ئەویش هاریکاری هەردوو پارتەکەیە بۆ رێگەگرتن لە کۆمەڵکوژی مرۆڤایەتی. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، جیهان کارامەیی خۆی نیشانددا لە بەخشینی خواردەمەنی، ئاو و دەرمان بۆئەو شوێنانەی کەلەم بوارەوە بێبەشن، کەچی بەخشینی چەك نابێتە هۆی چارەسەرکردنی ئاریشەکانیان. هەرچەندە ئەمەش نابێتە هۆیەکی دڵنیاکەرەوە بۆ نەهێشتنی جینۆساید.

لەوکاتەی ئەم کۆمەڵکوژییەی لە روەندا لەساڵی ١٩٩٤ روویدا، لەدوای ئەمەوە قسەیەکی زۆر هەیە کەئایا ئێمە جارێکیتر چۆن رێگە دەدەین کارێکی وا دووبارە ببێتەوە. لەم کاتەشدا شتێکیتر نزیك ئەمە روویداوە. لە دە ساڵی رابردوودا، شەڕێکی گەورە و یەکلاینەکراوە لەکۆماری کۆنگۆی دیموکرات روویدا کە مردنی ٣ ملیۆن خەڵکی لێکەوتەوە. هەروەها لە هەرێمی دارفۆری سودانی ٣٠٠،٠٠٠ هاووڵاتی بەهۆی توندوتیژی کۆمەڵکوژی گیانیان لەدەستدا. هەڵگیرساندنی شەڕ لەم وڵاتانە—جگە لە روەندا—شەڕێکی هەنگاو بەهەنگاوە لەوەی شەڕێکی بورکان ئاسا بێت، کاتێکی تەواو دەدەنە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بۆ وەڵامدانەوەیان. وەڵامیان دانەوە بەڵام زۆر بە لاوازی و لەسەرخۆییەوە. کێشەکە ئەوە نییە کەموکوڕی هەبێ لە تووڕەبوونی ئەخلاقی- توندوتیژییەکەی دارفۆر زۆر بەفراوانی ئاشکراکراوە - بەڵکو بەکارهێنانی هێزەکە بەشێوەیەکی کاریگەرییانە سەرکەوتوونییە.

یەك رێگاچارەی شیاو هەیە بۆئەم حاڵەتانە تاوەکو لەم قەیرانانە رزگاریمان بێت ئەویش بە نوێنەرایەتیکردنی ئەنجومەنی ئاسایشە بە پێکهێنانی هێزێکی گەورە بۆ رێکخستنی هاوپەیمانییەك کەبتوانێ کۆنترۆڵی هەموو ویستەکانی جیهان بکات. دەستتێوەردانی هاییتی، لەساڵی ١٩٩٤ بەسەرکردایەتیکردنی ولایەتە یەکگرتووەکان بوو، رزگارکردنی تەیموری رۆژهەڵات، لەساڵی ١٩٩٩ بەسەرکردایەتیکردنی ئوستراڵیا بوو، هەروەها کردارە سەربازییەکەی بەریتانیا لە سیرا لیۆن لەساڵی ٢٠٠٠ ئەمانە هەمووی زۆر کاری سەرکەوتووبوون. کێشەی پشت بەستن بەم "هاوپەیمانی ویستن"، هەرچەندە دڵنیاییەك هەیە لە

کارەکانی بەڵام تاوەکو ئێستا هەنگاوەك نەچۆتە پێش. ئەمەش نەك زۆربەی لەبەرئەوەی سەرکردەکان دڵیان رەقە لەهەنگاوانی جیددی بەڵکو زیاتر لەبەرئەوەیە کە ئەرکەکانی هێزی ئاشتیپارێز ئەرکێکی زەحمەت و بە تێچوو و مەترسیدارە تائەوکاتەی سوپاسنەکراویشە.

ئەو کەسانەی چەك هەڵدەگرن، پێویستە باش رابهێنرێن، چونکە ئەم هێزە پێویستی بە کەسانی ئاوا هەیە، بەڵام دۆزینەوەیان بەمجۆرە ئاسان نییە. چاوەڕوانکردنی سەربازێك بۆئەوەی رووبەڕووی مەترسی بێتە لەپێناو بەرگریکردنی نیشتیمانەکەی شتێکە، هەروەها هەمان سەرباز کاتێ چەندین میل دەبڕێ، لەوەیە گیانی خۆشی لەدەست بدات، بۆ دەستتێوەردانی لەناکۆکی کەسانیتر ئەمەشیان شتێکیترە. زۆربەی خەڵك بەمجۆرە خۆبەخش نییە، بەتایبەتی کاتێ هێزە نێودەوڵەتییەکان بەم لۆمەلێکراوییەوە دەبینرێن زیاتر لەوەی بەدەستیان هێناوە. لەئەنجامدا، ئێمە لەگەڵ سیستەمێکی وەڵامدانەوەی ئەم ئاریشانەوە بەجێنەهێشتراوین کە هەندێجار بە باشی کارەکانی دەکات و هەندێجاریتریش کارەکان بەمجۆرە نییە.

لە سێپتەمبەری ٢٠٠٥ بۆ یەکمجاری کۆمەڵەی گشتی UN بڕیاری لەسەر لێپێرسراوییەتێکی نێودەوڵەتی کۆکراوەیدا بۆ پاراستنی هاووڵاتیان لە جینۆساید، تاوانی جەنگ، پاکتاوی کەمینەکان، و تاوان لەدژی مرۆڤایەتی. قەبووڵکردنی بوونی ئەم لێپرسراوییەتە یارمەتی هیچ کەسێك نادات هەتا ئەگەر خاوەنی هەردوولا نەبێ دەسەڵات بۆ پاراستنی خەڵکەکە، هەروەها ویستی خۆبەخشانەی ئازاد بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە. رێکخراوی UN شەست ساڵ لەمەوبەر دامەزراوە لەگەڵ پێشبینی ئەوەی کە سوپایەکی تایبەت بەخۆی بەرەو پێشببات. ململانێی نێوان هێزە زەبەلاحەکان هەر زوو کۆتاییەکی خێرایان بۆئەم بیرۆکەیە دانا، کەچی هێشتاکەش هیچ پاڵپشتییەك نییە بۆ دووبارە زیندووکردنەوەی بیرۆکەکە. رۆڵی لۆژیکی UN لەهەر ئاریشەیەك رێگادانی هێزە سەربازییە نەتەوە کۆکراوەکانە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئاریشەکە. هەروەها رۆڵی لۆژیکی ولایەتە یەکگرتووەکان سەرکردایەتیکردنی ئەم هێزانەیە هەرکاتێ پێویست بوو، سەرکەوتنیانە کاتێ دەگوازرێتەوە بۆ رووبەڕووبوونەوەی جەنگ. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، پێویستە هەوڵی زۆربدەین بۆ کەمکردنەوەی دوودڵییەکانی نییەت و مەبەستەکانمان. پێویستە زۆر روون و ئاشکرابین لەوەی کە چیمان لێوە داوادەکرێ.

هەر هێزێك کەبیەوێ رووبەڕووی قەدەغەکردنی جینۆساید بێتەوە دەبێ خۆی پرۆژەیەکی سەربازی جیددی بێ، نابێ کۆمەکی لێرە و لەوێ بۆ پەیدابکرێت و بۆ ماوەیەکی کورت

پێکبهێنرێت و هەروەها لە خولەکەکانی کۆتایی ئاریشەکە خۆی یەك بخات. لەسەر وڵاتان پێویستە دەستنیشانی کەسانی بەتوانا و کارامە بکەن بەجۆرێك کە چەند ساڵێك خەریکی ئامادەکردنیان بووبن بۆئەوەی لێهاتوانە ئەرکەکەی خۆی رابپەڕێنن. بەشێوەیەکی نموونەیی، ئەم هێزانە پێویستە زۆر بە باشی رابهێنرێن بۆ پێشوەچوونی ئەرکەکانیان و تەواوکردنی کەموکوڕییەکانیان هەروەها بۆ پاراستنی ئامادەیی خۆیان لەکاتی گواستنەوەیان بەماوەیکی زۆر کورت. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەم هێزە دەبێ بەباشترین چەکی سەردەم و کەرەستەکانی پەیوەندیکردن و گواستنەوە تێربکرێن، هەروەها دەبێ لەلایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی وڵاتەکانەوە یارمەتی بدرێن. ئەم هێزە لەلایەن پێکهاتە سەربازی و نیمچە سەربازییەکان و ئیدارییە مەدەنییەکان و داواکارانی گشتی ئەوانەی لە دەسەڵاتی یاسای نێودەوڵەتییەوە کاردەکەن هاوکاری بکرێن. کاتێ هێزەکە بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانیان دەردەچێ، ئەرکی سەربازی جێبەجێکردنی فەرمانەکانە، ئەرکی رێکخراوە مەدەنییەکان دووبارە نۆژەنکردنەوەی ناوچەکەیە، هەروەها ئەرکی داواکارانی گشتی گەیاندنی ئەم لێپرسراوییەتەیە بۆ دادگای نێودەوڵەتی کە وەك تاوانی جەنگ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

جارێکیتر دەیڵێمەوە ئەمە پێی ناڵێین هێزی ئامادەی UN. بەڵکو ئەم هێزە هاوشێوەی هێزێکی سوار وایە بەجۆرێك سەرکردەکان وەك سوارچاك بەکاریدێنن بۆ رزگارکردنی کاتە پێویستییەکانیان. لەوەیە درێژەی ئەم باسە مابێت (وەك لایەنی داراییەکەی) کە پێویستە چارەسەر بکرێت(*)، بەڵام لەبیرۆکەیەکدا ئەمەیان رێگایەکی باشترە بەوەی رێگەبگرین لە داهاتووی دارفۆرەکانیتر لەوەی کە ئێستا چیمان دەستکەوتووە. بەرلەوەی ولایەتە یەکگرتووەکان دیزاینی یاخود بەشداری لەم هەڵمەتانە بکات پێویستە لەسەر موحافیزکاران و لیبرالییەکان دەستبەرداری هەندێ لایەنگیرییە نەریتەکان بباناوە. مومکین نییە میکانیزمێك کەجێی باوەڕبێ بۆ رێگەگرتن لە روودانی جینۆسایدی بەبێ ئاستەکانی هاریکاری سەربازی نێودەوڵەتی دروستبێ. UN لەوەیە لێپرسراوییەتەکە هەڵنەگرێ بەڵام هەر دەبێ لەم هەڵمەتەیە بەشداربێ. ئایا مەسیحییە باڵ راستەکان ئامادەن بە ئەقڵێکی کراوە بەدوای ئەم

(*) یەکێك لەم درێژکردنەوانە هەڵوێستی وڵاتە یەکگرتووەکانە بۆ پاڵپشتیکردنی دادگای تاوانی نێودەوڵەتی. هەتا ئەگەر بەردەوامیش بین لەسەر قەدەغەکردنی بەشداریمان لەم دادگاییە، ئێمە سەرکەوتنی لێ چاوەڕان دەکەین.

جۆرە بیرۆکانە بگەڕێن، وەیاخود بە کۆتی دوودڵییە کۆنەکانەوە بمێننەوە، تەنانەت نەخۆشی چەوسانەوە خودیش، ئەوەی کە پەیوەندی بە UN ەوە هەیە؟ لەم کاتەشدا، سیاسەتی باڵ چەپ رازی بوون لەسەر خەرجکردنی بڕێکی زۆری پارە بۆ کاراکردنی تواناکانی سەربازی نێودەوڵەتی، تەنانەت لەسەر حیسابی فشاری پێویستە کۆمەڵایەتییەکانیشەوە.

ئەگەر رابردوو پێشەکییەك بووبێ، ئەوا هیچ هیوایەك نامێنێ. بەڵام ئەگەر رابردووبێ، ئەوە لەوەیە هەوڵێك هەبێ. لەکۆتاییدا، ئەو خەڵکانەی کە بەرهەڵستی کۆمەککردنی دەرەکی و بنیاتنانی نەتەوە و رووبەڕووبوونەوەی HIV/AIDS یان دەکرد، ئەوا ئێستاکە پاڵپشتی لە هەرسێکیان دەکات. رۆناڵد ریگان، دوای ئەوەی لە سەرۆکایەتیکردنی وڵات خانەنشین کرا، بە یەکێتی ئۆکسفۆردی وت: " پێویستە لەسەرمان پشت بە دەزگا بێ لایەنەکان ببەستین... پێشنیاری هیچ شتێ ناکەم جگە لە دەستکێشێکی کوتاڵی مرۆڤایەتی پشت بەستوو بە مستی هێزی سەربازی" یەوە نەبێ.

هاریکاری بەرفراوانی نێوان مەسیحییە باڵ راستەکان و چالاککەرە ئەمەریکییەکان لەبارەی مەسەلە مرۆڤایەتییە نێودەوڵەتییەکان خەونێکی دوور لە واقیع نییە. من و سیناتۆر براون باك بەشداریمان لە کۆنفرانسێکی زۆر سەرکەوتوو کرد کە لەسەر ئەم بابەتەوە لە نۆڤەمبەری (٢٠٠٥)ەوە رێکخرابوو. بوونی ئەم مەسەلە هاریکارییانە تەنها باشییەکەی بۆئەوە نییە یارمەتیمان بدات تاوەکو لەکارەکان سەرکەوتن بەدەست بێنین بۆ کۆنترۆڵکردنی مەسەلە دەرەکییەکان، بەڵکو یارمەتی ئەمەریکا دەدات تاوەکو خۆیان لەیەکتر تێبگەن. هەروەك خۆم قەناعەتم پێی هەیە، ئێمە ئەوها دابەشکراونینە هەروەکو وابەدیاردەکەوین. زۆربەی ئەمەریکییەکانمان نایانەوێ سەرلێشێواوییەك لەنێوان ویستی سەرکردەکانیان و ویستی پەروەردگار رووبدات، هەروەها ناشیانەوێ کەمتەرخەمی بنوێنن لە رێسا ئەخلاقی و ئایینییەکانەوە. ئێمە پاڵپشتی لە جیاکردنەوەی کڵێسە لە وڵات دەکەین، بەڵام هەرگیز پاڵپشتی لە جیاکردنەوەی بە زۆری ئایین لەژیانی گشتی نەتەوەکەمان ناکەین. زۆربەمان بە بەردەوام دوعا دەکەین بۆئەوەی پەروەدگار رێنمایی سەرکردەکانمان بکات. هیوا دەخوازین ئەوانەی نوێنەرایەتی ئێمە دەکەن و بەناوی ئێمەشەوە بڕیارەکان دەردەکەن بیرکردنەوەی قوول بکەن لەبارەی راست و هەڵەی مەسەلەکان ئینجا بڕیارەکە دەربکەن. لێیانەوە داواکارین بمانپارێزن لەهەمان کاتیشدا وامان لیبکەن شانازی بەبوونی خۆمان وەك ئەمەریکی بکەین.

هاریکاری نێوان ئەم دوو پارتــە ســەرەکییە لەســەر مەســەلە مرۆڤایەتییــەکان یارمــەتی ئەوەدەدات کە جیهان چۆن سەیری کارگەری ئەمەریکا دەکـات. بێگومـانم لـەوەی زۆربــەمان حەزدەکات ولآتەکەمان بەشێوەیەکی بڕوادار، گرنگیدەر، خـاوەن ڕێبـاز، دڵسـۆز، و هــەروەها بەهێز بەدیاربکەوێت. زۆر لەمێژەوەیە فێری ئەوەبووینە، هــەر لــە ڤێتنـام و ئێرانــەوە بگـرە، جیهان بەو جۆرەوە سەیرمان ناکات لەوەی کەخۆمان دەمانەوێ. هەندێك وابیردەکەنــەوە ئــیتر پێویستیمان بە رای کەســانیترەوە نییــە، بــەجۆرێك بــەهێز و بەتوانابووینــە پێویســتیمان بــە خۆدەرخستن نییە، هەروەك لەڕاگەیانــدنی ســەربەخۆیماندا هــاتووە و فــەرمانمان پێــدەکات، " پێویستە رێزی گەورە لە رای مرۆڤایەتی بگرین". چاوپۆشیکردن لەم لووتبەرزی و لەخۆباییــە دەبێتە هۆی پەیدابوونی هەڵەیەکی کوژەر و بێ ئومێدی لەبەرامبەر هاوڕێیــە راســتەقینەکانی ئەمەریکا لەهەموو شوێنێکی جیهان. و هەروەها هەڵوێستی ولایەتــە یــەکگرتووەکان لەهــەر هەنگاوێك لەهەنگاوەکانی مێژوو یەکلایکەرەوە دەبێ، ئێستاکە ئەم هــەنگاوە زۆر پێویســتە، هەروەکو ئەمرۆکە بەدوای کلیلی سەرکەوتنی ئەم دوو جەنگە هاوکاتە دەگەرێین. ئەم گەڕانەش بەو زانیارییــە دەســت پێــدەکات کــە ئێمــە ســەرکەوتن لــەجیهان بەدەســت نــاهێنین تــاوەکو لەسەرەتادا لەو کەسانە تێنەگەین کە ئێمە پێویستیمان بەکاریگەرییانــەوە هەیــە، بەتایبــەتی دواکەوتوانی ئیسلام.

**(٨)**

# تێگەیشتن لە ئیسلام

یەکەم رووبەڕووبوونەوەی ئیسلام و مەسیحی لەشەڕێکدا بوو لە ساڵی ٦٣٦ نزیك رووباری یەرمووك، کە یەکێکە لەجۆگەلەکانی وڵاتی ئوردن، ئەم شەڕە خوێناوییە بە سەربڕینی ٧٠،٠٠٠ مەسیحی و دەستپێکی کۆنترۆڵکردنی ئیسلامی بەسەر شاری قودس کۆتایی پێهات، کە پێشتر شوێنگەی ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتی بوو. لەساڵی ١٠٩٩ خاچ پەرستەکان دووبارە دەستیان بەسەر ئەم شارە پیرۆزەدا گرتەوە لەئەنجامیشدا سەبڕینی ٧٠،٠٠٠ موسڵمانی لێکەوتەوە لەگەڵ کوشتنی هەر جوولەکەیەك کە مەسیحییەکی سەرکەوتوو بیتوانیبایە. لەساڵی ١١٨٧ شاری قودس دووبارە لەلایەن ئیسلامەوە دەستی بەسەرداگیرایەوە بە سەرکردایەتیکردنی جەنەراڵ (صلاح الدين)، ئەم سەرکەوتنەش دوابەدوای خاچ پەرستانەوە دێت کەبووە هۆی مردنی دەیان هەزار کەس. لەزۆربەی بەشی ئەم شەڕانە جیهانییە ئەمانە بە شەڕی پیرۆز ناودەنران.

شارستانییەت لە سەدەی بیست و یەکەم پێشوەچوونی باشی بەخۆیەوە بینیوە، ئێستاکە دووبارە هەمان دەنگ دەبیسترێتەوە. جوولەکە و عەرەب بەر لە ١٠٠٠ ساڵ چەندین جار لەسەر زەوی و شوێنە پیرۆزەکانەوە رووبەڕووی یەکتربوونەتەوە. چەتەی تیرۆریستان کە ئەوەی بیانەوێ بەناوی پەروەردگارەوە ئەنجامی دەدەن، تاکە هێرشێکی خوێناویان کردە سەر زەوی ئەمەریکا. وەڵامدانەوەی خێرای ئیدارەی بۆش بووە جێگای هەڵقوولاندنی تووڕەبوونێکی زۆر لەنێو هەستی موسڵمانەکان. نیگەرانی لەئەوروپا لەگەشەکردندا بوو، کەتیایدا کۆچکردنی موسڵمانان بەرفراوان بوو، و هەروەها کارە تیرۆریستییەکان و دەمارگیری روو لەزیادبووندایە. لە ئەفریقیا لایەنی ئیسلامی و لایەنی مەسیحی تووشی پێکدادان دەبنەوە. لە ئاسیا، لە شیشانەوە تا فیلیپین دابەش بوونی دواکەوتوانی ئیسلام و دواکەوتوانی ئایینەکانیتر شەڕ و ململانێی خوێناوییان لێدەکەوێتەوە. وەکو خێزانێك وایە لەسەر ناڕازیبوونی وەسیەتەکەی

باوکیان لێك بترازێن، منداڵەکانی پێغەمبەر ئیبراهیم ئەوەندەی بە ئیرەیی و ئاژاوە و رق لێبوونەوە سەرقاڵن ئەوەندە بە هەستی خزمایەتی و نزیکبوونەوە ئاشنا نین.

ئەوکاتەی دەستم بۆ سوێندخواردن وەك وەزیری دەرەوەی وڵات بەرزکردەوە، لەنێو مێشکمدا پرۆژە لیستێکم رێکخست بۆئەوەی لەرۆژی دەست بەکاربوونمەوە هەوڵی ئەنجامدانیان بم، لەسەرووی هەمووشیانەوە بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان ئەمەریکا و جیهانی ئیسلامی بوو. دەست پێکردنی ئەم کارە زۆر پێویست بوو. ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرژەوەندی دووروودرێژی هەیە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری ئاسیا، و هەوڵی پاراستنیشیان دەدات. کۆتایی هاتنی جەنگی سارد بووە هۆی دروستکردنی هەندێ دەرفەتی بەسوود بۆ پێکهێنانی شەریکایەتی لەگەڵ ئەو وڵاتە نوێیە سەربەخۆیانەی کە لە ئاسیای ناوەڕاستدا کاریگەری تایبەتیان هەیە. هەڵبژاردنی لەناکاوی میانڕەوی سەرۆکایەتی ئێران گەرموگوڕییەکی دەدایە پەیوەندی ساردوسڕی لەمێژینە لەگەڵ ئەم وڵاتە. هەروەها پرۆژە دیموکراتییەکان لە ئەندەنوسیا و نایجیریا، کە هەریەکەیان وڵاتی زەبەلاحی ناوچەکەن کە ئیسلام بەفراوانی هەستی پێدەکرێت. بەدرێژایی ساڵانی ١٩٩٠ میدیای سیاسەتی دەرەوە وتارە زۆری لەبارەی " ئیسلامییە توندڕەوەکانەوە" دەردەکرد. منیش کۆبوونەوە دوای کۆبوونەوە، هەموو تێبینییەکانم بەکەمتەرخەمییەوە لەسەر دەفتەری تێبینییەکانم دیاردەکرد بۆئەوەی " تێگەیشتنم هەبێت لەبارەی ئیسلام".

بەدڵنیاییەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ هەندێ لەم بابەتەوە پەیداکرد. کاتێ تەمەنم دە ساڵان بوو، باوکم وەك سەرۆکی کۆمیسیۆنی UN لە هیندستان و پاکستان خزمەتی دەکرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوانیان لەبارەی هەرێمی کشمیرەوە. تەنانەت لەم تەمەنیشەوە، لە راستییە بنەڕەتییەکانەوە تێدەگەیشتم. لەبەر هۆکاری ئایینییەوە نیمچە کیشوەری هیندی ببووە دووبەش. سەرکردەکانی هیندی وڵاتێکی عیلمانی فرە نەتەوەیان لە کشمیر دەویست. کەچی پاکستانییەکان وڵاتێکی ئیسلامییان دەویست. لەم نێوەندەشدا کشمیر بەدەست ئەم دووانەوە گیری خواردبوو. رێژەی دانیشتوانی زۆربەی موسڵمان بوون، بەڵام کەمە نەتەوایەتییەکی گەورەی هیندۆزی تێدابوون، هەروەها فەرمانڕەوایی کردنی کشمیر لەلایەن هیندۆزەکانەوە بوو. کاری دیپلۆماتکارەکان دۆزینەوەی رێگا چارەیە کەبتوانن هەردوولا رازیبکەن. ئەمەش بەنزیکەیی شەست ساڵ پێش ئێستایە، لەکاتێکدا باوکم مردووە، خۆشم

چوومەتە تەمەنەوە، هەردوو وڵاتیش خاوەن چەکی ئەتۆمین، کێشەکە خەریکە تۆزێك لە چارەسەربوون نزیك بۆتەوە.

ژمارەیەکی زۆر موسڵمان لە دێنڤەر نییە، ئەو شوێنەی کە ساڵانی هەرزەکاریم تیا بەسەربردووە. ئەو کاتەی باوکم لە UN کاریدەکرد پەیوەندییەکی زۆری لەگەڵ کەسایەتییە بەناوبانگەکان دروستکردبوو، دواتر هەندێکیان سەردانی باوکمیانی دەکرد. یەکێك لەوانەی لەبیرمە بەڕێز **ظفرالله** خان، وەزیری پێشووی دەرەوەی پاکستان بوو. زۆر پێیەوە سەرسام بووم، چونکە کەسایەتییەکی خاوەن ویقارو پڕ زانیاری و سەرنجڕاکێش بوو. ڕۆژێکیان منی لەگەڵ خۆی بۆ نانخواردنی بەیانی بردە دەرەوە کاتێ هاوپۆلەکانم منیان بینی بەئیرەییەوە نوکتەیان پێدەکردم بەوەی کە ئەم پیاوە خەریکە ژنی دووەمی پێکدەینی سەرەڕای پاراستنی یەکەمیشی. ئەوەی منی ڕاکێشابوو بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ ئەم پیاوە بکەم لەبارەی کشمیرەوە ئەوەبوو کەوا ژیان چەندە سەختە لەو شوێنەی کە گفتوگۆیەکان لە ڕێگای ئایین و ناسیۆنالیزمییەوە گرێدەگرن کەچی هەریەکێکیشیان تەواو قەناعەتیان بەوە هەیە کە خۆیان خاوەن تاکە ڕاستینە.

دوای چەند ساڵ کارکردن لە وەزارەتی دەرەوە، هەر بیرم لە کەسایەتی بەڕێز **ظفرالله** خان دەکردەوە بەجۆرێك چۆن کارەکان لەدەرەوەی دێنڤەر دەست پێبکرێ باشە. لەڕاستیدا ئەم پیاوە لەساڵی ١٩٩٧ لەوەزارەتی دەرەوە بەغەریب بەدیاردەکەوت: هیچ موسڵمانێکمان نەبوو لەپۆستێکی بەرز کاربکات، تەنانەت هەندێکیان ئەوانیش لە پۆستی ناوەندییەوە کاریان دەکرد. بڕیاری ئەوەمدا کە پێویستە پەیوەندییەکانمان باشتربکەین. بەم هۆیەشەوە، چاوپێخشانەوەمان لەبارەی هەموو کارەکانی فەرمانبەران و ڕاهێنانیان دەکرد بە دیاریکردنی لیستی ڕۆژانی پشووی موسڵمانان شانبەشانی ڕۆژانی پشووی مەسیحی و جوولەکەکان لەسەر ڕۆژژمێری ڕەسمی. لەگەڵ ئەمەشدا دەستمانکرد بە زنجیرەیەك گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەرانی موسڵمانانی ئەمەریکا، هەروەها داوەتکردنیان لەڕۆژی یەکەمی مانگی ڕەمەزان بۆ فتارکردنەوە لەلایەن وەزیری دەرەوە ئەم میواندارییانە ڕێك دەخران.

هەروا پێشەکییە ڕێنماییەکی ڕوونمان بەو کەسانە دەدا کە بەنیازبوون وەك نوێنەری ولایەتە یەکگرتووەکان گەشت بۆئەو وڵاتانە بکەن کە تیایدا زۆرینەی دانیشتوانەکەیان موسڵمانن. بڵاوکراوەکە ئەم زانیارییانەی خوارەوەی لەخۆی دەگرت، هەرچەندە زانیاری سەرەتایین، بەڵام بۆ زۆربەی ئەمەریکییەکان شتێکی نوێیە:

- موسڵمانەکان هەمان ئەو خودایە دەپەرستن ( کە بە زمانی عەرەبی پێی دەڵێن، الله) هەروەك مەسیحی و جوولەکەکان دەیپەرستن.
- "ئیسلام" مانای ملکەچ بوونە بۆ پەروەردگار. ئەگەر یەکێك ملکەچی پەروەردگاربێ و ژیانێکی راست و دروست بەسەربەرێ ئەوا ژیانێك دەدۆزێتەوە کە زۆر گونجاوبێ بۆ خۆیی و ئاواتەکانی.
- موسڵمانان بڕوایان بە رۆژی دوایی و ژیانی دوای مردن و لێپێچینەوە لەسەر ئەم کارە ئەخلاقییانەی هەر تاکێك هەیەتی. لەیەکەم لێپرسراوییەتی موسڵمانان ئەوەیە چاودێری هەژار و هەتیو و بێوەژن و ستەملێکراوان بکەی.
- کتێبی پیرۆزی موسڵمانان "قورئان"ە، کەتیایدا هەموو وشەکانی راستەوخۆ لەلایەن خوداوە بۆ سەر بازرگانێکی شاری مەککە بەناوی موحەممەد کوڕی عەبدوللا (کە پێغەمبەری موسڵمانانە)، لەڕێگای فریشتەی ئاسمان جبرائیلەوە دەستنیشانکرا، لەساڵی ٦١٠ دەست بەدابەزینی کرا بۆماوەی زیاتر لە بیست و دوو مانگ.
- شەریعە، یاخود یاسای ئیسلامی پێکهاتووە لە فەرموودەکانی پەروەردگار و کار و فەرموودەکانی پێغەمبەر و تەفسیری زانایانەوە. یاساکە هەموو لایەنەکانی کەسێتی و کۆمەڵایەتی و مەدەنی ژیانی داپۆشیووە.
- پێنج کۆڵەگەکەی ئیسلام بریتییە لە: ١- راگەیاندنی بڕواکەت، ٢- نوێژکردن، ٣- خۆپاککردنەوەی لەڕێگای زەکات، ٤-رۆژووگرتن، ٥- حەجکردن (سەردانیکردن بۆ مەککە).
- موحەممەد لەلایەن موسڵمانانەوە بە دواهەمین زنجیرەی پێغەمبەران دادەنرێت کە ئەم زنجیرەیە لە ئادەم و نووحەوە دەستی پێکردووە، بەردەوامبووە لەگەڵ ئیبراهیم و موسا پێغەمبەرەوە، هەروەها پادشا داود و عیسای نەسرانیشی گرتۆتەوە. قورئان ئەوە روونەدکاتەوە کەوا راگەیاندنی موحەممەد وەك پێغەمبەر جەختکردنەوە و بەردەوامبوونی پەیامی پێغەمبەرانی پێش خۆی بووە. موحەممەد وەك (عیسا) هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە کەخۆی دامەزرێنەری ئایینێکی نوێیە، بەڵکو لەبری ئەمەوە خۆی وەك نێرردراوێکەوە حیساب دەکرد و هەروەها بانگی خەڵکەکەی دەکرد بۆ گەڕانەوەی بۆلای راست و دروستی تەنهایی خودای پەروەردگار.
- نەسەبی عەرەبەکان لەڕێگای ئیسماعیلەوە—کوڕی هاجەر، لەگەڵ ئیبراهیم یەکدەگرێتەوە، کەچی نەسەبی جوولەکەکان لەڕێگای ئیسحاقەوە - کوڕی سارەوە لەگەڵ

ئیبراهیم یەکدەگرێتەوە. ئەم مەسەلە ئایینییە زۆر گرنگە لەبەرئەوەی هەردوو موسڵمانان و جوولەکەکان ( تەنانەت مەسیحییەکانیش) بڕوایان وایە کە خودای پەروەردگار فەرمانی بە ئیبراهیم کردبوو بۆئەوەی بچێتە زەوی کەنعان لەگەڵ ئەو بەڵێنەی کەوا منداڵی منداڵەکانی دوای خۆی لەم شوێنە جێگیردەبن و دەبنە گەورەترین نەتەوە.

- موسڵمانەکان بڕوایان بەوە هەیە کە عیسای مەسیح پێغەمبەرێکی گەورەیە، بەلأم بەوە رازینابن کە بووتریٰ خودای پەروەردگار " کوڕ" ێکی هەیە. بڕوایان بەوە هەیە کەوا عیسای مەسیح لە پاکیزەیەکی داوێن پاکەوە لەدایك بووە دواتریش بەرەو ئاسمان هەڵکشاوە، بەلأم هەرگیز رازینابن بەوە کە لەخاچ درایە و زیندوو بۆتەوە.

- لە کلتووری ئیسلامیدا، یەکەم ماڵی خودا مەککەیە کە لەلایەن (ئادەم)ەوە بنیاتنرابوو دواتریش لەلایەن ئیبراهیم و ئیسماعیلەوە دووبارە بنیاتنرایەوە. ئەم دوو مزگەوتەی لەمەککە و مەدینە هەیە، کە دوو شاری پیرۆزن پێغەمبەر موحەممەد خۆی تیاژیاوە، پیرۆزترین شوێنن لە ئایینی ئیسلام. سێیەمیشیان مزگەوتی ئەقسایە لە شاری قودس، ئەو شوێنەی کە موحەممەد سەردانیکردووە، جا لەخەوندا یاخود بەلاشەیەوەیە ئەمە جێگای گفتوگۆی تیا هەیە، لەوێدا نوێژی بۆ عیسا و پێغەمبەرانیتر کردو دواتر بە هاوڕییەتی جیبرائیل بەرەوە حەوت چینی ئاسمان بەرێکەوتن.

- قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر مەسیحی و جوولەکەکان لەشوێنێك دەژیان کە تیایدا ئیسلام فەرمانڕەوایی دەکرد، لەسەر فەرمانڕەوایی ئیسلامی پێویستە سامان و یاسا و نەریتی ئایینی و شوێنی پەرستنیان بپارێزن. لەزۆربەی هەرە زۆری ساڵانی هەزارەی دووەم کۆمەڵگاکانی موسڵمانان زۆر نەرم و نیانیان لەبەرامبەر ئایینەکانیترەوە دەردەبڕی زیاتر لەوەی کە مەسیحییەکانی ئەوروپا دەیانکرد. هەرچەندە مەسیحی و جوولەکەکان ئازادانە پەیڕوکردنی ئایینەکانیان رادەپەڕاند، بەلأم هەر لەنێو کۆمەڵگاکانی ئیسلامی وەك کەمینەیەکی سیاسییەوە مامەڵیان لەگەڵدا دەکرێت.

- جیهاد لە زاراوەی ئیسلامیدا—تەنانەت لەلای زۆربەی موسڵمانانیشەوە ئەوا دەخوێندرێتەوە—زۆر بەئاسانی چەمکی شەڕی پیرۆز دەدات. ئەگەر وشەی جیهاد بە راست و رەوانی وەرگێڕین مانای " هەوڵدان" یاخود " تێکۆشان" لەپێناو خودای پەروەردگار دەدات. لەلای زۆربەی موسڵمانان "گەورەترین جیهاد" ئەوەیە مرۆڤ لەگەڵ نەفسی خۆی جیهاد بکات.

"جیهادی بچووك" ململانێیه له پێناو دادگەری، لەوێشەوە بەرگریکردن لـە ئیسـلام لـەدژی ئەوانەی هێرشی دەکەنە سەری جا بەهەر چ جۆرە وەسیلەیەك بێت.

- موسڵمانان جیاوازی دەکـەن لـەنێوان شـەڕێکی پاسـاو هـەڵگر و شـەڕێکی پاسـاو هەڵنەگر. شەڕێك لەپێناو خودا—بەرگریکردنی خود کەسی یاخود لەدژی ستەمکارییەوە— ئەوا شەڕێکی دادگەرییە. شەڕێکیش وەك داگیرکردنی هەرێم و ناوچـەیەك کـە پەیوەنـدی بـە خاوەنیـەتی تـۆوە نییـە، ئـەمجۆرەیان جێگـای قـەبووڵکردن نییـە و بەشـەڕی لـەپێناو خـودا ناژمێردرێت. بێگومان لەئیسلام یاسا هەیە کەچۆن دەست بە شەڕکردن دەکەی. نابێ هێـرش بکرێتە سەر کەسانی مەدەنی و خاڵی لە هەڵگرتنی چەك، نـابێ مامەڵـەی خـراپ بەرامبـەر بەندکراوەکانەوە بکرێت. بەگوێرەی خالد ئەبو فەزڵ زانای بەئەزموونی شـەریعەتی ئیسـلامی، ئێستاکە لە ولایەتە یەکگرتووەکانەوە ژیان بەسەردەبات، دەڵێ فتوادەرانی ئیسلامی "جـەخت دەکەنەوە کە ئەگەر دوژمن بـەدیلگیراوە موسـڵمانەکانی ئـازاردا و کوشـتنیانی، موسـڵمانان قەدەغەکراون لەوەی بچن هەمان شت ئەنجامبدەن".
- خۆکوشتن لە ئیسلام قەدەغەکراوە، بەڵام ئەگەر یەکێك لە پێناو خزمەتکردنی خـودا گیانی خۆی بەخشی و شەهیدبوو، ئەوا راستەوخۆ جێگای بەهەشت دەبێ.
- هەرچەندە ئیسلام لە نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە پەیدابووە، بەڵام ئیمڕۆکە لە کۆی پێنج موسڵمانی هەموو جیهـان یـەکێکیان عەرەبـە ( کەچـی لـەکۆی پێـنج عـەرەب تـەنها یەکێکیان موسڵمانە). زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانان کەوتۆتە لای کیشوەری ئاسیای باشـوور و ناوەڕاست.
- موسڵمانان ئەرکێکیان هەیە ئەویش یارمەتیدانی موسڵمانانیترە، بەتایبەتی ئەوانەی ئازار دەچێژن و ستەمیان لێدەکرا.

کلتووری ئیسلامی رەتی هەڵواسینی وێنە و تابلۆی موحەممەد دەکاتەوە، تەنانـەت لـەنێو مزگەوتەکانیشەوە. لەماوەی ژیانی خۆیدا، گەر وەسفی موحەممەد بکەین، کەسێکی باڵابەرز و خاوەن دوو چاوی رەش و رووخسارێکی زەرد و قژێکی پڕی رەش و ریشـێکی زۆر کـە بەسـەر سینگییەوە کەوتبوو. شارەکەی کە مەککەیە، شوێنێکی بازرگانی بـوو، ئـەو کەسـانەی کـە بەمەبەستی جێبەجێکردنی پەرستنی خوداوە روویان لەم شوێنە دەکرد چەندین قوربانییـان بـۆ سەدان خودای خێڵەکانەوە پێشکەش دەکرد. بازرگانە ناوخۆیەکان قازانجی زۆریـان لـە پێـدانی

خواردن بەم خەڵکەی هەروەها فرۆشتنی هەموو جۆرە شتومەکییەکان دەکرد، جا زیندوو بوایە یاخود نازیندوو، بۆئەوەی لەکاتی جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە ئایینییەوە بەکاریبێنن. سروشتی موحەممەد خۆی لەیەك شتدا دەبینییەوە ئەویش باوەڕهێنانبوو بۆ خودایەکی تاك و تەنیا، هەروەها هەڕەشەکردن بۆ ئەو کەسانەی کە کاری دوور لە نەریتی ئایینەوە دەکەن تەنها بۆ دەستکەوتنی هەندێ قازانج لەگەڵ ئەوانەی ڕێگری دەکەن لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە تازەیە و ئەوانەی هەوڵی کوشتنی موحەممەد دەدەن. لە دوا ساتی هەوڵی کوشتنی، موحەممەد بە نهێنییەوە کۆچی بۆ شارێکی نزیك مەککە کە پێی دەڵێن مەدینەوە کرد، ئەو شوێنەی کەخۆی وەك سەرکردەیەکی سیاسی و ڕۆحانییەوە تیا هەڵکەوت. هەرئەو کاتەی پاڵپشتییەکی کۆکردەوە دەستبەجێ بەسەرکەوتنەوە گەڕایەوە مەککە، دەستیکرد بە شکاندنی هەموو بتەکانی دەوروبەری شاری مەککە، و تەرخانکردنی ئەم شوێنە پیرۆزە تەنها بۆ پەرستنی پەروەردگار و هەروەها چەسپاندنی دەسەڵات بەسەر تەواوی دوورگەی عەرەبی.

کاتێ تەمەنی لە شەست ساڵ بەسەرکەوت، موحەممەد وتاری خواحافیزبوونی لەسەر بەرزایی بەزەیی ( جبل الرحمە) نزیك کێوی عەرەفە پێشکەشکرد، کە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری مەککە. خەڵکەکەی هۆشیارکردەوە لەوەی " ئازاری کەس مەدەن تاوەکو کەس ئازارتان نەدات. ئەوەتان بەبیربێتەوە کە ڕۆژێك دادێ لەگەڵ خودای پەروەردگار چاوپێکەوتن دەکەن و ئەویش (پەروەردگار) بەهەموو کارەکانتانەوە دەزانێ" دواتر قسەی لەبارەی یەکسانی ڕەگەزی دەکرد، بەمەش بڕیارێکی یارمەتیدەرە بەوەی کە ئایینی ئیسلام وەك ئایینی هەموو جیهان قەبووڵدەکرێ، " هیچ عەرەبێك لە عەجەمیەك باشتر نییە و نە سپی پێستێك لە ڕەش پێستێك باشتربێ تەنها بە کرداری چاکە و خوا پەرستییەوە خەڵکان جیاوازی دەکرێن".

وەك عەقیدە تاك پەرستییەکانیترەوە، ئیسلام وەك "ڕەشماڵێکی گەورە" وایە بە چەندین ڕێگای جیاوازەوە تەفسیر دەکرێت. دەوڵەمەندی بیرکردنەوە لە ئەنجامی کاریگەرییەکانی نیشتیمانی و ئەتنیکییەوەیە، هەروەها جیاوازییەکانیش لەنێوان زانیارییە دیارەکان و دابەشبوونی مەزهەبییەکانەوە دێت. لەئەنجامدا هەموو گشتگیرییەك لە ئیسلامدا بەشێکی هەڵەیە. داواکردنەکان لەهەندێ کۆمەڵگادا، بۆنموونە خۆداپۆشینی ئافرەتان کاتێ لە شوێنێکی گشتیدانە ڕەنگدانەوەیەکە لەنێو کلتووری عەرەبیدا نەوەك یاسایەك بێ لەنێو ئەم ئایینە— هەروا پیاوانی عەرەبیش جلێکی درێژی بێ فێز دەپۆشن. زۆربەی هەرە زۆری ئافرەتانی موسڵمان سەرپۆش لەسەر ناکەن. قورئان جیاوازی لەدژی ئافرەتان دەکات (بەتایبەتی لەزمانی

بەکارهێنانی فرە ژنی، تەڵاق و میراتدا) بەڵام لەهەر حاڵەتێکدا ئەم ئایەتانە جیاوازییەکەی کەمتر دەگەیەنێ لەوەی ئێستاکە عەرەبەکان پەیڕەوی دەکەن. موحەممەد بە هاوەڵەکانی دەوت: "راستە ئێوە مافتان بەسەر ژنەکانتانەوە هەیە، بەڵام ئەوانیش مافی خۆیان بەسەرتانەوە هەیە".

شاژنی ئوردن، شاژن نوور، ئاماژەی بەوەداوە "ژمارەیەکی کەم لە رۆژئاواییەکان دەرك بەوەدەکەن کەوا ئیسلام لە سەدەی حەفتەمەوە مافی سیاسی و کۆمەڵایەتی و یاسای بە ئافرەتانەوە بەخشیوە، کە ئەو رۆژئاوا هەر گوێشی لێنەبووە، لەڕاستیدا هێشتاکە ئافرەتان لە ولایەتە یەکگرتووەکان و شوێنەکانیتر لەسەدەی بیستەمدا ململانێی بەدەستهێنانی ئەم مافانە دەکەن. هەر لەسەرتاوە ئیسلام لەسەر ئەم مافانەوە بنیاتنراوە، وەك مافی یەکسانی بۆ فێربوون و پەروەردە، خاوەنیەتی، پشك وەرگرتنی میرات، مامەڵەی بازرگانی، و هەروەها ناچارنەکردن لەکاتی زەواجکردن، چونکە هەردوو رەگەز لەبەرامبەر خودای پەروەردگار یەکسانن—کەچی ئەوانیتر لەجیهان ئافرەتیان وەك کاڵا و خواردەمەنی حیساب دەکرد". هیچ شتێك نییە لەقورئان ئاماژە بەقەدەغەکردنی ئافرەتان بکات لە دەنگدانیان لەکاتی هەڵبژاردنەکان، لێخوڕینی ئۆتۆمبێل، تێکەڵ بوونیان لەگەڵ پیاوان لە شوێنی کارکردنی گشتی دەرەوەی ماڵ ( هەروەك خێزانی پێغەمبەر، خدیجە، بازرگانێکی زۆر سەرکەوتوو بوو). ئەو وڵاتانەی کە گەورەترین ژمارەی موسڵمانانی تێدایە—ئەندەنوسیا، هیندستان، پاکستان، بەنگلادیش، و هەروەها تورکیا، هەریەك لەوانە ئافرەتێکیان هەڵبژاردووە وەك سەرۆکی حکوومەتی ئەم وڵاتە، بەمەش نە وڵاتە عەرەبییەکان وەنە ولایەتە یەکگرتووەکان ئەمەیان قەبووڵە.

مردنی موحەممەد لەساڵی ٦٣٢ بووە هۆی هەڵگیرساندنی کۆمەڵێك شەڕ لەسەرئەوەی کە کێ ببێتە خەلیفە و جێگای ئەو بگرێتەوە، دەرئەنجام ئیسلام بەسەر دوو مەعەسکەری گەورە دابەشبوو. بەشی گەورەتری کە پێیان دەڵێن سوننە، سەرەتا پاڵپشتی خەزورانی پێغەمبەریان دەکرد، بەشی دووەم، پێیان دەڵێن شیعە، ئەمانەش لە نەوەی عەلی ئامۆزا و زاوای پێغەمبەردابوون. تاوەکو ئێستاش دوای تێپەربوونی نزیکەی ١،٤٠٠ ساڵە هێشتاکە ئەم دابەشبوونە بەردەوامی هەیە و کاریگەری کردۆتە سەر سیاسەتی جیهانی و هەرێمی. لەزۆربەی هەرێمە سوننییەکان زۆرینەیان پێکهێناوە، بەڵام شیعە زۆرتر و بەهێزترن لەهەندێ هەرێم وەك ئێران، عێراق، لوبنان و بەحرێن، هەروەها کاریگەریشیان هەیە لە سووریا و

ئازربایجان و باشووری ئاسیا. ئەم دابەشبوونە زۆر لـە جیـاوازی بـیرورای سیاسـییەوە دوورە. کەمینەی شیعەکانی نێو ئەو هەرێمانەی کە سوننەی تێدا زاڵە هەمیشە سکاڵای ئەوە دەکـەن کە جیاوازییان لەگەڵدا دەکرێت لێبوردەییان نییە. بە رای سوننییە توندڕەوەکان شیعەکان هەر موسلمان نینە.

دابەشبوونی دووەم، لەنێوان نوێخوازان و موحافیزکارانە، کە کاریگـەری لەسـەر شـیعە و سوننە دەکات. نوێخوازەکان لەسەر رێگای سەرەکی ئیسـلام وەسـتاون بـەدوای ئاشـتبوونەوە "عەقلانی" و باوەڕی ئایینی دەکەون. ئەوان حەزدەکەن ئـارامتربن بـۆ پێکـەوە ژیـان لەگـەڵ حکوومەتە عیلمانییەکان، زیاتر قەناعەت بکەن بە بەهای پەروەردە لەنێو زانست و ماتماتیك و مێژوو و زمانەکانی دەرەکی، لیبراڵترین لەمامەڵەکردنیان لەگەڵ ئافرەتـان، زیـاتر حـەز بـە لەباوەشـگرتنی دەزگـا دیموکراتییـەکان بکـەن. موحافیزکارەکـان سـوورن لەسـەر زیـاتر کۆنترۆڵکردنی مەسەلە خێزانییـەکان وەك جیاکردنـەوەی رەگـەزەکان، بـەرگریکردنی نەریتـە دەرەکییەکان.

وڵاتی عەرەبی سعودی ماوەیەکی زۆرە وەك سەنتەرێکی سوننی موحافیزکـاری ئیسـلامی خزمەت دەکـات، کـە لەلایـەن بزووتنـەوەی ئـایینی وەهـابی ( یـاخود سـەلەفی) لەسـەدەی هەژدەمەوە کاریگەرە. شۆڕشی (١٩٧٩)ی ئێران بووە هۆی نیشانکردنی شیعەی موحافیزکار ئێران وەك ئەوەی ئەمڕۆکە هەیە بووە: مەیدانی شەڕی نێوان موحافیزکاران و نوێخوازان بووە.

موسڵمانەکان هەموویان لەسەرئەوە رازین قورئان قسەی خودای پەروەردگارە بەڵام جیاوازن لەسەر تەفسیرکردنی ئایەتە دیاریکراوەکان و جێبـەجێکردنیان بـەپێی دەقەکانـەوە. بۆمـاوەی چەندین سەدەیە، پراکتیزەکردن یاخود ئەوەی کـەناوینراوە *ئیجتیهـاد* کـە لەلایـەن بیرمەنـدە ئیسلامییەکانەوە بـەکارهاتووە بـۆ تەفسـیرکردنی رێسـا یاسـاکان لـە دەقـە نوێیەکانـەوە و جێبەجێکردنیان و بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەنێو زۆرێك لە ئیمپراتۆرییەکانی بێزەنتین و فارسـەوە تا بەرەو ئیسـپانیا، بـاکووری ئـەفریقیا، تورکیـا، هیندسـتان، ئاسـیای ناوەڕاسـت، وە دوای ئەوانیشەوە هەڵکشاوە. ئەم فراوانبوونـەی یارمەتیـدەر بـوو بـۆ کۆکردنـەوەی بارودۆخـەکانی کڵێسەی مەسیحی و دەزگاکانی ئایینەکانیتری ئەم سەردەمە. ئیسلام داوا لـە دواکەوتـەکانی ناکات بە قەبووڵکردنی یاخود تێگەیشتنی لاهوتییەکی زەحمـەت وەك سـێیانە (Trinity).

هەموو ئەوەی لێیانی داواکردبوو ملکەچکردنە بۆ خودای پەروەردگار، بەجۆرێك هەموو کەس دەتوانێ راستەوخۆی قسەی لەگەڵ بکات. بەپێی قسەکانی یەکێك لە مێژوونووسەکان دەیووت

ئیسلام" دەرگای رزگاربوون بەسەر جیهانێکی فراوانی نائومێدی و دابەشبوونی خیانەتکاری و بەرگەنەگیراوەکان کـردەوە بۆئـەوەی برایـەتی زیادببێـت و شایسـتەکردنی مرۆڤـەکان بگاتـە ئەوپەری بۆئەوەی بگەن بە بەهەشت...هەروا یەکسانی هاورێیەتی و شادییەکی ئاسان دەست بکـەوێت". ئـەم ریفۆرمخوازانـە جێگـای رەخنـەی رۆژئـاوان، بـەڵام موحافیزکارەکـان بـەوە تاوانبـاردەکرێن کـەوا بـۆ بەرژەوەنـدی رۆژئاواییـەکان کاردەکـەن، بـۆلاوازکردن و رووخـانی رۆحییەتی ئیسلامی راستەقینە. هەر لەوکاتەی سوننییەکان بێبەش بوونە لە ناوەندی هەرەمی کەهنوتی، بانگەشەکردن بۆ کوفر زۆر بەدەگمەن چارەسەر دەبێ.

ئەورووپای مەسیحی، لە شـەڕەکانی لەگـەڵ موسـڵمانەکان لەزۆربـەی کاتـەکانی چـەرخی ناوەڕاست دەترسا، هەروەها وەسیەتی بۆ ولایەتە یەککگرتووەکانیش کـردووە تـاوەکو بـەگومان بێت لەبەرامبەر ئیسلام. زۆربەی ئەمەریکییەکان ئەم ئایینە بـە ئـایینێکی غـەریب و ئـاڵۆز وەردەگرن جیاواز لەگەڵ نەریتی مەسیحی و جوولەکـە کـە زۆر پێیانـەوە ئـارام و مورتـاحن. لەساڵانی (١٩٦٠)ی سەدەی رابردوو، نەتەوەی ئیسلام ناوبـانگێکی خراپیـان لـەنێو ولایەتـە یەککگرتووەکانەوە بۆخۆیان تۆمارکرد ئەمەش بەهۆی گفتوگۆیان لەسـەر سـەرکردایەتیکردن و تووڕەبـوون و جوداخوازییانـە. زۆربـەی ئەمەریکییـەکان سەرسـام بـوون کـاتێ گوێبیسـتی راگەیاندنی ئیسلام بوونی وەرزشەوانەکانیان بوون وەك، کاسیۆس کـلای ( موحەمـەد علـی) و لیۆ ئەلسیندۆر ( کەریم عەبدول جەبار) هەروەها بە شانازیشەوە ناوی خۆیان گـۆڕی " بـەناوە بەندییەکان" یاخود ئیسـلامییەکان. ناونـانی وەك موحەمـەد عـەلی وەك تەحەددایەکـە بـۆ ئیسلامبوونی، دەیووت: " مـن ئەمـەریکیم، بەشـێکم ئێـوە نایناسـن. بـەڵام تـەنها بـۆمن بەکاردێت. من کەسێکی رەش پێستم بە برِوا و بەدەنگەدەنگم، نـاوم وەك نـاوی ئێـوە نییـە، ئایینم وەك ئایینی ئێوە نییە. ئامانجم تایبەتە بەخۆمـەوە، دوورە لـەئامانجی ئێـوە". لەسـەر ئاستی نێودەوڵەتی، ئەو هەستە زەحمەتییەی ئەوەی کەوا ئیسـلام لەلایـەن گـەماڕۆی نـەوتی عەرەبی، و ئاژاوەیی پیاوانی ئایینی ئێرانی و ترس و تۆقینەکانەوە بەهێزدەبێت.

هەرچەندە، ئەم مەسەلانە ناتوانن رێگربن لەبەردەم ولایەتە یەککگرتووەکان بۆ باشـترکردنی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کەزۆرینەی دانیشتوانەکەی موسڵمانن. هـەر لەسەرەتاوە سیاسەتی ئەمەریکا نەگۆڕبووە بەرامبەر رەتکردنەوەی هـەر بیرۆکەیـەکی شـەڕی کلتووری. لە یەکەم ماوەی سەرۆکایەتییەکەیدا، بیـل کلینتـۆن بـە پەرلـەمانی ئـوردنی وت: "هەندێ کەس هەنە سوورِن لەسەر ئـەوەی کـە لـەنێوان ئەمـەریکا و خۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـت

بەربەستی ئایینی حەتمی هەیە کە هەرگیز ڕێگا بەگونجانی ئەم دوولایەنە نادات، بەجۆرێك بڕوا و کلتوورەکانمان ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. بەڵام من لەو بڕوایەم ئەوانە بەهەڵەدا چوونە. ئەمەریکا ڕەتی قەبوولکردنی ئەوە دەکاتەوە کە شارستانییەتەکەمان هەرگیز تووشی پێکدادان ببێتەوە لەگەڵ شارستانییەت و باوەڕەکانیتر.

ئیدارەکەی کلینتۆن زۆر جەختی لەسەر ئەم بابەتە دەکردەوە چونکە ئێمە دەمانویست عەرەب و موسڵمانەکان بە ڕوێکی پڕاکتیکییەوە سەیری داهاتوو بکەن نەوەك ئایین بە رووخساری یەکەم دابنێن ئینجا هەموو شتەکان لەم ڕوانگەیەوە سەیربکەن. بەو هیوایەشیبووین کە خۆمان ئازاد نیشانبدەین لە لایەنگیری کردنی دژی ئیسلام. ئەمەش بەتەواوەتی ئەوپەڕی دلسۆزی و ڕاستگۆییە. ئێمە بە کارێکی ناڕەوا و دوور لە نۆڕمالیتی سەیری تیرۆریزمان دەکرد. هەروەك چۆن هیچ شتێ نییە لەناو مەسیحییەت دەربارەی توندوتیژی دەمارگیری کوکلوکس کلان، هەروەها هیچ شتێکیش نییە لەناو ئیسلام بەناوی تیرۆریزم. زەحمەتە بەهۆی کاری توندوتیژی هەندێ کەسانی سەرەڕۆ و ناتێگەیشتوو لە ئیسلام ناوی ملیارێك و سێ سەد ملیۆن خەڵك بەلاوە بنێی و وەك ئەم کەسانە حیسابیان بکەیت. قورئان ئاماژە بە قەدەغەکردنی کوشتنی تاکە کەسێکی بێگوناه دەکات بەجۆرێك وەك ئەوە وایە تۆ هەموو مرۆڤایەتیت کوشتبێ. ئەم قسانە نەیتوانییەوە دەمی ئەو خەڵکانە بگرێت کە ئیسلام وەك " شەڕانگێز و خراپە" یاخود موحەممەد وەك " تیرۆرست" ناودەبەن(*). ڕەخنەگران بەخوێندنەوەیەکی دیاریکراوەوە، ئاماژە بەم ئایەتانەی قورئان دەکەن کە ڕێنمایی موسڵمانان دەکات بۆ بەکارهێنانی هێز لەدژی دوژمنانی ئایین، ئەم ڕێنماییانە کەوا لە

---

(*) بابە جێری فۆلوێل، موحەممەد بە "تیرۆرست" ناودەبات. بابە فرانکلین گراهام ئیسلام وەك " شەڕانگێز و خراپە" ناودەبات. دواتر گراهام دەیووت، " من ڕێزی ئەو کەسانە دەگرم کە هەڵگری بیروباوەڕی ئیسلامین و هاتوونەتە ئەم وڵاتە. هاوڕێی موسڵمانم هەیە. بەڵام ئەوە هەرگیز ڕێگام لێناگرێ لە یارمەتیدانیانم. بەدڵنیاییەوە من باوەڕم بەوە نییە کە ئەوان باوەڕیان پێی هەیە، و هەروەها ئەوانیش باوەڕ بەو ناکەن کەمن باوەڕیم پێی هەیە. بەڵام ئەوەش ناتوانێ وام لێبکات رقیان لێهەڵگرم، بەڵکو زۆریش خۆشیانم دەوێ. حەز دەکەم هەموو جۆرە یارمەتییەکیان بدەم ئەوەی کەخۆم دەمەوێ... دەمەوێ زانیارییان لەسەر عیسای مەسیحەوە هەبێ، بەڵام ناچاریشیان ناکەم لەوەی زانیاری لەمبارەیەوە بزانن. زۆر حەزدەکەم ڕۆژێك دابێ موسڵمانەکان لەو کارانە ئاگاداربن کە مەسیحییەکان ئەنجامی دەدەن.

توندڕەوەکان دەکات—ئەوانەی حەزدەکەن هەمیشە دەنگیان بەبەرزترین ئاست قەبوولبکرێت— بتوانن قۆرخی هەلۆیست بکەن و پاساو بۆ کردارەکانی خۆیان بێننەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زمانی توندوتیژی و خوێناویش لەنێو کتێبی پیرۆزی تەورات ئەوەی کە مەسیحییەکان بە پەیمانی کۆن (العهد القديم) ناوی دەبەن هەیە. کتێبەکانی جۆشوا و دادوەرەکان کەتەلۆگی شەڕە پیرۆزەکان دەبەخشن، و هەروەها (Deuteronomy) پاڵپشتی لە کۆمەڵکوژی دەکات بەناوی خودای پەروەردگار[*]. لە پەیمانی نوێدا عیسای مەسیح هۆشداری دەدات بەوەی، " بیرلەوە مەکەنەوە کە من هاتبم بۆئەوەی ئاشتی بێنمە سەر زەوی: و نەشهاتووم تاوەکو ئاشتی بنێرم، بەڵام شمشێرێك". هەروەك لە کتێبی سروش، ئەم وتەیە دەکرێ بەچەندین ڕێگا تەفسیر بکرێ بەڵام بانگەشەی ئاشتی ناکات.

قورئان بەماوەی دوو دەیە ساڵ کۆکرایەوە، بەڵام تەوراتی جوولەکەکان بە چەندین سەدە کۆکرایەوە. هەروەها پەیمانی نوێ بەنزیکەی سەد ساڵێك کۆکرایەوە، لەنێو ئەم دەمەتەقێیەدا وتەی کێ ماوەتەوە و وتەی کامەیان دوورخراوەتەوە. لەهەر کتێبێکدا گۆڕان لە کەساکانەوە دەبینرێ.

بۆدروستکردنی دۆگمایەك لە هەندێ قسەی وەرگیراوەوە کارێکی سەفسەتییە. خوێنەر بەدوای زمانی دەمارگیری و شەڕکردن لەنێو تێکستە پیرۆزەکانەوە دەگەڕێ و دەیاندۆزێتەوە جا تێکستەکان هی مەسیحی بێ، ئیسلامی، وەیاخود جوولەکە. بۆ ئاگادری دەبێ هەر یەك لەم کتێبە پیرۆزانە زۆر بە دادگەرییانەوە بخوێندرێتەوە و دیراسەیان بۆ بکرێ هەروەك بە پێی کات و شوێنی خۆیانەوە وەربگیرێن. بۆیەش نەوەی عولەمایەکان کاری زۆریانکردووە بۆ ئاماژەدان بە نووسینە ئەساسییەکان، تەفسیرکردنی جیاوازییەکان، ڕوونکردنەوەی ئالۆزییەکان، ڕاستکردنەوەی وەرگێڕدراوە هەڵەکان، و هەروەها دۆزینەوەی دەستەواژە گرنگ و نادیارەکان.

بەپێی ئەزموونی کارکردنم زانیاریم لەسەرئەوە هەیە کەوا ئەوانەی لێپرسراویەتی سیاسەتی دەرەوەی ولایەتە یەکگرتووەکانیان بەدەستەوەیە وایان دەوێ کەوا ئاراستە ئایینییەکان بەم ڕێگایانەوە وەربگێردرێن کەببێتە هۆی کەمکردنەوەی مەترسییەکانی ناکۆکی نێودەوڵەتی—

---

(*) بۆنموونە، لە (Deuteronomy) 20: 16-17: ئەو خەڵکانەی کە خودای باڵادەست، میراتێکی پێبەخشیون، لەسەرتان، پێویستە هیچ شتێ بە زیندوویی نەهێڵنەوە، ئەوەی هەیە تێکیبشکێنن: ئەوانیش، (الحثيون والاموريون والكنعانيون والفرزيون والحوين واليبوسيون).

ئەمـەش هیوایـەکی بەتاڵـە. دوو بیرۆکـە بوونەتـە هـۆی دروسـتبوونی کێشـە. یەکـەمیان بانگەشەکردنە بەوەی دیاری خودای پەروەردگار بەخشینی زەوییە بە ئیسرائیل هەروەها پێدانی ئەم رووخسەتەیە بەوەی مافی فەڵەستینییەکان پێشێل بکرێت. بەرامبەر ئەم بیرۆکەیە ئایەتی قورئانی هەیە کە هانی موسڵمانان دەدات شەڕ لـەپێناوی وەرگرتنـەوەی زەوی داگیرکراوەکـان بکەن. خالد ئەل فەزڵ، " بەپێی هەندێ لە زانایـانی فیقـە ئـەو شـوێن و ناوچـە و هەرێمـەی هەمیشە موسـڵمانەکان فـەرمانڕەواییان تیـاکردووە تاهەتایـە بـۆ خـاك و زەوی موسـڵمانان دەمێنێتەوە".

ئەم رێباز و ئاراستانەی، کـە بەشـێوەیەکی کـوێرەوەری و دوورلـە فێرکردنـی کەسـانیتر، بەخوێنـەوە نووسـراونەتەوە. مێـژوو هـیچ ماددەیـەکی سـۆزداری لـەنێوان ئایینەکانـەوە بەجێنەهێشتووە. هەروەها زۆریشی ناوێ بە رێنیشاندانی خەڵکەکـە بـە روانینـی توندڕەوانـە بەوەی کە عەقیدەکەیان لەمەترسی هێرش کردنـە سـەردایە هـەروەها ئـەرکیان بەرگریکردنـە بەهەر رێگایەکی دیاریکراو.

**(٩)**

## خاكی پیرۆز، بەڵام هی كێیە؟

لە ٢ ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٧، ئەم رۆژە بەدیاریكردنی سەرەتایەك بۆ چەرخێك (ماوە)یەكی نویٚ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دادەنرێت، ئەم رۆژە بۆ هەندێكیان رۆژێكی درێژی- چاوەڕوانكراو و دوعابۆكراوە، بەڵام بۆهەندێكیتر رۆژێكی بەترس و دوعا لەدژ كراوە. نامەیەك كە لەلایەن وەزیری دەرەوەی بەریتانیا، ئارتر جێی. بلفۆر، واژووكراوە، ئەمەش دەقەكەیەتی:

*خاوەنی شكۆ حكوومەت بەچاوێكی سۆزەوە سەیری دامەزراندنی نیشتیمانێكی نەتەوەیی جوولەكە لەناو فەڵەستین دەكات، و هەروەها بەكارهێنانی هەموو رێگایەك بۆكارئاسانی ئەم ئامانجە. زۆر بەئاشكرا روونكراوەتەوە كە هیچ شتیٚ ناكریٚ بۆ لایەنگیركردنی مافە ئایینی و مەدەنییەكانی بوونی كۆمەڵگاكانی خەڵكی ناجوولەكە لە زەوی فەڵەستینی.*

لەدوای جەنگی جیهانی یەكەمەوە، كۆمەڵەی نەتەوەكان بەریتانیای راسپارد بۆئەوەی فەرمانڕەوایی فەڵەستین بكات، دەسەڵاتی سیاسی لەخاكی پیرۆز لەدەستی موسڵمانەكان بۆ یەكەمجار وەربگیرێتەوە لەدوای سەركەوتنی سەلاح الدین لە سەدەی دوانزەمدا. راگەیاندنی بەڵێنی بلفۆر بووە سیاسەتێكی رەسمی، رێگادان بە هێزی رۆژئاوایی بۆ هاندان و بەشەرعیكردن و پاراستنی كۆچكردنی جوولەكەكان. مەسیحییە كاریگەرییەكانیش بەدوای ئەم گۆڕینە مێژووییەدا دەگەڕێن كە بەرهەمی چەندین دە ساڵەی فشارەكانی زایۆنییە. لەساڵی ١٨٩١، سكاڵانامەیەك - یادگاری بلاكستۆن(*)- ئاڕاستەی سەرۆك بینیامین هاریسۆن و

---

(*) ئەم یادگارییە كە لە كۆنفرانسێكی مەسیحییەكان و جوولەكەكانەوە كە لە ولایەتی شیكاگۆوە سازكرابوو سەری هەڵدا لەلایەن ولیەم ئی. بلاكستۆنەوە رێكدەخرا، كە بازرگانێكی بەرچاو و بەرپرسی كاروباری ئینجیلی بوو. بلاكستۆن خۆی وەك خزمەتكارێكی بچووكی خودای پەروەردگار حیساب دەكرد، پڕفرۆشترین نامیلكەی نووسی، بەناونیشانی " مەسیح دەگەڕێتەوە" وەسفی گەڕانەوەی جوولەكەكان بۆ ئیسرائیل دەكات وەك مەرجێكی پێشینە بۆ هاتنەوەی دووەمی مەسیح.

سەرکردەکانیتری جیهان کرا کە ناچاری سازدانی کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتییان کرد بۆئەوەی دەوڵەتێکی جوولەکە دابمەزرێنن. سەدان ئەمەریکی بەناوبانگ واژوویان لەسەر ئەم سکاڵانامەیە کرد، لەوانەش سەرۆکی دادی ولایەتە یەکگرتووەکان، سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران و جۆن دی. رۆك فێلەر و هەروەها جێی. پی. مۆرگان. سکاڵانامەکە ئەوەنیشان دەدا کە هێزە سەرەکییەکان هەرئێستاکە بە "کۆشش دەست کەوتوونە" لە بەلگاریا، سربیا، رۆمانیا، مۆنتێنگێرۆ، و هەروەها یۆنان " لە تورکەکانەوە" گەڕانەوەیان " بۆ خاوەنە راستەقینەکانیان". پرسیار دەکرێ، بۆچی فەڵەستینییەکان نیشتیمانی جوولەکەکان نادەنەوە، خۆ ئەگەر بەگوێرەی دابەشبوونی نەتەوەکان بێ لەلایەن خوداوە ئەوە نیشتیمانی خۆیانە".

بۆ بێ ئومێدی داهاتووی نەوەی دیپلۆماتکارەکان، نە یادگارییەکەی بلاکستۆن و نە بەڵێنی بلفۆر هیچ مەسەلەیەکی یەکلایکەرەوەیان باس نەکردووە. ئایا بە وردی چۆن دەکرێ دەوڵەتێکی جوولەکە بەبێ هەبوونی لایەنگری یاسایی و رەچاونەکردنی مافە ئایینی و مەدەنییەکان و لەسەر کۆمەڵگایەکی دوور لە نەتەوەی جوولەکە دروست بکرێت؟ بەڵێننامەی بلفۆر لەم رووەوە هیچ گرنگییەك بەم مەسەلەیە نادات. بلفۆر دەڵێ، "زایۆنیزم" رەگی لەم نەریت و پێداویستییەکانی ئێستا و هێوای داهاتووی داکۆتاوە ئەمە باشترە لە خۆزگەی ٧٠٠،٠٠٠ عەرەب کە لە ناوچەکەوە جێگیرن". بلفۆر زۆر بەتیژی وەڵامی دایەوە کاتێ دیپلۆماتی بچووك تێبینی ئەوەی کرد، " لەبەرخاتری خودا، با بەموسڵمانەکە نەڵێین لەوەی کە پێویستە بیر لەچییەوە بکاتەوە. نازانم بۆچی هێزی ئاسمانی یاخود هەر هێزێکیتر بەرهەڵستی قسەکانی ئێمە دەکەن لەوەی کە موسڵمانەکە ئەرکە لەسەری بیرلەدژی بکاتەوە"

کەمتر لە سێ دەیە ساڵ، جەنگی جیهانی دووەم نزیك بوو کۆتایی بێت، ولایەتە یەکگرتووەکان خەریك بوو جێگای بەریتانیای گەورە بگرێتەوە ئەو ولاتەی کە کاریگەرییەکەی بەسەر جیهانەوە زۆر بوو. بۆ بەرز راگرتنی سەقامگیری رۆژهەلاتی ناوەڕاست، سەرۆك فرانکلین رۆزێڤڵت بە نهێنی لەسەر کەشتییەکی جەنگی نزیك کەناڵی سوێس چاوی کەوت بە ئیبن سعود، پادشای ولاتی سعودیا. سەرۆك هەوڵی رازیکردنی ئیبن سعودی دەدا بۆئەوەی پاڵپشتی لە دۆزی ئیسرائیل بکات لەناو خاکی فەڵەستین. هەرچەندە کورسییە جوولاوەکەی رۆزێڤڵت زۆر سەرنجی پادشای بۆلای خۆی راکێشابوو، هەرگیز ئەمەی لەپێشتر نەبینیبوو، بەلام قسەکانی سەرۆك هیچ کاریگەرییەکیان بەسەر بڕیاری پادشادا نەهێنا. وتی: "با دوژمن و ستەمکاران باجەکەی بدەن. پێویستە تاوانبارەکان باجی هەڵەکان بدەنەوە لەوەی کەسانی

دووره پەرێزی بێگوناه. ئایا عەرەبەکان چ ئازارێکی جوولەکەکانی ئەوروپای داوه؟ ئەوه مەسیحییەکان بوون کەوا ماڵ و ژیانیانی لە ئەڵمانیا لێ دزین". رۆزێڤڵت زۆر هەستی بەبێ ئومێدی کرد لەم رەتکردنەوەی پادشا، بەڵام هێشتاکە هەوڵ دەدات بۆ رازیکردنی بەوەی، "من هیچ هەنگاوی کرداری لەبەرامبەر فەڵەستین ناوێم تاوەکو راوێژ لەگەڵ عەرەبەکان نەکەم. هەروەها کورسییە جوولاوەکەی خۆیشی بە دیاری پێشکەش بە پادشا کرد. دوای دوو مانگ رۆزێڤڵت مرد. بەبیرم دێتەوە دوای ئەم هەموو گەشتەم کە بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجامم دەدان، سەرکردە عەرەبەکان بەڵێنەکەی رۆزێڤڵتیان لەبیرنەدەچوو هەمیشە دەیان وتەوە کە بەڵێنەکەی هیچ ڕێز و شەرەفێکی تیانەبوو. دەتوانم بڵێم ئەوان لەسەر ئەم بابەتەوە نیوە راستن. وەزارەتی دەرەوە راوێژی زۆری لەم رووەوە کردووە دەرباەوەی کۆچبەرانی جوولەکەی ئەوروپا بۆ فەڵەستین، بەڵام نەدەگەیشتنە هەوڵوێستێکی دوولایەنە. عەرەبەکان دەیانەوێ ئەم کۆچکردنە بوەستێت، سەرۆك ترۆمان هەستی بە ئەرکێکی ئەخلاقی کرد، دوای ئەم هۆڵەکۆستەیە پالپشتیکرد. لە مایسی ١٩٤٨ کاتێ راسپاردەکەی بەریتانیا ئیکسپایەر بوو ئیسرائیل سوودی لەم کاتە وەرگرت و سەربەخۆیی خۆی راگەیاند هەروەها ئەمەریکاش یەکەم وڵات بوو ئیسرائیلی وەك دەوڵەت ناساند. عەرەبەکان سکاڵای ئەوەیان دەکرد کەوا عەرەب راوێژی لەگەڵ نەکراوە، ترۆمان جەخت لەوە دەکاتەوە کەوا بڕیارەکەی کارێکی سەرسوڕمان نییە.

راگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆیی ئیسرائیل وابە بەهێمنی بەسەرنەچوو. سوپای عەرەبەکان دەستیان بەهێرشکردنە سەر ئەم نەتەوە نوێیە کرد. شەڕەکە بووە هۆی بەجێهێشتنی سەدان هەزار هاووڵاتی فەڵەستینی لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان، زۆربەیان لە کەمپی پەنابەران لە ئێستای ئوردن و لوبناندا خۆیان گرتەوە، تا ئێستاش  ژمارەیەکی زۆر لەنەوەکانیان لەم شوێنە دەژین. لەساڵی ١٩٦٧ شەڕی دووەم، کە تەنها شەش رۆژی خایاند، بووە هۆی فراوانکردنی ئەو ناوچانەی کە ئیسرائیل کۆنترۆڵیکردبوون دوای ئەوەی لەزۆربەی گۆڕەپانەکانی شەڕ سوپاکانی عەرەبی بەزاند. هەواڵی سەرکەوتن لەهەموو شوێنێك بڵاوبۆوە. مێناجم بیگن، سەرۆکی پارتی هێروتی پارێزگارانی ئیسرائیلی، فەرمانیدا هەرچی زووە بیگەینە ئەو شوێنەی کە پەیکەری پێغەمبەر سولەیمانی تیا بەرزکراوەتەوە. بۆیەکەمجارە لەماوەی دێرینیدا ئەو خاکە پیرۆزە بکەوێتە ژێر دەستی ئیسرائیلی. بیگن بەهاوڕێیەتی سەرکردەکانیتری پارتەکان سوپاسگوزار بوو و دوعای کرد.

*لەم نیشتیمانەدا نەوەیەکی زۆرباش سەری هەڵداوە..لە جەنگاوەران و پاڵەوانان. کاتێ هەنگاو بەرەو رووی دوژمنان داوێن دەنگدانەوە لەنێو دڵی نەوەکان بەتەواوی خولدەخواتەوە، بانگێك لە باوکی پێغەمبەرانەوە، رزگارکەری ئیسرائیل لەژێر دەستی بەندایەتی مسری: "ئەی خودایە دوژمنەکانت لەبەردەمتدا بڵاوەیان پێبکەو پارچە پارچەیان بکەی" . بەڵێ پارچە پارچەمان کردن و هەڵاتن.*

دوعاکانی بیگن رەنگدانەوەی قووڵترین خۆشەویستی خەڵکانێکە کە زیاتر لە ۲۰۰۰ ساڵ لەئاوارەیی و دەربەدەری و ئەزیەتدانەوە ژیان بەسەر دەبەن، دوور لە نەریت و باوەڕ و خەونەکانی گەڕانەوەیان بۆ نێو باوەشی مێژوویی نیشتیمانیانەوە. هەروەك بابلییەکان، یۆنانییەکان، سریانەکان، رۆمانییەکان، موسڵمانەکان، و هەروەها داگیرکارە مەسیحییەکان ئەوانەی پێش ئەوان لە قودس بوون، بیگن بەزمانی سەرکەوتنەوە قسەی دەکرد. بەڵام یەك لایەن دەبێ سەربکەوێ، لایەنەکەیتر دەبێ ببەزێنرێت. شەڕی ۱۹٦۷ بووە هۆی فراوانکردنی دەسەڵاتی جوولەکەکان بەسەر زەوییەکی زۆری کۆنترۆڵکراو لەلایەن عەرەبەکانەوە بەمەش وایکرد ئیسرائیل ببێتە خاوەنی قودسی رۆژهەڵاتی عەرەبی. لەزۆربەی شوێنەکان، بەتایبەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کاردانەوەی هەرکەسێك کە شتێکی لەدەست دابێ، هەوڵدانیەتی بۆ گەڕاندنەوەی.

لەناوەڕاستی ساڵانی ۱۹۸۰ یەکەمجار بوو سەردانی شاری قودسم کرد. لەلای پەنجەرەی ژوورەکەم لە هۆتێل وەستابووم سەیری یەکێك لە سەرنجڕاکێشترین دیمەنی جیهانم دەکرد—ئەویش قوببەی بەردین بوو کە بە دیوارەکانی شاری کۆنەوە دەورەدراوە، پیرۆزترین شوێن لەپیرۆزترین شار. ئەم کاتەش زۆر بەهێمنی لە مێژووی ئیسرائیلەوە تێپەڕ دەبوو چونکە هێشتاکە راپەڕینی فەلەستینییەکان دەستی پێنەکردبوو. هەستەکانم بەهۆی چڕی دەنگەدەنگ و رووناکی و سۆزەوە پڕببوون. هیچ شتێ یارمەتی نەدەدام، جگە لە کاردانەوەی ئەم مێژووەی کە لەبەردەممدا روویاندەدا، لەنێو کۆڵانە تەسکەکان، لەنێو بیستانە زەیتونەکان، لەسەر چوارچێوەی گردەکان.

کڵێسەی قیامەتی پیرۆز ۹۰۰ ساڵ پێشتر لەلایەن خاچ پەرستەکانەوە بنیاتنرایەوە، شوێنێك بەپێی نەریتەکان، گوایە کاتی خۆی لاشەی مەسیح لێرەوە لە خاچەکەی هێنراوەتە خوارەوە. منیش دەستم لەسەر ئەو شوێنە دانا کە پێیان وتبووم ئێرە ئەم شوێنەیە کە مەسیحی لێ لە خاچ دراوە. هەستم بە ترس دەکرد لەوەی بپرسم ئایا کەس هەیە تەواو لەوە

دڵنیابێت کە ئەم شوێنە خۆیەتی، هەستم بە لەرزین دەکرد. ئەزموون لەگەڵ تێپەڕبوونی کات لاواز دەبێ بەهۆی مێژووی رووداوی سەیر لەنێو کڵێسەکە بەهۆیەوە کڵێسەکە دابەشکرابوو. گرووپە مەسیحییەکان شەڕیان لەسەر شوێنێك دەکرد کە بۆ یەکەمجار دیاریکراو بوو، بەڵام ئەمڕۆکە شوێنەکە دابەشکراوە لەلایەن شەش گرووپەوە کۆنترۆڵ دەکرێ یۆنانییەکان، فرانسیسکانەکان، ئەرمەنییەکان، قوپتەکان، ئەسیوبییەکان، و هەروەها سوورییەکان. کەچی کلیلە سەرەکییەکە لەلایەن موسڵمانەکانەوە پارێزراوە چونکە مەسیحییە جۆراوجۆرەکان زۆر بڕوایان پێی هەیە لەوەی خۆیان بڕوایان بە یەکتر هەبێ[1] .

هەر لەنزیك کڵێسەکەوە ئەو شوێنەبوو کە سولەیمان پێغەمبەر مەعبەدێکی لێ دروستکردووە، بیگن نوێژی تیاکرد. ئەم شوێنە پیرۆزە یەکەم شوێن بووە دوای دەربەردەری جوولەکەکان لە بابل نۆژەنکرایەوە، دواتر لەلایەن پادشا هێرۆدەوە دووبارە چاککرایەوە. لەسەدەی یەکەمدا رۆمانییەکان هەڵسان بە وێرانکردنی تەواوی شارەکە جگە لەدیواری دەرەوەی نەبێ، وەك خۆی بەجێیان هێشت لەبەربوونی مەعبەدەکەی سولەیمان. ئەم پێکهاتەیە، تاوەکو ئێستاش هەرماوە، لەلایەن ئایینی جوولەکەوە زۆر پیرۆزە. من وەك پیاوێکی ریشدار سەیری دەکەم سەری داپۆشیوە بە خۆیی و بە شاڵی نوێژکردن و لەبەرامبەریەوە وەستاوە و هەندێ وەرەقەی لەنێوان بەردەکانیەوە جێهێشتووە.

جوولەکە ئایین پەروەرەکان رۆژانە دوعای لەبەرامبەریەوە دەکەن، " خودایە پەرستن بگەڕێنیتەوە نێو مەعبەدی زایۆنی خۆت"[2] . بەشێکی زۆر لە یاسای جوولەکە تەرخانکراوە بۆ ئەو قوربانییانەی کە بۆ ماوەی چەند سەدەیەکە لەنێو ئەم مەعبەدەیە خوێنیان رژاوە. سامانەکان لەنێو سندووقی زێڕەوەن بە دە وەسایەکانەوە قوفلدراوە و بەو باوەڕەی کەوا

---

(١) توندوتیژی لەنێو کڵێسەی قیامەتەوە لەم دوایانە لە سێپتەمبەری ٢٠٠٤ دا وە بەرپابوو، کاتێك یۆنانییە ئۆرتۆدکسەکان و راهیبەکانی فڕانسنکان لەفیلمێکدا گیرابوون لەوکاتەی بەراکێشان و شەق تێهەڵدان و مست وەشاندنەوە رووبەڕووی یەکتر دەبنەوە.

(٢) ئەمە لە ئامید وەرگیراوە، یاخود لەنێو نوێژ وەرگیراوە، کۆمەڵێکە لە سوپاسکردن و شوکرکردن. خەڵك رووخسارێکی سوپاسگوزاری دەبێ لە ئاراستەکردنی ئیسرائیل ئەگەربێتو لەدەرەوەی ئیسرائیل بن، لە ئاراستەی قودس دەبێ ئەگەربێتو لەئیسرائیل بن بەڵام لەدەرەوەی قودس، و یاخود لەئاراستەکردنی مەعبەدی چیایی ئەگەربێتو لەنێو قودس بن.

نوێنەرایەتی جێبەجێکردنی بەڵێنەکەی  خودای پەروەردگار بۆ ئیسرائیل دەکات "بەلەمەکەی نوح پێغەمبەر".

لەژێرەوەی دیواری گەورەی رۆژئاوادا، رێگایەك هەیە بەرەو سی و پێنج شوێنی نافورە و باخات و بیناياتی بەرزت دەبات کە جوولەکەکان ناویان لێناوە پەیکەری چیایی، کەچی موسڵمانەکان ناویان ناوە هەرەمی پیرۆز، یاخود " شوێنی پیرۆزی خانەدانەکان". دوای ژاوەژاوەیەکی زۆری نێو شار دووبارە هێمنی باڵی بەسەر ئەم شارە کێشایەوە. دەنگی ئاو بەنەرمییەوە دەبیسترا وەك ئەوانەی کە تازە خۆیان بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن ئامادە دەکەن. ناو ژووری مزگەوتی ئەقسا زۆر ساردبوو بە ستوون و رووناکییەکانی ناوەوەی رازانرابۆوە. ئەم هەرەمەش لەکۆتایی سەدەی حەڤدەمدا لەلایەن موسڵمانەکانەوە دروستکراوە. ئەم شوێنە پیرۆزە بۆ یادگاری ئەم شەوە دروستکراوە کاتێ موحەممەد شەورۆیی لەمەککەی پیرۆزەوە بۆ شاری قودس کرد (*ئەقسا* وەك "ماوەیەکی دوور" وەرگێردراوە). بەگوێرەی کلتووری ئیسلامییەوە، موحەممەد شەوی سەرکەوتنی بۆ ئاسمانەکان لەم گردەی ژێر ئەم قوببە زێڕینەوە دەست پێکردووە. کلتووره جیاوازەکانی جوولەکە لەو بڕوایەدانە کەوا ئەم گردە خودای گەورە وەك بناغەیەك بۆ بنیاتنانی ئاسمانەکان و زەوی دروستی کردووە، یاخود ئەم کڵێسەیەی کە ئیبراهیم پێغەمبەر کە بەنیاز بوو منداڵەکەی خۆی ئیسحاق[٣](٣) بکاتە قوربانی بۆ خودای پەروەردگار، یان شوێنی پشوودانی یەعقووب پێغەمبەر کەتیایدا خەونی بینی و بە پەلیکانەکانەوە بەسەر ئاسمان دەکەوت. بەغەمبارییەوە، خاکی پیرۆز چاوی بڕیوەتە خاکەکەی. لەکاتی هەڵمەتی خاچ پەرستیدا، مەسیحییە سەرکەوتووەکان شێوەی خاچێکیان لەسەر قوببەکە بەرزکردەوە، گردەکەیان بۆ پاڵپشتکردنی خۆیان بەکاردەهێنا، هەروەها داپۆشینی نووسینە هەڵکەنراوەکانی قورئانیان بە تێکستە لاتینییەکان و گۆڕینی مزگەوتی ئەقسا بۆ پێگەیەکی سەربازی. هەرچی ئیمڕۆکەیە گەورە موفتی فەڵەستینییەکانی شاری قوودس داوای ئەوە دەکات کە پەیکەری چیایی و هەموو پێکهاتەکانیتری، بەدیواری گەورەی رۆژئاواشیدا تەنها بۆ موسڵمانەکان شوێنی پیرۆزن. کەچی گرووپی جوولەکەکان بەدوای پاڵپشتیکردن دەگەڕێن بۆ دروستکردنەوەی مەعبەدەکە و گواستنەوەی  مەزارگەکانی موسڵمانان بۆ شوێنێکیتر.

---

(٣) لەروانگەی ئایینی موسڵمانەکانەوە ئیسماعیلی کوڕی بوو نەوەك ئیسحاق (وەرگێڕ).

بەشێوەیەکی ئاسایی کاتێ دیپلۆماسییەکان لەسەر مێزی گفتوگـۆ دادەنیشـن دانوسـاندن لەسەر سنوورێك دەکەن، نەخشەی ئەم شوێنە دەخەنەڕوو و پێشنیازی موسـاوەمەش دەکـەن. لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ئەم شێوەیە بـەس نییـە. ئیسـرائیل و فەلەسـتینییەکان هەریەکـەیان گرنگییـەکی قـوول بـە مەسـەلەکانی ئـابووری و ئـەمنی دەدەن. بـەدەنگێکی بـەرز و هەرەشەکارییەوە باس لە ئەمنیەت، ڕێکخستنەکان، ڕێگاکانی بەدەستهێنانی ئاو، ڕێگاکانی گواستنەوە، کۆنترۆلکردنی مەجالی هاتوچۆی ئاسمانی دەکەن، بـەلام بـۆ دانوسـتکارەکان ئـەم کێشانە لەکاتی پرۆسەی بەخشین و وەرگرتنەوە چارەسەردەبێ. گفتوگۆیە بەسـوودەکان لێـرەوە دەوەستێ، کاتێ لایەنەکان گفتوگۆ لەسەر راستی شـوێنەکانی خۆیـان دەکـەن نـەوەك لەسـەر بناغـەی یاسـاکانی مرۆڤایـەتی و ئـەوانی پێشـووتربێ بـەلکو لەسـەر بناغـەی بـەلێن و مەبەستەکانی خودای پەروەدگارەوەیە.

لەگەل نووسینەوەی ئەم کتێبە، لەسەرەتاکانی سالی ٢٠٠٠، خەونی ئاشتی لەڕۆژهـەلاتی ناوەڕاستدا زۆر دوورتر خۆی نیشانددا. لایەنە فەلەستینییەکان لەدژی یەکتردا پارچـە پارچـە بوون. ئیسرائیلییەکانیش لەلایەن خۆیانەوە گەیشتنە ئەو کۆتاییەی کە ئیتر لایەنی دووەم نییە بۆئەوەی گفتوگۆی ئاشتی لەگەلدا بکەین. زۆربەیان سـەیری دانوسـانەکانی سـالانی ١٩٩٠ی سـەدەی رابردوویـان وەك هەلەیـەك دەکـرد ، ئەنجامەکـەی ئـەوەبوو کـە یاسـر عـەرەفات و بزووتنەوەی رزگاریخوازی فەلەستینی دانیان بە بوونی ئیسرائیلدا نا. بڕوام وایە، راستییەکە زۆر ئالۆزترە. بۆ تێگەیشتن لە ئیحتیمالاتەکانی داهاتوو، زۆر پێویستە چاوپێخشانەوەیەك بکـرێ لەوەی کە چۆن خالی سربوون هاتۆتە بوون.

لەسالانی ٢٠٠٠، کە دواسالی خزمەتکردنمان بوو لەم نووسینگەیە، من و سەرۆك کلینتۆن و دانوستکار دێنیس رۆز، ململانێی زۆرمان کرد لەگەل نوێنـەرانی ئیسـرائیلی و فەلەسـتینی بـۆ دۆزینـەوەی ڕێگـە چـارەیەك بـۆ لابردنـی ئـەم هـەموو بەربەسـتانەی کەدێنـە بـەردەم بەرقـەراربوونی ئاشـتی. لـەم بەربەسـتانە، لەهـەموویان زەحمـەتتر شـاری قـودس بـوو. فەلەستینییەکان سووربوون لەسەرئەوەی کەوا ئەم شارە، کە بۆ ئەوان بە القدسـی ( "پـیرۆز") ناسراوە، پێویستە ببێتە پایتەختی دەولەتی فەلەستینی. هەروەها داوای دەسـەلاتی تـەواویان بۆئەم شوێنە پیرۆزە دەکرد. لەکاتی گفتوگۆکانماندا، هەندێ ناکۆکیمـان لـەبارەی یاسـادانان و دەسەلاتەوە هاتەپێش. تەنانەت داوامان لە هەردوولا کرد بـەوەی کـە ئایـا ئێـوە رازی دەبـن

لەسەر ئەو بیرکردنەوە نوێیەی کە ئێمە لای خۆمان هەمانە بەوەی: " دەسەڵاتی خودایی" بۆ پیرۆزترین شوێنەکانەوە بگەڕێتەوە. لەکاتی ئەم گفتوگۆیانەدا، سەرۆك کلینتۆن بەتایبەت کاتی خۆی تەرخانکردبوو بۆ خوێندنەوەی بەشەکانی قورئان و تەورات. لەکۆتاییدا، پێشنیازی ئەوەی کرد، "کە ئەو بەشەی عەرەبییە لەم شارە دەبێ بۆ فەڵەستینییەکان بێ، و ئەوەی تایبەتە بە جوولەکەکان دەبێ بۆ ئیسرائیل بێ". ئەمەش ئەو مانایەی دەدا کەوا دەسەڵاتی فەڵەستینی دەکەوێتە "شوێنی پیرۆز (قودس)" و دراوسێیە عەرەبییەکان- ئەو شوێنانەی کە فەڵەستینییەکان پایتەختی ئەوانیان لەنێواندایە—هەروا دەسەڵاتی ئیسرائیلیش بەسەر بەشەکانیتر دادەبێ، بە دیواری گەورەی ڕۆژئاواشدا. سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتی ئیسرائیل ئەیهود باراك بەم بیرۆکەیەی سەرۆك رازیبوو. پێش جێبەجێکردن، و رازیبوون بە دابەشکردنەوەی قودس، سەرکردە ئیسرائیلییەکانی دواتر بە (باراك)یشەوە، بەڵێنی ئەویان دا کە پابەند نەبن بەم بەڵێننامەیە. کەچی رازی بوونی خۆیان لەمەڕ دامەزراندنی دەوڵەتێکی فەڵەستینی نیشاندا کە بریتیبێ لەسەدا ٩٧ ی کەناری ڕۆژئاوا و غەززە و قودسی ڕۆژهەڵات.

بێگومان ئێمە یەکەم لایەن نینە بۆ گەڕان بەدوای هاوکێشەیەك کە ببێتە هۆی هێنانی ئاشتی بۆ شاری قودس. لەساڵی ١١٩٢ (صلاح الدین) و ریتشارد کۆیەر ( دڵی شێر)، هەردووکیان فەرماندەیی سوپاکانیان دەکرد کەبەهۆیەوە چەندین کوژرانی لێکەوتەوە، هەوڵی دانوساندنیان دا بۆ کۆتایی پێهێنان بە هەڵمەتی خاچ پەرستی سێیەم. ئەم مەرجانەی کە ریتشارد پێشکەشی کردبوو زۆر نزیك بوو لەوەی لە بیرۆکەکەی ئێمەدابوو، بەجۆرێك (کاریگەری لەسەر مەسیحییەکانەوە دەبوو نەوەك جوولەکەکان). بەگوێرەی پلانەکەی ریتشارد، موسڵمانەکان بۆیان هەبوو کۆنترۆڵی قوبەی بەردینی (قبة الصخرة) و مزگەوتی ئەقسا بکەن، مەسیحییەکانیش شوێنە پیرۆزەکانیتریان بەربکەوێ، هەروەها شوێنەکانیتری شاری قودس و دەوروبەریشی بەیەکسانی بەسەر هەردوولا دابەش بکرێ. لەگۆڕینەوەی نامەکانیاندا، هەردوو سەرکردە جەختیان لەسەر گرنگی وەرگرتنی ئەم شارە پیرۆزەیان دەکردەوە، ریتشارد نووسی، " قودس بۆئێمە زۆر پیرۆزە شوێنی پەرستنی ئێمەیە، ناتوانین دەستبەرداری بین هەتا ئەگەر یەککەسیشمان تێیدا بەجێمابێ". (صلاح الدین) وەڵامی دایەوە بەوەی، " شاری قودس... بۆئێمە زۆر پیرۆزترە لەوەی بۆئێوە، چونکە ئەمە شوێنێکە کاتی خۆی پێغەمبەری ئێمە تیایدا گەشتە شەورۆیەکەی لێرەوەکردووە و ئومەتی ئێمەش هەرلێرەوە لەڕۆژی دواییدا کۆدەبنەوە. بیرلەوەنەکەنەوە رۆژێك دابێ دەستبەرداری خۆمان لەم شارە

پیرۆزەوە رابگەیەنین". لەکۆتاییدا، دانوسانەکان لەناوەڕاستی هەڵمەتی سیاسی و نسکۆی سەربازی و شاندە مەبەست خراپەکانەوە هەرەسیان هێنا. ریتشارد کشایەوە، و مەسیحییەکانیش لەنێو شاری قودس تەنها بەبوونی مافی سەردانیکردن بەجێهێشتران.

دوای هەشتا و هەشت ساڵ دانوسانەکانی ئێمەش شکستیان خوارد. بەپێچەوانەی نەرمونیانەکانی باراك، یاسر عەرەفات کەللە رەقی خۆی نیشاندا بەرامبەر بەم پێشنیارەی کە سەرۆك کلینتۆن پێشکەشی هەردوولای کردبوو بۆ بەرەو پێشوەچوونی پرۆسەی ئاشتی لەم ناوچەیە. لەدوا هەوڵدانمان بۆ رازیکردنی یاسر عەرەفات، داوای پاڵپشتیکردنی سەرکردە عەرەبەکانمان کرد لە میسر و ئوردن و مەغریب و سعودیەی عەرەبی. بەو هیوایە بووین پاڵپشتی و یارمەتی ئەوان ببێتە هاندەرێك بۆئەوەی عەرەفات رازیبکەن و وشەی "بەڵێ" ی لەدەم دەربێنن. گەڕانەوە بۆدواوە، پاڵپشتییەکانیان زۆر سوودبەخش نەبوو. سەرۆکەکانی سعودییە و میسر فشاری زۆریان نەدەخستە سەر عەرەفات، بەهەر حاڵەتێك بڕوات، حکوومەتەکانیان ئەم متمانەیەیان لەنێو عەرەبەکان نییە بۆ رازیکردنی عەرەفات بۆبەڕێوەبردنی مەترسییە کەسییەکان و پێویستی نیشتەجێبوونیان. لەتەفسیرکردنی ئەم بارودۆخە، عەرەفات دوودڵ نەبوو لە پێشکەشکردنی پاساوەکەی: کەموکوڕی هەبوو لە دەسەڵات، دەیوت: دەیتوانی دەستبەرداری هەندێ شوێنی پیرۆزبێ کە پەیوەندییان بە ئیسلامەوە هەیە. نەیدەتوانی دەستبەردای ئەم شوێنانە بێ کەپەیوەندییان بە موسڵمانەکانەوە هەیە لەهەموو شوێنەکان تەنانەت لەکاتی داوەتکردنیشی بۆ دواکەوتنی جەنازەکەی. خراپتر ئەوەبوو، درۆی لەگەڵ ئێمەکرد—لەنێو پرۆپاگەندە میللییەکانی عەرەبی—کەوا جوولەکەکان داوای شاری قودس ناکەن، لەبەرئەوەی مەعبەدی یەکەم و دووەم لەشوێنێکیتر دروستکراون. عەرەفات یەکەم سەرۆك نییە فەڵەستینی بەجیهان بناسێنی، لەبڕی ئەوە پێشوازی بەچەپڵەی پشتیوانەکانی هەڵبژارد بەرەتکردنەوەی واژووکردنی تەنها پارچە "زەوییەکی عەرەبی" و یاخود داننانی بە دەسەڵاتی ئیسرائیلی لەلای دیواری گەورەی رۆژئاوا. کاتێ بۆ کەناری رۆژئاوا گەڕایەوە بە ئاڵای نووسراوی "سەلاح الدینی فەڵەستینی" پێشوازییان لێکرد.

پرسیارەکە بۆ داهاتوو ئەوەیە کەئایا سەرکردە فەڵەستینییەکانی داهاتوو ئەوە قەبووڵ دەکەی کە عەرەفات رەتی کردبۆوە--ئەگەربێتو رێککەوتنێکی لەم چەشنە پێشکەشکرایەوە؟ وەڵامەکە زۆر ئاڵۆزە بە پەیڕەوکردنی فەرمانی قورئانی بۆ موسڵمانان بەوەی: " وقاتلوا في سبيل الله الذين يقتلونكم... واقتلوهم حيث ثقفتموهم واخرجوهم من حيث اخرجوكم".

ئەمەش لەلایەن سیاسەتی درێژی ئیسرائیلییەکانیشەوە سەختترە بۆ دروستکردنی یەکەی نیشتەجێبوون لەسەر خاکی داگیرکراو لەوەتەی شەڕی ١٩٦٧ ەوەیە.

یەکەم یەکەی نیشتەجێبوون، لەناوەڕاستی سالانی ١٩٧٠ دروستکران بە پاساوی پاراستنی ئاسایشی خاکی بەرزی وڵات بناغەی گرتبوو. لەدواییدا حکوومەتە موحافیزکارەکان بەسەرۆکایەتی میناجم بیگن و ئیسحاق شامیر هاتنە نێو نووسینگەکانیان بەمەبەستی بیرۆکەی " ئیسرائیلێکی گەورەتر" و دووبارە دروستکردنەوەی داواکانی وڵات بۆ کەناری رۆژئاوا بەتەواوەتی ( هەموو یەهودە و سامیرەکانی تەوراة) گرنگینەدان بە خەون و بەرزخوازییەکانی ملیۆنان فەلەستینی. لەژێر دەسەڵاتی ئەم دووانەیە، ئیسرائیلییەکان کۆمەکێکی باشی دارایی کران بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەك لەو شوێنەی کە لەمێژوودا عەرەبەکان تیایدا نیشتەجێببوون. بیگن ناوی لەم شوێنە داگیرکراونا " خاکی ئیسرائیلی ئازاد"(*). شامیر بەدروستکردنی ئەم کۆمەڵگە نیشتەجێبووەی دەووت: "کارکردنی پیرۆز". یەکێك لەرابییەکانی (زانا) ئیسرائیلی دەیووت: "رزگاربوونی هەموو جیهان دەوەستێتە سەر رزگاربوونی ئیسرائیل. لەم رووەشەوە کاریگەری ئەخلاقی و رۆحانی و کلتووری ئێمە بەسەر هەموو جیهان دەڕوانێت. بەرەکەت بەسەر هەموو ئەو مرۆڤانە دادێت کە لەنێو خاکی ئیسرائیلەوە دەژین".

ئەم رابییە بڕوای وابوو کە یەکە نیشتەنگەکان کاریگەربوونی ئیسرائیل پتەودەکات، بەڵام بەڵگەکەی بەهێز نەبوو. هەروەك زۆربەی ئیسرائیلی ئەمەیان روونکردۆتەوە کەوا پرۆگرامی دوژمندارانەی دروستکردنی ئەم یەکانە لەسەر خاکێکی یەکلایی نەکراوە دەبێتە هۆی زڕاندنی ناوبانگی ئەخلاقی وڵات و قووڵترکردنی تووڕەیی عەرەبەکان. ئەم نیشتەنگایانە خۆیان بەسەر باڵی ئیسرائیلییەکان چەسپاندووە تاوەکو لەلایەنی ئاسایشەوە بپارێزرێن لەدژی دراوسێیە عەرەبە نەیارەکانی فەلەستینییەوە. لەم پێناوەشدا سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلی ئاریەل شارۆن، لە ئابی ٢٠٠٥، فەرمانی بە کشانەوەی هێزە ئیسرائیلییەکان و نیشتەنگاکان کرد لە

---

(*) لەنێوان سالانی ١٩٧٧، ئەو کاتەی بیگن نووسینگەی سەرۆکایەتی وەرگرت، وەکاتی شامیر نووسینگەی بەجێهێشت، ژمارەی نیشتەجێبووە ئیسرائیلییەکان لە کەناری رۆژئاوا، کەرتی غەززە، بەرزاییەکانی جۆلان، و هەروەها قودسی رۆژهەڵات لە ٥٧٠٠٠ (کە ٥٠،٠٠٠ لە قودسی رۆژهەڵات بوو) بەرزبۆوە بۆ زیاتر لە ٢٤٠،٠٠٠ نیشتەجێبوو.

کەرتی غەززە. بەڵام مشتومڕی مانەوەیان لە کەناری رۆژئاوا تاوەکو ئێستاش هەر بەردەوامە.
گەر بگەڕێینەوە بۆ دەیان ساڵ پێش ئێستای خاڵی سڕبوون، زۆر غەمباربووم بە رێککەوتننامەکەی لیۆن ویزلتیر، سەرنووسەری گۆڤاری (New Republic) " بیرۆکەی ئیسرائیلێکی گەورەتر... هەمیشە بیرۆکەیەکی گەمژەبووە چ لەلایەنی ئەخلاقی و چ لەلایەنی ستراتیژیش. دەبێتە هۆی بەرزڕاگرتنی خۆشحاڵی بۆ هەندێ کەس و لەکۆتایشدا ئاسایش بۆ هەموان دێنێ، و هەروەها ناساندنی ژەهری موژدەبەرانە و سۆفیگەرانە بەنێو سیاسەتەکانی دیموکراسییەتێکی نوێتر".

نیشتەنگاکان باڵێکیتریشیان بەسەر سەپاندووە. ئیگاڵ عامیر، کوڕە ئیسرائیلییەکی نۆزدە ساڵان بوو، ئیسحاق رابینی لەساڵی ١٩٩٥ کوشت بەمەبەستی جێبەجێکردنی سزای ئایینی لەوەی کە تاوانی لەدژی ئایینییەکەیەوە ئەنجامداوە. رابیەکی توندڕەوتر هات جەختی لەسەر کوشتنی رابین کردەوە بەوەی کەوا ئەم کوڕە گەنجە ( بکوژە) لەژێر یاسای ئایینی جوولەکەدابووە ئەویش بە کوشتنی رابین خۆی ئارام کردۆتەوە، لەبەرئەوەی سەرۆك وەزیران پاڵپشتی لە ئاشتی کردووە کەچی موساوەمەکردن بووە لە مافەکانی نیشتەنگاکانی ئیسرائیلی لەناو خاکی فەلەستینی. پرسیاری ئەوە لە عامیر کرا کەئایا ئەم کارە بەتەنها ئەنجامیداوە: وتی نەخێر خودای پەروەردگار لەم کارە لەگەڵمدابووە.

هەرچەندە من لەگەڵ هەندێ سیاسەتی حکوومەتی ئیسرائیلیدا کۆك نیم، بەتایبەتی دوژمنداری زۆر بەرامبەر نیشتەنگاکانەوە ئەنجام دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا بەتەواوی پابەندم بە پاراستنی بوون و ئاسایشی ئیسرائیلی. زۆربەی ئەمەریکییەکانیش بەمجۆرە دەڕواننە بارودۆخەکە. بۆچی؟ دەزانین کەوا کۆمەڵگای ئیسرائیلی بۆماوەیەکی درێژ تووشی مامەڵەی خراپ بوونەتەوە هەر لەسەردەمی بەندایەتی میسرییەکان و کوشتارگەکانی قەیسەری رووسی. پێمانوایە، هۆڵۆکۆست دەبێ ببێتە تایبەتمەندییەکی خۆیان - بەجۆرێك هەڵمەتێکی تراژیدی بوو لەدژیانەوە ئەنجامدراوە — و ناشبێ لەبیربکرێت و دووبارەبێتەوە. ئێمە نەك هەر لەدروستکردنی ئیسرائیلەوە دەیانبینین بەڵکو لەئامادەکردنی خەڵکەکەیشەوە دەیانبینین، بەڵام وەك نیشانەیەکی گونجاوە تەواوی رەگەزی مرۆڤایەتیشەوەیە. ئەم رێککەوتننامەیە قەبووڵ دەکەین بەوەی کەوا چیتر داوای زیاتر لەو عەرەبانە نەکەین کە شوێنی پیرۆز یان خاکی زۆریان هەیە بۆئەوەی رێگە بدەن شوێنێك بۆ ئیسرائیلی بچووك بکەنەوە لەبەرئەوەی نیشتیمانی راستەقینەی خۆیانە. تەنانەت ئەوەشمان بینیوە ئەم جۆرە وڵاتەی—بەدیموکراسییەتێکی

گەشەکردوو - کە ئیسرائیلییەکان بنیاتیان ناوە. گەڕان بەدوای وەڵامــی ئــەم پرســیارەی کــە بۆچی ولایەتە یەککگرتووەکان هاوپەیمانی لەگەڵ ئیسرائیل دەکــات، بــەوەش تاچــەندی ڕێــژەی سەدی هاووڵاتیانی ئەمەریکا جوولەکەن، بەپێی یەکێك لە توێژینەوەکان لە سەدا ١٠ تــا ٨٥ ی دانیشتوانی ئەمــەریکا جوولــەکــەن، بــەڵام ڕێــژەی تــەواو جوولەکــە کــەمتر لەســەدا ٢ ی دانیشتووانی ئەمەریکا پێکدێنن. یەکێك لە مەسیحەکانی عەرەبی ئەوەی دەرخستووە، کــەوا ( لۆبی زایۆنی) گەورەترین کاریگەری بەســەر سیاســەتی دەرەوەی ولایەتــە یەکگرتووەکانــەوە هەیە. زۆر دەقیقە بەوەی بووترێ کە ئەمەریکییەکان بەو ئایدیلۆژییەوە پاڵپشتی لە ئیسرائیل دەکەن  چونکە لــەم کۆمەڵگایــە هەنــدێ تایبەتمەنــدی دەبیــنین دەیانناســینەوە و سەرســامین پێیانەوە.

بێگومان، ئەمەریکییەکان گرنگی بە بارودۆخی ئیسرائیلییەکان دەدەن، لەبــەر هاوبەشــی کلتووری ئایینییەکانیان. لەوەیە ئەم هۆلۆکۆستە ببێتە خاڵی هاندانی ولایەتە یــەککگرتووەکان بۆیارمەتیدانی دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیلی، بەڵام سیاسەتی ئەمەریکا قووڵ چووتەوە بــۆ ڕاگەیاندنەکەی بەڵێننامەی بەلفۆر - کەتیایدا خاکێکی بەڵێنــدراو هەیــە ( الارض الموعــودة) هەروەها ئیسرائیلییەکانیش وەرگری ئــەم خاکــەن. بــەگوێرەی دیپلۆماسییەتەکانی ئێمــەوە، ململانێیەکــە لێــرە گەیانــدن و ڕازیبــوونی خــاڵی دەســتپێکە لەگــەڵ مافــە شــەرعییەکانی فەڵەستینییەکان. کەئەمەش کارێکی زۆر زەحمەتە لەتێپەڕبوونی هەر بارودۆخێکدابێت. بەلای هەندێ ئەمــەریکی، گوناهبارکردنــە ئایینییــەکان لادانــە لەســنووری هــەر گرنگیــدانێك بــە یەکسانی فەڵەستینییەکان. بــەوە ڕازیــن، عیســا پێغەمبــەر ناگەڕێتــەوە ســەر زەوی مەگــەر پەیکەری سلێمان دووبارە دروست نەکرێتەوە و هەروەها شەڕی یەکلاییکەرەوەی نێوان چــاکە و خراپە دەست پێدەکات، هەروەك لەکتێبی سروشەوە باسی لێوەکراوە.

پڕفرۆشترین زنجیرەی ڕۆمانەکان بەمجۆرە باس لە چیرۆکەکە دەکەن. دارمانی شارســتانییەتی دوابەدوای (خۆشی) دێت لەوکاتــەی مەســیحییە باوەڕدارەکــان بــەرەو ئاســمان هەڵدەکشــێن و کەسانیتریش بەدوای خۆیانەوە جێدەهێڵن. لەدواییدا دەجال دێت خۆی وەك ســکرتێری گشــتی نەتەوە یەککگرتووەکان نیشاندەدات. بەهۆی بەڵێنەکانەوە ئیسرائیل هێمن کرایەوە و هەڵسا بە واژووکردنی پەیماننامەی ئاشتی لەژێر بنیاتنانەوەی مەعبەد لە شاری قودس (لەگەڵ ئەوەشــدا لەلایەن دەجالەوە ناوبانگیان زڕا). لەگەڵ ئەم نەگبەتیانەشدا، خودای گەورە نەخۆشــی بەســەر زەویدا باراند بۆهاندانی دۆزینەوەی باوەڕ. سوپایەکی زۆر لەدوورەوە خۆی بۆ هێرش کردنە سەر

ئیسرائیل ئامادەکرد - سوپایەك نزیکەی ٢٠٠ ملیۆن جەنگاوەردەبێ. ئەم شەڕە یەکلایکەرەوەیە لەنزیك شارۆچکەی مەگیدۆی کەرتی رۆژئاوا روودەدات، کەمتر لە پەنجا میل لە شاری قودسەوە دوورە. ئەم شوێنەیە کە عیسای مەسیح دووبارە بەدیار دەکەوێتەوە، لەئاسمانەوە دادەبەزێتە سەر زەوی بۆ پێشڕەویکردنی مەسیحییە باوەڕدارەکان و ١٤٤،٠٠٠ جوولەکەی گۆڕاو (ئەوانەی ئایینی خۆیان گۆڕیووە.و) (ئەو جوولەکانەی کە لەژیاندا ماون) بۆ سەرکەوتنێکی خوێناوی خۆیان ئامادە دەکەن. ئەمەش دوابەدوای هەزار ساڵی حوکمی مەسیح دەبێ لەسەر زەوی.

لەساڵی ١٩٩٩ لەیەکێك لە راپرسییەکانی گۆڤاری *نیوزویك* ئەوەی ئاشکراکرد کەوا سەدا ٤٠ ی ئەمەریکییەکان—کەدەکاتە ١٠٠ ملیۆن ئەمەریکی—" بڕوایان وایە، هەروەك تەوڕاتیش ئاماژەی پێدایە، دونیا کۆتایی پێدێت بەهەڵگیرساندنی جەنگی نێوان مەسیح و دەجال". هەروەها سەدا نۆزدەی وەڵامدەرەوەکان بڕوایان وایە ئەمڕۆکە دەجال زیندووە. سەدا سێزدە بڕوای وایە، " کەیف خۆشی" بەتایبەتی ئەوانەی ئاگاداری بڵاودەکەنەوە " وەرن بۆ خۆشی ژیان، ئەم ئۆتۆمبێلەش لەوەیە بێ شوفێربێ".

لەبەرئەوەی لەنێو کڵێسەی رۆمانی کاسۆلیکی گەورەبوومە، بەجۆرێك فشار ناخاتە سەر کتێبی سروشەوە، تێکستەکان بە دیمەنێکی کاریگەرتر دەبینم لەوەی بە نەخشەدانراوەوە بێت بۆ مەسیحییەکان لە رزگاربوونیان لەدوژمندارییەتی رۆمانییەکان. منیش بە دیمەنەکانی دەجال مانووبووم. لەکاتی شەڕی خاچ پەرستیدا، راوێژکارە ئایینییەکان ریتشارد دڵی شێریان دڵنیاکردەوە کە (صلاح الدین) هەڵگری وەسف و پیاهەڵدانەکانیەتی، هیچ قازانجێکی زۆری لەم باشەیە نەکردووە. مارتن لۆسەر، ئەو کەسەی ریفۆڕمی دەستپێکرد، ئەوەی راگەیاند کەوا پاپا دەجال بووە، ئەورووپا بەهۆی شەڕە ئایینییەکانی سەدان ساڵێتر پارچە پارچە دەبێ. کڵێسەی ئۆرتۆدۆکسی رووسی وەسفی ناپلیۆنی کرد بەوەی شەڕ و لەناوچوونی زیاتر روودەدەن. زمانی سروش زۆر دڕاماتیکییە بەجۆرێك کەسانێك فریودەدات بۆ هاورێگرتن، بەتایبەتی، نەیارەکان وەك کارەکتەرێکی دیاریکراو. ئێمە بەهۆی هەستەکانی خۆمانەوە فریودراوین کە ئەگەر مێژوو خاڵی گۆڕانی یەکلایکەرەوەی هەبێ ئەوا پێویستە لەکاتی ژیانی ئێمەوە روویدات. خەیاڵی ئەوە بکە رابردوو بێ بوونی ئێمە کارێکی زۆر زەحمەت نییە، خەیاڵی ئەوەبکە داهاتوویێکی ئاوا زەحمەتتر و خۆشتر نییە—بۆیە ئێمە بەدوای ئەو هۆکارانە دەگەڕێین کە خەیاڵی شتیترمان پێدەدەن.

لەوەیە شەڕی نێوان چاکە و خراپە لەسەر حیساباتەکانمان بەرپابێ. بەمەش دەبێتە کارێکی پاساو هەڵنەگر بەوەی ئەگەر سەرکردەکانمان پشت بەم گریمانانە ببەستن بۆ هەموو نەکردارەکانیان، تەنها بۆ سەلماندنی هەڵەکان، ئێمە لەگەڵ ئەم هەموو وێرانکاری هیچ شتێك لەبەهەشت بەجێدێڵن. رەخساندنی قۆناغی ناکۆکی نێوان چاکە و خراپە بەرگریکردنی سیاسەتی دەرەوە نییە. بەڵکو لەوەیە بەرگریکردنی ئاشتی بێ. ئائەمەشە بووەتە هۆی لێك تێنەگەیشتن لەنێوان سیاسەتمەداران و وتاربێژەکان. لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٨ بیل کلینتۆن هەردوو سەرەك وەزیرانی ئیسرائیلی بنیامین نەتنیاهۆ و یاسر عەرەفاتی بۆ کۆشکی سپی داوەتکرد. ئامانجی سەرۆك کلینتۆن بۆ رازیکردنی ئەم دووانە بوو بۆ دووبارە نوێکردنەوەی پرۆسەی ئاشتی، کەبەهۆی کاری تیرۆریستی و چالاکییە نیشتەنگاکانەوە بۆماوەیەك وەستابوو. پێش ئەنجامدانی کۆبوونەوە، نەتنیاهۆ چاوی بە سەرکردەکانی مەسیحی باڵ راست کەوت بەجۆرێك سلاویان لە نەتنیاهۆ کرد وەك " رۆناڵد ریگانی ئیسرائیلی" پێشوازییان لێکرد، و بەشێوەیەك هانیان دەدا—کەبڕوای من هاندانێکی زۆر بێمانابوو—کە هەرگیز موساوەمە لەسەر مافەکانی خۆیان نەکات. چالاکەکانی مەسیحی باڵ راست و رەخنەگرەکانی ئیدارەی کلینتۆن مشتومڕی ئەوەیان بوو کە پابەندبوونی ولایەتە یەکگرتووەکان بە پرۆسەی ئاشتی فشارێکی زۆری خستۆتە سەر ئیسرائیل. بەپێی بیرکردنەوەکانیان، هەر سیاسەتێك ببێتە هۆی گەڕانەوەی ئیسرائیل بۆسەر زیاتری خاکی فەڵەستینییەکان پێچەوانەی تەوراتە یاخود مەترسیدارە بۆسەر ئاسایشی ئیسرائیلی و یاخود هەردووکیانە.

کاتێ سەرۆك بۆش پۆستی سەرۆکایەتی گرتە دەست، بڕیاریدا ئەو هەلانەی سەرۆك کلینتۆن دووبارە نەکاتەوە کە لە رێگای ئەم پرۆسەیە هەوڵی بۆ دابوو. سەرۆك بۆش رەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ عەرەفات کردەوە، وە کەسێکی وەك وتوێژکاری بەردەوام لەناوچەکە دیاری نەکرد، هەروەها پەیوەندی خۆشی لەم هەولانە رانەگەیاند بۆ وەستاندنی توندوتیژی لەنێوان ئیسرائیلی و فەڵەستینییەکان کە نزیکەی ٤،٠٠٠ خەڵك تیا کوژرابوو. لەوەیە روانگەکانی بۆش لایەنی سوودبەخشی پێوە ببینرێت لەپاراستنی سەرچاوەکانی دیبلۆماسییەتی ئەمەریکی لەبەرامبەر مەبەستەکانیتر. بەلام ئەمەش لایەنێکی نێگەتیڤی زۆر روونی هەیە بۆ خراپبوونی پێگەی ئەمەریکا لەنێوان عەرەب و موسڵمانەکان.

بەداخەوە، ئەم مەسەلانە دەبوایە بەرلەوەی پرۆسەی ئاشتی گەشەیکردبوایە چارەسەرکرابانایە لەوەی بەزەحمەتتر بکەوێت لەکاتی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی لەلایەن

جۆرج بۆشەوە. ساڵانی شەڕکردن وایکرد گرووپی توندڕەوی حەماس - کە لە مێژوودا ئەم گرووپە دژی بەرقەراربوونی ئاشتی بووە - ببێتە بەراوردکارێکی بەهێزتری بەربەریکارە عیلمانییەکەی، فەتح، کەگەورەترین پێکهاتەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی فەڵەستینییە. ئابووری فەڵەستینی بەرەو دواوە دەچوو، بەڵام لەبەرهەمهێنانی بۆمب و بۆمبی دەستی و رۆکێت بەرەو زیادبوون دەڕۆیشت. دیواری ئەمنی کە لەلایەن ئیسرائیلەوە لەبەشی هەرە زۆری کەناری رۆژئاوا دروستیکرا، بەمەش هیچ فەڵەستینییەك بەم دیوارە ئەمنیانە رازی نەبوو، کەچی ئیسرائیلییەکان نەیاندەتوانی بەبێ بوونی ئەم دیوارە بتوانن بژین. سەرکردە ئیسرائیلییەکان رەتی داواکانی فەڵەستینیان کردەوە بە ئازادکردنی بەندییە عەرەبەکان لەنێو بەندیخانەکانی ئیسرائیلی، ئەگەر بێتو ئەم بەندییانە "دەستیان بەخوێنی ئیسرائیلییەوە سووربووبێ" ، ژمارەی بەندییەکان زۆر زیاتر بووە بەبەراورد لەگەڵ ساڵی ٢٠٠٠.

مردنی یاسر عەرەفات لە ساڵی ٢٠٠٤ بووە هۆی کردنەوەی دەرگایەك بۆ لایەنی سەرۆکایەتیکردنی فەڵەستینی. سەرۆکی دوای عەرەفات، مەحموود عەبباس، بە گۆڕانی سیاسەتی فەڵەستینی بەدیارکەوت لەکاتی دانوستانەکانی ساڵی ١٩٩٠ عەبباس لایەنی فەڵەستینی بوو ئێمەش بەهەموو راشکاوییەکەوە گفتوگۆمان دەکرد. هەرگیز خیانەتی لەم متمانەیە نەدەکرد کەپێیان سپاردبوو، بەڵام هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆشی نەبوو. جەختی لەوەدەکردەوە کە چارەسەری کێشەکانی فەڵەستینی لەکاتی دانوساندنەکان بە پێدان و بەخشین دەبێ لەگەڵ لایەنی بەرامبەر. وەك سەرۆکێك، عەبباس، بەرەنگاری هەموو ئەو کۆبیرکردنەوەیانەی دەکردەوە کەپێشتر پێیان وابوو توندوتیژی تاکە رێگای پێشکەوتنی وڵاتە. بەپێچەوانەی عەرەفات، عەبباس بیری بۆ خەیاڵی گەورە نەدەڕۆیی بە گەڕانەوەی فەرمانڕەوایی عەرەبی هەر لە رووباری ئوردنەوە تا دەریای ناوەڕاست. تاکە ئامانجی دروستکردنی دەوڵەتێکی بەتوانای فەڵەستینییە، هەروەك خۆی دەیووت، کەبتوانێ ئەم کارە بە رێگاکانی ئاشتییەوە بەئەنجام بگات.

کێشەکەی عەبباس لێرە ئەوەیە - هەرچەندە بە رێگایەکی دیموکراتیشەوە هەڵبژێردراوە - بەڵام کەموکوڕی هەیە لە بناغەیەکی سیاسی پتەو. بزووتنەوەی فەتح، کە عەبباس وەك میرات لە عەرەفاتی وەرگرتەوە، ناوبانگێکی باشی بەدەست هێناوە لە مەسەلە گەندەڵییەکان، کەچی بەهۆی بەربەرەکانی کەسی و ئایدیۆلۆژی و جیلییەوە پارچەپارچە بووە. کێشەی عەبباس لەوە کۆبۆتەوە کە لایەنەکانی وەك ولایەتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل بەوە نازانن کە

کەمی یارمەتیدانی ئەوان بۆتە لاوازی سەرکەوتنی. لەبڕی ئەوەوە داواکاری فەڵەستینییەکان بەڕووی عەبباس ئەوەیە کە توانای جێبەجێکردنی پڕۆسەی ئاشتی بۆ دەوڵەتەکەیان نەماوە. ئەمەش عەبباسی لەهەردوولادا بە خراپترین بار جێهێشتووە. لەلایەن بەرهەڵستکارە فەڵەستینییەکان عەبباس بە باشترین کاندید بۆ ئیسرائیل و رۆژئاوا ناسراوە. بۆیەش هیچ یارمەتییەك نەدراوە بۆ بەدەستهێنانی پێداویستی مافەکانی خەڵکی فەڵەستینی. بۆ کڕینی کات، عەبباس هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی دواخست لە حوزەیرانی ٢٠٠٥ بۆ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦. ئەم تاکتیکەش هەرەسی هێنا لە پەیداکردنی جەماوەری زیاتر بۆ بزووتنەوەی فەتح. بەڵام لەکۆتاییدا کاتێ هەڵبژاردنەکان دەستیپێکرد، بزووتنەوەی حەماس زۆرینەی دەنگەکانی بۆخۆی کۆکردەوە—کەبووە جێگای سەرسوڕمانی بزووتنەوەی فەتح و ئیسرائیل و ولایەتە یەکگرتووەکان و تەنانەت بزووتنەوەی حەماسیش بۆخۆیان.

سەرکەوتنی حەماس بووە هۆی گەڕانەوەی پڕۆسەی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ سەرەتای دەستپێکردنی بەنزیکەی ١٥ساڵ پێش ئێستا. حەماس، وەك بزووتنەوەی رزگاریخوازی فەڵەستینی پێشووتر، رازی نابێ بەبوونی ئیسرائیل لەناوچەکە تەنانەت ئامادەش نییە چەکی دانێ و توندوتیژیش کەمبکاتەوە. تاوەکو ئەم کارانە ئەنجامنەدات، بەرقەراربوونی پڕۆسەی ئاشتی کارێکی مەحاڵە. باشترین رێگا بۆ کاتی ئێستادا راگرتنی دوژمنداریبە. ئەمەش وا لەهەردوو لایەن دەکات بیرێك بکەنەوە و هەنگاوێك بۆ بەرەو پێشوەچوونی ئاشتی بدەن. بۆلایەنی حەماس بەرەنگاربوونەوەی ئەم حاڵەتە بە جیبەجێکردنی بەڵێنەکانی هەڵمەتی هەڵبژاردنیەتی " گۆڕان و چاکسازی". ئەم بەڵێنانەش هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسرائیلەوە نییە ئەوەندەی پەیوەندی بە باشترکردنی بەڕێوەبردنی حوکمی فەڵستینەوە هەیە.

لەلایەکیتریشەوە، کارێکی زۆر چاوەڕێی ئیسرائیلییەکان دەکات. پێش ئەوەی ئاریەل شارۆن ببێتە نێچیری نەخۆشییەکەی (سەکتەی مێشکی) لەساڵی ٢٠٠٦، هەڵسا بە جێبەجێکردنی پلانێك بۆ زامنکردنی ئاسایشی ئیسرائیل بە جیاکردنەوەی ئیسرائیلییەکان لە فەڵەستینییەکان. ئەم پلانەش، هەرچەندە بەتەواوەتی روون نەبوو، بەوجۆرە دیزاینی بۆ کرابوو بۆ زیندوو راگرتنی دەوڵەتی جوولەکە بە بەجێهێشتنی ژمارەیەکی زۆری جوولەکە و کەمێك لە فەڵەستینییەکان لەناو زەوی جوولەکە کە ئیسرائیل ئەرکی پاراستنی گرتۆتە دەست. ئەم پلانەش بەدیاریکراوی حوکم دەدات لە ئیحتیمالەکانی دابەشکردنی شاری قودس، یاخود کشانەوەی ئیسرائیل بۆ سنوورەکانی ساڵی ١٩٦٧. هەنگاوەکان ئێستاش لەجێبەجێکردندا

بەردەوامن کە دروستکردنی دیواری ئـەمنی و بڵاوکردنـەوەی  هێـزە ئیسـرائیلییەکانە لـەناو کەرتی غـەزە و چـڕکردنەوەی یەکـە نیشـتەنگەکانە لـەناوەوە و دەوروبـەری شـاری قـودس. ناخۆشترین هەنگاوەکان ئەوانەن بە داخستنی هەنـدێ لـە نیشـتەنگەکان لـە کـەرتی ڕۆژئـاوا بۆئەوەی ببێتە پارێزگاریکردنی داهاتووی ئەوانیتر.

بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەرهەڵستە موحافیزکارەکانی نێـو پـارتی لیکـۆدی خـۆی، شـارۆن هەڵسا بە پێکهێنانی پارتی کادیما، هاوپەیمانییەتێك بوو کە تـوانی پاڵپشـتی لەلایـەن هێـزە سیاسییە فراوانەکانەوە بۆخۆی رابکێشێت.  ماوەتەوە بڵێین ئایا سەرۆکی دوای شارۆن دەتوانێ ستراتیژییەتی بەم پارتەیە بەرەو پێش ببات. دیارکەوتنی حـەماس بەدڵنیاییـەوە بۆتـە هـۆی دواخستنی داننانی ئیسرائیل بە دەوڵەتی سەربەخۆی فەڵەستینی، لەکاتێکدا ئامـانجی شـارۆن جیاکردنەوەی جوولەکە و فەڵەستینییەکانە هـەر بـە خـاڵی وەسـتانی سیاسـەتی ئیسـرائیلی هەژماردەکرێت.

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست شوێنێکە تیایدا برینەکان وابەئاسـانی سـارێژ نـابن، غـەمـەکان زوو لەبیرناکرێن، هەروەها کاتیش بەشێوەیەکی ئاسایی هاوڕێیەتی ئاشتی ناکات.  کات بۆلایـەنی فەڵەستینی زۆر پێویستە بۆ گەشەسەندنی دەزگاکانیان تـاوەکو بتـوانن کاروبارەکـانی خۆیـان بەشێوەیەکی لێپرساوانە پێ بەڕێوەببەن. ئیدارەی کاریگەر پێویستی بە دڵسۆزی و  کارامەیی و ئامـادەیی موسـاوەمە هەیـە. کەچـی هـیچ کـام لـەم دوولایەنـە حـەماس و فـەتح ئـەم کارەکتەرانەیان لێبەدیناکرێت. خەڵکی فەڵەستینی زۆر بە ڕوونی ئەوەیان لەکاتی دەنگدانەکان نیشاندا کەوا چاوەڕێی زیاتریان لە سەرکردەکان دەکرد لەوەی ئێستا بەدەستیان هێناوە ئەمەش هاندانێکە لەوەی کەوا هەڵبژاردنەکان ئازاد و دادگەر و پێشـبڕکێکەربوو. ئەمـەش هـەنگاوی یەکەمە لەدروستکردنی حکوومەتێکی گوێڕایەل و وەڵامدەرەوە.  هێشتاکەش هەنگاوی زیـاتر پێویستە.  لەسەر دەوڵەت و ڕێکخراوە دەرەکییـەکان پێویسـتە یارمـەتی گـەلی فەڵەسـتینی بدەن، بەڵام ئەگەر بتوانن ئەم یارمەتییە بدەن بەبێ خۆشکردنی ڕێگا بۆ بزووتنەوەی حەماس و توخمە توندڕەوەکانیتر بۆ پاراستنی هەڵبژاردنی ( ئیختیاری) توندوتیژی.

یەکێك لە لێکۆڵـەرەوە گەشـبینەکان  پێشـنیازی ئـەوەی کـرد کـەوا بەشـداریکردن  لـە حکوومەت والە حەماس دەکات میانڕەوتر بێت. کەچی من گومانی خۆم هەیـە. وای بۆدەچـم بارودۆخی سیاسی نوێی بزووتنەوەکە دەبێتە هـۆی خراپترکردنـی  دابەشـبوونەکانی نێـو ئـەم بزووتنەوەیە. لەم نێوەندەشـدا پراگماتیکییـەکان و ئایدۆلۆژیکییـەکان پێشـبڕکێی وەرگرتنـی

دەسەڵاتیان بوو. لەسەر ولایەتە یەکگرتووەکان پێویستە هەموو کارێك بکات بۆئەوەی زۆرترین میانڕەوی لەنێو هێزە فەڵەستینییەکان دروستبکات، بەڵام کەموکوڕی دەستێوەردانی ئەمەریکا لەماوەی ئەم پێنج ساڵەی رابردوودا بووە هۆی لەدەستدانی متمانە و کاریگەریمان بەبەراورد لەگەڵ ساڵانی پێشووتردا.

گۆڕانەکان لە سەرکردایەتی هەردوولا لە ئیسرائیل و دەسەڵاتداریەتی فەڵەستینی بووە هۆی دروستکردنی دینامیتێکی نوێی سیاسی لەکاتێکدا دەرفەتی ئاشتیش کورتتربوو. بەڵام ئەی لەبارەی دەرفەتی درێژەوە؟ ئایا بەڕاستی ئیحتیمالاتی بەرقەراربوونی ئاشتی مردووە؟ لەنەبوونی بیرکردنەوەی نوێدا، دەترسم وەڵامەکە بەڵێ بێ.

زۆربەی کاتەکان دەمویست گوێی وتوێژکارانی فەڵەستینی و ئیسرائیلی بۆلای خۆم رابکێشم و لەهەستەکانیان بدەم بۆئەوەی هەوڵی ئاشتی بدەن. لەکۆتاییدا هەموو تواناکانم خستەگەر بۆ بەکارهێنانی زمانێکی زیرەکانە و دادگەرییانە بۆئەوەی بتوانم قەناعەت بەم دوولایەنە بێنم و بەرگری لە پرۆسەی ئاشتی بکەن. لەگەڵ بوونی چەندین نسکۆ لەم پرۆسەیەدا، هێشتاکە بیرم لەم ئیحتیمالاتانە دەکردەوە کەدێنە بەردەم ئەم پێکهاتەیە. پێشنیازێك لەلایەن سەرۆك بیل کلینتۆنەوە پێشکەش بە هەردوولایەن کرا بەجۆرێك میانڕەوی پێوە دیاربوو کە هەردوولا چاوەڕوانیان دەکرد. پرسیارەکە لێرە ئەوەیە ئایا لۆژیکی ئاشتی بەمجۆرە بەهێز و بەتوانایە بتوانێ بڕیار لەسەر داهاتووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بدات. داواکردنی هۆکار و بەرژەوەندییە کەسییەکان تاکە رێگای پراکتیکی بەردەوامبوونی ئەم پرۆسەیەیە، بەڵام ئەگەر دیزاینکردنی نیشتەنگاکان تەنها بۆ مامەڵەیەکی بازرگانی راست بێت ئەوا چەند ساڵێکی دەوێ بە تەواوبوونی پرۆسەکە. ئەگەر دانوسانەکان دووبارە ببنەوە پراکتیکی، دیپلۆماسیەتە تەقلیدییەکان زۆر پێویست دێنە بەرچاو. بەڵام هێشتاکە هەندێ شت دەمێنێ ئەنجامدانیان زۆر پێویستە: تێگەیشتنمان بۆئەوەی کە خودای پەروەردگار بەڕاستی چی دەوێت.

لەمێژوودا، حیکمەتی تەقلیدی لەنێوان وتووێژکارە ئەمەریکییەکان بەرامبەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەم قسەکردن بەرامبەر خودا باشترین رێگابووە. ئەمەشیان قەبوولکراوە، دیمەنی گۆڕاوی ناوچەکە، بەڵام ئەمەش شیاو نییە بە جیاکردنەوەی ئایین و مێژوو کە بەیەکەوە بۆ بەرەو پێشوەچوونی پرۆسەی ئاشتی دەگونجێن. شارۆن شاری قودسی وەك "پایتەختی ئیسرائیلی و یەکگرتوویی هەتاهەتایی" دەستنیشانکردبوو.

لەگەڵ ئەم دابەشکردنەدا، فەلەستینییەکان بیر لە هیچ چارەسەرێکی دوو دەوڵەتی ناکەنەوە بێئەوەی قودس نەبێتە پایتەختی خۆیان. گەورەترین نیشتەنگاکانی ئیسرائیلی لە کەناری رۆژئاوا جێگیرە، کەچی پرۆپۆزەڵی ئاشتەوایی کە لەلایەن عەرەبەکانەوە پێشکەشکراوە گەڕانەوەی هەموو ئەو زەوییە داگیرکراوانەیە لەوەتەی ساڵی ١٩٦٧ ەوە بەزۆری لە عەرەبەکان زەوتکراوە. دژواری شارۆن لە شەڕکردنی بەرامبەر راپەڕینی دووەمی فەلەستینییەکان ئامانجی قەناعەت پێهێنانی فەلەستینییەکان بوو بۆئەوەی پێیان رابگەیەنێ کەوا بەرگەگرتن هیچ هیوایەکیان پێنابەخشێ. لەکاتی کشانەوەی هێزە ئیسرائیلییەکان لە غەزە، فەلەستینییەکان تی شێرت (T- shirt)یان لەبەر کردبوو لەسەری نووسرابوو " ئەمڕۆ غەزەیە، بەیانی کەناری رۆژئاواو و قودسە". لەسەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا، موسڵمانەکان بۆماوەی نزیکەی ١٣٠٠ ساڵ کۆنترۆڵی شاری قودسیان کردبوو کەمتر لە شەست ساڵ - لەروانگەی مێژووەوە - بەسەرچووە لەدروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیلی. ئایا فەلەستینییەکان ئێستاکە چیان دەوێ بەئەنجامی بگەیەنن—دەرفەتی دووروودرێژ (خوێن رشتن) بۆ دووبارە سەرکەوتنەکەی (صلاح الدين)، و یاخود دەرفەتێکی راستەقینە بۆ پەروەردەکردنی خێزانەکانیان لە شکۆمەندی و ئاشتیدا؟ ئایا خەونیان بۆ شەهیدبوونە یان بۆ بنیاتنەری دەوڵەتێکی فەلەستینییە؟

جیمی کارتەر لەباسکردنی ئاپین نەدەترسا لەوکاتەی هەردوو سەرکردەکانی ئیسرائیلی و میسری کۆکردەوە لە کەمپی دێڤد. بیل کلینتۆن توانی کارەکانی خۆی بە سەرکەوتوویی ئەنجامبدات چونکە لە مێژووی حاڵەتەکە گەیشتبوو، هەروەها زۆریش ئارام بوو لە باسکردنی مەسەلە رۆحانییەکان. وتووێژکارانی داهاتوو ناتوانن هیچ گەشەسەندنێکی داواکراو بەدەست بێنن، تاوەکو نەتوانن رووبەڕووی هەموو پێکدادانەکان نەبنەوە. ئایا ئەمەش واقیعییە؟ نازانم. زۆر بە قسەکەی جۆرج بێرنارد شۆ، کاریگەرم بەوەی دەڵێ، " کەسی عاقڵ هەوڵ دەدات خۆی لەگەڵ جیهان بگونجێنێ، کەسی ناعاقڵیش هەوڵدەدات، جیهان لەگەڵ خۆی بگونجێنێ. بۆیەش، هەموو گەشەسەندنەکان دەوەستێتە سەر پیاوی ناعاقڵ".

ئەگەربێتو لە قورئان و ئینجیلدا پاساوی ئاوا بدۆزرێتەوە بۆئەم ناکۆکییە بەردەوامانە، بڕوام وایە ئەوانیتریش دەتوانن فەرمانی ئاوا گرنگ بدۆزنەوە بۆ گەڕان بەدوای پێچەوانەکان. یەکێك لەدەستپێکە هاندەرەکان پرۆسەی ئەلیکسەندەرە کەلەساڵی

٢٠٠٢ ەوە دەستی پێکرد و لەلایەن سەنتەری کۆبوونەوەی موسەوی بۆ هاریکاری ئایینی چاودێری دەکرا. بەپێی ئەم پرۆژەیە ئاشتی لەنێوان نەتەوەکان بەدەست نایێت بەبێ بوونی تەوافقێکی ئایینی و کلتوورەکان، لەگەڵ ئەمانەشدا، هێزی ئایین دەبێ لە سەرچاوەی دوژمنداری و نەیاری بۆ سەرچاوەیەکی بەرگەگرتن و لێك تێگەیشتن بگوازرێتەوە. ڕێساکانی ڕاگەیاندنی ئەلیکسەندەر بەکاردەهێنرێن بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان لەساڵی ٢٠٠٣—کە پاڵپشتی لەئاشتی و ناتوندوتیژی و ڕێزگرتن لە شوێنە پیرۆزەکان دەکات- لەوکاتەی فەڵەستینییەکان کلێسەی مەهدیان تەسلیم کردەوە، یەکێکیتر لەساڵی ٢٠٠٤، ئەوکاتەی دەسەڵاتەکانی ئایینی ئیسلامی کۆبوونەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کێشەی وروژاندنی دژی سامییە (anti-Semitism) لەنێو کۆمەڵگاکانی عەرەبی. لەسەر بناغەی ڕۆتینی، ڕێساکان لەلایەن سەنتەرەکانی " ئادەم" جێبەجێدەکرێ کەکەوتوونەتە ئیسرائیل و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی فەڵەستینی، دامەزرێنەر و هاندەری ئەم بزووتنەوەیە ڕابی مایکل ملکیۆر بوو، جەنگاوەرێکی ئازا و قسەڕەوان بۆ کاروباری ئاشتی، پاڵپشتییەکی بەهێزی لەلایەن شێخ عیماد فالوجی بەدەستهێنا، دامەزرێنەری حەماس، هەر خۆیشی ئەم ڕێکخراوەی بەجێهێشت لەبەرهۆی هێرشەکانی ئەم ڕێکخراوەیە بۆسەر خەڵکی سیڤیل بەمەش لادانە لە ئیسلام.

ئەوانەی کەوا زۆر دڵنیان لە مەبەستی خودای پەروەردگار لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست تەنها شەڕی جیاکردنەوەی نێوان چاکە و خراپەیە دەبێتە ڕەنگدانەوەی نووسینەکانی (اشعیا) بۆ پێشبینیکردنی لەوکاتەی کە خودای گەورە تەنها لەلایەن ئیسرائیلییەکانەوە ناپەرسترێت بەڵکو لەلایەن عەرەبەکانی نێو (میسر) و (سووریا)ش دەپەرسترێت. پێغەمبەر ئەوەی ڕاگەیاند کەوا "ئەو ڕۆژەی ئیسرائیل دەبێتە سێیەم توخم لەدوای میسر و ئاشورییەکان، تەنانەت لەنێو ئەم خاکەشەوە پیرۆزکراوە، ئەو دەوڵەتەی کە خودا پیرۆزی دەکات، بە وتنی، بەرەکەت بۆ خەڵکی میسری، بۆ کار و چالاکییەکانی ئاشوری، وە بۆ ئیسرائیلییەکان کە خۆم هەڵمبژاردوون". هەر لەوکاتەی موحەممەد پێغەمبەرایەتی خۆی ڕاگەیاندووە، عەرەب و جوولەکەکان هەمان خودا دەپەرستن. هەر ئەو ڕۆژە هات و بۆ پێشکەشکردنی ناوەرۆکی پرۆسەی ئەلیکسەندەر بۆ جێبەجێکردنی بەسەر هەردوولا. لەدواییدا، بە قسەکانی ئیسحاق ڕابین وتی ئیسرائیلی و فەڵەستینییەکان دەبێ "لەم کانیانەی کە سەرچاوەی ڕۆحانیی ئێمەنە دووربکەونەوە بۆ لێخۆشبوونی ئەم ئازارانەی کە

یەکێك بە ئەوەیتری گەیاندووە، هەروەها بۆ پاککردنەوەی ئەم شوێنە بەمینچێنراوانەی کە ماوەی چەند ساڵێکە هەردوولایەنی دابەشکردووە". لەوەیە ئەو کاتە کە هەردوولا گرنگی بدەن بە رێنماییەکانی قورئان: "وان جنحوا للسلم فاجنح لها وتوکل على الله".

تا ئەو رۆژە، ئەو کێشەی بەڵێنی بەلفۆر هەر بەردەوامی هەبوو، کارەکتەری سەرکردەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێوەیەکی رێکخراو تاقی دەکرێتەوە، رێگا شیاوەکەی ولایەتە یەکگرتووەکان جێگای مشتومڕە، خەڵکی ئەم ناوچەیە لە ترس و دڵەڕاوکێوە دەژین. فشاری ئەمڕۆکەی موسڵمان و جوولەکە و مەسیحییەکان بەرەو خراپی هەنگاو دەنێ وە بۆ ئەوپەڕی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە درێژەی دەبێ، هەروەها هەڕەشەیەکە بەڕاستی بۆتە هەژاندنی جیهان.

## (١٠)

# " گەورەترین جیهاد"

خەڵكی ئیسرائیل بەم وشكییەوە هاندران بۆئەوەی لەلێژاییــەكانی بــەرزایی كارمــل كۆببنەوە تا شــاهێدی ئــەم بەربەرەكانییــە بــدەن. لەلایەكــەوە ٤٥٠ قەشــەی بــەعلی و خواكانی كەنعان وەستاون. لەلایەكەیترەوە ئیلیــا وەســتاوە، پێغەمبــەری یەهودییــەكان، خودای ئیبراهیم، موسا، داوود. لەنێو وەستاوانیشــدا، اهــابی تێدایــە، كــە پادشــایەكی بێهێزی كەللەڕەقە. پرسیارەكە لێرە ئەوەیە ئایا خودای كامەلا بالأدەستتر و بــەتواناترە. بەڵگەكەش داوای ئەوەدەكات دەبێ وەك كردارێك نیشانی خەڵكەكە بــدرێ بــە گڕگرتنــی مێزی پیرۆزی كڵێسە بەجۆرێك گایەك ببێتە قوربانی ئەم بەڵگە و وەڵامەیە. لەسەرەتادا، دواكەوتوانی بەعل، خۆیان تاقیكردەوە، هەڵسان بە دوعــاكردن و ســەماكردن و گــۆرانی وتن، چەند سەعاتێك خۆیان ماندووكرد بۆئەوەی بیسەلمێنن خوداكەیان بالأدەستترە، بەڵام ئەم هەموو هیلاكییە بەبێ سوود كۆتاییان پێهات. ئیلیا گاڵتەی پێدەكردن پێی دەووتن: " بەدەنگی بەرز هاواربكەن: چونكە ئەم خوایە، لەوەیە سەرقاڵ بێ، یان ماندوو، یــاخود چوبێتە سەفەر، كێ ناڵێ نەخەوتووە، بەئاگای بێننەوە". دواتر نۆرەی پێغەمبــەر هــات. مێزێكی پیرۆزی دروستكرد، دوانزە بەردی بەكارهێنا كە ئاماژە بە خێڵەكانی ئیســرائیل دەكەن، ئاویانی بەسەردا پرژاند، لەلایەن خودای پەروەردگارەوە دوعای بــۆكردن، ئینجــا كشایەوە دواوە. لەماوەی چەند چركەیەكدا، قوربانییەكە گــڕی گــرت. ئەوانــەی لەلایــەن خۆیانەوە سەیریان دەكرد دەستیان بەهاواركردن كرد، " خودا هەر خۆی بالأ دەستە، خودا هەر خۆی تاك و تەنهایە".

دوای تێپەربوونی زیاتر لە ٢،٨٠٠ ســاڵ هێشــتاكە پەیوەنــدی نێــوان مرۆڤایــەتی و خوداوەندەكان بەم زۆرییە نەگۆڕاوە. هێشتاكە چاومان بڕیوەتە نیشانە و بەڵگــەی زۆرتــر لەسەر ئەم زەوییە بۆ نیشاندانی مەبەست و سروشتی خودای پەروەردگار.

له ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١ هەردوو تاوەرە جمکەکەی سەنتەری بازرگانی جیهانی ئاگریان تێبەربوو تەقێنرانەوە. ئایا ئەمە نیشانەیەك بوو؟

دوای دوو رۆژ لەم رووداوە تراژیدییە، لەیەکێك لە چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنییەکان جێری فۆلۆیل وتی: "خودا بەردەوامە لەهەڵدانەوەی پەردەکان و رێگا بە دوژمنانی ئەمەریکا دەدات بۆ ئەوەی ئەوەی شایانمانە لەدژمانەوە ئەنجامی بدەن". جێری بەردەوام دەبێ لەقسەکانی، دەڵێ، " بەڕاستی باوەڕم وایە کەوا بتپەرستان و ئەوانەی منداڵ لەباردەبەن، فێمینیستەکان، هەڵگرانی دروشمی نێربازی و مێبازی ئەوانەی کە هەوڵی فەراهەمکردنی رێگاژیانێکی ئەڵتەرناتیڤی تایبەت بەخۆیانەوە هەیە، ئەو ئەمەریکییانەی کە هەوڵی ئازادی شارستانی دەدەن—هەموو ئەوانەی هەوڵی بەعیلمانیکردنی ئەمەریکایان دایە—دەتوانم بە پەنجە ئاماژەیان بە نێو چاوانیان بدەم و پێیان بڵێم، " ئێوەن یارمەتی تیرۆریستانتان دابوو بۆئەوەی ئەم تراژیدیایە رووبدات(١) "(١)

فۆلۆێل بڕوای وایە کە دەستی خودایی تەنها نییە لەپشت ئەم هێرشانەی تیرۆریستان. سەرکردەکانی رێکخراوی ئەلقاعیدە زۆر لەوە دڵنیان کەوا سەرکەوتنەکانیان بەڵگەیە لە بەزەیی و بەرەکەتی خودایی. لە فیلمێکی ڤیدیۆییدا ئوسامە بن لادن و یەکێك لە شێخەکانی سعودیە، دوای ئەم هێرشانە ئاهەنگ دەگێڕن بەبۆنەی سەرکەوتنیان. ئەم هەولانە بە دیارییەکی خودا دادەنێن " سەرکەوتنی ئاشکرا"، هەروەها چیرۆکەکانیان بۆ یەکتر دەگێڕنەوە بەوەی کە چییان لەخەونەکانیان بینییەوە کەچۆن فڕۆکەکان بەرەو رووی ئەم بینایانە دەهاتن و تێکیانی دەشکاندن. شێخەکە بە خۆشحاڵییەوە هاواری دەکرد، " ئەمە دەبێتە گەورەترین جیهاد لەمێژووی ئیسلامیدا".

لەکلتووری جوولەکەکاندا، سەرکەوتن و نسکۆ هەردووکیان دەگەڕێنەوە بۆ ویستی پەروەردگار. هەربۆیەش خودا دەفەرمووێ، " ئەگەر تۆ گوێڕایەڵم بیت، من دەبمە دوژمنی دوژمنت و دوژمنداری لەگەڵ دوژمنکارییەکانت دەکەم". موسڵمانانی پێشتر لەو بڕوایە دابوون کەوا پەروەردگار یارمەتی سەرکەوتنەکانیانی داوە توانیوتیان ئایینەکەی خۆیان فراوان بکەن. کاسۆلیکەکانی ئیسپانیا لەوە دڵنیان کەوا ئەم دەستکەوتنانەی کە بۆتە هۆی پەرینەوەی ئیمپراتۆرییەتەکەیان بۆ ئەوپەری دەریاکان لە سەدەی پانزەهەم و

---

(١) فۆلۆێل بەم قسانەیەوە رووبەڕووی شاڵاوێك لە رەخنەگرتن بۆوە، دواتر داوای لێبوردنی کرد.

شانزدەهەم پاداشتێکی خودایی بوو بەسەر چەوسانەوەی موسڵمانان و مەسیحی و جوولەکەکان. کاتێکیش هێزە ئەوروپی و بەریتانییەکان هەڵسان بە داگیرکردنی ئەفەریقیا بڕوایان وابوو کارێکی خودایی ئەنجام دەدەن. هەروەکو ئێستا خۆشمان دەیبینین، زۆربەی ئەمەریکییەکان سەرهەڵدانی وڵاتەکەیان بە کارێکی خودایی دەبەستنەوە. کاتێ جولیا وارد هاو کتێبەکەی بەناوی (Republic Battle Hymn of the) جەنگی *سرودی خودایی بۆ کۆمارییەکان*، ئەم کتێبە لەوە سەرچاوەی گرتووە کاتێ سەردانی سەربازگەی سوپاکانی کرد لەڕۆژانی زووی شەڕی ناوەخۆیی وڵات، کە تێکەڵەی مەسەلەی خودایی و ململانێی یەکێتی بوو لەدژی هێزی جیابوونەوە.

بێگومان ئەوەش سروشتی مرۆڤە کە هەمیشە حەز دەکات کاری خودایی لەکارەکانی خۆیی و مەبەستی خودایی لەنێو مەبەستەکانی خۆیەوە بەدی بکات. وەك تاکەکان زۆرجاران چاوپۆشی لە پاڵنەرەکە دەکەن بەبێ هیچ هۆیەکی ئازاردان، لەوانەشە هەندێ شتی باشەش بکەن. وەك مەسەلەیەکی پراکتیکی، هەر نەتەوەیەك (گرووپێك) بڕوای وایە سەرکەوتن و شکستی ئەنجامی راستەوخۆی خۆزگەکانی خودایە وەك ئەوە وایە یان داوەتی کێشە دەکات یان دروستی دەکات. لەکاتی بەدەست هێنانی سەرکەوتن، نەتەوە و سەرکردەکان خۆیان وەك کەسانی خاوەن راستی نیشاندەدەن هەروەها پڕدەبن لە هەستی پڕتوانایی. بەڵام لەکاتی شکست خواردندا، هەموو لایەك تووشی گرژی و دابەشبوون دەبن، هەریەکەو ئەوەیتر تۆمەتباردەکات. بەکام رێگا بێت، نەتەوە دەڵێتە خودای، "هەمووی لەسەر تۆوە وەستاوە" لەبڕی ئەمەوە مەترسییەکان گرنگی نادەن بە ئەرکەکان. هەرووەك

ئێمیل دیکنسۆن لە وتاری جیاوازدا نووسیویەتی، " عەقیدە داهێنانێکی زۆر گەورەیە/ کاتێ پیاوان دەیبینن/ بەڵام مایکرۆسکۆب زۆر وردبینە/ لەکاتی حاڵەتی فریاکەوتنەوە".

هەر دوای ماوەیەکی کورت لەهێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر داوەتیان کردم بۆ وتارێك لە کۆشکی هیوای کلێسەی بریسبیتاریەن لە سانت پۆڵ، مینێسۆتە. کورسی نێو کلێساکە هەمووی پڕببوون لە هاووڵاتی بەهەستێکی پەرۆشەوە گوێیان راخستبوو. کاتێ بەسەر قاڵدرمەکان سەرکەوتم بۆ سەر سەکۆی وتار خوێندنەوەکە، سەیرم کرد هەموو دەستە سڕ و کلێنسەکان بەدەرەوەن. لە یادگاریمدا، تاکە ساتی بەراوردکراوی یەکگرتنی نیشتیمانی

لەم نەهامەتییە تەنها تیرۆرکردنی جۆن کنێیدی بوو. بەهەرحاڵ زۆر خۆم ئامادە نەکردبوو بۆ پێشکەشکردنی وتار بەڵام بەقەد توانا ویستم زۆر بە کورتی ١١ی سێپتەمبەر روون بکەمەوە کە مانای چی بوو.

بەشبەحاڵی خۆم هیچ نیشانەیەکی خودایی لەم تاوانانەوە نابینم و هیچ کاریگەرییەکی عەقیدەی ئایینی وەنە هیچ ویژدانێکی کۆمەڵایەتی لە هاندانەکانیانەوە نییە. ئەنجامدەرانی ئەم تاوانە پێویست ناکان بەهۆی ئەم کردارانەیان دڵسۆزی خۆیان بۆ ئیسلام دەرببڕن، بەڵکو خیانەتیان لە فێربوونی عەقیدەکەی خۆیانەوە کردووە. تاوانبارانی ئەم کردەیە هیچ گرنگییەك بە فەڵەستینییەکان نادەن، بەجۆرێك کە سەرکردەکانیان توورەیی و غەم لەبەرامبەر ئەم هێرشانەوە دەرببڕن. هەرگیز گرنگی بە هەژاران نادەن، چونکە سەرچاوەی خۆراکیان بۆ فێربوونی دەست رەنگی کارامەیەك بەکارناهێنن بەڵکو بۆ چاندنی رق بەکاریان دێنن. ئەمان شێت نین، چونکە مامەڵە لەگەڵ حیسابی دڵ بەستووەکان دەکەن. ئەمانە هەمووی تاوانی شەڕانگێزین، پاساوەکانی هۆکاری سیاسی و کلتووری و ئیمانی هەڵناگرێ.

زۆرجاران ئەو پرسیارە دەکەین کە بۆچی خودا کە بەبەزەیی و بەتوانایە رێگایدا ئەم تراژیدییە رووبدا. بەشێك لەوەڵامەکە ئەوەیە کەوا ئێمەی ئەمەریکی ئازادیمان پێدراوە بۆ بیرکردنەوە و کارەکان بەدەستی خۆمانەوە دەکەین. هەندێك لەئێمە ئەم ئازادییە بۆ بنیاتنان و فێربوون و چاککردنەوە و پێکهێنان بەکاردەهێنێت، کەچی ئەوانیتر ئەم بنیاتنانانە تێکدەشکێنن. ئەمانەش کردارەکانی خۆمانە، نەوەك هی خودا ( هەرچەندە لەباربێ بۆ لۆمەکردنی لەکردارەکانی نەوەك هی شەیتان). کاتێ نەخۆشی یاخود رووداوێك مەرگی منداڵێك لەگەڵ خۆی دەبات، ئێمە تەنها دەتوانین ئازار و غەمی خۆمان بۆ ئەم ناخۆشی و نادادگەری چارەنووسە دەرببڕین. هەروەك روودانی گەردەلوولی بەهێز و بومەلەرزە و تسونامی، ئەوا لۆمەی سروشت دەکەین. کەچی باقی وەڵامەکانیتر لەدواوەی ئەوەیە کەئێمە دەیزانین. هەروەك وتاربێژەکان خۆیان بە گوناهبار دەزانن بە بیرهێنانەوەمان لەوەی کە ئێمە بە عەقیدەوە رێدەکەین نەوەك بە بینین. هەرچەندە ئێمە رێدەکەین، بەڵام ئەرکێکمان هەیە لەکاتی رۆیشتن ئەویش چاودێریکردنی خەڵکی و پارێزگاریکردنی یەك بۆ یەکێکیترە. هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر ئاراستەی نوێی زیادکرد بەوەی کەئەم ئەرکەیە چی پێویستە.

لەهەفتــەکانی دوابــەدوای هێرشــەکانی ١١ی ســێپتەمبەر، ســەرۆك بــۆش بــۆ گومانبارەکانی سەلماند کەوا سەرکردەیەکی راستەقینەیە. لە وتارێکی هاوبەشــی بــەردەم کۆنگرێس، بەڵێنی دا بەوەی بەر لەهەڵبژاردنی ببێتە خاڵی یەکگــرەوەی ناکۆکییــەکان. ئاماژەی بەوەدا کەوا هەموو خەڵك لەسەرتاسەری جیهان وەڵامی رفێنەرەکانیان داوەتەوە بــە دوعــاکردن بــە زمــانی ئینگلیــزی و عــەرەبی و عیــبری، و هــەروەها هۆشــداری بــە راستەقینەکی سەرسوڕمانیشدا بەوەی کەوا قوربانییەکانی ١١ی سێپتەمبەر خــەڵکانێك بوون کەمتر نەبوون لە هەشتا نەتــەوەی جیاجیــای جیهــان. سوپاســگوزاری خۆیشــی بــۆ رێکخراوە نێودەوڵەتی و هاوپەیمانانی لــە ئــەوروپا و ئاســیا و ئەفــەریقیا و ئەمــەریکای لاتینەوە دەربڕی. سەرۆك بەڵێنی ئەوەیدا کــە هــەموو کەرەســتەیەکی سیاســەتی دەرەوە بەکاربێنێ بۆ رووبەڕووبوونەوەی " رێکخــراوە تیرۆریســتییەکان و فراوانبوونیــان بەســەر پانتــایی جیهــان" ئەوەشــی روونکــردەوە کــەوا "رێکخــراوی ئەلقاعیــدە، نوێنەرایــەتی گرووپێکی توندڕەوی ئیسلامی دەکات بەجۆرێك زۆربەی زانایان و بیرمەندانی ئیســلامی رەتی ئەم گرووپە دەکەنەوە - ئەم گرووپــە توندڕەوەیــە ناوبــانگی فێربــوونی ئاشــتەوایی ئیسلامیشی پیس کردووە". قسەکانی سەرۆك چاککردنەوەی ئازارەکانی پێوە دەبینــران، هەروەها هەوڵێکیش بوو بۆ دیزاینکردنی رای گشتی هەموو جیهان تــاوەکو بەرهەڵســتی ئەلقاعیدە و پشتیوانانی بکەن. ئەمەش ستراتیژییەکی زۆر راست و رەوانە. بــۆ زاڵبــوون بەسەر تیرۆر، ئەمەریکا پێویستی بە یارمــەتی و هاوپــەیمانی هــەموو لایەکــەوە هەیــە، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی کە زۆربەی دانیشتوانیان موسڵمان و عەرەبن.

هێڵــی یەکلاکــەرەوەی قســەکانی ســەرۆك زۆر روون خــۆی نیشــانددا: " هــەموو نەتەوەیەك، لەهەر هەرێمێکدابێ، دەبێ هەر ئێستا بڕیاربدات. یان ئەوەتا لەگەڵ ئێمەن، یان لەگەڵ تیرۆریستەکانن(٢)". لە دوابەدوای هەفتەکاندا، زۆربەی وڵاتــان دوودڵ نــەبوون لەبڕیاردان.

---

(٢) لەدەرکردنی ئەم بەرەنگاربوونەوەیە، سەرۆك بۆش لەوەیە بیری لە ئاگادارکردنەوەی مەسیح کردبێتەوە، " ئەوەی لەگەڵم نەبێ واتە دژی منە" ( لۆقا ١١:٢٣). هەروەها تەواو هاو وێنەی ئەمەش نییە بەوەی هەوڵی ئەوە بدات بۆ بیرهێنانەوەی جیهان بەهۆی وتەکەی لینین لەکاتی شۆڕشی رووسیا کردووی" : ئەوەی لەگەڵمان نەبێ واتە لەدژمانەوەیە".

هاوپەیمانانی ئەمەریکا لە پەیمانی باکووری ئەتڵەسی (NATO) بۆ یەکەمجار ئەوەیان ڕاگەیاند ئەم هێرشانە کارێکی شەڕانگێزییە لەدژی تەواوی هاوپەیمانییەتەکەیان. جگە لەعێراق، هەموو حکوومەتەکانی جیهانی ئیسلامی، بە ئێران و فەلەستینیشەوە، ئیدانەی ئەم هێرشانەیان کرد بەکارێکی نامرۆڤانەیان وەسفکرد. کاتێ سوپای ئەمەریکا هاتنە نێو ئەفغانستان بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی تالیبان و دەوردانی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە، هاوپەیمانانی ئەمەریکا وەك: کەنەدا، ژاپۆن، ئوستڕالیا، پەلەیانکرد لەیارمەتیدانی ئەم سوپایە. پاکستان سەرەڕای پەیوەندی نزیکی لەگەڵ سەرکردە رادیکالییە ئەفغانییەکان ڕازیبوو بە یارمەتیدانی سوپای ئەمەریکا. چین و ڕووسیا بەڵێنی هاوکاری یەکتریاندا، لەگەڵ ئەوەی لەلایەن موسڵمانە جیاخوازییەکانەوە بەرەنگاری دەکرێن. تەنانەت ئەو موسڵمانانەی کەلەسەرەتادا پڕۆتستۆی هێرشەکانی ئەمەریکایان بۆ سەر تالیبان دەکرد، کاتێ ڕوون بۆوە کە لادانی ئەم ڕژێمە توندڕەوانە لەلایەن زۆربەی ئەفغانییەکانەوە پێشوازی گەرمی لێکرا ئەوانیش بێدەنگ بوون. لە ولایەتە یەکگرتووەکان، گرووپێکی شەست ئەکادیمی—پێکهاتبوون لە مەسیحی، جوولەکە، موسڵمان، بێباوەڕەکان—نامەیەکیان واژووکرد بەوەی پاڵپشتی خۆیان بۆئەم ئۆپەڕاسیۆنە سەربازییەی ئەمەریکا لە ئەفغانستان دووپات دەکردەوە، هەروەها ناویاننا بەرگری لە" ئەخلاقی مرۆڤی جیهان" یاخود " جەنگی دادگەری". چەند مانگێك دوای ١١ی سێپتەمبەر، ئیدارەی بۆش سەرکەوتوو بوو لە یەکگرتنی ئەمەریکا و حکوومەتە دەرەکییەکان بۆ بەرهەڵستکردنی هەڕەشەیەکی هاوبەش.

وەك دیموکراتییەك، زۆر شانازی بە ئەندامانی پارتەکەم دەکەم بۆ ئەو پاڵپشتیکردنەی کۆشکی سپی. ئەندامانی کۆنگرێس و فەرمانبەران ئەوانەی لە ئیدارەی کلینتۆنەوە خزمەتیان دەکرد بە چەپڵەڕێزان پێشوازییان لەم بڕیارانەی ئیدارەی بۆش دەکرد. لەهەموو دەرفەتەکاندا، من هەمیشە پاڵپشتی خۆم پێشکەش بە سیاسەتەکانی سەرۆك کردووە. کاتێ بینیم ڕژێمی تالیبان ڕووخێنرا، زۆر کەیفخۆش بووم. کاتێ لە حکوومەت خزمەتم دەکرد، چاوم بە ئافرەت و کچانی ئەفغانی کەوت لە کەمپی پەنابەران لە وڵاتی پاکستان نزیك مەمەڕی خەیبەر، گوێم لە داوا و چیرۆکەکانیان دەگرت بەوەی کەچەندە بێبەش و ئازاردراون. منیش لەلایەن خۆمەوە بەڵێنی ئەوەم پێدان کەوا ئەمەریکا هەرگیز ئەم زۆرداری و ستەمانە قەبووڵ ناکات و لەبیریان ناکات. هیوادارم ئێستاکە ئەم پەنابەرانە

توانیبێتیان گەڕابنەوە نێو ماڵ و وڵاتی خۆیان و ڕێز لە مافەکانیان گیرابێ. هەروەها پاڵپشتی خۆم بۆ بڕیارەکانی پێنتاگۆن دووپات دەکەمەوە بەوەی راوەدووی تیرۆریستان دەنێ و دەیانگرێ دەستگیریان دەکات دەیانداتە دەستی دادگا، جا ئەگەر تاوانبارن دادگای بکرێن و ئەگەر بێتاوانیان لەسەر راست بۆوە ئازاد دەکرێن.

لە فێبرایەری ١٩٩٨، بن لادن فتوایەکی دەرکرد کەوا خۆیی و سەرکردە تیرۆریستەکان بانگی هەموو موسڵمانانی جیهانیان کرد کە لەهەر شوێنێك ئەمەریکییان بینی بیکوژن. هۆیەکەشی ئەوە بوو ئەمەریکا پاڵپشتی لە سزا ئابوورییەکەی عێراقی کردووە، یارمەتی ئەمەریکا بۆ ئیسرائیل، و هەروەها بوونی هێزە ئەمەریکییەکان لە سعودیەی عەرەبی. ئەمەریکای بە راگەیاندنی شەڕ لەدژی خودا و پێغەمبەر و موسڵمانان تۆمەتبار دەکرد. بۆ پەیڕەوکردنی ئەرکی ئایینی دەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە ئایینییەکان بە بەرپەرچدانەوەی هێرشەکان بۆسەر عەقیدەی موسڵمانان. دواتر بانگی هەموو موسڵمانانی کرد بۆ ئەوەی بەشداری بکەن لە هێرشکردنی سەر " سوپای شەیتانی ئەمەریکا".

ئەگەر لەلایەکەوە باس لە خاڵەکانی بن لادن بکەین، هێشتاکە خاوەن ئەو تایبەتمەندییە نییە بۆئەوەی بتوانێ موسڵمانان فێری ئەرکە ئایینییەکان بکات. تەنانەت خاوەن ماڵ و چاودێرەکەشی مەلا محەممەد عومەر دانی بەوەنا، " بن لادن کەسێکە ئەو مافەی نییە لە مەسەلە فتواکاندا نزیك ببێتەوە، چونکە هێشتاکە وانەی قورئانی نەخوێندووە، دەبێ دوانزە ساڵ ئەم وانەیە بخوێنێ تا دەگاتە شوێنی موفتییەکان. تەنها موفتی دەتوانێ فتوا بدات. بۆیە بن لادن ناتوانێ فتوابدات ئەگەر هەر فتوایەکیشیدا ئەوە ناچێتە بواری جێبەجێکردن چونکە فتوایەکی ناشەرعی و ئاڵۆز و بەتاڵە". ئەم قسانەی مەلا نەیانتوانی ڕێگا لە بن لادن بگرن لە فتوادانەکانی. بەرێکەوتی سروشتی، ئیسلامی سوننە بێبەشن لە سەرکردەیەکی یەکگرتوو. هیچ کەس و دەزگایەکی تایبەتی نییە ئەم لێپرسراوییەتە هەڵگرێ لە جیاتی هەموو موسڵمانانەوە قسە بکات، ڕوونکردنەوە بدات لەم پەیامانەی کە بن لادن دەریدەکات، سەرئەنجام دەبێتە هۆی قەناعەت پێهێنانی موسڵمانەکان و پەیڕەوکردنیان بەشێوەیەکی نادروست.

ئەوکاتەی وەك وەزیری دەرەوە لەحکوومەت خزمەتم دەکرد، ئوسامە بن لادن هەڵاتوو و لەدوورترین شوێنی ئەم زەوییە داواکراو بوو. بەزانیاری تایبەتی خۆمانەوە هیچ وڵاتێك لەدەرەوەی ئەفغانستان یارمەتی چالاکییەکانی نەدەدا. بن لادن کەسێکی تیرۆریست بوو،

بکوژی موسڵمانان بوو، لە وڵاتی خۆی (سعوديە) حاشای لێکراوە، هەروەها لەو وڵاتەی کە تیایدا گەورە بووە (سودان) بەدەرنراوە. ئاگاداری ئەوە ببووین لەهەوڵی گرتنی عاتیفەی موسڵمانان دابوو بۆئەوەی بۆ مەرامەکانی خۆیەوە بەکاریان بێنێ، بەناوی دەربڕینی تووڕەی و عەقیدەیان بەرامبەر بێباوەڕان و گەیشتن بۆ پلەی " شەهید". دیماگۆگ زۆر مەترسیدارە لەکاتێکدا بەخەڵکەکەیان دەووت ئایا حەز دەکەن گوێتان لە چی بێ و چیتان دەوێ، هەرچەندە کاری تیرۆریستی پێویستی بە ژمارەیەکی کەم هەیە بۆ خولقاندنی گەورەترین کێشە.

بێگومان شتێکی بێ مانایە بەوەی بڵێین ئەمەریکا جەنگی دژی ئیسلامی ڕاگەیاندووە. لەژێر ئیدارەی کلینتۆن، ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەهێڵی پێشەوەی بەرگریکردنی موسڵمانان بووە بەتایبەتی لە بۆسنە و کۆسۆڤۆ، هەروەها یارمەتیدەری دیموکراسی بوو بۆ موسڵمانانی ئەندەنوسیا، باسکردنی ئاشکرای لادانەکانی رووسیا لەبەرامبەر پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لە شیشان، و هەروەها هێنانی ئاشتی بۆ قەوقاز و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لەسەردەمی کارتەر و ریگان، ئەمەریکا یارمەتی موجاهیدە دوورخراوەکانی نێو سوپای رووسی دەدا لە ئەفغانستان.

سەلماندنی نێگەتیڤانە کارێکی ساکارنییە، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی گومانیان هەیە، هەندێك لەو موسڵمانانەی کە لەلایەن بن لادنەوە بەکارنەهێنراون هێشتاکە بەشدارن لە بەرهەڵستەکانی بن لادن بەرامبەر سیاسەتی ئەمەریکا. بەلایەنیکەم گوێبیستی قسەکانی بن لادن دەبن کاتێ باسی " پاککردنەوەی" خاکی پیرۆز دەکەن لە بێ باوەڕەکان، هەروەها گەڕانەوەی فەرمانڕەوایی موسڵمانان لە شاری قودس، زیندووکردنەوەی رۆحی ئەو جەنگاوەرانە کە لەرۆژانی زووی ئیسلامەوە بەجێیان هێشتوون. کاتێ پێیان دەووترێ ئەمەریکییەکان پێویستە بەرگەی ئەم سیاسەتە رەخنەگراوییە بگرن کەلە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کەنداوی فارسییەوە پەیڕەوی دەکەن سەریان دەهەژێنن. کاتێ هێرشە تیرۆریستییەکان بۆسەر بالیۆزخانەی ولایەتە یەککگرتووەکان لەساڵی ١٩٩٨ لە کینیا و تانزانیا ڕوویاندا، وەزارەتی دەرەوە بڕی ٥ ملیۆن دۆلاری وەك پاداشت تەرخانکرد بۆ ئەو کەس و لایەنانەی کە زانیاری دەدەن لەسەر ئوسامە بن لادن. ئەمەش بووە هۆی بەرزکردنەوەی بەخشینە سێلاوییەکانی بۆ بن لادن لەلایەن عەرەبە دەوڵەمەندەکان. هەرچەندە وڵاتانی موسڵمان زۆر بەبەزەیی نەبوون لەگەڵ بانگەشەکانی بن لادن بۆ ئەوەی

بەدوای قسەکانی بکەون بۆ ئەنجامدانی شەڕی پیرۆز، بەڵام هەندێ هاووڵاتیان ئەم کارەیان دەکرد.

بن لادن هەڵدەستێ بەگەڕان بەدوای بەگەڕخستنی پاڵپشتی بەهۆی داواکردنی کۆکردنەوەی تووڕەیی و ئیرەیی خەڵکەکە. هەمیشە بن لادن بیر لە رووداوە کۆنەکانی مێژوو دەکاتەوە، بەجۆرێك کەمێك لەوانەی دەرەوەی جیهانی ئیسلامین بیری لێدەکەنەوە، بەڵام موسڵمانانیش بەئاسانی لەبیری ناکەن، ئەوانیش: رووخانی ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی، دابەشکردنی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی عەرەبی و باکووری ئەفەریقیا لەنێوان هێزە مەسیحییەکانەوە، و هەتا دەرکردنی موسڵمانان (شانبەشانی جوولەکەکان) لە ئیسپانیا لەهەمان ئەو ساڵەی کۆلۆمبۆس یەکەم کەشتی خۆی بۆ جیهانی نوێ هەڵگرت. موسڵمانەکان سکاڵای ئەوە دەکەن ئایینەکەیان کەوتۆتە ژێر هەڕەشە و ترسی ئازاردانیان هەیە (paranoid) لە بەرامبەر رۆژئاواییەکان، بەڵام سنووری جیهانی ئیسلامی لەم چەرخانەی دواییدا کەم بۆتەوە. کاتێ فەڕەنسییەکان لەساڵی ١٩٢٠ هەنگاویان بەرەو دیمەشق نا، سەرکردە گەورەی سوپاکە، جنراڵ هێنری گورود، بەرەو مەزارگەی گەورە پاڵەوانی بەرێزی ئیسلام—سەلاح الدین— رۆیشت لەسەر مەزارەکە وەستا و وتی: "ها سەلاح الدین ئێمە هاتووینەتەوە بۆئەوەی سەرکەوتنی خاچی مەسیحییەکان بەسەر مانگەکەی موسڵمانان پیرۆز بکەین". لەداگیرکردنی وڵاتانی عەرەبی، نوێنەرەکانی هێزە رۆژئاواییەکان زۆر بەمەبەستەوە هانی پێشکەوتنی هەڵبژاردە عیلمانییەکانیان دەدا ئەوانەی دەسەڵاتی سەرکردە ئایینییەکانیان زەوتکردبوو. لەم کاتەشدا، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی سۆڤیەتی چەندین دە ساڵەیان بەرێکرد و بەملیۆنان موسڵمانیان رادەگەیاند کەوا هیچ خودایەك بوونی نییە. ناسیۆنالیستی عەرەبی وەك جەمال عەبدولناسری میسری بەجۆرێك وێنەی ئیسلامی کێشا کە گوایە ئیسلام دژی پێشکەوتنە. خەونی زایۆنییەکان بەیارمەتیدانیان لەلایەن هێزە رۆژئاواییەکان هاتە دی ئەمەش لەسەر حیسابی عەرەبەکان.

ئامانجی بن لادن دروینەوەی ئەو تاڵیەتییەیە کە لەرێگای کێلانی ئەم و ئەو بەهۆی سکاڵای زۆرەوە دێنە بەرهەم. دەیەوێ دابەشبوونێکی جیهانی لە بیرکردنەوە دروستبکات لەنێوان موسڵمانان لەلایەك و رۆژئاوا لەلایەکیتر—بەتایبەتی ئەوەی کەخۆمان دەمانەوێ خۆی لێ رزگارکەین. بن لادن و ئەوانەی وەك ئەو بیردەکەنەوە، تەرکیزیان کردۆتە سەر

دادی کۆن و نەمانی دەرفەتەکانی داهاتوو. کاتێك دەگەڕێینەوە سەر قورئان، ئەم ئایەتە ناخوێنینەوە کە دەڵێ، "عسی الله ان یجعل بینكم وبین ماعادیتم منهم مودة والله قدیر والله غفور رحیم"— خودای گەورە خۆشەویستی و هاوڕێیەتی نێوان ئێوە و ئەوانەی کە ئێستاکە وەك دوژمن قەبووڵتان کردووە بەرز رادەگرێ، چونکە خودای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکەوە هەیە، زۆر بە لێبوردە و بەبەزەییە. کەچی بن لادن و دواکەوتەکانی لەبری ئەمجۆرە ئایاتە قورئانیانە هەوڵی پەنابردنە بەر کوشتن و خوێنڕشتنی کافرانن. هیچ بیرۆکەیەك پێشکەش ناکەن بۆ دەوڵەمەندکردن و باشترکردنی ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر رووی زەوی. خۆیان بەو شکۆمەندییانەوە سەرقاڵکردووە کەلە رۆژی دواییدا پێشبینی دەکەن. بە بۆچوونی خۆیانەوە ئەخلاقیان لەوپەڕیدایە، وە سروشی پەروەردگاریش تەنها راسپاردەی کوشتنە.

رووداوە دڵتەزێنەکانی ٩/١١ بە مردنی زیاتر لە ٣٠٠٠ مرۆڤ کۆتاییان پێهات. هەر ئەم رۆژەش بە بەرەنگاربوونەوەیەکی نوێ و ئاڵۆزی ئاسایشی نەتەوەیی ولایەتە یەکگرتووەکانەوە نیشانکرا. بەپێچەوانەی ئەمەوە کۆمۆنیستە "بێ باوەڕەکان" ئەم دوژمنە داوای هاریکاری لەکاری پیرۆز دەکرد. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسانە، ئەمەریکا پێویستە ببێتە داهێنەر نەك تەنها بۆ ئامادەکردنی رێگای جیاواز بۆ خۆپاراستنی لە هێرشی چاوەڕوان نەکراو، بەڵکو لەپێشکەوتنی پەیامێك بۆئەوەی سەرکەوتوانە بتوانێ بناغەی یارمەتیدانی دوژمنەکانی بڕووخێنێ.

## (١١)

# "خودا منی وەك سەرۆك دەوێ"

دوای ٩/١١ سەرۆك بۆش هەڵبژاردنی دڕاماتیکییەکەی خۆی بەڕووی جیهانەوە پێشکەشکرد، پەیامەکەی زۆر روون بوو: جیهان گۆڕاوە ئەمەریکاش بەرگری لەخۆی دەکات. هاتنە ژوورەوەی سوپای ئەمەریکا بۆناو ئەفغانستان پشتڕاستی ئەم پەیامەی کردەوە، رێکخراوی ئەلقاعیدەی پەرش و بڵاوکرد، رژێمی تالیبانی لەسەر کورسی دەسەڵات لادا. بە بۆچوونی من، هەنگاوەکانی داهاتووشی ئاشکرابوون. یەکەم، کردەی *سەربازی* بۆ رێگەگرتن لە ئەلقاعیدە لە دۆزینەوەی حەشارگە لەسەر سنووری نێوان ئەفغانستان و پاکستان. دووەم، کردەی *سیاسی* بۆ بنیاتنانی دەزگای دیموکراسییەکان لەسەرانسەری ئەفغانستان و هەروەها دڵنیابوون لەوەی کە توخمە رادیکاڵییەکان ناتوانن دووبارە لەم ناوچەیەیە پێگەی خۆیان دابمەزرێننەوە. سێیەم، کردەی *دیپلۆماسی* بۆ ناونووسکردنی یارمەتی وڵاتانی دراوسێی ئەفغانستان—وەك ئێران، پاکستان، وڵاتانی موسڵمانی ئاسیای ناوەڕاست—بۆپێکهێنانی هاوپەیمانییەتێکی زۆر بەهێز لەدژی ئەلقاعیدە. ئامانجی گرنگ ئەوەبوو تا ئەوپەڕی بتوانین تۆڕەکەی بن لادن بڕووخێنن، وە پەراوێزکردنی ئەوانەی ماونەتەوە، هەروەها رێگەگرتن لە دووبارە ریشەگرتنەوەی.

هەر لەم کۆتاییەوە، وای بۆدەچووم، سەرۆك بۆش بەردەوام بێت لە باسکردنی ئەم بابەتانەی کە زۆر بە کاریگەرییەوە لە هەفتەکانی سەرەتای دوای ٩/١١ ئاماژەی پێدابوون: یەکگرتنی جیهانی، زاڵبوون بەسەر تیرۆریستان، کارکردن لەگەڵ هاوپەیمانان، گەیاندنی دەستی دۆستایەتی بۆ عەرەب و موسڵمانان. کەچی ئەم پێشنیازە هیچی لەجێی خۆیەوە نەهاتنە دی. ئالەم ساتەدا کاتێ بەردەوامی ئاراستەکە دەیەوێ بکەوێتە سەر سکەی لۆژیکی و پێویستی، سەرۆك ئاراستەکەی خۆی دەگۆڕێ.

لەبڕی ئەوەی سەرۆك بۆش کاتی خۆی تەرخانبکات بۆ لەناوبردنی رێکخراوی ئەلقاعیدە، بەڵکو هەڵدەستێ بە پەیڕەوکردنی رێگایەك کە بەتەواوی پێچەوانەی ئەوەی پێشووتربوو. لەساڵی ٢٠٠٢ لە وتارەکەی کاتی یەکگرتنەوەدا، سەرۆك زیاتر جەختی لەسەر تیرۆریستەکان

و بیناتنانی نەتەوەیەکی نوێ لە ئەفغانستان نەکردەوە، بەڵکو هەڵسا بە جەختکردنەوە لەسەر " تەوەرەکانی شەڕانگێزی"- عێراق، ئێران، وە کۆریای باکوور. لەتێبینییەکانی دواتری هەمان ساڵدا، دووپاتی لەسەر پێداویستییە سەرەکییەکانی هاوپەیمانییەتەکی فرەنەتەوەیی دژ بەتیرۆر نەدەکردەوە بەڵکو دووپاتی پاراستنی مەبەستی بێ لایەنی ئەمەریکا دەکردەوە بە دانانی "هێزێکی فرەنەتەوەیی لەڕادەبەدەر لەتوانا لۆجستییەکان کەهیچ لایەنێك نەتوانێ بەرەنگاری ببێتەوە". لە بڵاوکردنەوەی ستراتیژییە ئاسایشە نەتەوەیەکەیدا، سەرۆك جەختی لەسەر مافی هێرشکردنە سەر نەتەوە دەرەکییەکان دەکردەوە، بەوەی کە گومانی ئەوە بکات ئەم نەتەوە و دەوڵەتانە رۆژێك لەرۆژان چالاکی لەدژی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەنجامدەدەن. ئەمەش رێبازێکی پاساو هەڵگرە بەوەی مافێك دەداتە ئەمەریکا بەجۆرێك ئێمە هەرگیز ئەوەمان بە یاسایی نەزانیوە ئەگەر لەلایەن هەر حکوومەتێکیترەوە داواکرابوایە. هەروەها داوای لە کۆنگرێس کرد بۆئەوەی دەسەڵاتی پێبدات بە دروستکردنی نەوەیەکی نوێ لە چەکی ئەتۆمی بۆئەوەی لەسەر زەخیرەی چەکی مەترسی ئێستای ولایەتە یەکگرتووەکانەوە زیادبکات.

ئەم وتارە هاندەرانە سەرنجی زۆربەی موعجیبانی سەرۆك بۆخۆی راکێشا بەڵام ئەمە نەبووە پاراستنی ئاسایشی زیاتری ئەمەریکا. بەپێچەوانەوە بووە هۆی ئالۆزترکردنی ئەو هەڵبژاردنە ساکارانەی کە پێویست بوون ئەنجامبدرێن. سەرۆك داوای لە هەموو ولاتان کرد بۆئەوەی رووبەرووی قاعیدە ببنەوە. لەوکاتەی سەرۆك داوای رووبەڕووبوونەوەی قاعیدەی دەکرد کەچی لەهەمان کاتیشدا پاڵپشتی لە دیمەنێکی دوور لە سنووردراوی هێزی ولایەتە یەکگرتووەکانی دەکرد. بەرامبەر بەم هەڵبژاردنەیە، زۆربەی ئەوانەی رقیان لە تیرۆریزم دەبۆوە دوودڵ بوون لەبەرامبەر بوونیان لەیەك سایدی گۆڕەپانەکە لەگەڵ ئەمەریکا. بەهۆی هەرەس هێنانی لە گرنگیدان بە ئامۆژگارییەکانی تیۆدۆر رۆزڤڵت بە قسەکردن بەشێوەیەکی نەرم و نیان، ئیدارەی سەرۆك بۆش دەستی کرد بە گۆڕینی سەرنجی جیهان بەرامبەر بەوەی کە تیرۆریستان چیان ئەنجامداوە و ئەمەریکاش بەنیازە چی ئەنجامبدات.

لە سێپتەمبەری ۲۰۰۲، سەرۆك بۆش فەرمانی بە جەماوەرێکی زۆردا لەوکاتەی سەفەری بۆ مەنهاتان دەکرد بەمەبەستی ئامادەبوونی لە کۆبوونەوەی ساڵانەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان. لەوکاتەدا ئەگەر من لەو پۆستە بوومایە کەبتوانم ئامۆژگاری سەرۆك بکەم، فشارم دەکردە سەری بۆئەوەی لەم کۆبوونەوەیەدا هاریکاری ئەو ولاتانە بکات کە دژی

ڕێکخراوی قاعیدەن، هەروەها یارمەتی ئەم حکوومەتانەش بدات کە گومانلێکراوانی قاعیدەیان دەستگیرکردووە، لەگەڵ ئەمەشدا تکا لە پیاوانی ئایینی و توێژەران و کەسانی ڕۆشنبیر بکات بۆئەوەی هەموو ئەو بارودۆخانە ڕەت بکەنەوە کە وەك پاساو بۆ کاری تیرۆریستی بەکاریاندێنن. کەچی لەبری ئەمانە سەرۆك داوای پاڵپشتی دەکرد بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ لەگەڵ سەددام حوسێن. بەدرێژایی ئەم پاییزە، کاتێ سەرۆك باسی مەسەلەی قاعیدەی دەکرد، وێنەیەکی کەمتری لە بەرەنگاربوونەوە وەك ململانێیەکی فرەنەتەوەیی لەدژی هەڕەشەی جیهانی پێشکەشکرد لەوەی هات باسی هەڵمەتێکی دەکرد بۆئەوەی تیرۆریستان ڕاپێچی "دادگای ئەمەریکی" بکات، بەوپێیەی "دادگا" خۆی بەس نییە بۆ دادگایی کردنی تیرۆریستان.

لە کانوونی دووەمی ساڵی ۲۰۰۳، سەرۆك دەرفەتێکیتری هەبوو بۆ نیشاندانی پێشینەکانی خۆی لەڕێگای وتاری یەککرتنەوە. ئەمجارەیان، عێراقی بەچوارجار مەترسیدارتر دانا لە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە—لەم وتارە هەژدەجار ناوی سەددام حسێنی هێنا بێئەوەی جارێکیش ناوی ئوسامە بن لادن بێنێ. بۆ پاڵپشتیکردنی ئەو بڕیارەی کە دەریکردبوو بە داگیرکردنی عێراق، سەرۆك بۆش هەردوولا حکوومەتی بەغدا و قاعیدەی بەیەکەوە بەستەوە، وەك دووڕووی یەك هەڕەشە وەسفیانی دەکرد. ئەم تاکتیکە وای لە زۆربەی ئەمەریکییەکان کرد کەوا سەددام حوسێن لەپشتەوەی هێرشەکانی ۹/۱۱ دایە—ئەگینا بۆئێمە هەموومان لەم شەڕە لەگەڵ سەرۆکدا بووین؟ ئەمەش وای کرد توانا ببەخشێتە ئیدارەکە بەوەی تۆمەتباری هەموو ئەوانە بکات کە پرسیار لەوە دەکەن کەوا داگیرکردنی عێراق مامەڵەیەکی نەرم و نیانەیە لە شەڕکردن لەگەڵ تیرۆر. هەندێ وڵات وەك ئەڵمانیا و فەڕەنسا ڕەخنەی توندیان لەلایەن وەزیری بەرگری ئەمەریکا ئاڕاستەکرا، و هەروەها ئەم دوو وڵاتە لەلایەن هەندێ لە ئەندامانی کۆنگریس بە خائین تۆمەتبار دەکران. ئەمەش نادادگەرییە. سەربازانی فەڕەنسا بەبەردەوامی شانبەشانی سوپای ئەمەریکا لەئەفغانستان خزمەتیان دەکرد، ئەو شوێنەی کە پێگەی سەرەکی قاعیدەیە، و هەروەها ئەڵمانیاش لەم شوێنە پێشڕەوی هێزەکانی ئاسایشی نێودەوڵەتی دەکرد.

لەوکاتەی شەڕ لەگەڵ عێراق ڕاگەیەنرابوو، دوای چەند مانگێك، دەنگۆی سەرکەوتن بەنێو ئیدارەکەی بۆش دەخولایەوە. ئەوانەی کە پلانی ئەم شەڕەیان دانا شانازییان بەو " شۆك و ترس" ە دەکرد کە سوپای ئەمەریکا لەناوچەکە دروستیکردبوو. جێگری سەرۆك چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کەوا سوپاکەیان وەك " ڕزگارکەر" پێشوازییان لێدەکرێ. کۆندالیزا ڕایز

پلانەکەی شیکردەوە و هەروەها بۆ تەواوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگوازرێتەوە. سەرۆك زۆر بە خێرایی و تورەییەوە وەڵامی شکستی خۆی دایەوە لە کۆبوونەوەی هاوپەیمانی فرەنەتەوەکان، " لەهەندێ خاڵدا، ئێمە تاکە لایەنین لەگۆڕەپانەکە دەمێنینەوە. ئەمەش زۆر باشە بۆ من. ئێمە ئەمەریکین".

لەماوەی ئەم مانگانەدا، ئیدارەی سەرۆك سەرکەوتنی لەپاڵپشتیکردنی زۆربەی ئەمەریکییەکان بەدەستهێنان، لەکاتێکدا سەرۆك بۆش توانی سەرەك وەزیرانی بەریتانیای گەورە تۆنی بلێر و چەندین سەرۆکی تری دەرەکی رازی بکات بە ناردنی سەربازانیان بۆ یارمەتیدانی هێزی داگیرکردن لە عێراق. بەڵام ئایا کاری هەریەك لەمانە چی بوو بۆ سەرکەوتنی لەشەڕی تیرۆر؟ ئەم پرسیارە زۆر بەربڵاوبوو، لەبەرئەوەی ئەگەر ئامانجی روونی ئەمەریکا پەراوێزکردنی تیرۆر بوایە ئەوا قاعیدەش ئامانجی خۆی هەبوو. ستراتیژییەتەکەی بۆ رازیکردنیان بوو، یاخود بەلایەنی کەمەوە بۆ حاڵەتێکی بێ لایەنی سەرسوڕمانی، تەنانەت هەموو موسڵمانانیش بەرهەڵستی سیاسەتەکانی ولایەتە یەکگرتووەکانیان دەکرد. لەلایەن خۆیشیەوە بن لادن، لەقسەکانیدا، بەڵێنی خۆ یەکخستنەوەی دا لەگەڵ داواکارییەکانی فەڵەستینی بەگەڕانەوەی خاکی پیرۆز و هەروەها بەرگریکردن لە ململانێی عەرەبی لەدژی ئیمپریالیستی مەسیحییەکان لە شەڕی عێراق. لینکی نێوان هێرشەکانی سەر ئیسلام و داگیرکردنی دەرەکی یەکلایکەرەوەیە، چونکە توێژینەوەکە ئەوە دیاریدەکات، کە ئەوانەی لە پشت تەقینەوە خۆکوژییەکانن زۆر بەدەگمەن لەلایەن باوەڕە ئایینییەکانەوە هاندەدرێن. رێکخستنی هەڵمەتی تیرۆرستی هەمیشە فشارێك بووە بۆ کشانەوە لەم هەرێمانەی کە جێگای گفتوگۆبووە. دەنگی ئەمەریکی خۆی وای لەکارەکانی قاعیدەکرد ئاسانتر بێ لەوەی کە هەبووە.

هەفتەکانی دوای هێرشەکانی ۹/۱۱ رای گشتی بەتەواوەتی بەزەییان بە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەهاتەوە. هەر دوای دوو ساڵ وێنەیەکی تەواو جیاواز هاتە پێشەوە. لە وڵاتی ئەندەنوسیا، کە گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامییە لەڕووی دانیشتوانیەوە، هەڵوێستیان بەرامبەر ئەمەریکا بەشێوەیەکی لەناکاو هاتە خوارەوە بەجۆرێك لەساڵی ۲۰۰۰، ۷۵٪ ی خەڵکەکەی پشتیوانییان لە ئەمەریکا دەکرد کەچی لەساڵی ۲۰۰۳، ۸۳٪ ی خەڵکەکە لەدژی ئەمەریکا هەڵوێستیان گۆڕا بۆ دژایەتیکردنی ئەمەریکا. زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکان لەخۆیان دەترسان لەوە نەوەکو ولایەتە یەکگرتووەکان پلان دابرێژێ بۆئەوەی هێرش بکاتە سەریان. پاکستان کە تەوەرێکی ناوەندی جەنگەکە بوو، پاڵپشتی ئەمەریکاش بوو لەم جەنگەیە، ۱٦٪

خەڵکەکەی پشتیوانییان لە شەڕکردن دەکرد. ئاستەکانی پاڵپشتیکردن لەساڵی ٢٠٠٥ بەرەو کەمبوونەوە دەچوو: ١٢٪ لە ئەردەن، ١٧٪ لە تورکیا، ٣١٪ لە لوبنان.

لەگەڵ ئەمانەشدا، هاندانەکانی ئەمەریکا بۆ شەڕکردن لەگەڵ تیرۆر دڵسۆزی و پاکی پێوە دیار نەبوو. زۆربەی خەڵکی، نەك هەرتەنها کۆمەڵگا ئیسلامییەکان، لەو بڕوایەدابوون کەوا ئامانجە راستەقینەکانی ئەمەریکا دەستگرتنە بەسەر نەوت، زاڵبوونە بەسەر موسڵمانان، گەشەپێکردنی بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیلە، و هەروەها کۆنترۆڵکردنی جیهانە—هەروەك قاعیدە بانگەشەی بۆدەکات. دەستەی راوێژکردنی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا ئەوەی ئاشکراکرد کەوا ئێستاکە ئەمەریکا " کەمتر لە منارەیەکی هیوا دەبینرێ لەوەی وەك هێزێکی مەترسیدار رووبەڕووببێتەوە" و ئەم زۆرینە گەورەیەش لە میسر و مەغریب و سعودیە بەجۆرێك سەیردەکەن بەوەی کەوا هەڕەشەی بوونی جۆرج دەبلیو بۆش زۆر زیاترە بۆسەر جیهان لەوەی ئوسامە بن لادن".

وەك بیل کلینتۆن لەپێش ئەویشەوە، سەرۆك بۆش دەیان وت زۆربەی کاتەکان بە دڵسۆزییەکی زۆریشەوە ئەمەریکا نەکەوتۆتە نێو پێکدادانی ئایینەکان. لەم کاتە ناسکەدا، دیپلۆماسییەتێکی خراپە بەوەی بڵێی ئەمەریکا پەیوەندییەکی تایبەت و تاقانەی لەگەڵ پەروەدگارەوە هەیە. لەکاتی قسەکردنیدا، هەندێجار مەبەستەکانی دەگۆڕێن. وتارەکەی سەرۆك، هەروەك پێشووتریش لەلایەن سەرۆکەکانیترەوە بەکارهاتووە، نموونەیەکی باشە پڕیەتی لە قسەی کراوە و وێنەی ئایینییەوە. هیچ شتێ رووناداتت گەر بڵێین قاعیدەی گوێی لەوە گرتبوو کاتێ سەرۆك خۆی وەك خاچ پەرستێکی دونیای ئەمڕۆ دەناسێنی.

بۆنموونە، سەرۆك چەند جارێك ئەمەی دووبارە کردۆتەوە، کەوا ئەرکی ئەمەریکا " نەهێشتنی شەڕانگێزییە لە جیهان" ئەمەش بۆ مرۆڤ کارێکی مەحاڵە. ئەمەی راگەیاندووە کە " مەبەستی ئەمەریکا زۆر لەوە زیاترە بەدوای پڕۆسەیەك بکەوێ. بەمەش بەدەستهێنانی ئامانجێکە: کۆتایی پێهێنانی هەڕەشە مەترسیدارەکانە لە جیهانی شارستانییەت". لە مایسی ٢٠٠٣، لەکاتی وتارە بەناوبانگەکەی ( ئەرکەکە بەسەرکەوتوویی کۆتایی هات"، دوای شەڕی عێراق، سەرۆك قسەی اشعیای بە نموونە هێنایەوە، " بۆئێوەی دیل، وەرنە دەرەوە، بۆ ئەوانەی لەتاریکی خۆتان حەشارداوە، وەرنە دەرەوە ئازاد بن". ئەمە تەنها وتارێکە، بەڵام لەوەیە بۆکاتێکی دیاریکراو وترابێت. سەرۆك قسە لەبارەی بەرهەمەکانی سوپای ولایەتە یەکگرتووەکانی دەکرد، لەکاتێکدا اشعیا قسەی لەبارەی دیاری خودا بە رزگاربوونی هەتا هەتایی لە ئەهریمەن دەکرد. کاتێ سەددام حسێن دەستگیرکرا، سەرۆك لە وتارەکانی ئەوەی

دەووتەوە کەوا ئەمەریکا ئەرکێکی خودایی جێبەجێکرد بە گەڕانەوەی ئازادی بۆ گەلانی عێراق. لەلایەن یەکێك لە ڕۆژنامەنووسەکان پرسیاری ئەوەی لێکرا ئایا باوکت ( بۆش ی باوك) ئەم شەڕکردنەی ئەمەریکای لەگەڵ عێراق لا پەسەندبوو، وتی: "ئەو باوکێکی گونجاونییە بۆئەوەی داوای هێزی لێبکەم. باوکێکی بەرزتر هەیە بۆئەو داواکردنە". تەنانەت پێش کاندیدکردنیشی بۆ کۆشکی سپی، نهێنی ئەوەی لە ئینجیل درکاند بەوەی، " من بڕوام بە خودا هەیە و منیشی وەك سەرۆك دەوێت(١)".

بێگومان، زەحمەتیەکە لێرە ئەوەنییە کە ئیدارەی بۆش بەدوای ئەوە بگەڕێ بۆئەوەی پراکتیزەی سەرکردایەتی لەسەر ئەرزییەتی ئەخلاقی بکات، بەشێوەیەکی پراکتیکی هەموو ئیدارەیەك هەوڵی ئەوەی داوە بەجۆرە سەرکردایەتی بکات. کێشەکە لێرە ئەوەیە وتارەکان زۆر نزیکن لە پاساوی سیاسەتەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان لە زاراوە ئاشکراکانی ئایینی— و هەروەها ئەمەش وەك ئەوەیە ئالای سوور لەبەرامبەر گایە سەرخۆشەکان بجوولێنییەوە. بەڕاستی ئەمانەش ئەرزییەتێکن کە قاعیدە زۆر بەپەسەندی دەزانی بۆ شەڕکردنی. لەگەڵ بوونی سەرکردایەتییەکی بەهێز، ولایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێ هەموو جیهان بەیەك بگەیەنێت بۆ بەرهەڵستیکردنی کوشتنی خەڵکی بێگوناه. بەڵام ئێمە هەرگیز ناتوانین یەکگرتن لەدەوری ئەم پێشنیارەوە لەنێوان هیچ کەسێکەوە بکەین بەوەی، رازی نەبوون بە وتەکانی سەرۆکی ولایەتە یەکگرتووەکان مانای دەست پێکردنە بە دەمەقالێ لەگەڵ پەروەردگار.

---

(١) لە چاوپێکەوتنێکی کەناڵی NBC بەرنامەی (Meet the Press) چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕۆژنامەگەری لە ٢٧ی ئازاری ٢٠٠٥، پرسیاریان لە ریتشارد لاند لە کۆمەڵەی مەعمەدانی باشوور کرد کەئایا ئەم قسە وەرگیراوەی سەرۆك راستە و خۆیەتی، وەڵامی دایەوە وتی: "بەڵێ راستە، بەڵام ناتەواوە. بەڵام میدیاکان سوورن لەسەر ئەم ناتەواوییە، بەجۆرێك کەتەواوی دەقەکە دەگۆڕێت. وتی، ئەمە راست بوو کاتێ بووە خزمەتکارێکی پەرستنی ئایینی لەو بەیانییەی کە وەك حاکم بۆجاری دووەم هەڵبژێردرایەوە، و هەروەها قەشەی میتۆدی وتارێکی زۆر بەکاریگەری پێشکەشکرد لەبارەی، خودای پەروەردگار مەبەستێکی هەیە بۆ ژیانی تۆ و هەروەها پلانێکشی بۆ ژیانت داناوە. دایکیشی گەیشت و پێیووت: جۆرج، ئەوە قسە لەگەڵ تۆ دەکات' دواتر گەڕایەوە کۆشکی حاکمایەتی چاوی بە کۆمەڵێکی ئێمە کەوت و وتی، من بڕوام بەخودا هەیە منیشی وەك سەرۆك دەوێت، بەڵام ئەگەر ئەمە روونەدات، بەلامەوە گرنگ نییە".

لەکاتێکدا ئەمە دەبێتە دووەم سروشتی سەرۆك بۆش بە ئاماژەکردنی شەڕکردن لەدژی تیرۆریستان وەك شەڕێك لەنێوان چاکە و شەڕانی، ئایا ئەمەش تائەم ئاستە پێچەوانەی ئەوەیترە؟ ئەگەر قاعیدە شەڕانگێز نەبێ، کەواتە هیچ شتێ شەڕانی نییە. بەڵام ئەی کێ بەتەواوی بێ خەوشە؟ وەك ئەمەریکییەکی شانازیکەر، تەنانەت پێویستە دان بەوە بنێم گەر بەهەموو هەستێکی پاکەوە وەڵامە راشکاوەکە ئەوەیە—ئێمە نین. لەوەیە سەرکردەکانمان خاوەن دڵسۆزترین دڵ بن، بەڵام کاتێ لەشەڕکردن لەگەڵ تیرۆر داینە یاخود بەدوای هەندێ ئامانجدا دەگەڕێین، زۆرجاران هاندەرەکانمان پاك نین، پلانەکانمان خەوشدارن، زانیارییەکانمان تەواو نین، کردارەکانمان بەهۆی هەڵەکانی فەرامۆشکردن و کۆمیسیۆنەوە شکست دێنن. ئەمەش پشتڕاستە لەهەموو قۆناغەکانی مێژووی ئەمەریکا و مەودایەکی زۆرتر یان کەمتر لەسەر ئەزموونی نەتەوەکانیتریشەوە سەلمێنراوە. تەنانەت مەسیحی نەسرانیش، کاتێ لەلایەن کەسێکی غەریبەوە بە " مامۆستای بێ خەوش، بانگکرا، وەڵامی دایەوە، " بۆچی بە بێ خەوش بانگم دەکەی؟ هیچ کەس نییە بێ خەوش بێ، جگە لە خودای پەروەردگار نەبێ". لەشەڕکردن لەگەڵ تیرۆر، دەبێ زۆر وردبین لەئاماژەکردن بەوەی بە رووبەڕووبوونەوەی نێوان شەڕانی و " نزیکەی باشە" یان نێوان شەڕانی و " نەخراپە" یان نێوان شەڕانی و " کاری باشە ئەوەی لە توانامان دابێ". لەوەیە ئێمە ئەو فۆرمەی ئەبراهام لینکۆڵن گەشە پێبدەین—شەڕی نێوان شەڕانی و "راستی وەك ئەوەی پەروەدگار توانای پێداوین ئەو راستییە ببینین".

من ئەو خاڵەم لە وتارێکی ئازاری ٢٠٠٤ دیاریکردبوو، ئەوەشم زیادکرد کە دەڵێم "ئەوە رەخنەگرتن نییە لە سەرۆك، چونکە بەشێوەیەکی گشتی هەوڵی داوە لە قسەکانی هۆشیاربێت هەروەها لەبەرئەوەی من خۆم تووشی وتارە شانازییەکان ببوومەوە وەکو هەریەکێکیتر. هەمووومان پەرۆشین بۆ باوەڕکردن بەوەی کەدەمانەوێ باوەڕی پێبینین و هەروەها ئەوەی وامان لێدەکات هەست بەباشە بکەین باوەڕی پێبکەین. بەڵام عەقیدە هەمیشە نابێتە رێگا نیشاندەری زیرەکی. لەجیهانی گرگرتووی ئیمڕۆدا، باشترە رێگایەك بدۆزینەوە بۆئەوەی دەست بە دانانی رووناکییە کۆنەکە بکەین لەبری ئەوەی رووناکییەکی نوێ دابگیرسێنین.

هەوڵدانەکەم لە ئامۆژگارییەکانم شکستی هێنا بۆ راگەیاندنەکانی سەرۆك لەخێرا جێبەجێکردنی بۆ رزگاربوونی لەم قەیرانەی کەتیای کەوتووە. لە رۆژی دواتردا، بێژەری بەرنامەیەکی گفتوگۆیی، سین هانتی، لەتەلەفزیۆنی فۆکس وەسفی منی کرد وەك

"سەرکردەیەکی باڵ چەپی دەنگ تیژ" بە ڕەوانبێژییەوە پرسیاری کرد، " ئایا تاچەند راستە کە لیبڕالییەکان عەشقی گەڕانەوەیانە بۆسەر کورسی دەسەڵات بەجۆرێك لەم رووەوە هەموو شتێك دەڵێن؟"یەکێك لە هاوڕێیانی هانتی بەزەردەخەنەیەکی پڕ لە گاڵتەجارییەوە پێشنیاری ئەوەی کرد کەوا پلانەکەی من بۆ شەڕکردن لەگەڵ تیرۆر دەبووە " گۆرانی کومبایا لەعەرەبی".

هەروەك بینیمان، سەرۆك بۆش یەکەم سەرکردەی ئەمەریکی نییە کە ئەجێندای خۆی لەگەڵ ئەجێندای خودا بەیەك ببەستێتەوە. پشتیوانانی نەهێشتنی بەندایەتی، بزووتنەوەی مافەکانی مەدەنی، هەوڵەکانی شەڕکردن لەدژی هەژاری و نەخۆشی، هەمان شتیان ئەنجام دابوو. بەتایبەتی لەبارودۆخەکانی ئێستادا، هەرچەندە، ئەمەش تاکتیکێکە بەورییاییەوە بەکاردەهێنرێت، کواڵیتێکە وەك بەڵگەیەکی زۆر لە کۆبوونەوەی پارتی کۆمار ساڵی ٢٠٠٤ بەدیار نەدەکەوت. بەمەش کاتێ حاکمی ولایەتی ئۆهایۆی پارتی کۆماری ئەمەی راگەیاند کەوا (GPO) 'واتە پارتی رەسمی خودایی'". بەرنامەی سیاسی کۆمارییەکان لە ولایەتی تەکساس دووپاتی ئەمە دەکاتەوە کەوا " ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەتەوەیەکی مەسیحییە". کۆمیتەی کۆماری نەتەوەیی داوای بەشداریکرد بۆ پێشکەشکردنی "زرێی خودا" بەسەرۆك بۆش. جێگری سەرۆك دیك تشینی قسەی یەکێك لە مێژووناسانی وەرگرتووە کە نووسیوەتی، " کاتێ ئەمەریکا دروستبوو، ئەستێرەکان لەئاسمان خەریکی سەماکردن بوونە". هەروەها سەرۆك بۆش لە راگەیاندنی قەبووڵکردنی وەك کاندید وتی: "وەکو هەموو حکوومەتەکانی پێش ئێمە، دەعوەتێکمان لەپشتەوەی ئەستێرەکانەوە بەدەست گەیشتووە بۆ وەستان و ژیان بەسەر بردن لەگەڵ ئازادی". سەرۆك بۆش شانازی بەو عەقیدەیە دەکات کە لەنێو حوکمەکانی خۆیەوە پەیڕەوی دەکات لەبارەی چاکە و خراپە، هەروەها بە پێشبینییەکانی لەبارەی ئەوەی کەخودا چی دەوێت و چی ناوێت. وای بۆدەچێ ئەم ئاستە دڵنیایە زۆر پێویستە بۆ تایبەتمەندی وەك سەرۆکێك. لە پاییزی ٢٠٠٤ بە گوێگرانی وت: " بۆ ئێوە باشترە بزانن بەچی باوەڕدەکەن یاخود ترسی هاوێشتنی هاتوچوونی ماستاوچییەتی هاوڕێیان و یاخود کۆمەڵەی رەخنەگران. زۆر گرنگە بۆ سەرۆکی ئەمەریکا کەوا نەگۆڕ بێت لە بڕیاردان " بەردەوام بوو و دەیووت: " لەسەر سەرۆکی ئەمەریکا پێویستە بڕیارەکانی لەسەر بنەمای رێسا و قەناعەتی جەوهەرییەوە بێ کە نەبێتە هۆی پەشیمان بوونەوە".

ئایا کێ مشتومڕی ئەمە دەکات؟ بێگومان هەموو سەرکردەکان پێویستیان بەوەیە بڕوایان بەخۆیانەوە هەبێ،، بەڵام هێڵێکی روون هەیە لەنێوان بڕوابەخۆبوون و خۆبەڕاست زانـین. بـڕوا لەوەوە دێت کەیەکێك هەوڵبدات بۆ فێربوونی هەموو لایەنەکانی کێشەکە، کەچی خۆبەڕاسـت زانین لەو ئارەزووەوە دێت کەیەکێك بڕوای وابێ هەموو ئەو شتانە فێربووە کە پێویستە بیزانێ. سەرکردەی بڕوا بەخۆ ئەو بڕیارە دەردەکات کە باشترینیانە، بەڵام ئـەو پێویسـتییەش قـەبوڵ دەکات بۆ دووبارە چاوپێخشانەوە بەسەر مەسەلەکە کاتێ زانیارییەکی نوێ دێتە پێش، بەڵام سەرکردەی خۆبەڕاست زانی سوور دەبێ لەسەر هەموو ئەو زانیارییانەی کە پێچەوانەی ئەوەیە کە خۆی بڕوای پێ هەیە.

ئەمەش لێپرسراویەتی سەرکردایەتیکردنە بۆ کێشانی جیاوازی ئەخلاقی، هەروەها بەشێکە لە سروشی مرۆڤ بە بیرکردنەوە لە شتە رەهاکان، بـەڵام بڕیـاردان دەبـێ ئامۆژگـاری بکرێـت. ئەگەر هەبێ، ژمارەیەکی کەم لەئێمە روانینی ئەخلاقی هەیە کە (٢٠-٢٠)ە. ئەگەر دڵنیابین لەوەی کە لەسەر راستین، لەوەیـە بـەدوای ئەڵتـەرناتیڤ بگـەڕێین یـاخود بـۆ پێشوەچـوونی پلانێکـی B پێویسـتە پلانـیA بـەلاوە نـێین. لەوەیـە خۆمـان بـەجۆریك قەناعـەت بـە ئەدگارەکانی مەسەلەی خۆمانەوە بێت کە خەمساردی بکەین لە قەناعەت هێنـانی ئـەوانیتر. لەوەیە بەجۆرێك جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە راستەکان کە شکست لە هەڵبژاردنی رێگا راستەکان بێنین. مێژوو پڕیەتی لەو ڕۆژانەی کە شکستیان هێناوە لەبـەر بڕوا نەگۆڕی ئەوانەی کەدەستیان پێکردوون. بڕوا جەوهەرییەکانی سەرۆك بۆش لـە ٩/١١ دوە پێشڕەوی ئەمەریکای کرد بە هەڵگیرسـاندنی جـەنگ و درێژەکێشـانی داگیرکردنەکـە بەسـەر وڵاتێك کەهیچ پەیوەندییەکی بە هێرشەکانی ٩/١١ دوە نەبوو. ئـەم رووداوانـە بـووە هـۆی فراوانبوونی بۆشایی نێوان موسڵمانان و ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمـەریکا، ژیـانێکی نـوێی بەخشییە قاعیدە، هەروەها ئەمەریکای هەنگاوێك دوورخستەوە لە زاڵبوونی بەسـەر تـیرۆری نێودەوڵەتی.

## (١٢)

## عێراق: دەرئەنجامە نەویستراوەکان

ساینت ئۆگستن دەینووسێ، " جیاوازاییەکی گەورە دروستدەبێ، بەوەی کام هۆکار و لەژێر کامە دەسەڵاتدا مرۆڤ لێپرسراویەتی ئەم شەڕانە هەڵدەگرێ کە پێویستن روودەن".

بەنزیکەی دوای ١٦٠٠ ساڵ، لە ئاداری ٢٠٠٣، کاردینالێ پیۆ لاغی هەولێ رازیکردنی سەرۆك بۆشی دا بۆئەوەی هەنگاوی پراکتیکی نەهاوێ لەو بڕیارەی کەداویەتی بە داگیرکردنی عێراق. کاردینالێ، کە نێردەی تایبەتی ڤاتیکانە، هۆشداریدا بە روودانی قوربانییەکی زۆری خەڵکی سیڤیل و لاربوونی پەیوەندییەکانی نێوان مەسیحی و موسڵمانان، هەروەها جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە نە کارێکی ئەخلاقییە وەنە یاساییشە بە هێرش کردنە سەر وڵاتێك تەنانەت بۆ رووخانی رژێمێك بێت کە رق هەڵگریش بێت وەك رژێمەکەی سەددام حسێن. بەڵام سەرۆك بۆش هەڵوێستی خۆی نەگۆڕی. سەرۆك وتی: شەڕ " کارەکان باشتر دەکات".

لە وتارێکی هەمان هەفتەدا، گفتوگۆی ئەوەم کرد کە، " ئەگەر پاساوێکی عەقلانیش هەبێت بۆ داگیرکردنی عێراق، بەڵام ئەمە بۆ ئەمەریکا ژیریەتی نییە بەدەست پێکردنی ئەم شەڕە لەژێر ئەم بارودۆخە ناسکانە". من لەم ئاگرە نیگەرانم بە کەمکردنەوەی ئەم هەوڵانەی بۆ دەستگیرکردنی ئوسامە بن لادن بەمەش ئەم کارە لەلایەن قاعیدەوە ئیستغلال دەکرێت بۆئەوەی ژمارەیەکی زۆرتری تیرۆریست ناونووس بکات. هۆشداری ئەوەشمدا کەوا دابەشبوونە نێوخۆیەکان لەعێراق لەدوای ئەم ململانێیەوە ئاڵۆزتر دەبن و شتی نوێ سەرهەڵدەدات. هەروەها دوودڵم لەنەبوونی یارمەتی نێودەوڵەتی، دەڵێن هەرچەندە ولایەتە یەککگرتووەکان شەڕەکەی بردەوە و بێ ئەوەی یارمەتییەکی زۆر بدرێت، بەڵام پێویستی بە یارمەتییەکی زۆرتر دەبوو بۆ دامەزراندنی سەقامگیرکردنی دیموکراسی لەم وڵاتە. بۆیەش وای بۆدەچم لەوە هەیە کەوا زۆربەی خەڵك لەنێو حکوومەتدا، بەتایبەتی ئەوانەی لەنێو وەزارەتی دەرەوە کاردەکەن و

ئەوانەی لەنێوەندی سوپاوە خزمەت دەکەن، هەمان ئەم بۆچوونەیان بەرزکردۆتەوە کەوا تێبینییەکانم و تێبینی ئەوانیتر هەمووی بەبێ سوود بوون.

گومانەکانم لەبارەی حیکمەتی شەڕ لەسەر هیچ خەیاڵێکەوە لەبارەی سەددام حسێن بناغەیان نەگرتبوو. کاتێ لە حکوومەت کارم دەکرد، من خۆم پێداگیریم لەوە دەکرد کەوا هێرشە سەربازییەکان نابێتە پاساوێك بۆ سزادانی هەڵە زۆرەکانی عێراق، لەمانیش ئامادەنەبوونی هاوکاریکردنی پشکێنەرانی چەکی بەکۆمەڵکوژی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئێستاکە لەدەرەوەی حکوومەتم، بڕوا وابوو- لەسەر ئەساسی ئەم داتا هەواڵگرییانەی کە پێشتر خوێندنەوەم لەسەرکردوون- لەوەیە عێراق چەکی بایلۆژی و کیمیایی هەبووبێ، بەڵام توانای ئەوەیان نەبوو لەکاتی بەکارهێنانیان دەرەوەی سنوورەکانی خۆیەوە ببەزێنی. هیچ نیشانەیەکیش نەبوو بەوەی ئەم وڵاتە هەوڵی دووبارە دروستکردنەوەی ئەم چەکەی دابووبێ. دان بەوەش دەنێم کەوا حسێن هەوڵی ئەوەی نەدەدا بۆ دووبارە دروستکردنەوەیان تەنانەت ئەگەر دەرفەتیشیان پێدابێ. سەددام لەنێو سندووقێکەوە گیری خواردبوو- وەك ڕێوییەك کە هیچ ڕێگایەکی نەبێ بۆئەوەی بگاتە نێو قەفەسی مریشکەکان. سوپای عێراقی قەدەغەی کڕینی چەکی قورسی لێکرابوو و بە هێزێکی تەواو دەورەدرابوو، تەنانەت گەورەترین بەشی بۆشایی ئاسمانیش لەدەرەوەی کۆنترۆڵی ئەم سوپایەدابوو. حسێن ئاگادارکرابۆوە بەوەی ئەگەر دووبارە بیر لە داگیرکردنی وڵاتان بکاتەوە ئەوا لەبوونی خۆی نامینێ. وەکو ڕێسایەکی گشتی، ئەو کەسانەی پەیکەری خۆیان دروست دەکەن مانای خۆکوژی ناگەیەنێ. دوای زیاتر لە دە ساڵ کۆنترۆڵکردنی عێراق ئەو مەترسییەی بۆ داگیرکردنی وڵاتانی هەبوو لەدەستیدا.

لەساڵی ٢٠٠١، کۆڵن پاوڵ، کەلەدواتر بووە وەزیری دەرەوەی ولایەتە یەکگرتووەکان، بارودۆخەکەی زۆر بەوردی شیکردەوە. لەبارەی ئابلۆقەکە، وتی: "بەڕاشکاوانە، کارەکە سەرکەوتوو بوو". تێبینی ئەوەیدا کەوا حسێن "هیچ هەوڵێکی نەدا بۆ پەرەپێدانی چەکی بەکۆمەڵکوژی. ناتوانێ هیچ پرۆژەیەکیش لەدژی دراوسێکانی جێبەجێ بکات. بۆیە، بەکاریگەرییەوە، سیاسەتەکەمان ئاسایشی دراوسێکانی عێراقیان بەهێزکردووە، هەربۆیەش ئەم سیاسەتانەی کە ئێمە هەوڵی پاراستنیان دەدەین لەم ناوچەیە". هەرچەندە، پاوڵ پێشبینی ئەوەی نەکرد کە تاچەند ئەم سیاسەتە بەردەوام دەبێ. لە سەرەتاکانی ٢٠٠٢، سەرۆك بۆش بڕیاری دەستبەرداربوونی ئەم سیاسەتانەی دا و لەبڕی ئەوە بڕیاری ئامادەکردنی سوپای دا بە داگیرکردنی عێراق.

نەریتی " شەڕی دادگەری" بووە هۆی پەیدابوونی زنجیرەیەك زەحمەتی كە پێویستە پێش هەر بڕیارێك پاكبكرێنەوە. ئەمانیش: (١) مەسەلەی دادگەری، (٢) مەبەستی پاك، (٣) دەسەڵاتی راستەوان، (٤) هیوای گونجاو بۆ سەركەوتن، هەروەها (٥) باڵانسێكی گونجاو لەنێوان چاكەی بەدەستهاتوو و بەبەراورد لەگەڵ ئەو ئازارەی كە دەبێتە هۆكاری. كاتێ مەبەستی ئیدارە روون بۆوە، كۆمەڵێك لەدەسەڵاتی ئایینی پەیوەندییان بە ڤاتیكان كرد گفتوگۆی ئەوەیان دەكرد كە بیرۆكەی داگیركردن لەم ستاندرە سەركەوتن بەدەستناهێنێ. قەشەی میتۆدی شیكاغۆ گفتوگۆی ئەوەی دەكرد كە، " هیچ رێگایەك نییە بۆ خوێندنەوەی پێوەر و بنچینەكانی " تیۆری شەڕی دادگەری" كە بتوانێ پاساو بۆ ئەم سەرەڕۆییە بێ مانایە بێنێتەوە. ئەمەش كرداری بەرگریكردنی خۆیی نییە. هەموو هەڵبژاردنەكانیتر بێ سوودبوون. ئەم رووخانە چاوەڕوانكراوانە لەگەڵ دوژمنداریيەكانی سەددام حسێن ناگونجێت. سیڤیلی بێ گوناهـــبەتایبەتی ئافرەت و منداڵانـــناپارێزرێن.

بیترۆسی حەوتەمی ئەلیكسەندەر، دووەم گەورە پاتریاركی كڵێسەی ئۆرتۆدۆكسی مەسیحی، هۆشداریدا، بەوەی داگیركردنی عێراق " وەك هێرشێ بۆسەر ئیسلام سەیردەكرێت، و گەیشتن بە ئەنجامەكانیشی زۆر درێژخایەن دەبێ." دەستەی جێبەجێكاری كۆنفرانسی جیهانی لەسەر ئایین و ئاشتی بانگی بەغدای دەكرد بۆئەوەی بە یاساكانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان رازی بێت، بەڵام ئەو ترسەشی راگەیاند بەوەی "هەر كردەیەكی سەربازی لەدژی عێراق دەبێتە هۆی لێكەوتنەوەی كارەساتێكی مرۆڤایەتی دووروودرێژ و بەرەو دواوە چوونی سەقامگیری لەناوچەكە و سەرهەڵدانی گرووپی توندڕەو".

تیمی كاركردنی پرۆتستانتی، لە كۆڵ ەوە تا رینیۆڵ، هەڵبژاردنەكەی شەش خاڵیان پێشكەشكرد بۆ شەڕكردن، لەوانەش تۆمەتباركردنی سەددام حسێن لەلایەن دادگای نێودەوڵەتی، پشكنینی زۆرەملێ، یارمەتی مرۆڤایەتی، جەختكردنی زۆری هەڕەشە كە لەلایەن خۆكوژەكان دادەنرێنەوە.

پشتیوانانی ئیدارەكە ئەم ئەڵتەرناتیڤەیان بەلاوەنا، حیسابی ئەوەیانكرد كە هێرشەكانی ٩/١١ پێوەرێكی تەقلیدی بوو كەبووە هۆی ئەوەی شەڕی دادگەری چیتر بەكارنێت. گفتوگۆی ئەوەیان دەكرد ولایەتە یەكگرتووەكان موعەرەز بوو بۆ هەر هێرشكردنێكی لەناكاو لەلایەن دوژمنانەوە ئەوانەی كە پێشوازییان لەمردن دەكرد و رێگایان لێنەدەگیرا. دروشمی ئەوەیان بەرزكردەوە كەوا سەددام حسێن و رێكخراوی قاعیدە بەنیازی پێكهێنانی تیمێك بوون (یاخود

هەر ئێستا تیمەکەیان پێکهێناوە)، بەو مانایەی حسێن لەدەسەڵاتێك دایە کە کۆمەکی قاعیدە دەکات بەچەکە مەترسیدارەکان. تەنانەت ئەگەر ولایەتە یەکگرتووەکان نەیتوانی ئەوە بسەلمێنیٚ کە عێراق یارمەتی قاعیدەی داوە، مانای ئەوەنییە کە عێراق یارمەتی ئەم ڕێکخراوەی نەداوە. دۆناڵد رامسفیلد دەیووت: "نەبوونی بەڵگە مانای بەڵگەی نەبوون نییە". ئەم گفتوگۆیانە زۆر پێویستن بۆ سەرکەوتنی پشتیوانی موحافیزکاران و هەندیٚ گرووپە میانڕەوە مەسیحی و جوولەکەکان[1] (١).

بۆ هێنانەوەی پاساو، کاربەدەستانی ئیدارە ئاماژەیان بە " کۆبوونەوەی مەترسی" دەکرد کە لەلایەن رژێمی عێراقییەوە دروستبووە. کۆندەلیزا رایس وێنەی دووکەڵی دوای تەقینەوەی بۆمبی ئەتۆمی نیشاندا، وەك ئاگادارکردنەوەیەك کەهەر شکستێك لەئەرکمان بۆ هێرشکردن لەوەیە ببێتە قەڵاچۆکردنی ئەتۆمی. من وەك تاکێك زۆر کاریگەربووم بەم سیمینارەی کە کۆڵن پاوڵ لە فێبرایەری ٢٠٠٣ لەبەردەم ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشکەشی کرد. ئەو کات سەرۆکی ئاژانسی هەواڵگری (CIA)، جۆرج تێنەنت، لەولا تەنیشتەی دانیشتبوو، هەندیٚ شتی پێشکەشکرد، لەوانە جەختکردنەوە—منی لەشوێن خۆی راچڵەکاند—کە عێراق خاوەنی کۆمەڵێك تاقیگەی گەڕۆکی چەکی بایۆلۆژییە. ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزبوو، بەڵام بێئەوەی پاوڵ بزانیٚ، ئەم هەواڵە کاریگەرییانە—لەوانە تاقیگە گەڕۆکەکان—درۆ بوون. عێراقییە دوورخراوەکان، لەسەرووی ئەمانیشەوە زانیاری بەخشی بەناوی خوازراوەوە کێرڤ بۆڵ ئەم چیرۆکە خەیاڵ ئامێزانەیان دروستکردبوو بۆ دەربڕین و هاندانی ئەمەریکا بۆ ئەنجامدانی شەڕ لەدژی عێراق[2]. هەروەك زوو بینیمان، چەکی کۆمەڵکوژی بوونیان نەبوو.

---

(١) کۆمەڵەی نەتەوەیی ئینجیلی ئەم داگیرکردنەی بە کرداری بەرگریکردنی خودی ناو دەبرد. یەکێتی ریفۆرمی جوولەکە رازیبوو بە پاڵپشتیکردنی ئەم کردە سەربازییە، بەڵام دوای پشکنینی هەموو ڕێگایەك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی " هەبوونی چەکی کۆمەڵکوژی عێراقی".

(٢) واپێدەچیٚ، بەپێی حیساباتەکان، ئەوەی کە وەزیری پاوڵ هەوڵی زۆری داوە بەوەی ئەم زانیارییانەی کە لەبەردەم نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پێشکەشی کردبوو راستن و دەقیقن. پرسیاری راستی دەکرد، بەڵام کێشەکە لێرەوە سەری هەڵدا کاتیٚ وەڵامەکانی وەرگرتەوە. لە سێپتەمبەری ٢٠٠٥، لەچاوپێکەوتنێك لەگەڵ باربارا وۆڵتەرزی ABC، پاوڵ... وتی: "هەندیٚ کەس هەبوون لەناو دەزگای هەواڵگری دەیانزانی بەشێك لەم

شتێکی روونە گەر بگەڕێینەوە رابردوو، عێراق بۆ هەموو لایەنەکانی ناوچەکە جێگای مەترسی بوو جگە لە خەڵکی عێراقی نەبێ. بێگومان هیچ مەترسییەکی ئەوتۆی بۆ ئەمەریکا و هاوپەیمانانی ئەمەریکی دروست نەکردبوو. هیچ بەڵگەیەکیش لەئارادانییە بەوەی پەیوەندی هەبوبێ لەگەڵ رێکخراوی قاعیدە. هیچ پاساوێکیش نییە بۆ ئیدارەکەی بۆش، کە سەرکەوتنێکی دیبلۆماسی بردەوە بەهۆی فشارکردنێکی سەرکەوتوانە بە گەڕانەوەی پشکێنەرانی چەکی ئەتۆمی بۆ عێراق، بۆ تێکدانی ئەم سەرکەوتنەیە بەناچارکردنی کۆتاییەکی ناتەواو بۆ ئەم پشکنینانە. ولایەتە یەکگرتووەکان کەموکورِی لە "دەسەڵاتێکی راست" هەبوو بۆ شەڕکردنی لەگەڵ عێراق. کارێکی زەحمەتە بۆکارکردن بە ناچارکردنی ویستی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لەوکاتەی زۆربەی ئەندامانی ئەم ئەنجوومەنە بەرهەڵستی پلانەکەی سەرۆکیان دەکرد. بەگوێرەی ئەم گفتوگۆیەی لەنێوان لێپرسراوێکی بەریتانی و ئەمەریکی لە هاوینی ٢٠٠٢، " بۆش دەیەوێ لەرِێگای کردەی سەربازی سەددام لەسەر کورسی دەسەڵات لاببات، بەبیانووی ئەوەی پەیوەندی هەیە لەگەڵ رێکخراوی قاعیدە و چەکی کۆمەڵکوژی هەیە. بەڵام هەواڵگری و زانیارییەکان لەگەڵ ئەم سیاسەتە ناگونجێن".

هەرزوو، شەڕەکە مەبەستێکی گەورەی بەدەستهێنا—لادانی سەددام حسێن لەدەسەڵات. زۆر بەخێرایی روون بۆوە، کەوا نرخی ئەم " ئەرکە سەرکەوتووە" زۆر بەفراوانی دابەزی. کاربەدەستانی ئیدارە پێشبینی ئەوەیان دەکرد ئەم شەڕە و دەرئەنجامەکانی زۆر ئاسان و تێچووی کەم و دوور لە مەترسیی بێت. لەبەرئەوەی چاوەڕوانی رووداوی ئەم کێشانەیان نەدەکرد، بۆیە لەپلانداندان خەمسارد بوون. لەکۆبوونەوەیەکی پێش دەست پێکردنی ئەم شەڕە، بەئارامی دانیشتبووم لەوکاتەی سەرکردە مەدەنییەکانی وەزارەتی بەرگری نەخشەکانیان نیشان دەکرد و پوختەی پێشبینییەکانیان روون دەکردەوە. دەستم بەرزکردەوە و پرسیم، "ئەوانەی ئێوە باستان کرد زۆر جوانە، ئەی باشە کوا پلانی دوای جەنگ؟" لەبری ئەوەی وەڵامم بدەنەوە، کاربەدەستەکان پێیان وتم، نیگەران مەبە، بیر لەهەموو شتێك کراوەتەوە، هەموو شتێك بەدڵی ئێمە دەبێ. هەموویان زۆر دڵنیابوون لەوەی باسیان دەکرد. لە تۆمارکردنی سەددام حسێن، بەلایەنی کەم توانیم ئەوە قەبووڵبکەم کەوا هەندێ هۆکار هەبوون بۆئەوەی شەڕی پێ

---

زانیارییانە راست نینە، و ناشکرێت پشتی پێببەسترێت، بەڵام دەنگیان نەکرد. بەمەش بووە هۆی رووخانی تەواوی پاوڵ".

هەڵبگیرسێت. نەمدەتوانی لەم کاتەدا لەم بڕیارە تێبگەم کە فەرمانی شەڕکردنی دەدا، بەبێ بوونی سوپایەکی تەواو، بەبێ بوونی چەك و تەقەمەنییەکی گونجاو، بەبێ بوونی ستراتیژییەکی واقیعی بۆ گەڕانەوەی سیستەم، و هەروەها بەبێ بوونی لێکۆڵینەوەیەکی جیددی ژینگە بەجۆرێك سەربازە پیاو و ئافرەتانی ئەمەریکا لەمەترسی ژیانی خۆیان لێیان دەپرسرێت.

سوپای ئەمەریکا لە عێراق ئەرکی خۆیان بە کارامەیی و هاندانەوە جێبەجێکرد. بەڕێوەبردنی پنتاگۆن لەم داگیرکردنە، ببووە تراژیدیایەك لەهەڵەکردن. بارودۆخی ئاسایش سەرلەنوێ بەرەو وێرانی چوو، بوژانەوەی ئابووری بەمردوویی لەدایکبوو، پرۆسەی کۆنتراکت بۆنی هاوڕێیەتی لێدەهات، ئاراستەی بێ لایەنی ئیدارە، هاوپەیمانەکانی خۆی بەلاوەنا، و هەروەها تێچووی دارایی و مرۆڤایەتی گەیشتە ئەوپەڕی نرخەکانەوە. هەروەکو ناویان تۆمارکراوە، زیاتر لە ٢،٤٠٠ سەربازی هاوپەیمانان لەم شەڕەدا کوژرا، نزیکەی ١٦،٠٠٠ی تریش برینداربوونە. هەندێك لەم بریندارانە تووشی کەمئەندامی هاتوونە. دەیان هەزار عێراقی بێگوناهیش لەم نێوەندەدا گیانیان لەدەستدا. لەگەڵ ئەمانەشدا، زیاتر لە ٢٥٠ $ملیار، کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی قاعیدە و دووبارە بنیاتنانەوەی دوای کارەساتە سروشتییەکان، یاخود بۆ مەبەستە پێویستییەکانیتر تەرخانکرابوو، لەجیاتی ئەمانە لەشەڕی عێراق قووتدران. کەچی تاوەکو ئێستاش، سوپای ئەمەریکا، لەنێوانیشیاندا پاسەوانانی نەتەوەیی و بەشە ئیحتیاتەکانمان لەئاگادارکردنەوەی مەترسیدانە.

یەکێك لە پێوەرەکانی شەڕی دادگەری " مەبەستی پاکە" هەر ئەمەشە وای لەم ئیدارەیە کرد بە نمرەی سەرکەوتوو دەربچێت. سەرۆك زۆر بە دڵسۆزییەوە بە باڵیۆزی پاپای ڕاگەیاند کەوا خۆی بڕوای وابوو شەڕ "کارەکان باشتر دەکات". لەڕاستیدا سەرۆك زۆر بڕوای بە بۆچوونەکانی خۆی هەیە بەجۆرێك ڕاوێژی هەموولایەکانی پشتگوێ دەخات چ لە ناوەوە، چ لە دەرەوە. زنجیرەی لۆژیکەکەی، هەروەك بەبەڵگە خراوەتەڕوو لەڕێگای وتارەکانییەوە، ئەمانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێ" (١) چاکە و شەڕانگێزی هەردووکیان لەم جیهانە بوونیان هەیە، (٢) سەددام حسین شەڕانگێزە، (٣) لادانی ئەو لەسەر دەسەلات کارێکی باشەیە، (٤) عێراقێکی دیموکراتی نوێ دەبێتە مۆدێلێك بۆ وڵاتانی عەرەبیتر. گەورەترین زەحمەتی لەگەڵ ئەم بیرکردنەوەیە ئەوەیە کە چی لەبیرکراوە—ئەم ئالۆزیانەیە لەلایەن ئایین و مێژووەوە دروست بوونە.

ئەم ڕاسپاردەیەی کە دەسەڵاتی بەریتانی دایاننابوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەردوای جەنگی جیهانی یەکەم سنووردار نەبوو بۆ فەڵەستینییەکان، بەڵکو درێژکرایەوە بۆ سێ هەرێمی سەربە

ئیمپراتۆرییەتی هەڵوەشاوەی عوسمانی: یەکێکیان بە دەرەجە یەك نەتەوەی کوردەکان، دووەم عەرەبی سوننە، و هەروەها سێیەم عەرەبی شیعە. هەرێمەکان کەوتوونەتە سەر درێژایی رووبارەکانی دیجلە و فورات، کە دۆڵەکانی بە لانەی میزۆپۆتامیا (وڵاتی نێوانی دوو رووبارەکە) ناسراوە. لەمەبەستەکانی ئیدارەی بۆش، بەریتانییەکان ئەم هەرێمانەیان پێکەوە بەتاکە وڵاتێکەوە کۆکردەوە ئەویش: عێراقە.

وەك سەرکردەکانی ئەمەریکا، هەشتا و هەندێك ساڵە، بەریتانییەکان چاوەڕوانیان دەکرد بەگەرمی پێشوازییان لێبکرێت، دوای ئەمانەش، بەریتانیا ئەم خەڵکەیان ئازادکرد دوای چەندین ساڵ لە رووبەڕووبوونەوە و بەرهەڵستیکردن. کۆماندەری بەریتانی، جەنەراڵ فریدریك ماودی، کاربەدەستە ناوخۆیەکانی بینی و بەدڵنیایی کردنەوەی ئەم قسانەی کە " سوپاکەی ئێمە وەك داگیرکەر و دوژمن نەهاتۆتە ناو شارەکان و خاکی ئێوە بەڵکو وەك رزگارکەر هاتوونە... (ئەوەش خۆزگەی ئێمەیە) کە ئێوە گەشەدەکەن وەك ئەوەی لەڕابردوو ئەنجامتان دەدا، کاتێ دەستەکانتان دەبنە بەرهەمهێن، کاتێ باپیرانتان ئەدەب و زانست و هونەریان پێشکەش بە جیهان دەکرد، کاتێ بەغدا یەکێك بوو لە شوێنە هەرە سەرنجڕاکێشەکانی جیهان".

قسە بۆنداره‌کانی جەنەڕاڵ لە ئارامکردنەوەی بارودۆخەکە سەرکەوتوو نەبوو. عێراقییەکان لەبەرژەوەندییاندا نەبوو بەگۆڕینی گەورەیەکی مەسیحی لەجیاتی گەورەیەکی موسڵمان دابنرێت، دەیانویست خۆیان خۆیان بەڕێوەببەن. لەهاوینی ١٩٢٠، یاخیبوان لەزۆربەی بەشی وڵات هەڵسانەوە. جەنگاوەران دەستیانکرد بەبڕینی هێڵە ئاسنینەکان، هێرشکردنە سەر شار و شارۆچکەکان، و هەروەها کوشتنی ئەفسەرە بەریتانییەکان. ئینگلیزەکانیش زۆر بەتوندی وەڵامیان دانەوە، بەبەکارهێنانی بۆمب و گازی ژەهراوی و سەربڕینی یاخیبوان وەك مەدەنییەکان. دەسەڵاتدارییەتی شیعەی عێراقی، ئەوانەی کە سەرکردایەتی ئەم راپەڕینەیان دەکرد، رەتی خۆبەستەوەدانیان دەکرد. کاتێك بەریتانییەکان لەکۆتاییدا توانییان دەسەڵات و سیستەم بگەڕیننەوە، هەڵسان بە دانانی حکوومەتێکی پاشایەتی کە لەلایەن کەمینەی سوننەوە بەڕێوەدەبرا، هەروەها شیعەکانیشیان بۆدواوی تووڕەبوون و رقەکان پەراوێزکرد. هەروەها نەوتەکەی عێراقیش، قازانجەکەی بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا دابەشدەکرا.

هەرچەندە ماندێتی بەریتانیا لەساڵی ١٩٣٢ کۆتایی پێهات، تا ساڵی ١٩٥٨عێراق لەژێر پاراستنی پاشایەتی مایەوە، کاتێ گرووپی لەسێدارەدانی ئەفسەرانی سەربازی لەپاشایەتی خۆیان

کێشایەوە. لەساڵی ١٩٧٩ بە ئەنجامدانی کودەتایەك سەددام حسێن جڵەوی دەسەڵاتی گرتەدەست. حسێن--کە سوننەکی عیلمانی بوو، لەسەرکردایەتیکردنیدا شێوازی جۆزیف ستالینی پەیڕەو دەکرد—بە وەحشیانە وەڵامی ئەوانەی دەدایەوە کە بەرهەڵستی و رەخنەیان لە سەرکردایەتیکردنەکەی دەگرت، بەتایبەتی بەرامبەر شیعە و کوردەکان.

ئەم مێژووە مانای ئەوە دەدات کە لە بەهاری ٢٠٠٣—کاتێ رژێمی بەغدا شکستی خوارد- سوپای ئەمەریکا رووبەڕووی دانیشتوانێکی تەواو پارچە پارچەکراو بۆوە بەجۆرێك بووە جێگای گومانی رۆژئاوا کە سەربازانی مەسیحی شارێکیان داگیرکردووە کە ماوەی چەند سەدەیەك پایتەختی ئیسلامی بووە لە چەرخی زێڕیندا. سەرسوڕمانەکە لێرە ئەوەیە کە، جارێکیتر، نییەتی پاکەکان و قسە بۆن گوڵەکان لە هێمن کردنەوەی بارودۆخەکە هەرەسیان هێنا.

هەرچەندە زۆر بە پاکییەوە هیوامان بە پێچەوانەکەیەوە دەخواست، داگیرکردنی عێراق—وە ئەوەی بەدوایدا هات—لەوەیە لەکۆتاییدا ببێتە خراپترین کارەساتی مێژووی سیاسەتی دەرەوەی ولایەتە یەککگرتووەکان. بڕیاری هێرشکردن بووە دیراسەیەکی حالەی دەرئەنجامە نەویستراوەکان. سەرسوڕمانییەکە ئەوەیە، کەوا سەرکەوتنی گەورەترین یاری قوماری ئیدارەی بۆش لە مەسەلەکانی جیهانی پشت بە بەردەوامی نەخۆشی ئایەتوڵای تەمەن حەفتا و پێنج ساڵی ئێرانی دەبەستێ کە بەهۆی ئازارەکانی نەخۆشی دڵیەوە دەیناڵاند. کاتێ لادانی سەددام حسێن بووە هۆی سەراوژێرکردنی سیاسەتی عێراقی، کەمینەی سوننە کە بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر کورسی دەسەڵات فەرمانڕەواییان دەکرد لەلایەن زۆرینەی شیعەکانەوە دەسەڵاتیان لێوەرگیرا، کە کاریگەرترینیان ئایەتوڵای عوزما سیستانییە.

بەپێچەوانەی سەرکردە شیعییە ئێرانییەکان ئەوانەی کە سوورن لەسەر بەکارهێنانی هێزی سیاسی، سیستانی کەسێکی "خۆپارێزە" رێچکەی نەریتی شیعەی خۆی گرتووە، دوورە لە رۆتینی ژیانی گشتی، خۆشیان پاراستووە لە بەکارهێنانی دەسەڵات لە کاتە پێویستییەکان. لەوەتەی رووخانی رژێمی بەغداوەیە، سیستانی ئەم رۆڵەی خۆی زۆر بەتەواوی بەجێگەیاندووە. لەگەڵ دووبارەکردنەوەی ئەم هەڵەیەی بە ئاشکرا راگەیاندنی یاخیبوون لەدژی سوپای رۆژئاوا، سیستانی رێگایەکی دۆزییەوە بۆئەوەی داگیرکەران کار بۆ بەرژەوەندی ئەو بکەن. لەساڵی ٢٠٠٣ کاتێ ولایەتە یەککگرتووەکان پلانی خۆیان بۆ عێراق ئاشکراکرد بە دیاریکردنی ئەنجوومەنی نیشتیمانی و دانانی رەشنووسی دەستوور، سیستانی رەتی ئەمانەی کردەوە—نەك لەبەرئەوەی ئەم پلانە دیموکراتی بوو، بەڵکو ئەم پلانە بەپێی پێویست دیموکراتی نەبوو. ئەمەریکییەکان

پرۆسەیەکی تەواو کۆنترۆڵکراویان دەویست کە ببێتە هۆی دامەزراندنی یاساکان پێش ئەوەی هەڵبژاردن سازبکرێت. سیستانی دەیووت ئەو دەستوورەی کە لەلایەن ئەو نوێنەرانەی بەبێ هەڵبژاردن نوێنەرایەتی خەڵك دەکەن پەسەند بکرێت دەستوورێکی نایاساییە، بۆیە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە هەڵبژاردن پێویستە پێش نووسینەوەی دەستوور سازبکرێت. دوای ئەوەی یەکەمجار ئەمەریکییەکان گرنگییان نەدا بەم داوایە، لەدواییدا شکستیان هێنا لە موساوەمەکردنی، کاربەدەستانی ولایەتە یەکگرتووەکان هیچ ڕێگایەکیتریان لەبەردەم نەما—هەموو قسەکانیان بەلایەنی دیموکراتییەوە دەشکاندەوە—جگە لە ڕێگادان بە هەڵبژاردن نەبێ. پاڵپشتی بەردەوامی سیستانی دڵنیایی سەرکەوتنی دەبەخشییە ئەم هەڵبژاردنانە، سەرەڕای هەڕەشەی تیرۆریستان، تەنانەت فەرمانیدا بەوەی ئافرەتانیش بچن بۆ سەر سندووقی دەنگدان بەجۆرەی ئایا هاوسەرەکانیان دەیانەوێ یاخود نا. کاندیدە پەسەندکراوەکانی سیستانی زۆر بەئاسانی توانییان بەسەر ئەوانە زاڵبن کە نزیکن لە ولایەتە یەکگرتووەکانەوە.

ئایەتوولا سیستانی وەك پێشینەکانی خۆی بۆماوەی چەندین سەدە کاری ئایینی دەکات، جگە لە بەکارهێنانی تۆڕی پەیوەندیکردنی فراوان. سیستانی کەسێکی خۆپارێزە، لە خانوویێکی بچووك لەشاری پیرۆزی نەجەف ژیان بەسەر دەبات و بەردەوامە لە وتاردان و ئامۆژگاریکردنی ئایینی. هەروەها ڕەتی کۆبوونەوەی ڕاستەوخۆی لەگەڵ کاربەدەستانی ولایەتە یەکگرتووەکان دەکاتەوە. وێنە و ئەندێشەکانی لەلایەن ڕاوێژکارانی کارامەوە پەروەردە و ڕێنمایی دەکرێن، کاریگەرییەکانیشی لەلایەن ئەو ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی و خێرخوازییەکانەوە کەخۆی سەرپەرشتی دەکات بڵاودەکرێتەوە. سیستانی بەجۆرە بەهێز نییە بتوانێ ئەجێندای نیشتیمانی بسەپێنێ، بەڵام هیچ لایەنێکیتریش ناتوانێ بێ ڕەزامەندی ئەو ئامانجەکانی خۆی بپێکێ. سیستانی ئەم هێزە بەکاردێنێ بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەوەی کەوا ئیسلام ڕۆلی بەرچاو دەبینێ لە دارِشتنی یاسا و کۆمەڵگای عێراقی. زیرەکی سیستانی لەوە دووبارە تاقیدەکرێتەوە وەك موسڵمانە موحافیزکارەکان، کە بۆماوەیەکی درێژ کپ کرابوون، لەڕێگای میانڕە و بانگەشەکارانی مافی ئافرەت بۆ بڕیاردان لەسەر چۆنیەتی بەرگەگرتن و جیاوازی لەوەی عێراقی نوێ بەخۆیەوە دەبینێ.

لەنێو سەرکردە کاریگەرییە شیعییەکان کە بەربەرەکانی سیستانی بکات، موقتەدا سەدرە، گەنجێکی ئایین پەروەری لە خێزانێکی ناسراو. باپیرە گەورەی سەدر ناوبانگێکی گەورەی بەدەستهێنا لەدژی هێزی بەریتانیا لەساڵانی ۱۹۲۰. باوکی، کە لەلایەن ڕژێمی سەددامەوە لەساڵی ۱۹۹۹ تیرۆرکرا، کەسایەتییەکی ئایینی ناسراوبوو. سەدر بڕیاریدا دەست بە نەریتی

خێزانەکەیەوە بگرێ ئەویش یاخیبوونی ئاشکرابوو بەڵام نازانێ چ ڕێگایەك باشترینیانە تاوەکو بیگرێتەبەر. کەوتۆتە دوای ستراتیژییەکی هەڵگەڕاوە، هەندێجار ناوی دەنێ جەیشی مەهدی ئامادەنەکراو بۆ هێرشکردنە سەر هێزی هاوپەیمانان، و هەندێجارشی هەڵوێستی بەرگری وەردەگرن، کەچی هەندێجاریش ئیعلانی راگرتنی توندوتیژی دەکەن و ئامادەبوونی خۆیان دووپات دەکەنەوە لەبەشداریکردنی سیاسی وڵات. رۆڵی سەدر زۆر یەکلایکەرەوەیە، چونکە ستایلی دیماگۆگی ئەو جەماوەرەکی زۆری بۆ پەیداکردووە زیاتر لەهەر کەسایەتییەکیتری بێبەشی نێو بەغدا، چ سوننە و چ شیعە. ئەم هەڵوێستانەی وای لەسەدر کردووە دیاریبکات هەڵبژاردنی یەککرتنەوەی وڵات یان ئەوەتا بە پارچە پارچەبوونی. ئەمەش بۆتە خاڵێکی یەکلایکەرەوەی پێشکەوتنی عێراق. ئەگەربێتو ناوی تێکەڵ بێت لەگەڵ بەهێزکردنی یەککرتنی نیشتیمانی، ئەوا هۆکارێکە بۆ هاندان. ئەگەر ناویشی پەیوەندی هەبێت لەگەڵ هەڵگیرساندنەوەی سەرلەنوێی شەڕکردن، دەرفەتەکان زۆر مەترسیدار دەبن.

لەوکاتەی سەددام لەسەر دەسەڵات لابرا، کورد و شیعە دەسەڵاتیان وەرگرت، عەرەبی سوننە هێزی خۆی لەدەستدا. دوای دەست بەسەرداگرتنی دەزگا ئیدارییەکانی حکوومەت بۆماوەی زیاتر لە هەشتا ساڵ، لە ٢٠٠٣ کاربەدەستانی ئەمەریکا سوپای عێراقیان هەڵوەشاندەوە و هەروەها ئەندامەکانی حیزبی ئیدارەی کۆنی قەدەغەکردن لەسەر ئیش و کارە گشتییەکان. ئەم هەنگاوە خراپە بووە هۆی بێبەشکردنی وڵات لە پێکهێنانی ئاسایش و دەیان هەزار خەڵکی سوننە مەزهەب بێ کارکرد لەکاتێکدا برێکی کەم جێگرەوەی کار هەیە. عەرەبە سوونەکان زۆر بێ هیوان لە هەڵوێستەکانیان. هەندێکیان بە قەناعەتەوە بڕوایان پێی هەیە، تەنانەت ئێستاکەش، کەوا ئەوان زۆرینەی دانیشتوانی عێراق پێکدێنن، پسپۆڕان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەوا دانیشتوانی عەرەبی سوننە زۆر نزیکە لە ٢٠٪ی دانیشتوانی هەموو عێراق.

سوننەکان کێشەی بوونی سەرکردەیەکی بە ویقاریان هەیە کە هاوشانی سیستانی بێت. هەندێك لە کەسایەتییە دیارەکانیان تیرۆرکراوە، ئەوانیتر لەرابردوودا ناوی خۆیان لە پەیوەندیکردن لەگەڵ سەددام حسێن پیس کردبوو، هێشتا هەندێکیان دوورخراونەتەوە پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بە حیزبەکانەوە نەماوە. کاریگەرترین کاریان بەرگریکردنە لە داگیرکردن، هەرچەندە هێشتاکە بۆچوونی جیاواز هەیە بەوەی کە تاچەند بەکارهێنانی توندوتیژی پاساوە بۆ ئەم مەسەلەیە. لەهەمان کاتدا، ژمارەیەکی زۆری تیرۆریست کەلە وڵاتە عەرەبییە سوننەکانەوە رەوانەی عێراق کراون شەڕ لەدژی ئەمەریکا دەکەن ( بۆنموونە، مەسیحییەکان، بێ باوەڕان)،

ئێرانییەکان (بۆنموونە، شیعەکان) بەکرێگیراوی ئەو جوولەکانەی ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کەوا وڵاتەکەیان دزی و تاڵانی لێکراوە و هێرش کراوەتە سەر عەقیدەیان. لەدیارترین کەسایەتییەکانی دەرەوەی عێراق تیرۆریستی لەدایکبووی ئوردنی ئەبو موسعەب ئەلزەرقاوی بوو، کە ناوبانگێکی خراپی بۆخۆی تۆمارکرد بەهۆی فڕاندنی خەڵك و سەربڕینیان و بڵاوکردنەوەی وێنەکان لە تۆڕی ئینتەرنێت. هەرچەندە زەرقاوی پلانی زۆرتری دانابوو بۆ هێرشکردنە سەر بەرژەوەندییەکانی عێراق، بەڵام دەیان گرووپی چەکداری توندڕەو لێپرسراوییەتی کوشتن و بڕین و خۆتەقاندنەوە و هێرشکردنە سەر هێزەکانی ئاسایش و کاری تەخریبییان گرتۆتە ئەستۆ. هەردوولا بەیەکەوە، ئەم گرووپانە لەلایەن چەند کەسێکەوە سەرکردایەتی دەکرێت کە پێشبینی زیادبوونی ژمارەیان لێدەکرێت بەمەبەستی بەفیڕۆدانی سەرچاوە سروشتییەکانی وڵات و هەڕەشەکردنی عێراق بەهەڵگیرساندنی ناکۆکی فراوانی تایفییەوە. لەلایەکیترەوە لەبەرئەوەی زۆر لامەرکەزییەتی پێوە دەبینرێت، یاخیبوان دەتوانن ئەم شکستانە هەرس بکەن بەبێ ئەوەی توانستی خۆیان بۆ جێبەجێکردنی تاوانکارەکانیان لەدەست بدەن. یاخیبوان هیچ هەلێکیتریان لەبەر دەستدا نییە بۆ دووبارە کۆنترۆڵکردنی عێراق، بەڵام لەلایەنی سەربازیش کۆنترۆڵ نەکراون، تەنها لەنێو خۆیاندا کەوتوونەتە مشتومڕ و شەڕکردن لەگەڵ یەکتردا. ئەجیندای کارکردنیان بریتییە لە وەدەرنانی هێزی هاوپەیمانان و کوشتنی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ ئەم هێزانە کاردەکەن. یەکێك لە ڕاهێنراوانی سوننە کەخۆی بۆ تەقینەوەی گیانی خۆی ئامادەکردبوو بە گۆڤاری تایم (Time) ی وتبوو: "هەنگاوی یەکەم دەرکردنی ئەمەریکییەکانە لەعێراق. پاش ئەوەی ئەم هەنگاوەمان بەدەست هێنا، ئینجا کار بۆ درێژەی ئەجینداکەمان دەکەین".

سەرکردە ئەمەریکییەکان وەسفی ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیەی عێراق وەك شەڕێك دەکەن لەنێوان هێزەکانی ئازادی و ستەمکاران، ئەوانەی بەبێ سەرکەوتنێکی گەورە بیر لە کەمکردنەوەی ئاڕاستەی ئایینی دەکەنەوە. نەك هەموو کەسێك ئایینداره، بێگومان، ملیۆنان کەس ڕۆژانە سەرقاڵی پەیداکردنی بژێوی ژیانن، بەجۆرێك ئەو کاتەیان نییە بیر لە کارەکانیتر بکەنەوە، بەڵام عەقیدە چەقی ناسنامەی زۆربەی عێراقییەکانە. لەوەتەی ڕژێمی بەغدا ڕووخاوە، سەرکردە ئایینییەکان بەشێوەیەکی بەردەوام توانای خۆیان نیشاندەدەن لەڕێگای ڕژانە سەر شەقامی زۆرینەی خەڵکی عێراقی لەبڕی ئەم مەسەلە پەسەندکراوەیە. بوونی سەربازانی ئەمەریکی وەك کارێکی لێبووردە وەرگیراوە هەروەك سیستانی بەمجۆرە ڕێنمایی دەرکردبوو. کەچی ئەم کارە لەلایەن عەرەبە سوننەکانەوە موقاوەمە دەکرێن، لەبەرئەوەی دەستەی زانایانی موسڵمان، کە

گرووپێکی دیاری نێو عەرەبی سوننەیە، بانگەشەی ئەوە دەکات رووبەڕووبوونەوە ئەرکێکی ئایینییە. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرینەی عێراقییە ئاییندارەکان موتەعەسیب نینە، هەندێکیان نەبێ. کارێکی ئاساییە رۆژانە رۆژنامەیەك هەڵگری بیخوێنیتەوە، چیرۆکێکی لێ بدۆزیتەوە دەربارەی کەسێك کە ئامادەی مردن و گیانبەخشینیەتی ئەگەربێتو لەلایەن ئیمامەکەیەوە فەرمانی پێبکرێت. بۆنموونە، مستەفا جەبار، گەنجێکی بیست و سێ سالّییە، منداڵێکی ساوای کوڕی هەیە، یەکەم منداڵیەتی، وتی: "من و خێزانەکەم ئامادەین ئەم منداڵەمان بۆمبڕێژبکەین و بیتەقێنینەوە"، ئەگەربێتو فەرمانمان لەلایەن موقتەدا سەدرەوە پێبگات.

یەکێك لەو کارە پێچەوانانەی سیاسەتی ولایەتە یەککگرتووەکان ئەوەیە کە ئیدارەی بۆش، لەهەموو دەستپێشخەرییە عەقیدە بنەڕەتییەکاندا، زیاتر کاری لەگەڵ سەرکردە عیلمانییەکان دەکرد لەوەی ( پارتە سیاسییە عێراقییەکان)، ئەوانەی کە ئایین بۆتە ناوەندی هەموو هەنگاوەکانیان. ئەمەش راستە کاتێك سەرکردە ئایینپەروەرەکان میانڕەو بن و بەشێوەیەکی گشتی قەبووڵی ئامانجەکانی ئەمەریکا بکەن.

بەڵگەی ئەم مەسەلانە بەدیارکەوت لەوکاتەی هەڵمەتی خۆ ئامادەکردن بۆ دەورەی یەکەمی هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەم ٢٠٠٥ بەڕێوەبوو. پەیمانگەی دیموکراتی نەتەوەیی (NDI)، کەمن خۆم بەڕێوەی دەبەم، راستەوخۆ کاری لەگەڵ پارتە سیاسییەکانی عێراقی دەکرد، کەخۆیان بۆ ئەم رووداوە مێژووییە ئامادە دەکرد. پرۆگرامەکانی ئێمە بەجۆرێك دیزاینکرابوو کە یارمەتی پارتەکانی دەدا بۆ تێگەیشتن لە میکانیزمەکانی پرۆسەی هەڵبژاردن، رێکخستن و ئاشکراکردنی بیرۆکەکانیان، کۆکردنەوەی لیستی دەنگدەران، هەروەها دڵنیابوون لەدەرفەتی بەشداریکردنی ئافرەتان. توانستی (NDI) بۆ ئەنجامدانی گونجاندنی ناکۆکییەکانی لایەنە عێراقییەکان هەر بە بێ لایەنی دەمێنێتەوە. بەهیچ شێوەیەك نابینرێت کە پاڵپشتی لەلایەنێك بکات لەسەر ئەوەیتریان.

هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو، تووشی شۆك هاتم کاتێ زانیم بۆچوونی جیاواز هەیە لەنێو وەزارەتی دەرەوە لەمەڕ تەرخانکردنی دەیان ملیۆن دۆلار وەك یارمەتی بۆ پارتە عیلمانییەکان. ئەوکاتەی لەم بیرۆکە مەترسیدارە تێگەیشتووین، کین وۆڵاك ( سەرۆکی NDI) و لێس کامبێڵ (بەڕێوەبەری NDI بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست) نارەزاییان دەربڕی. شانبەشانی نوێنەری رێکخراوەکانیتر بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی دیموکراتی لە ولات، بەبیری ئیدارەیان هێنایەوە کەوا ئامانجی بنەڕەتی سیاسەتی ولایەتە یەککگرتووەکان یارمەتیدانی خەڵکی عێراقە بۆ ئەنجامدانی

هەڵبژاردن و دامەزراندنی حکوومەتێکی یاسایی. ئەگەر ئێمە بەمجۆرەوە کارەکانمان ئەنجام بدابایە، ئەوا جەختمان لەسەر هەموو گومانەکانی مەبەستمان دەکردەوە، و قسەکانمان لەبارەی دیموکراسی بە گەمژەیی وەردەگیرا و پرسیاری نوێتر لەبارەی هەڵوێستمان بەرامبەر ئیسلام دەهاتە پێش. NDI هۆشداریدا ئەگەربێتو ئیدارە هەڵسابوایە بەئەنجامدانی ئەم کارە، ئەوا پەیمانگا چاوێکی بە بەرنامەکانی خۆیەوە دەخشاندەوە، چونکە میسداقیەتی بەرەو نەمان دەچوو، بارودۆخی ئاسایشی تێك دەشێوا.

پرۆپۆزەلی پارمەتیدانی ئەو کاندیدانە بەشێوەیەکی جیددی چەند مانگێکی خایاند بەرلەوە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوە رەتی بکەنەوە. بیرۆکەی هاوشێوە، بۆپەیوەندی بەم هەڵبژاردنەوە پێشنیارکرابوو. بەپێی زانیاری خۆم، هیچ پلانێکی لەم چەشنە نە لەلایەن وەزارەتی دەرەوەو نە لەلایەن هیچ ئاژانسێکی فیدرالییەوە جێبەجێنەکراوە. هەوڵێك هەبوو بۆ رێکخستنی ئەم دەستکەوتانەی کە خۆشحاڵمان دەکات، سەرەڕای هەموو ئەو توانایانەی ئەمەریکا وەك وەبەرهێنان هێناویەتە ناو عێراق. بەڵام ئایا ئێمە بڕوامان بە دیموکراسییەت هەیە یان نا. ناردنی سوپای ئەمەریکی بۆ عێراق و مردنیان بیرۆکەیەکی پاساو هەڵگرە لەهەموو بارودۆخەکاندا. ئەگەر پرسیاریشیان لێبکەین بۆ پێشکەشکردنی هەمان ئەو قوربانیدانەی کە ئێمە داومانە لەکاتێکدا دیموکراسییەتێکی تەخریبکراو بۆتە عەیبە لەنێو خۆماندا.

داگیرکردنی عێراق ویستێك بوو توانای ئەمەریکای نیشاندا، بەجۆرێك سنووری هێزی ئەمەریکای بۆ جیهان خستەڕوو. سەرۆك بۆش بڕیاری شەڕیدا بەسەر عێراق چونکە بڕاوی وابوو ئەنجامدانی ئەم بڕیارە زۆرپێویستە بۆ پاراستنی ئاسایشی ئەمەریکا. بەدڵنیاییەوە ئەوەی نەدەویست کە ئێستاکە رووددەدا: گۆڕینی مێژوویی موسڵمانە شیعە و سوننەکانە نەك هەرتەنها لەعێراق بەڵکو لەتەواوی ناوچەکەش. بۆ یەکەمجارە لەمێژوودا شیعەکان دەسەڵاتی وڵاتێکی عەرەبی بگرنە دەست. کاربەدەستانی پایتەختی گەورەی سوننەی سعودی و ئوردن و میسر نیگەران بوون لەسەرهەڵدانی هیلالی شیعی کە لەبەحرێن و عێراق و سووریا و لوبنانەوە خۆی دەبینێتەوە. لەکۆبوونەوەیەکی واشنتۆن لە بەهاری ٢٠٠٥ پادشا عبداللەی ئوردن پێی ڕاگەیاندم کە زۆر نیگەرانە لە پێکدادانی شیعە و سوننە بەجۆرێك جێگەی ناکۆکی نێوان عەرەب و ئیسرائیل بگرێتەوە ببێتە کێشەی بنەڕەتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بۆ هەزار ساڵ دەچێت، سوننەکان هەر سەرکەوتوو بوونە لەنێو ئایینی ئیسلامدا. لەداهاتوودا باڵانسەکە زیاتر تەختایی بەخۆیەوە دەبینێ، هیچ کەسێکیش نازانێ ئەم مەسەلانە چ مانا دەبەخشن. پاشا عەبدوللا

هۆشداری ئەوەیدا بەرپێگادانی سەرکردە شیعەکانی ئێران و عێراق بۆ ئەوەی خۆیان وەك نوێنەر و خەلیفەی شەرعی موحەممەد نیشان بدەن. هەرچەندە لە هەردوولادا کەسانی میانڕەو هەنە بۆ کپکردنی ئەم توندڕەوییانە، بەڵام ئێمە دەبێ حیسابی رووداني ناکۆکی نێوانیان بکەین—شەڕە قسەی نێوانیان بۆ تیرۆرکردنی یەکتر بەکاردێنن، لەکۆتاییدا دەبێتە پێشبڕکێی چەکی ئەتۆمی نێوان شیعە و سوننە.

دوابەدوای دەرئەنجامەکانی ئەم شەڕە، بەجۆرێك نەویستراوبوو، پەیدابوونی کاریگەری وڵاتی دەوروبەری وەك ئێرانی لێکەوتەوە، کە هەزارانی خەڵکی ئەم وڵاتە لە شارە پیرۆزەکان وەك نەجەف و کەربەلا ژیان بەسەر دەبەن. زۆربەی سەرکردەکانی ئێستای عێراق پێشووتر بۆ ئێران دوورخرابوونەوە، خەریکی دامەزراندنی پەیوەندی بوون لەگەڵ ئەم وڵاتە. بەپێچەوانەوە ئەو پەیوەندییەی کە لەنێوان عێراق و پایتەختانی عەرەبی سوننە هەبوو ئێستاکە گۆڕدراوە بۆ پەیوەندی نێوان عێراق و ئێران، هەروەها سەرداني کردنی هاوڕێیانەی نێوانیان و بەستنی پەیماننامەی دووقۆڵی بۆ بەرگریکردن و لایەنی ئەمنی وڵات. هێزەکانی میلیشیای شیعە، کە کۆنترۆڵی باشووری عێراقیان کردووە، هاوپەیمانی کردەییان لەگەڵ ئێران هەیە، و هەروەها ئاژانسی ئەمنی و هەواڵگری تەواویان لەگەڵ ئەم وڵاتە دروستکردووە. ئەم شەڕە بووە هۆی لادانی تاڵترین دوژمنی ئێرانی، سەددام حسێن. بەڵام ئێستاکە دوو دوژمنیتری ماوە ئەوانیش، ولایەتە یەکگرتووەکان و سوننەیە توندڕەوەکانە، کە بەخوێن رووبەڕوویان دەبنەوە. لەنێو خودی ئێران، موحافیزکارانی ئاییندار کە بەتوندی بەرهەڵستی بۆچوونەکانی ئیسرائیل دەکەن توانییان لە هەڵمەتی هەڵبژاردنی ٢٠٠٥ سەرکەوتنی چاوەڕواننەکراو بەدەست بێنن. لەبۆچوونی مەلایەکانی ئێران وادەردەکەوێت، زۆر زەحمەتە بە خەیاڵکردنی رووداوی زیاتری ئەم کێشانە.

ئەگەر پلاندانەرانی ئەمەریکا هۆکاریتریان هەبوایە، ئەوا میلیشیاتی شیعە و میلیشیاتی کوردی لە باکووری وڵات لەمێژبوو هەڵدەستاندەوە و یاخود بەیەکەوەی گرێدەدان بۆ نێو هێزی نیشتیمانی. ئەمەش بەم زووییە روونادات، ئەگەر بکرێ. لەبری ئەوەی بەیەکەوەبن، عێراق ئێستاکە لەقەراغی مەترسی پارچە پارچە بووندایە. هەرچەندە، ئێستاکە، کوردەکان سەقامگیرییان بەخۆیەوە بینیووە، بەڵام پێشینەی هەموو شتێکیان و ئامانجی کۆتاییان، دامەزرانی کوردستانێکی سەربەخۆیە. بۆماوەی دوو ساڵە شیعەکانی باشوور چاوەڕێی راگەیاندنی فەرمی ئۆتۆنۆمی خۆیان لەگەڵ بوونی بیرە نەوتەکان و بەندەری بەسرای سەر کەنداوی فارس، و هەروەها حکوومەتێك کە بە تەواوی ئیمتیازات و توانای خۆیەوە جیابێت لە

حکوومەتی بەغدا. هەرچەندە سیاسییە ئایینی و نەتەوەییەکان ڕۆڵی گەورە لەنێو ئەم تایفیانەوە دەبینن، بەڵام ڕۆڵی پارەش لەم نێوەندەدا کەم نییە. لەڕێگای راهێنانی کۆنترۆڵکردن بەسەر سنوورەکان، میلیشیا جیاوازەکان دەرفەتی گەورەیان بۆ ڕێککەوتووە بۆ کاری قاچاغی و نایاسایی. بەهۆی هەبوونی لایەنگیرییەك و نەوتێکی زۆر، سەرکردەکانی ئەم ناوچەیە هیوای زەوییەکی پڕ لە خێر و بێر و قازانجێکی گەورە لە وەبەرهێنەرە دەرەکییەکان دەخوازن. ئەگەربێتو ناوەڕاستی وڵات بێ هێز و هەژار بوو، ئەوە وەك تۆڵەسەندنەوەیەك وایە کە بۆماوەی چەندین دەیە ساڵ پایتەخت ئەم ناوچانەی بۆ مەرامەکانی خۆی قۆرغکردبوو. بۆ سیاسەتڕێژانی ئەمەریکا، دابەشبوونی عێراق بۆ سەر سێ هەرێمی نایەکسان جێگای قەبووڵ نییە، چونکە دەبێتە هۆی پارچەبوونی وڵات، قووڵبوونەوەی تووڕەیی نێوان عەرەبی سوننە و شیعە، هەروەها ئاڵۆزبوونی پەیوەندی نێوان تورکەکان و کوردەکان. عێراقێکی دابەشکراو دەبێتە هۆی پەیدابوونی کەموکوڕی تایبەتمەندی و دیموکراسی، دەرئەنجام لە ولایەتە یەکگرتووەکان دەکات هێزەکانی خۆی لەماوەیەکی زوو نەکشێنەوە تاوەکو باوەڕی ئەوەی بۆ دروست نەبێ کە ئەرکەکەی لەعێراق بەسەرکەوتوویی کۆتایی پێهاتووە. راوێژکارانی ئەمەریکی فشاریان خستۆتە سەر سەرکردەکانی شیعە و کوردی تا واز لە جیابوونەوە بێنن و تەرکیز بکەنە سەر وەزعی سیاسی ئێستای وڵات و کار لەگەڵ عەرەبی سوننە بکەن بۆ بنیاتنانی تاکە دەوڵەتێکی یەکگرتوو. ئەم پڕۆژەیە کاتێ سەردەکەوێ ئەگەر عێراقییەکان بڕوایان بەوە بێ کە ئەم پڕۆژەیە هەم مەرغوبە وەهەم مومکینیشە، بە لەبەرچاوگرتنی دابەشبوونەکانی رابردوو و تاوانکارییەکانی ئێستا.

لەگەڵ زیادبوونی ئەم کێشانەش کەمەنەتەوەیی مەسیحییەکانی عێراق ڕووبەڕووی بارودۆخێك بوونەتەوە، بەجۆرێك ژمارەیان نزیکی ملیۆنێکە ئەمانیش، ئاشووری، کلدان، کاسۆلیکی، ئەرمەنی، و هەروەها سریانییەکانن. بە بۆچوونی هەندێ میلیشیاتە ئیسلامییە توندڕەوەکان مەسیحییەکانیش لایەنگیری ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکان، بۆیە هەندێك لەکڵێسەکانیان تەقێنراونەتەوە. زۆربەی مەسیحییەکانی عێراق بەڵێنیان پێدراوە کە نەترسێن، بەڵام بەهەزارانیان ناوچەکەیان جێهێشتووە. ئەو کێشەیەی تووشی مەسیحییەکانی عێراق بۆتەوە زیاتر بەهۆی ئەم بزووتنەوە تەبشیرییەوە خراپتربووە کە دوابەدوای سەربازەکانی ئەمەریکا کەوتوونە و هاتوونەتە نێو عێراق.

دوای شەڕی بەغدا، بەڕێوەبەری جێبەجێکردنی کۆمەڵەی نیشتیمانی ئینجیلی پێشبینی ئەوەی کرد کەوا " عێراق دەبێتە ناوەندی بڵاوبوونەوەی زانیاری لەسەر ژیان و کارەکانی پێغەمبەر مەسیح بۆ ئێران، لیبیا، و هەروەها تەواوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. سەرۆك بۆش دەیووت، دیموکراسی لە عێراقەوە بۆ وڵاتانی دەوروبەری بڵاودەبێتەوە. عێراقێکی ئازاد ڕێگامان پێدەدات بە بڵاوکردنەوەی ڕێنماییەکانی پێغەمبەر مەسیح تەنانەت لەنێو ئەو نەتەوانەی کە یاساکانیان بوار بەدەرکردنی ئێمە دەدەن".

نەتەوەی مەسیحییەکانی عێراق بەقەد مێژووی مەسیحییەوە کۆنن، بەهەوڵی نەگۆڕینی ئایینیان بۆ ئیسلام ماونەتەوە. بەگوێرەی قەشەی کاسۆلیکی رۆمانی لە بەغدا، " ئەو ڕێگایەی کە ویعازەکان گەیشتوونەتە ئێرە... لەگەڵ سەربازەکان... شتێکی باش نەبوو. وای بۆدەچم ئەوان نییەتێکیان هەبوو بۆئەوەی بتوانن خەڵکی موسڵمانی ئەم وڵاتە لە ئایینی خۆیان هەڵبگەڕێنەوە، لەکاتێکدا ئێمە لێرە بۆماوەی ٢٠٠٠ ساڵە ئەم کارەمان نەکردووە". هیچ کەس نییەتێکی باشتری نییە لە موژدەبەرەکان لەنێو ئەم خاکە دوژمندارییە. لەگەڵ ڕەچاوکردنی بارودۆخی ئێستای عێراق، پێشبینیکردنی تەبشیری مەسیحی بۆ هەڵگەڕاوانی موسڵمانان هیچ یارمەتییەکی سیاسەتی ولایەتە یەکگرتووەکان نادات، و هەروەها تەبشیرکردن ڕێگایەك نییە بۆ کەمکردنەوەی ئەو مەترسییانەی کە دێنە پێش سوپای ئەمەریکا.

لەگەڵ ڕوودانی ئەم هەموو دەرئەنجامە نەویستراوانەی داگیرکردنی عێراق لەلایەن ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە، ئیدارەی بۆش سوورە لەسەر بەدیهێنانی بەڵێنەکەی سەرۆك بەوەی " وا لەکارەکان دەکەین باشتر بچن بەڕێوە". بۆ لێکۆڵینەوە لەم قسەیە، بەشداری کۆبوونەوەیەکی نێو کۆشکی سپیم کرد لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥، کە هەموو وەزیرەکانی دەرەوە و بەرگری تیا بەشداربوون ئەوانەی کە تاوەکو ئێستا لەژیاندا ماون. گرووپێکی زۆر بەڕێزبوون، خاوەن ئەزموونی زۆربوون وایان لێکردم هەست بە گەنجییەتی زۆر بکەم. هەمووومان لەژوورەکەی رۆزڤێلت کۆبووینەوە، ئەو ژوورەی کەتیایدا گوێمان لە وتارێکی یەکلایکەرەوەی سەرۆك بوو کە لەیەکێك لە ڕاپۆرتە ڤیدیۆییەکان لەڕێگای باڵیۆزمان لەعێراق نیشاندەدرا. کاتێ ڤیدیۆیەکە بەشێکی بە نەبیستراوی نیشاندا، ئەوەم بەبیرهاتەوە کەوا لەکارکەوتنی تەکنەلۆژیا زۆر لە کۆبوونەوەکانی ئێمەی دەبڕی لەوکاتەی لە وەزارەتی دەرەوە خزمەتم دەکرد. تەنانەت لەنێو کۆشکی سپیش لە سەدەی بیست و یەکەمدا، بۆیە ئێمە زیاتر لەوە چاوەڕوان دەکەین کە تەکنەلۆژیا دەتوانێ پێشکەشیبکات.

لەوکاتەی هەموومان دانیشتبووین، ستافی سەرۆکایەتی نامیلکەیەکی بەسەرمان دابەشکرد کە تیایدا قسە وەرگیراوەکانی جێگری سەرۆك دیك تشینی لەبارەی عێراق و کۆمەڵەیەك لە خاڵی گرنگی دەربارەی دەستکەوتەکانی سیاسی سەربازی ئەوانەی تاوەکو ئێستاکە بەدەست هاتوون تیا نووسرابوونەوە. لەدوای راپۆرتێکیتر، ئەمەیان لەلایەن فەرماندەی سەربازی ولایەتە یەکگرتووەکان لەعێراق پێشکەشکرا، دەرفەتی ئەوەمان پێدرا گفتوگۆ لەگەڵ سەرۆك بکەین. وەزیرانی بەرگری—ژمارەیەکی زۆر بوون، هەرلە سەردەمی رۆبێرت مکنمارا وە—مشتومڕی تاکتیکەکانی سەربازییان دەکرد لەگەڵ گەورە جێبەجێکاری و هەروەها دەربڕینی ئەو کاریگەرییەی کە لەسەر سوپاکەی ئێمەدایە گەربێتو بۆماوەیەکی درێژ لەدەرەوەی ئەمەریکادا بمێننەوە. کاتێ سڕەی من داهات، سەرەتا سوپاسی سەرۆکم کرد بۆ ئەم دانیشتنە و هیوای سەرکەوتنی سوپاکەمان خواست. هەروەها هاونیگەرانی خۆمم دەربڕی بەرامبەر لاوازبوونی هەڵوێستی جیهانی ئەمەریکی کە مامەڵەکردنمان چەندە مەترسیداربووە بەهۆی ئەوەی ئێستاکە سوپاکەمان لەعێراق چی بەسەردێت. سەرۆك سوپاسیکردم بۆ بیرکردنەکانم لەهەمان کاتیشدا بەرەنگاری رەخنەکانیشم بووە. لەدواتر گوازراینەوە نووسینگەی هێلکەیی بۆ وەرگرتنی وێنەیەکی یادگاری کۆمەڵەیی. کۆبوونەوەیەکی زۆر بەئەدەبانە بوو، بەلام بەداوای لێبوردنەوە، هیچ بەرهەمهێن نەبوو.

هەرچەندە سیاسەتی ئەمەریکا بەهۆی چەند شکستێکییەوە تاوەکو ئێستاش ئازار دەخوات، بەلام هێشتاکە ئیدارەی بۆش باسی " سەرکەوتن" دەکات. لەڕاستیدا، ئەو دەرفەتە بۆ ئەمەریکا دووبارە نەبۆوە کە لە جەنگی یەکەمی کەنداودا سەرکەوتن بەدەستی هێنا. دوای سێ ساڵ لەداگیرکردن، هێشتاکە داهاتووی عێراق ئاڵۆز و نادیارە. هەستێك لە هەردوولا هەیە لە ولات و لە ئەمەریکا، بەجۆرێك کە سوپای هاوپەیمانان—لەگەڵ بوونیان—چەندە هەوڵی یەکخستن و مانەوەی یاخیبوان دەدات بەوەی زاڵبێت بەسەریاندا. تەنانەت راهێنانی سەربازان و پۆلیسی عێراقی ئاکامێکی چاوەڕواننەکراو دێنێتە پێش ئەگەر ئەم هێزانە دڵسۆزی خۆیان پێشکەش بە سەرکردەکانیان نەکەن ئەوانەی کە نوێنەرایەتی تەواوی ولات دەکەن. هێلێکی ورد هەیە، بەلام زۆر گرنگە، لەنێوان دروستکردنی سوپایەکی نیشتیمانی راستەقینە لەگەڵ تەنها فێرکردنی ژمارەیەکی زۆر خەڵك ئەوانەی حەز بە یەکتر ناکەن و نازانن چۆن چەك بەکاردەهێنرێت.

لەگەڵ داگیرکردندا، ولایەتە یەکگرتووەکان گریمانەی لێپرسراوییەتەکی ئەخلاقی بەخۆیدا بەیارمەتیدانی عێراق بۆئەوەی ببێتە ولاتێکی ئاشتیخواز و دیموکراس پارێز. لەلایەکەوە، عێراق

سەرکردایەتییەکی یاسایی هەیە، دەتوانێ ئەمن و ئاسایش بەرقەرار بکات—لەم قۆناغەدا—کە باشترین دەستکەوتە. ئەم ئامانجەش جێبەجێ دەکرێت ئەگەربێتو یاخیبوان دەست پارچەپارچە بوون بکەن و بەهۆی جیاوازییەکانیان لە ئامانج و تاکتیکییەکانیان لێك بترازێن. هەروەها هیوایەك هەیە، لەڕاستیدا هەندێك لە لەعێراقییەکان، لەهەموو بەشەکانی وڵات، بۆیەکەمجارە بەئاشکرا بەشداری چالاکی سیاسی دەکەن، لەرێکخستن و مشتومڕکردندا، لەگەڵ ئەوەشدا حەز بە چ جۆرە کۆمەڵگایەك دەکات بۆئەوەی وڵاتەکەی ڕێچکەی تیا بگرێت. دیموکراسی ڕێگایەکی بەهێزە بۆ بەدەستهێنانی هیواکان. ڕێزگرتنی مافەکانی ئۆپۆزۆسیۆنی سیاسی وەك مەترسییەکی گەورە سەیردەکرێت لەلایەن ئەوانەی کەوا ژیانیان بەهۆی ترسەوە کۆنترۆڵکراوە. بۆ ماوەی دەیان ساڵە خەڵکی عێراق لەژێر سێبەری ترسەوە دەژیت—لەلایەن ڕژێمی سەددام حسێنەوە- ئێستاش لەبەر ئەو نادڵنیایی و ستەمکارانەی کەدوابەدوای ئەوەوە هاتووە. ئەوەی بۆ ستراتیژییەتی ئەمەریکا ماوەتەوە بەهێزکردنی هیواکانە لەڕێگای کارەکانی حکوومەتێکی نموونەیی و جێبەجێکردنی بەڵێنەکان—لەکۆتاییشدا—بۆ فەراهەمکردنی ئابوورییەکی سەرکەوتوو. پرسیارەکە لێرە هێشتاکە پێویستی بە وەڵام هەیە، ئایا ئەم ستراتیژییە دەتوانێ سەرکەوێ لەبەردەم زۆرێك لە بەرەنگاربوونەوە سیاسی و ئەمنییەکانی وڵاتدا، و لە سێبەری ئەم ترسەی کە عێراقییەکان لەناوەوە و دەرەوە هەستی پێدەکەن.

بەگرنگیینەدانی ئامۆژگاری پسپۆڕان، سەرۆك بۆش قوماری ئەوە دەکات کەوا داگیرکردنی عێراق سەرکەوتوو دەبێ لەگەڵ ئەم ئالۆزییانەی کە لەلایەن ئاین و مێژووەوە دروستبوونە، لە کەمتەرخەمی مەنتقی "شەڕی دادگەری"، هەروەها نەبوونی بەردەوامی پاڵپشتی نێودەوڵەتی. بۆ پاساوهێنانەوە، زێدەڕۆیی زۆری لە هەردوولا کردا، لەو مەترسییانەی کەوا حکوومەتی عێراقی شێوەی نەخشاندووە هەروەها سوودمەندییانەی کەوا سەددام حسێنی لادراو دەیهێنا. سەرۆك زۆر بەجیددییەوە بەڵێنی بە سوپای ولایەتە یەککگرتووەکاندا کەوا "هەڕەشەی تیرۆریستان لەسەر ئەمەریکا و جیهان کەمدەبێتەوە لەو ساتەی سەددام حسێن چەك دەکرێت". لەڕاستیدا داگیرکردن و شەڕکردن بووە هۆی زیادکردنی ئەم مەترسییانە.

## (١٣)

# رووبەڕووبوونەوەی قاعیدە

کاتێکی زۆری نیوەی یەکەمی ژیانی هەرزەکاریم لە خوێندنەوەی حکوومەتەکانی کۆمۆنیستی بەسەربرد. لە بەهێزترین کاتەکانیان کە لەنێوان سالآنی ١٩٥٠ تاوەکو سەرەتاکانی سالآنی ١٩٨٠، فەرمانڕەوایی نیوەی جیهانیان دەکرد. بیرۆکەکانی دواوەی کۆمۆنیزم هەڵگری داوایەکی بەهێزبوو. بۆ زۆربەی ئەو خەڵکانەی هەژارن، کۆمۆنیستەکان لەنێو نائاسایشی جەنجالّی ژیان بەڵێنی گوزەرانیان پێداون: مافی کارکردن، پەروەردە و فێرکردن، تەندروستییەکی باش، شوێنێك بۆ گوزەرکردن، و هەروەها پێدانی خواردن دەبێ لەلایەن ئابوورییەکی بەهێزەوە کۆمەك بکرێت کە بناغەی لەسەر پلانێکی ناوەندییەوە دانرابێت.

بۆ دڵنیایی ئایین گۆڕەکان، بانگەوازانی کۆمۆنیستی پێویستیان بە کاری شەڕانگێزییە لەدژی نیشاندانی وێنەکانیان: تەنها دانەیەکیان لێ دروستکردووە بۆ بنیاتنانی خانووێکی شوشە لە رۆژئاوا- کێشانی وێنەی شارستانییەتێك نەك بۆ سەرهەڵدانی نیسبی و ئازادی بەڵکو بۆ رەگەزپەرستی و ماددەی بێهۆشکەر و بێکاری و قۆرخکردنەوەیە. لە مەسەلە جیهانییەکان، رۆژئاوا ئەوەی راگەیاندووە وەك ئیمپریالیست و دوژمندارێك ئەو ولآتە تازە پێگەیشتوانە راو دەکات بۆئەوەی قازانجەکانیان بدوورێتەوە بەناوی هاریکارییە فرەنەتەوەکان. زۆربەی بەشە دوورەکانی سەر زەوی، ئەم ناوزڕاندنانەیان قەبووڵکردووە. دوای ئەمانەش، زۆربەی ولآتانی ئەفەریقیا و ئاسیا و رۆژهەلآتی ناوەڕاست بۆماوەیەکی درێژ رووبەڕووی دەستبەسەرداگیرکردنی کۆلۆنیالّ بوونەتەوە، هەروەها سەرچاوە سروشتییەکانی ئەم هەرێمانە هەمووی بەهەدەر دراو دووراونەتەوە لەبەرامبەر دابینکردنی پشکێکی کەم بۆ دانیشتوانەکانیان. لەگەڵ ئەمەشدا، کۆمۆنیزم هەرەسی هێنا، چونکە ئایدیاکانی، کاتێ کەوتنە بواری پڕاکتیزەکردنەوە، کاری تەواویان پێنەکرا. لەکۆتاییەکانی سالآنی ١٩٨٠، نەك تەنانەت سەرکردە کۆمۆنیستەکانیش نەیانتوانی کارێك بکەن بۆ پێکهاتنی کۆمەڵگا

یەکسانەکان و دروستکردنی ویستگەی ئابووری ناوخۆیی بەجۆرێك بتوانێ ڕۆژئاوا لە "گۆڕ"نێت. کاتێکیش سیسەتەمەکە دەستی بە هەرەسهێنان کرد، زۆر بەخێرایی دەستیپێکرد.

بەپێچەوانەی مارکسییەکان، سەرکردەکانی قاعیدە و هاوپەیمانانی بیر لە دەربڕینی فەلسەفەیەکی ئابووری پەیوەست ناکەنەوە، وە هەرگیز بەڵێنیش بە دواکەوتوانی نادەن بۆ ئەنجامدانی کارێکی باشتر، چاودێری تەندروستی و ماڵێك—بەجۆرێك هێشتاکە هەندێ تیرۆریستی چالاکوان مشتومڕ لەسەر ئەم بەندانە دەکەن. مەبەستی قاعیدە ئەوە نییە ببێتە هەموو شتێکی هەموو خەڵکەکە، بەڵکو ئامانجی ڕاکێشانی کۆنترۆڵی ئایینێکە. بەپێچەوانەی کۆمۆنیزم لەدوای شۆڕشی رووسیای ساڵی ١٩١٧، قاعیدە ئیدارەی هیچ حکوومەتێك و هەرێمێکی دیاریکراو ناکات، بەڵام کۆمۆنیزم، توانیوەتی پاڵپشتی بۆ هۆکارێك پەیدابکات: بۆ پێناسکردنی ئازار و ئاڕاستەکردنی تووڕەبوون بۆ ئامانجەکان، بە لایەنیکەم بۆ هەندێ خەڵك، کە پێدەچێ شایانی ئەمە بن.

بەهێزترین گوتاری قاعیدە ئەوەیە موسڵمانان لەهەموو شوێنێکدا ڕووبەڕووی هێرشکردن و چەوسانەوە هاتوون، و لەسەر هەموو موسڵمانانەوە پێویستە بەرگری لەخۆیان بکەن و شەڕ لەدژی دوژمنانی ئیسلام هەڵبگیرسێنن. تیرۆریستان بەراورد لەنێوان سوپای ولایەتە یەکگرتووەکان لە عێراق و ئەفغانستان لەگەڵ مەغۆلییەکان دەکەن ئەوانەی لە سەدەی سێزدەهەمدا وەك لافاو هاتنە نێو ئەم هەرێمە و کەوتنە گیانی دانیشتوانەکەی و ماڵ و سامانی موسڵمانانیان بەتاڵان برد و مزگەوتەکانیان ڕووخاند. ئەم تێزەیە—کە ئیسلام لەژێر هێرشکردندایە- تەنها لەلایەن توندڕەوکانەوە باوەڕی پێ ناکرێت، بەپێچەوانەوە، بۆتە شتێك کە زۆر نزیکە لە حیکمەتی تەقلیدی لەنێو ئەو وڵاتانەی کە زۆرینەیان عەرەب و موسڵمانن. وا بیردەکرێتەوە، کەوا موسڵمانان هەڕەشەیان لێدەکرێت، نەك تەنها لەلایەن سوپای ئەمەریکاوە، بەڵکو لەلایەن زایۆنییەکان ئەوانەی کە ولایەتە یەکگرتووەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چەك و تەقەمەنییان پێدەدەن و لەلایەن ڕژێمەکانی قەوقاس، ئاسیای ناوەڕاست، کشمیر، چین، بەڵقان، ئەندەنوسیا، فیلیپین، تایلەند و بەشەکانی ئەفریقیا. هێشتاکە زەلیلی زۆرتر ماوە، دیعایەی ئەوە هەیە کەوا زۆرێك لە جیهانی عەرەبی لەلایەن حکوومەتی مورتەدەوە فەرمانڕەوایی دەکرێت و گیانی خۆیان بە ئەمەریکا فرۆشتووە یاخود ئایدیۆلۆژیای بێ باوەڕەکانیان لەباوەش گرتووە وەك بەعسییەکانی سووریا یان عیلمانییەکان لە تورکیا—ئەو ئایدیۆلۆژیایانەی نامۆبن لەگەڵ بوونی ڤێرژنی ئیسلامی "شارێك لە بەرزایی" یان

نەتەوەیەك لەژێر چاودێری پەروەردگارەوە". بەهایەکانی کلتووری ئیسلامیش لەژێر مەترسی کاریگەرییەکانی رۆژئاواییەکاندایە، بەوجۆرەی وەك ماددی و بەرەڵایی و دەستکردەوە بەدیار دەکەوێت. ئەم وێنە جیهانییە بەتایبەتی لەلایەن ئەو گەنجە بێ کار و دوودڵ و رەشبینانەوە بەرچاو دەکەوێت.

سەرۆك بۆش بە دڵنیاییەوە دەڵێ قاعیدە ئەم کارە تیرۆریستیانە دەکات، چونکە " قاعیدە رقی لە ئازادی دەبێتەوە". لەبری ئەمە ئوسامە بن لادن وەڵامی دایەوە، ئەگەر بەگوێرەی ئەوە بێت کەوا قاعیدە رقی لەئازادییە ئەی بۆچی قاعیدە هێرشی نەکردۆتە سەر "سوید ، بۆ نموونە". هەروەك سەرۆك بۆش، بن لادن ئەوە وێنەدەکات کە پێکدادانێك لەنێوان بەرگریکارانی چاکە و دوژمنانی شەڕانی هەیە، بەڵام هەریەك بە رۆلێکی جیاواز. لەساڵی ٢٠٠٤، یەکێك لە ئەندامانی بۆردی راوێژکاری وەزارەتی بەرگری ولایەتە یەککگرتووەکان ئەوەی روونکردەوە کەوا "موسڵمانان رقیان لە ئازادی نابێتەوە بەڵکو رقیان لەو سیاسەتانە دەبێتەوە کە ئێمە پەیرەوی دەکەین". ئەمەشی روونکردەوە، "کردارەکانی ئەمەریکی و لێشاوی رووداوەکان بۆتە هۆی زیادبوونی دەسەڵاتی جەنگاوەرانی جیهاد هەروەها بەهێزکردنی شەرعیەتیان لەنێو موسڵماناندا. ئەوەی پێشتر تۆرێکی پەراوێز بوو ئێمرۆکە بۆتە بزووتنەوەیەکی فراوانی جیهان". هەروەك کۆمۆنیزمەکان لەنێو ناوەندی هەژارانی جیهان خۆیان وەك رێگایەکی بەرەنگاربوونەوەی رۆژئاوا حیساب دەکرد، بۆیەش قاعیدە لەلایەن زۆرێك لەخەڵکانەوە بەوجۆرە حوکمی لەسەر دەدرێ نەك قاعیدە چییە بەڵکی قاعیدە لەدژی کێوە شەڕ دەکات.

بەمەبەستی بەخشینی هێزێکی عاتفی، سەرکردە تیرۆریستەکان دەگەڕێنەوە سەردەمی محەممەد، کاتێك جەنگاوەرانی ئیسلامی باوەڕی خۆیان راگەیاند دواتر بەرهەڵستی دووڕوو و بێ باوەڕانیان دەکرد. رووداوەکانی ٩/١١ گۆڕانکارییەکی گەورە و سایکۆلۆژی بوو، و هەروەها ئاهەنگگێڕانێك بوو بۆ " هێرشێکی پیرۆز کە بووە هۆی دارمانی ئەمەریکییە خیانەتکارە گەمژەکان و هۆیەکیش بوو بۆ لەخەو هەڵسانی ئەم خەڵکانەی کە لە خەوێکی قووڵ دانە". هەر لەو کاتیشەوە، کردارە خۆکوژییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو بەرەو زیادبوون چوون، هەروەها ژمارەی ئەو گرووپانەی کە ئەم کارە توندوتیژییانە دەکەن لەشەشەوە بەرزبۆتەوە بۆ زیاتر لە سی.

تیرۆریستەکان دەڵێن، ئێستاکە کاتی ئەوە هاتووە موسڵمانی راستەقینە لەرێگای کردارەکانیان خۆی پێناس بکات بۆ زامنکردنی شوێنێك لە بەهەشت بەهۆی بەشداریکردن لە

جیهادە موقەدەسەکانەوە. جەنگاوەرەکان لەڕێگای بەڵێنە پێدراوەکانیانەوە هەڵدەخەڵەتێنرێن و بەو چاوەڕوانییەی کە ڕێگایان پێ بدرێن حەفتا لە ئەندامانی خێزان و هاوڕێکانیانەوە لەگەڵ خۆیان ببەنە بەهەشت. ئەم بیرکردنەوەیە سادەیە زۆر ترسناکە بەبەراورد لەگەڵ تەکنەلۆژیای سەدەی بیست و یەکەمدا. هەزاران ماڵپەڕی تۆڕی ئینتەرنێت ناوی "شەهیدان" بەرز دەنرخێنن و باسی قوربانیانی موسڵمانان دەکەن، و هەروەها هانی پەیدابوونی سەرلەنوێی ئەم کردارانە دەدەن. یەکێك لە مانشێتی گۆڤارەکان کەلەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاویکردبوٚوە، " برای موجاهید، بۆ پەیوەندیکردن لە گەورەترین سەربازگە ڕاهێنانییەکان، پێویست ناکات بەتەنها بۆ خاکەکانیتر گەشت بکەیت. تۆ دەتوانی لەنێو ماڵی خۆت بەتەنها یاخود لەگەڵ برایەکانت ئەم کارەیە جێبەجێ بکەیت". وەکو هاندەرانی فوتبۆڵێن و جابی پارە کۆکردنەوە، کۆبوونەوەی جیهادکاران بۆ دابەشکردنی ئەم پەرۆشیەی کەبەیەکەوە کۆیان دەکاتەوە. هەربۆیەش هەندێجار، ئەم پەرۆشییە گەشەدەکات و دەبێتە کردەیی. ئەم پەیوەندییانە زۆرجاران دەبێتە تۆڕێکی نادیاری بەکاربەرە تیرۆریستەکان ئەوانەی لەبەشەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، و باشووری ئاسیا، باکووری ئەفەریقیا، و ئەورووپا، هەروەها بەدڵنیاییەوە ئەمەریکا کاردەکەن.

لەوەتەی ۹/۱۱ ، ڕوویداوە هەوڵی ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆریستەکان بە سەرکردایەتی ولایەتە یەکگرتووەکان دەستیپێکرد کەبۆتە هۆی لاوازکردنی تۆڕی ڕێکخراوی قاعیدە. دەیان سەرکردەیان لێ کوژران و دەستگیرکران، چەندین سەربازگەی ڕاهێنانیان هەڵوەشێنرایەوە، هێرشە پلانرێژەکانیان پووچەڵکرایەوە. ئێستاکە پەیوەندیکردنەکان زۆر زەحمەت بووە، کارمەندانی هەواڵگری زۆر هۆشیارن لەکارکردن. هەروەك سەرۆك بۆش دەڵێ، " لەوکاتەی تیرۆریستان بەشەو و ڕۆژ هەوڵی خۆ ڕزگارکردنی خۆیان لە کوشتن و دەستگیرکردنیان دەدەن، ئەوا کەمتر توانای پلاندانانی هێرشەکان دەبێ". زۆر بەروونییەوە دیارە، هەرچەندە، خۆبەخشەکان هەوڵی جێگرتنەوەی ئەو کەسانە دەدەن کەوا گیراون یاخود ناچارکراون دەستبەرداری کارەکانی خۆیان بن. بۆنموونە، لە نۆڤەمبەری ۲۰۰۵، توندڕەوەکان بۆجاری یەکەم عێراقیان بەجێهێشت بۆئەوەی لەدەرەوە هێرش بکەن، ئەوەبوو هێرشیان کردە سەر ئوردن، لەئەنجامدا پەنجا و حەوت کەسیان لەبەردەم قەرەباڵغی هۆتێلێك لەکاتی ئاهەنگگێڕانێکی ژنهێنان کوشت. بەپێی توێژینەوەیەکی دەزگای هەواڵگری ئەمەریکا هاتووە، کەوا خاکی عێراق زیاتر کاریگەری هەیە بۆ ڕاهێنانی تیرۆریستان بەبەراورد لە ئەفغانستان لەسالآنی ۱۹۸۰، لەبەرئەوەی عێراق وەك تاقیگەیەکی ڕاستەقینەی جیهانی وایە

بۆ جەنگی مەدەنیەت. پسپۆڕانی ئەم بوارە لەوە دەترسن کەوا تیرۆریستان لەزۆر وڵاتاندا رادەهێنرێن لەسەر تیرۆرکردن و فڕاندن و دروستکردنی بۆمب و هێرشکردنە سەر ئامانجە دەوروبەرداوەکان. کلۆدی مۆنیکێت، بەڕێوەبەری گشتی سەنتەری زانیاری ستراتیژی و ئاسایشی ئەورووپی دەڵێ، " ئەوەی ئێستا چاوەڕێی دەکەین سەرهەڵدانی نەوەیەکی نوێی تیرۆریستانە، ئەو منداڵانەی تەمەنیان لە نێوان ١٢-١٥ دایە لە ١١/ سێپتەمبەری ٢٠٠١، کە تەنها ساڵێك تا دوو ساڵیان بۆ دروستکردنی هەمان ئەم پرۆسە ئایدیۆلۆژییەیە وەرگرتووە، کە دەبێتەهۆی پەیدابوونی توندوتیژی.

ئەگەربێتو قاعیدە و هاوپەیمانانی نسکۆ بێنن، بەڕاشکاوی پێویستە ئەم کۆبوونەوانەی دابخرێن. بەمەش داوای سەرکەوتنێکی سیاسی دەکات کەوەك سەرکەوتنی دیموکراسییەت بەسەر کۆمۆنیزم یەکلایکەرەوە بێت.

ئەمەش خاڵێکی دڵخۆشکەرە بەوەی هیچ حکوومەتێکی سەر ئەم زەوییە بەئاشکرا باوەشی بۆ رێکخراوی قاعیدە نەکردۆتەوەە. ئەوەی قاعیدە حەزدەکات ئەوەیە بە جێگرتنەوەی ئەم سیستەمە نەتەوەیە دەوڵەتییەی ئێستایەی بە حکوومەتێکی ئایینی—جێنشین— بۆئەوەی بتوانێ فەرمان بەسەر موسڵمانانەوە بکات. ئەمەش دەگمەنە بەوەی بەخۆی پاڵپشتی لەتوانەوەی خۆی دەکات. لەکاتی جەنگی سارددا، دەمانتوانی پێوانەی پرۆسەی خۆمان لەسەر نەخشە بکەین بەوەی کە کامە وڵاتە پشتگیری لە کوتلەی سۆڤیەتی دەکرد، کامەیە بەشێکە لە جیهانی ئازاد و کامەشیانە لایەنگیری هیچ کام لەم دووانە ناکات. بەڵام ئەم سیستەمەی ئەمرۆکە وا بەم شێوەیە ئاسان نییە بۆ ئەوەی دەستنیشانی کەسانی خراپ بکات و بیان پشکنێ کامەیان گیراوە و کامەیان کوژراوە. دامەزراندنی ئەندامی نوێ و پەیوەندیکردنیان بەم تۆڕە دەبێتە هۆی فراوانبوون و ئەرکی زۆری ئەم رێکخراوەیە. وەك گرووپێك کە لەلایەن قاعیدەوە شێوەیان بۆ دەکێشرێت بەڵام لەلایەن ئەم رێکخراوەوە رێنمایی ناکرێن. هەروەك دۆناڵد رامسفێلید سکاڵای ئەوەی دەکرد، " کەموکوڕیمان لە پێوەرێکەوە هەیە بۆئەوەی بزانین ئایا ئێمە ئەو شەڕە جیهانییەی کە لەدژی تیرۆریستانەوە ئەنجامی دەدەین سەرکەوتووینە یاخود شکستمان هێناوە. ئایا رۆژانە تیرۆریستەکانمان دەستگیرکردوون، کوشتوون، و یاخود رێمان لێگرتوون لەئەنجامدانی کردە تیرۆریستییەکانیان زیاتر لەوەی پیاوە ئایینییە رادیکاڵییەکان هەڵدەستن بە ناونووسکردن و راهێنان و دابەشکردنی ئەرکەکانیان لەدژی ئێمە؟" پرسیارەکەی رامسفێلد "زار و مار" ی بەبیرهێنامەوە، یارییەکە کاتی خۆی بەمنداڵی

دەمكرد ئێستاكەش لەگەڵ حەفیدەكانم دەیكەم، بەس ئەوكاتەی هەستدەكەی لە كۆتایی ئەنجامەكە نزیك بوویتەوە، لەپڕێكا دەكەویتە نێودەمی مارەكە، بۆخوارەوە دەگەڕێیتەوە، ناچاردەبی لەسەرەتاوە دەست پێبكەیتەوە(١).

لەماوەی دە ساڵی رابردوودا، ولایەتە یەكگرتووەكان ملیاران دۆلاری بۆ دروستكردنی ئاژانسە هەواڵگرییەكان، راهێنانی هێزە ئەمنییەكان، چاككردنی پەیوەندییەكانی لەگەڵ دەرەوە، و هەروەها خۆئامادەكردن بۆ بەرگریكردنی نیشتیمانی خەرجكردووە. ئەمانە هەمووی پێویستن، لەڕاستیدا، زیاتریش پێویستە ئەنجامبدرێت. هەرچەندە، ئێمە هێشتاكە باشترین شێوازی رووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەی تیرۆریستانمان نەدۆزیتەوە. جێبەجێكردنی یاسا تەقلیدییەكان بەس نینە، لەكاتێكدا نەگونجانێك لەنێوان تیۆرییەكانی سەربازی و شەڕكردن لەگەڵ یەكتردا بەدیدەكرێت. كەچی وتەبێژانی ئیدارە هەڵدەستن بە دڵنیاكردنەوەمان بەوەی تاوەكو ئێستا چەندین سەركردەی قاعیدە كوژراو و دەستگیركراون. بەڵام هەروەكو لە یادداشتنامەكەی رامسفێڵدا هاتووە، ئەمە تاچەندی مانادارە؟ قاعیدە گرووپێكی چەتە نییە تاوەكو لەسەر شەقامەكان دەورە بدرێت یاخود سوپایەك نییە لەگۆڕەپانی جەنگدا تێكبشكێنرێت. بەڵكو وەك ڤایرۆسێك وایە لە كەسێكی تووشبوو دەگوازرێتەوە بۆ كەسێكیتر، لەگەڵ هەموو خراپەیەكدا زیاتر دەردەكە قووڵتر دەبێ—جا راستی بێ یان بانگەشەكراو—بەمجۆرە لەلایەن ولایەتە یەكگرتووەكانەوە حیسابی بۆكراوە.

دوابەدوای ئەم هەوڵانەش سەرانی ئەمەریكی پێویستە كار بۆ كەمكردنەوەی ئەم كردانە بكەن كە تیرۆرستان هەوڵی بەدەستهێنانیان دەدەن، بەڵام كاتێكی سەختمان لەپێشە بۆ ئەنجامدانیان. هێرشەكانی ٩/١١ خوێنی هەموومانی وەرگرت، میحنەت و كاری شەڕانگێزانە لەدژی سوپای ئەمەریكی و خەڵكی سڤیلی عێراقی بوونە هۆی ناخۆشتركردنی هەستە سۆزدارییەكانمان. تیرۆریستان كاریگەری ئێمەیان دەویست و سەركەوتووش بوون. تێبینی ئەو

---

(١) قاڵدرمە و مار (زار و مار) یارییەكە پێش چەندین سەدە لە هیند پەیدابوو. لەم یارییە هیندییە، هەر یەك لەمارەكان ئاماژە بە خراپەیەك (دزیكردن و درۆكردن) دەكات، و هەر قاڵدرمەیەكیش ئاماژە بە كارێكی باش ( ئارامی و خێر) دەكات. گەیشتن بە كۆتایی هێمایەكە بۆ گەیشتن بە بەهەشت. ڤێرژنی نوێی ئەم یارییە، ناوی " ئاوەڕۆ و قاڵدرمە" یە بەمەش كەم و كوڕی لەم رەهەندە ئەخلاقییەوە هەیە.

قسانەی کۆلۆنێلێکی خانەنیشکراوی نێو سوپای ولایەتە یەکگرتووەکان، لەکۆربەندێکی ئایین و ئاسایشدا کە لە واشنتۆن لەپاییزی ٢٠٠٤ دا وتبووی.

*لەیەکێك لە میحوەرەکان، پێویستیمان...بەگرتن و کوشتنی زۆرترین ژمارەی تیرۆریستانە و نیشاندانی ئەوەی کە ئێمە گەورەترین و خراپترین و بەهێزترین سوپاین لەجیهان، سوپایەك کەهیچ شتێك ناتوانێ ببێتە رێگر لەبەردەم راپەڕاندنی ئەرکەکانی..لەمیحوەرەکەیترەوە...جیاکردنەوەی ئەو کەسانەی کەبەدوایانەوە کەوتوونە، وایان لێبکەین ئەو شوێنەی کەبۆتە جێگای داڵدە و پاڵپشتیان ببێتە بناغەی تێکشکاندنیان. و هەروەها لەسەرمان پێویستە کار بۆ هەر دوو میحوەرەکە بکەین. پێویستە لەسەرمان شەڕ لەدژی ئیسلامییە توندڕەو و رادیکاڵەکانەوە بکەین... هەر لە ئەفریقیاوە تادەگاتە باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا و ناوەڕاست و باشووری ئەمەریکا، و هەروەها رۆژهەلاتی ئەوروپا.*

وای بۆدەچم زۆربەی ئەمەریکییەکان لەسەر ئەم قسانەوە کۆکن. لەوەتەی ٩/١١ وەیە بەشداری چەندین کۆبوونەوەم لەبارەی تیرۆریزم کردووە، تاوەکو ئێستا گوێم لەکەسێك نەبووە قسەیەکیتر جگە لەوەی ئێمەی ئەمەریکی پێویستە لەوەلامدانەوەکانمان رەق رەفتار نەبین، بلێ. و بەدڵنیاییەوە، ئەم دوو ئامانجەی کە لەلایەن کۆلۆنێلەوە دیاریکرابوو—سەرکەوتنی سەربازی و جیاکردنەوەی کەسانی شەڕان - زۆر بەتەواوی لەجێگای خۆیەتن. جیاکردنەوەی تیرۆریستەکان لە جێگای پاڵپشتیکردنیان زۆر کارێکی زەروریيە. بەلام چۆن ئەم کارە بکەین؟ بە شەڕکردن لەدژی "چەکدارانی توندڕەوی ئیسلامی" لەهەر شوێنێك کە بوونیان هەبێ؟ ئەمەش رێگایەکە بۆ ماندووبوونی سەربازانمان، زیاتر دوورخستنەوەی رای گشتی جیهانە بەرامبەر ئێمە، و هەروەها نوێبوونەوەی بانگەشەی ئەوەی کەوا ئێمە نیازمان دووبارە شەڕکردنەوەی خاچ پەرستییە. بەدڵنیاییەوە ئەم ئامانجە زۆر فراوانە.

ملیۆنان موسڵمانی چالاکی سیاسی هەیە کە بڕوایان بە تەفسیری زۆر تەسکی ئیسلام هەیە. لەوەیە زۆربەی ئەوانە دژی رۆژئاوایی بن و دوور لە ئایدیۆلۆژیای دیموکراتی لە بیرکردنەوەکانیان، ترساون لە بوونی ئەمەریکییەکان لەنێو خاکی عێراق، هەروەها دوژمنی ئیسرائیلن و پەرۆشی ئەوەن رۆژێك دابێ بۆچوونی ئەخلاقی خۆیان لەسەر ئەوانیتر بسەپێنن، بەلام ئەوان تەنها ئەگەر کارێکی تیرۆریستی بکەن یاخود ئاسانکاری بکەن دەچنە نێو قالبی تیرۆریستان. پێویستە لەسەرمان گفتوگۆ لەبارەی خاڵە ئایدیۆلۆژییە ناکۆکییەکانمان لەگەڵیاندا

بکەین، بەڵام حکوومەتەکەمان هیچ بانگکردنێکی نییە، تەنها بەسانایی لەسەر بناغەی باوەڕەکانی خەڵکەوە چەقی گرتووە، بۆ هێرشکردنە سەریان لە ڕێگای سەربازییەوە. هەروەك ئەوەی تەقەمان لە کۆمۆنیستەکان نەکرد لەبەرئەوەی کۆمۆنیست بوون، و هەرگیز ئاشتی ناناسین ئەگەربێتو بکەوینە نێو ئەم بیرۆکەیەی کەوا هەموو موسڵمانان ئەوانەی ڕەتی بیرۆکە سیاسییەکان دەکەنەوە وەك دوژمنی مرۆڤ سەیریان بکەین و حیسابیان بۆ بکەین. دوژمنی ئێمە ئیسلام نییە و شێوەکانی ئیسلامیش نییە، بەڵکو دوژمنەکە قاعیدە و شێوەکانیەتی. دەربارەی دروشمی پردەکان ئەویە کە سەربازانی ولایەتە یەککگرتووەکان گەورە و خراپ و تۆقێنەرن و لە" هیچ شتێکیش دەست هەڵناگرن"، ئەمەش ڕێگایەکی زۆر زەحمەتە بۆئەوەی بتوانێ قەناعەت بە بێدەنگی زۆرینەی موسڵمانان بکات تا ڕووبەڕووی تیرۆریستان ببنەوە. بەپێچەوانەوە، ئەم شێوازە یارمەتی تیرۆریستان دەدات بۆئەوەی پاڵپشتی لە دروشمەکەیان بکەن بەوەی شەڕ دەکەن لەپێناو "دەست هەڵنەگرتن لە هیچ شتێك".

شێوازی قاعیدە بۆ کاری تیرۆریستی ئەو کاتە لەناودەچێ ئەگەربێتو گوتاری سەرەکییان لەلایەن ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێی هەیە بەدرۆ بخرێتەوە. ناتوانین پێشبینی ئەوانە بکەین کە خۆیان وەك بەرگریکاری ئیسلام دادەنێن بۆئەوەی واز لەم دیمەنە خۆییە بێنن. هەرچەندە هیوامان وایە بتوانین قەناعەت بە زۆرێکیان بێنین کەوا هێرشکردنە سەر خەڵکی بێگوناه لەنێو پاس و شەمەندەفەر و فڕۆکەکان هۆیەك نییە بۆ بەرگریکردنی ئیسلام. وەنابێ ئەم پەیامە بە زەحمەت وەربگیرێت. کوشتنی سیڤیل و منداڵ و موسڵمانانیتر لەژێر ناوی ئیسلام تا ئەوپەڕی دووڕوویی و گومڕایی پێوە دەبینرێ. پەیوەندییەکان لەنێوان دابەشبوونی کلتوور تووشی لێکترازان هاتووە. بەگوێرەی دیراسەیەك کە لەلایەن وەزارەتی بەرگرییەوە سەرپەرشتی دەکرا، " کێشەی سەرەکی لە دیپلۆماسییەتی گشتی ئەمەریکا بەرامبەر جیهانی ئیسلامی " بڵاوکردنەوەی زانیاری " نییە، و تەنانەت داڕشتنی پەیامی " ڕاستی " و پێشکەشکردنیشی نییە. بەڵکو ئەمە کێشەیەکی بنەڕەتی باوەڕ بوونە " مصداقیە". هیچ ڕێگایەك نییە— ئەمڕۆکە ولایەتە یەگکرتووەکان هیچ کەناڵێکی کارکردنی پەیوەندیکردن نییە بۆ موسڵمانانی جیهان و ئیسلام.

ئایا چی وایکرد ئەم وێرانکارییە ڕوویدات؟ کاتێ کۆلۆنێل باسی لە هێرشکردنە سەر " ئیسلامییە توندڕەو و ڕادیکاڵەکان" ی دەکرد، لەپێشدا ئەم دڕاندانەی لەمێشکدابوو کە لەعێراق دەستیان بەخوێنی کەسانی بێگوناه سوور بووبوون. تووڕەبوونەکەی زۆر ڕوونە، بۆیە

ئێمـەش بەشـداری تیادەکـەین. سـەرکردە موسـڵمانەکانی جیهـان ئەوانـەی هەسـت بـە لێپرساوییەتی ئەم ئایینە دەکەن بەهەر شێوەیەك لەشێوەکان ئیدانەی ئەم کردە تیرۆریسـتیانە دەکەن. بەڵام زۆربەی موسڵمانانیش وەك منـداڵ و ئافرەتـان بەرێکـەوت لەئۆپەڕاسـیۆنەکانی سەربازی ئەمەریکی دەکوژرێن. ژمارەی پێشـبینیکراوی کـوژراوە سـیڤیلییە بێگوناهـەکانی لـەعێراق لەلایـەن سـوپای هاوپەیمانانـەوە لـە ٣٠،٠٠٠ تـا ١٠٠،٠٠٠ مەزەنـدە دەکرێـت. ئەگەربێتو ئەوانەش حیساب بکەین کە بەهەزارانیتر بریندداربوونە و ماڵیان تێکدراوە، ژیانیـان بەهۆی ئۆپەڕاسیۆنە ئەمەریکییەکانەوە کەوتۆتە باری هەڕەشەی مردنەوە، نابێ سەرمان سـوڕ بمێنێ لەو ئەنجامە تاڵانەی کەلە عێراقدا ئامادەکراون.

موسڵمانانیش ئەم مامەڵە خراپانەیان لەنێو مێشکدا هەیە کەبەرامبەر بەندییـەکانی نێـو عێراق و ئەفغانستان و گوانتانامۆی دەکرێ. ئەم ئابڕوچوونانەی کەبەرامبەر بەندییەکانی نێـو بەندیخانەی ئەبو غرێب یاخود لەهەر دەستبەسەرگرتنێکی ئەمەریکیدا هەیـە کـارێکی پاسـاو هەڵنەگرە. هەندێکیان گفتوگۆی ئەوە دەکەن کەئەم کارە وەحشیانەی کە بەدرێـژایی سـەدەکان ئەنجامدراوە هیچیان تۆمار نەکردووە، یاخود بە بـەراورد لەگـەڵ ئـەم کـارە تێکدەرانـەی کـە لەلایەن ڕێکخراوی قاعیدە و چەکدارە عێراقییەکانەوە ئەنجامدەدرێن. هەربۆیەش ئـەم هۆیـە کـە بۆچـی وەزیـری دەرەوەی ڤاتیکـان نـاوی لـەم ئابڕووچـوونەی بەندییـەکان بنـێ بـە " دوژمنداریەتی لەگەڵ خودا و کارێکی زۆر ترسناکتر بۆ ئەمەریکا لە هێرشەکانی ٩/١١".

باسکردنی ئەم مەسەلە ئازاردانانە زۆر ئاسانترە لەوەی بە پڕاکتیـزەوە بکـرێ. زۆربـەمان ئەوانـەی ڤێتنامیـان بەبیردێتـەوە بەهـەمان شـێوەش داواکارییـەکانی دەسـەڵاتدارییەتی ئەمەریکایان بەبیردێتەوە کەوا ڤێتنامی باکوور پێویستە پابەندبێت بە پەیمانی جنێڤ دەربارەی مامەڵەکردن لەگەڵ بەندییەکانی جەنگ. کەچی جیمی کارتەر مافەکانی مرۆڤی لە ئەولەویاتی حکوومـەتی ولایەتـە یـەکگرتووەکان دانـابوو، و هـەروەها وەزارەتـی دەرەوەش ڕەخنـەی لەحکوومەتەکانی دەرەوە دەگرت بەوەی بەنهێنییەوە ئەشکەنجەی بەندییەکانی خۆیـان دەدەن و ڕێگایان لێدەگرن لەپەیوەندیکردنیان لەگەڵ ڕێکخراوە مرۆییەکان. بەبۆچـوونی سـەرۆك بـۆش خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ بەندی لەگەڵ ئەو بەرنامەیـە نـاگونجێ کەلـە ئەمـەریکا پـەیڕەوی دەکـەین. بـەڵام واقیـع زۆر ئـاڵۆزترە. بەتایبـەتی دوای ڕووداوەکـانی ٩/١١ لێپرسـراوە ئەمەریکییەکان پەرۆش نەبوون بە پابەندبوونیان بە بەندە یاساییەکان، و هەروەها ڕای گشـتی ئەمەریکیش ئەمجۆرە کاریگەرییەی نەبوو. تووڕەبوونمان بەرامبـەر ڕووخـانی ئـەم دوو تـاوەرە

پرسیارێکی نادیاری هێنایە بەرهەم: ئێمە بۆچی ئازار ناخەینە سەر ئەو دوژمنانەی کە نیازی رووخاندنی ئێمەیان هەیە، بەتایبەتیش ئەگەر ئەم کارە بکەین لەوەیە زانیاریمان بۆ پاراستنی رۆحی خەڵکانی بێگوناه دەست بکەوێ؟ دوای هەموو ئەمانەش، دە ساڵ پێش ئێستا دەسەڵاتداران لە فیلیپین بەئاشکرا ئەشکەنجە و ئازاریان بەکاردەهێنا بۆئەوەی گومانباران ناچار بەقسەکردن بکەن و رێگابگرن لە روودانی فڕاندنی فڕۆکەکان. هەروەك کلتووری میللیی ئەمەریکی لەمێژەوە رێزی زۆری لە جۆری ئەم کارەکتەرانە گرتووە کە جۆن واین یاخود کلینت ئیست وود وێنەیان کێشابوو: کەسی شەڕانگێز ئەوەی کاری خراپە دەکات بەبێ رەچاوکردنی یاساکان باجەکەی دەدات.

لەساڵی ٢٠٠٥، پاڵەوانی زنجیرە درامای میللی (٢٤)، ئەشکەنجەی بەردەوامی بەکاردەهێنا بۆ دەستکەوتنی زانیاری بۆئەوەی ئەمەریکا لە دژی هێرشی تیرۆریستان بپارێزێ. لەم درامایەدا، کاتێ سەرۆك رەتی سەرپشککردنی ئەشکەنجەدان دەکات، وەك کەسێکی لاواز وێنەی دەکێشرێت. کاتێك پارێزەری مافی مرۆڤ نارەزایی دەربڕی، وەك کەسێکی شەڕانگێز نیشاندرا. دەنگەکان هەمووی تۆمارکراوە: ئەو کەسەی ئیهانە دەکرێت زۆر روونە کەسێکی شەڕانگێزبوو، زانیارییەکە تازە و باوەڕپێکراوبوو، کات لەسەرووی کارە جەوهەرییەکانەوەبوو، ئازاردراوەکە، کەسێکی، رێك و مەردانە دەهاتە بەرچاو، " تەنها هەڵساوە بەکاری خۆی". ئەگەر کاریگەری تەلەفزیۆن بەلاوە بنێین، زۆربەمان—ئەگەر لەگەڵ خۆماندا راستگۆبین—بەلایەنی کەمەوە دەتوانین خەیاڵی بارودۆخەکانی ژیانێکی راستەقینە بکەین بەجۆرێك بەکارهێنانی پێوانەییە زۆرەملێکان بۆ دەرکردنی زانیاری پاساوهەڵگر دەبێ.

لەوەتەی ٩/١١ وەیە، ئەم پرسیارە هۆشی زۆرێك لەپسپۆڕانی بواری ئەخلاقی و یاسای بۆخۆی راکێشاوە. پرۆفیسۆر ئالان دێرشۆویتز لە زانکۆی هارڤارد بانگەشەی ئەشکەنجەدان دەکات بەجۆرێك لەلایەن دادوەرەوە دەسەڵاتی پێدرابێ بۆ بەکارهێنان لەهەندێ کەیسی تایبەتدا[٢]. بوونی بۆچوونێکی ئاوا نابێ زۆر خۆمانی لێ بەدوور بگرین. ئەمەریکاش، وەك

(٢) دێرشۆویتز پاڵپشتی لە ئەشکەنجەدان ناکات. دەڵێ لەبڕی ئەوەی ئەشکەنجەدان بەکاربێت کە دەسەڵاتدارەکان لەهەندێ بواردا حەز بەبەکارهێنانی دەکەن، باشترە بۆیان لەچوارچێوەیەکی یاساییەوە ئەم حاڵەتە بەکاربێنن نەوەك لەدەرەوەی یاسا. لە *Los Angeles Time* نووسیبووی " ئەگەربێتو ئەشکەنجەدانمان هەبێ، دەبێ لەلایەن یاساوە ئەو دەسەڵاتەی پێدرابێ بۆ بەکارهێنانی".

زۆربەی وڵاتان، ئیدانەی ئەشکەنجەدانی کردۆتەوە. لەساڵی ٢٠٠٣ و ٢٠٠٤ لە یادداشتەکانی وەزارەتی داد ئەوە هاتبوو کە شەرعیەت بەبەکارهێنانی ئەشکەنجەدان دەدات، بەڵام هەرزوو ئیدارەی بۆش ئەم تەفسیرە تایبەتییەی جیاکردەوە و بەرامبەریەوە وەستا. بەشێوەیەکی ڕێسایەوە، زۆر بەتوندی بەرامبەر ئەشکەنجەدانەوە وەستاوین. بەشێوەیەکی ڕاستی، هێشتاکە هەستە ئاوێتەبوونەکانمان هەیە.

ئەمەیان بەس نییە. پێویستە لەسەرمان بچینە قووڵایی مەسەلەکە و باشتر بیری لێبکەینەوە. لەسەرەتادا، ژیانی ڕاستەقینە وەکو درامای (٢٤) نییە. کارێکی خەیاڵییە گەر بڵێین ئەشکەنجەدان بەشێوەیەکی گشتی هۆیەکی کاریگەرە بۆ دەستکەوتنی زانیاری ورد. ئەشکەنجەدان کاری خۆی دەکات بەڵام هەمیشە سەرکەوتوو نابێ. ناپلیۆن " دڵی بێ خوێن"، بەر لە دوو سەدە تێبینی ئەوەیکردبوو، " نەریتی بەربەرییەکان ئەوەبوو ئەشکەنجەی پیاوانیان دەدا ئەوانەی گومانی ئەوەیان لێدەکرا نهێنییان حەشاردابێ، بۆ درکاندنی ئەم نهێنییانە پەنایان دەبردە بەر لێدان و ئازاردان، کەچی سەرئەنجام هەموو هەوڵەکان بێ سوود دەمایەوە".

دووەم، هەروەك جۆن ماککین دەیووت، ئەم گفتوگۆیە لەبارەی دوژمنەکانمانەوە نییە کە هاوشێوەی ئەم چینەن، بەڵکو لەبارەی ئێمەوەیە.

ئەگەر ئەشکەنجەدان بە عەقڵانییەوە لێکبدەینەوە، یاخود هەڵوێردنێك بکەین بۆ ئەم بارودۆخە تایبەتییانە، هەموو کەسێك ئەم کارە دەکات. ئەو حکوومەتانەی بەشێوەیەکی ڕۆتینی ئازاری بەندییەکانیان دەدەن پەنجە بۆ ولایەتە یەکگرتووەکان درێژدەکات و داوای پاساوی لێدەکەن. هەڵوێستمان لەسەر سووربوونمان بەرامبەر مامەڵەکردنێکی مرۆڤانەی ئەمەریکییەکان بەرامبەر بەندییەکان ڕوو لە لاوازبووندایە. ئەمەریکا بەوە ناسراوە وەك وڵاتێکە کە ئازار و ئەشکەنجەدان خەڵکی تیا دەبینرێ یاخود کارئاسانی بۆ ئەوانیتر دەکات بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە. بۆ چ مەبەستێکەوە؟ بۆ زاڵبوون بەسەر تیرۆریستان؟ کاریگەرییەکە تەواو پێچەوانە دەبێ؟ گوانتانامۆ چەندین ئەندامانی چینی تیرۆریستی ساڵی ٢٠٠٢ ی لای خۆی دەست بەسەرکردووە لەسەر کاری تێکدەری جیاجیا، بەڵام لەساڵی ٢٠٠٦ ئەم ڕووبەرە فراوانتربوو. ئەم ناوەندە دەست بەسەرداگرتنە دەبوایە ماوەیەکی زۆر پێش ئێستا داخرابوایە. بەندیخانەی ئەبو غرێب، گەورەترین دیارییە بۆ ئەوەی بانگەشەکارانی قاعیدە لەخۆیەوە وەرگرێت.

ئەوەی لێرە جێگای سەرنجە ئەوەیە، زۆربەی ئەوانەی ئەشکەنجە و ئابڕوویـان دەبرێـت یـان کەسانی بێگوناهن و یاخود زانیارییەکی وا زۆریان پێ نییە کە شـایانی ئـەم ئازاردانـە بێـت. نیشانەیەکی واهەیە لەسەر پاسەوانانی ئەمـەریکی بـەوەی تـا ئەوپـەڕی تواناییـان ئـەم کـارە ناشرینانە ئەنجامدەدەن بۆ ئابڕوبردنی پیاوانی عەرەب لەبەرئەوەی توانایان هەیە و زۆرجـاریش بۆ خۆشی وەرگرتن ئەم کارە دەکەن. لەکاتێکدا زۆربـەی سـەربازە ئەمەریکییـەکان لەهـەوڵی دروستکردنی پردێکی لێك تێگەیشتن و هاوڕێیەتیدانە لەنێوان خۆیان و موسڵمانان، و هەروەها پاسەوانان و لێکۆلەرەوان—ئەوانەی ڕێنمایی دەبەخشن—نارەزایی و رق بەرامبەر کلتـووری عەرەبی و مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ نیشاندەدەن. هەر ئەم کردانەیە دەبێتە هۆی خراپترکردنی هەستی زۆربەی موسڵمانان کە ئەوان بوونەتە قوربانی و لەژێر حاڵەتی داگیرکردندانە.

بـۆ زۆربـەی ئێمـەی ئەمـەریکی سـەختە بگەینـە ئـەو بڕوایـەی دان بـەوەبنێین کەلـەم هەولآنەماندا تووشی هەڵەبووینە، بەڵام ئەم ئابڕووچوونانە هەڵەی زۆر گەورەنە ناکرێ بە چەند سـزایەکی سـووك بۆسـەر ئەوانـەی نزیکـی زنجـیرەی فەرمانـدەرەکان بوونـە بارودۆخەکـە چاکبکەینەوە. پێویستە کەیسەکە گەورەتر بکەین تا دەگاتە دەسەڵاتی گەورە. ئەگینا کارەکان زۆر مەحاڵ دەبێ بۆ هێورکردنەوەی ئەم تێگەیشتنە نێگەتیڤـەی کـە ولایەتـە یـەکگرتووەکان لەنێو مێشکی موسڵمانان دروستی کردووە. لەوکاتەی یەکەم وێنەی فۆتـۆی ئابڕووچـوونەکەی ئەبو غرێب بەدیارکەوت، چەندین نامیلکە و گۆڤار لەنێو کۆمەڵگاکانی عەرەبی دەسووڕایەوە تیایدا وێنە شەرم هەڵگرەکانی فەڵەستینییە مردووەکان و منداڵانی عێراقی تیان دەردەخست. لەمانشـێتی سـەر وێنـەکان دەخوێندرایـەوە " کـوا ئـەم پیاوانـە؟ کـێ تۆڵـەی کەڕامـەتمان دەکاتەوە؟" لەهەرێمێك کە یادگارییەکی زۆرم لێی هەیە، دەترسم لـەوەی ئـەم وێنانـە ببێتـە هەوێنی توندوتیژی دژی ئەمەریکی لەنێو زیهنی ئەم نەوەیەی کەدواتر دێنە دونیا.

بەگوێرەی ئەزموونی خۆم سەربازانمان  تووشی ماوەیەکی درێژی نائاسایی دەبنەوە بـۆ خـۆ رزگارکردن لە قوربانییە سیڤیلییەکان. لەهـەمان کاتـدا، سـەرکردە سیاسـییەکانمان دەتـوانن سوپایە چەکدارییەکانمان لـەم شـوێنانە بـلاوە پێبکـەن کەتیایـدا زۆرتـرین قوربـانی سـیڤیلی لێدەکەوێتەوە. ئەنجامەکە لە سـەرکەوتنێکی سـەربازی دەگۆڕێـت بـۆ زاڵبـوونێکی سیاسـی. هەروەکو ڤێتنام، لەوەیە لە رووبەڕووبوونەوەکان سەربکەوین، بەڵام لە شـەڕەکە بەگشـتی ئـەم سەرکەوتنە نەبێ. بەبێ ستراتیژییەتێکی سیاسی کاریگـەر، ولایەتـە یـەکگرتووەکان نـاتوانێ بەسەر قاعیدە زاڵبێت.

ئەم ستراتیژییەتەش پێویستە بە باوەڕەوە  (ثقة) دروستبێت. بن لادن و دواکەوتوانی هیچ شتێکی راستەقینەیان نییە تاوەکو بیبەخشنە خەڵکەکە. هێرشەکانی ٩/١١ مەودایەکی بینینیانی پێ بەخشی بەوەی ئەم گرووپە شایانی ئەوەنییە باس بکرێن گەربێتو بەردەوام نەبن لەم کارە تیرۆریستییانەی کە لەدژی ئێمەوە ئەنجامی دەدەن. ئەرکمان جەختکردنەوەیە لەسەر تیشك خستنە سەر ئەو رەتکردنەوە تەکفیری و کارە وەحشییانە و درۆیانە. ئەگەر بەم کارەی خۆمانەوە هەڵسین ئەوا لەکۆتاییدا دەتوانین ئەم پاڵپشتییە بەدەست بێنین کە ئاواتی بۆ دەخوازین. بوونی جێی باوەڕی پاساو نییە بۆ رازیبوون. دەبێ گفتوگۆی ئەم کەیسەمان بکەین تەنانەت لەبەردەم رەخنەگرترین و سەختترین گوێگران.

کۆمیتەی نیشتیمانی ولایەتە یەکگرتووەکان تایبەت بە هێرشەکانی ٩/١١ گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە:

> *بن لادن و تیرۆریستە ئیسلامییەکان بەتەواوەتی ئەوەی دەڵێن کە مەبەستیانە: بە بۆچوونی ئەوان، ئەمەریکا شەیتانی راستەقینەیە: سەری مارەکەیە"، و هەروەها پێویستە بگۆڕدرێت و لەناوبرێت. ئەم مەسەلەیە هەڵوێستێك نییە ئەمەریکا بتوانێ مامەڵەی لەگەڵ بکات و دانوسانی لەبارەیەوە بکات. هیچ ئەرزییەتێکی هاوبەش لەگەڵ ئەم رێکخراوەیە نییە—نەك تەنانەت رێزگرتن بۆ ژیان—بەجۆرێك دەستیش بکرێ بە دیلۆگ. تاکە شتێك هەیە ئەویش تەنها یان دەبێ بەتەواوەتی لەناوببرێت یاخود لێیەوە جیابیتەوە.*

کۆمیتەکە بەبێ هیچ گومانییەکەوە لە پێناسکردنی بن لادن و دواکەوتوانی زۆر راستگۆبوو وەك دوو توخمی چارەسەرنەکراو لەجیهاندا، و هێشتاکەش کۆمیتەکە ئەوەمان پێ دەڵێ کەوا ئەم بڕیارەی کە هێرشەکانی ٩.١١ ی پێ جێبەجێکرا بڕیارێکی گشتگیرنەبوو. ئەوە ئاشکراکراوە کە مەلا عومەر، سەرکردەی تالیبان، رەتی ئەوەی کردبۆوە هێرش بکرێتە سەر ئەمەریکا، چونکە لەتۆڵە سەندنەوە دەترسا. بەڕێوەبەری دارایی رێکخراوی قاعیدە پاڵپشتی لەهەڵوێستەکەی مەلا عومەر دەکرد. زانای ئایینی بەناوبانگی قاعیدە وتبووی هێرشکردن دژی ئایەتەکانی قورئانە. مامۆستای رۆحانی ئەبو مەسعەب زەرقاوی، سەرکردەی چەکدارە بیانییەکان لەعێراق، لەسەر مەسەلەی خۆکوشتن و کوشتنی سیڤیلە بێگوناهەکان تووشی پەیمان شکاندن هات لەگەڵ زەرقاوی.

ئەم جیاوازییانە لە بۆچوونەکاندا مانای وانییە رۆژئاوا بەدوای "دانوساندن" لەگەڵ قاعیدە بگەڕێت، بەڵکو مانای ئەوەدەدات کە لەنێو تۆڕە تیرۆریستییەکان بیروبۆچوونی جیاواز هەیە و پێویستیشە لەسەرمان هەموو هەوڵمان بخەینە گەڕ بۆ ئیستغلالکردنی ئەم هەڵوێستانە.

هەندێك لەو خەڵکانەی، لەوەیە زۆربەیان، کە ناونووسکراون وەك تیرۆریست لەدەرەوەی تێگەیشتنە لۆژیك و ویژدانییەکان بن، بەڵام بەپێی ئەو فێربوونەی کەکاتی خۆی لەکۆلیژ وەرمگرتبوو هەندێکیان وەك "کارەکتەری عەقڵانی" وەسف دەکرێن. ئەستەمە قەناعەتیان پێبینی کە کوشتنی کەسانی بێ چەك و بێگوناهـ لەئیسلامدا سەرپێچیکردنە لەوەی بەرگریکردبێت، یاخود بۆیان سەختترە بە بەجێهێشتنی خێزان و هاوڕێکانیان، وەیان لەوەیە بەشێوەیەکی سەرەتایی لەلایەن ئامانجە ناوخۆیەکان و بەرژەوەندییەکانەوە هانبدرێن بۆ قسەکردن لەسەر ولایەتە یەکگرتووەکان و تەواوی رۆژئاوا. تەنانەت هەندێکیان هەستەوەرن بۆ پێشکەشکردنی کار و سوودمەندییە مادییەکان. ئەمەش بەهیچ جۆرێك یارمەتیمان نادات بۆئەوەی مامەڵە لەگەڵ تۆڕەکانی تیرۆریستان بکەین وەك رێکخراوێکی هەمیشە نەگۆڕاو. وەکو گرووپەکانیتر، لەو کەسانە پێکدێن کە بەبێ شەڕکردن وازناهێنن. لە ساڵی ٢٠٠٢ لە ولاتی یەمەن، بیرمەندانی ئیسلامی تەحەددای بەندییەکانی قاعیدەیان دەکرد و لەژێر رووناکی قورئان گفتوگۆیان لەگەڵ کردن ئەوەبوو توانییان قەناعەت بە نزیکەی ٣٥٠ کەسیان بێنن و ئامادەیی خۆیشیان نیشاندا بۆ هاریکاریکردنی دەسەلاتی یەمەنی. دادوەر حمود حیتاری، خۆی ئەم هەوڵانەی دابوو، دەیووت، "ئەگەر تۆ تیرۆریزم لەجیهان بخوێنیتەوە، ئەوکات دەزانی تیۆرێکی زۆر فیکری لەدواوەی ئەم تیرۆریزمەدایە، هەموو ئایدیایەکی فیکری دەتوانرێ بە فیکریەکیترەوە شکست بخوات". لەلایەکیترەوە، ئایدییەکی باش باشترین رێگایە بۆ زاڵبوون بەسەر ئایدییەکی خراپ.

لەو روانگەیەی کە ئیسلام پێگەیەکی بەناوبانگی لەنێو یاسادا هەیە. لەساڵی ٢٠٠٥ لە عەممان نزیکەی ١٨٠ زانای موسڵمان لەنێوان چل و پێنج ولاتەوە ( لەنێوانیشیاندا ولایەتە یەکگرتووەکان) کە نوێنەرایەتی هەشت قوتابخانەی فیکرییان دەکرد کۆنفرانسێکیان سازکرد لەژێر ناوی " ئیسلامی راستەقینە". مەبەستیان بێ بایەخکردنی پەرۆشی ئەوانەبوو کە فتوا دەردەکەن بێ ئەوەی شایستەی ئەم کارە بن و یاخود لەلایەن ئایینی ئیسلامەوە رێگایان پێدرابێ، و هەروەها ئەوانەی کە بەدوای پاساو هێنانەوە دەگەڕێن بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی لەدژی موسڵمانانیتر حیسابکردنیان وەك کەسانی هەڵگەڕاوە لەم ئایینە. زانایە موسڵمانەکان

بەدوای ئەوەدا دەگەڕان بۆ گۆڕینی ئەو زیّدەڕۆیانەی کە لەلایەن تیرۆریستانەوە لەدژیانەوە ئەنجامدەدرێن، و هەروەها بەکارهێنانی یاسا ئیسلامییەکان بۆ ئەم کارانەیان بەجۆرێك بۆشاییەکی فراوان هەیە لەنێوان نیشاندانی مەبەستە پیرۆزەکانیان و کارە نا پیرۆزییەکانیان. لەکۆتاییدا، گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی، کەئایا بەمجۆرە تیرۆریزم شکست دەخوات، بەهۆی یەککگرتنەوەی موسڵمانە راستەقینەکان بۆ پاراستنی ئیسلام لە هەموو بکوژەکان ئەوانەی هەوڵی دزینی ئەم ئایینە دەدەن.

ڕووبەڕووبوونەوەی قاعیدە پێویستی بەتەواوی کەرەستەکانی سیاسەتی دەرەوە هەیە، لەنێوانیاندا دەزگا هەواڵگرییەکان و سەربازانمان. بێگومان کاتی خۆی دادێ بۆ دەستنیشانکردنی پێگەی تیرۆریستان ئینجا ئەوکات سوپایەکی بەهێز بەکاردەهێنرێت بۆ لەناوبردنیان. هەڵە دەکەین گەر باوەڕمان وابێ تیرۆریزم بەدەرەجەی یەکەم هەڕەشەیەکی سەربازییە. ئەگەر وابوایە، ئەوا ماوەیەکی زۆربوو لەناوچووبووین. لەبەرئەوەی ئەمەیان بەرەنگاربوونەوەیەکی سیاسی و دەروونییە و پێویستیشە بە هەمان هۆکاری سیاسی و دەروونی رووبەڕووی ببینەوە. هیچ شتێك نییە بۆئەوەی ولایەتە یەککگرتووەکان بەکاری بێنێ بۆ کەمکردنەوەی ئەم رقەی کە عەرەب و موسڵمانان هەستی پێدەکەن، بەڵام ئەوەش زەروری نییە بۆ گۆڕینی بیرکردنەوەی هەر تاکێك.

بەگوێرەی وتەکانی ڤاکلاڤ هاڤڵ، " کۆمۆنیزم بەهۆی هێزی سەربازییەوە نسکۆی نەهێنا، بەڵکو بەهۆی ژیانەوە بوو، بەهۆی رۆحی مرۆڤ، بەهۆی ویژدان، بەهۆی بەرگەگرتنی بوون و یاریکردن بە مرۆڤەکانەوە بوو". بەمانایەکیتر، شکست خواردنیان، لەبەرئەوەبوو ئەوانەی بەرهەڵستی ئەوەیان دەکرد گوایە کۆمۆنیزم دەتوانێ ژیانێکی باشتر بێنێتە بەرهەم و هەموو درۆ و شکستەکان دەردەخات. لەوەیە تیرۆریستان جارجار بتوانن لەهاتنە ژوورەوەی ئەم بەربەستانەی کەبۆ پاراستن لێیانەوە دروستکراون سەربکەون. بەڵام هەرگیز ناتوانن سەربکەون تاوەکو رێگایان پێنەدەین بۆجیاکردنەوەی ئەم بەهایەی کە بۆماوەیەکی درێژ کلیلی سەرکەوتنی ئێمە و نسکۆی ئەوانی هەڵگرتووە.

کۆتایی هاتنی جەنگی سارد لە تەلەفزیۆن نیشاندرا. ئەوکاتەی لە ئۆفیسەکەم دانیشتبووم، دەمبینی قوتابیان لەخۆشی رووخانی دیواری گەورەی بەرلین سەمایان دەکرد، و ئاهەنگیان بەبۆنەی ئەم پایتەختە نوێیە ئازادانەی نێو ناوەند و رۆژهەلاتی ئەوروپا دەگێڕا. من بەتایبەتی ئەو کاتە خۆشەم بیردێتەوە، لەودیمەنەی کەلە چوارڕیانی وێنسێسلاس لە براغ، ئەو

شوێنەی ڤاکلاڤ هاڤڵ و هەندێ پاڵەوانیتری "شۆڕشی قەدیفە" ئەم داوەتنامـەیان قـەبووڵکرد بە پێشڕەویکردنی چیکۆسلۆڤاکیا تاکاتی سەربەخۆیی و ئازادی. ئەوکات بەخۆمم وتم "ئائـەو کاتەیە کە چاوەڕوانمان دەکرد، سوپاس بۆ خودا".

ئایا چۆن ڕووبەڕووبوونەوەکانمان لەگەڵ تیرۆر کۆتایی دێت؟ زۆر بە جیایی، هەروەك یەکێك ئەو گریمانەیە دادەنێ. لەوەیە ڕووداوی زۆر سەرسوڕهێنەر هەبێ. لەوەیـە کـاتی ئـەوەبێ لـەم کتێبەدا دەستگیرکردنی یاخود مردنی بن لادن بلاوبکرێتەوە. لەعێراق، لەوەیە زەرقاوی ببێتـە هەواڵی دوێنێکە. بێگومان، کاری هێرشکردن و دەستگیرکردن و شکست خواردن بـەردەوامی دەبێ. پێناچێ، بۆنەیەکی هاوشێوەی چوارڕیانی وێنسێسلاس ببیـنین. گومـانم هەیـە لـەوەی ڕۆژێك دابێ کەناڵی تەلەفزیۆنەکـەمان بگـۆڕین و بڵێـت، " ئائـەو کاتەیـە کـە چـاوەڕوانمان دەکرد". لەخراپترین حاڵەتدا، گەواهیدەری هێرشە یەك لەدوای یەکەکان دەبین ( لەوەیە چەکی بایلۆژی و ئەتۆمی تیایدا بەکاربهێنرێت) لەدژی ئەم لیستە فراوانەی ئامانجەکان. شوێنی زۆرتر دەبینین لەتەواوی ولاتاندا کەبۆتە پێگـەی حەواندنـەوەی توندڕەوەکان. ئێسـتاکەش دەبیـنین ئیسلام بۆتە دووبەش لەنێوان ئەو کەسانەی کە بەئاشتیانە پەیڕەوی ئەم ئایینە دەکەن و لەگەڵ ئەو کەسانەی کەوا مێشك و زیهنی خۆیان بە ڕقهەڵگرتنی کەسانی دەوروبەر ژەهراوی کردووە.

بەڵام لەباشترین حاڵەتدا، پێچەوانەکەی دەبیـنین: بەکەمکردنـەوەی ژمـارەی هێرشـەکان، تەسککردنەوەی ئەو شـوێنانەی کـە بوونەتـە داڵـدەی تیرۆریسـتان، و هـەورا نزیکبوونـەوەی ڕیزەکانی لەنێو ئایینی ئیسلام. ئەگەر ئەوانە ڕوویدەن، ئەوا ڕووبەڕووبوونەواکانمان بەبێ ئەنجام کۆتـایی پێـدێت. بـن لادن و جێنشـینەکانی هەڕەشـە وێنەیـەکیان تۆمـارکرد بەمەبسـتی ڕووخاندنی ئێمەوەبوو، وەهیچ لایەنێك ئەم وێنەیەی بلاونـەکردەوە چـونکە تیرۆریسـتان هـیچ پاڵپشتییەکی ئاشکرا و جەماوەرییان نییە. ئایا تاوەکو ئێستا گەیشـتووینەتە ئـەم قۆناغـە؟ وەڵامـی ئـەم پرسـیارە هـەنگاو بەهـەنگاو ڕوون دەبێتـەوە و بناغـەی لەسـەر ڕووداوەکـانی شوێنەکانی دەرەوە دەگرێت و درێژدەبێتەوە بۆ ئەرخبیل مالایۆ بۆ چیاکانی قەوقاس لەوێشەوە بۆ باکووری ئـەفریقیا. لەهەمووشـیان گـرنگتر جیهـانی عەرەبییـە، کەتیایـدا ئیسـلامی لێ لەدایکبووە، و هەروەها لەنێو ئەم جیهانەدا، کە پاشایەتی عەرەبی سـعودیە کـە گـەورەترین ئاڕاستەی ئەم ئایینەیە.

## (١٤)

# کێشەی عەرەبستانی سعودی

لە هاوینی ٢٠٠٤ یـەکێك لـە عەرەبـەکانی سـعودیە دەیـووت، " زۆر دەترسـێم، نـازانم ئاڕاستەی وڵاتەکەم بەرەو کوێ هەنگاو دەنێ. دەمانەوێ پێشـکەوین، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا دەشمانەوێ وەك موسڵمانە چاکەکانی پـێش ١،٤٠٠ سـاڵ بـەر لـە ئێسـتا بـژین. دەمانـەوێ گۆڕانکاری دەست پێبکەین، کەچی گۆڕانکاری ڕێگای جەهەنەمان پێ دەناسـێنێ. دەمانـەوێ خەڵکانێك هەبن پێشڕەوی وڵات بکەن و بەڕێوەی ببـەن، کەچـی حـەزیش بـە دیموکراسـییەت ناکەین. دەمانەوێ دەرگای دیالۆگ لەگەڵ ڕۆژئاوا بکەینەوە، کەچی زانا ئایینییەکانمان هەموو ڕۆژانی هەینی پێمان دەڵێن هەموو ڕۆژئاوا و خەڵکانی نا موسڵمان دەچنە جەهەننەم".

دامەزرێنەر و یەکگەرەوەی عەرەبستانی سعودی مۆدێرن، پاشا ئـیبن سـعود، لەسـەرەتای سەدەی بیستەم ئەوەی ڕاگەیاند" پاشایەتی من هەر بە زینـدوویی بـەردەوام دەبـێ، وڵاتێکـە دەستکەوتنەکانی زەحمەتە بۆیە دەمێنێتەوە، ئەو شوێنەیە کەوا دوژمن هـیچ مەبەسـتێکی نابێ تیایدا بەدی بێنێت جگە لە دەرچوونی لەم وڵاتە نەبێ". یەکێك لە وتەبێژەکانی خێزانـی شا سعود لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا ئـەوەی ئاشـکراکرد بـەوەی جـەختی لەسـەر وڵاتەکەی دەکردەوە: " ئێمە ناتوانین تەنها تەماشـاکەر بـین لەکاتێکـدا بـاقی جیهـان بـەرەو سیستەمی نوێی گلۆبالییەوە بەرەو پێشدەچن".

لەوەتەی هێرشەکانی ٩/١١ ڕوویانداوە، بەهایەکی بچووکی کتێبخانەی کتێب و وتارەکـان بەدیارکەوتوونە، لە ڕۆژئاوا دەنگۆی ئەوەیان دەکرد کە عەرەبسـتانی سـعودی شـەڕانگێزە— شوێنی لەدایکبوون و ناندەر و بانکی تیرۆرە کە بەناوی ئیسـلامەوە ئەنجامـدەدرێن. هـەروەك ئیقتیباسەکانی سەرەوە پێشنیاری ئەوە دەکەن، زاراوەیەکی تەواو گونجاوتر بـۆ " شـەڕانگێز" لەوەیە " شێواو" بوو بێت.

هیچ وڵاتێك هەوڵی ئەوەی نەدایە هەنگاو بۆ چەرخی مۆدێرن بهاوێژێ خێراتـر لـە وڵاتـی عەرەبستانی سعودی. هەندێ وڵات هەنە کەمتر ئەم هەوڵانەیانداوە. کلتووری سعودی بـەهۆی

وەهابیزمەوە زۆر کاریگەربووە، بزووتنەوەیەکی سوننی پیوریتانە کەلەسەدەی هەژدەمەوە سەریهەڵداوە زۆر بەتوندیش لەم وڵاتە جێگای خۆی قایمکردووە، لەوکاتەی ماڵی ئال سعود دەستیانگرت بەسەر نیمچە دوورگەی عەرەبی لەساڵانی (١٩٢٠) ی سەدەی رابردوو. پشتیوانانی رێبازی وەهابی گەڕان بەدوای دووبارە گەڕانەوەی ئەوەی خۆیان ناویدەنێن ئیسلامی پاك و راستەقینە[١]. وەهابییەکان جل و بەرگی نیشتیمانیان بەسەر خەڵکەکە سەپاند—جلی سپی بۆ پیاوان و جلی رەش بۆ ئافرەتان—قەدەغەکردنی مۆسیقا، بەتاڵکردنی وڵات لە کلتووری جیاواز و زۆرینەی هەرێمی. ئەنجامەکەی زۆر بە رەقی کۆنتڕۆڵی کۆمەڵگایانکرد بەجۆرێك شوێنە گشتییەکان کەوتنە ژێرچاودێری توندی پۆلیسی ئایینداراەوە، هەروەها ئەو شوێنانەی کەتیایدا خۆشەویستی تیایدا نیشاندەدرێت (تەنانەت خۆشەویستی خێزانیش بێت) قەدەغەکرا، سەماکردن دوورە لەیاسا، هەروەها رێگەگرتن لەئافرەتانی شار بۆ لێخوڕینی ئۆتۆمبێل. ناسنامەی پادشایەتی نێوەندی رەوشە هەنووکەییەکەی گرتووە وەك خزمەتکار و چاودێری سەرەکی مزگەوتی پیرۆز لە شاری مەککە، ئەو شوێنەی کە پێغەمبەر محەمەد تیایدا لەدایکبووە، شاری مەدینە، ئەو شوێنەی تیایدا نێژراوە. ئەو رەوشە شانازییەك دەبەخشێ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا جەختکردنەوەیەکە بۆ گونجاندن. لەم شوێنە پیرۆزەدا پەرستن بۆ موسڵمانە شیعەکان زۆر سنووردارە (مقید)، هەروەها بۆ کەسانی ناموسڵمان تەنانەت چوونە ژوورەوەشیان بۆ نێو ئەم شوێنە پیرۆزە قەدەغەیە. هەرزەکارانی ناموسڵمان تەنانەت ناتوانرێ لەسەر خاکی سعودیەش بنێژرێن. سەدا نۆهەتی ئەو کتێبانەی بڵاودەکرێنەوە لەچوارچێوەی ئەم پادشایەتییە پەیوەندییان بە ناونیشانی ئایینییەوە هەیە، و زۆربەی هەرە زۆری دەرچووانی زانکۆ بڕوانامەکانیان لەدیراساتی ئیسلامییەوە وەرگرتووە. ئەم وڵاتە هیچ دەستوورێکی نووسراوی نییە جگە لە قورئان نەبێ[٢]. مەبەستە نموونەییەکەیان

---

(١) لەبەرئەوەی زاراوەی (وەهابی) هەندێ مانای نێگەتیڤ دەدات، هەندێك بەکاربەر پێیان باشترە ناوی بنێن "سەلەفییەکان"، ئەو دواکەوتووانەی کە بەدوای مۆدێلێك دەگەڕێن بۆخۆیان، کەلەدوای نەوەی سێیەمی موسڵمانانەوە هاتوون.

(٢) لەساڵی ١٩٩٢، سعودیەکان " یاسای بنەڕەتی حکوومەتیان" دانا کەلەهەندێك رووەوە هاوشێوەیی دەستوورە.

ئەوەیە ئەم وڵاتە دەبێ ببێتە دورگەیەکی پاك، جیابکرێتەوە و دووربێت لەئاوێتەبوونی کارو نەریتی خراپەی ڕۆژئاوا.

عەرەبستانی سعودی بۆتە یەکێك لەو چوار وڵاتانەی لەریزبەندی یەکەمی جیهانی دێن بۆ دەرهێنانی نەوت، هەرئەمەشە ئەم وڵاتە وای لێکردووە ببێتە یەکێك لەو وڵاتە دەوڵەمەندانەی کەپەیوەندی پتەویان هەیە لەگەڵ وڵاتە پیشەسازییەکانی جیهان. ئەم نەوتە پێوانەیەکی باشی سەروەت و سامان دەبەخشێ، لەساڵانی ١٩٧٠ نرخی نەوتەکە بووە هۆی چەندجارکردنی سامانی دەوڵەمەندانی سعودی. گەورە بازرگانانی ڕۆژئاوا، پەرۆشن بۆ کارکردن لەگەڵ ئەم وڵاتە، بەڵێننامەی چەندین ملیار دۆلار لەگەڵ عەرەبستانی سعودی واژوو دەکەن بۆکاری تەکنەلۆژیا و ئاوەدانکردنەوە و کاری خزمەتگوزاری. کاتێ نرخی نەوت لەبازاڕەکانی جیهان بەرزدەبێتەوە، شازادەکانی سعودی بەجوانترین ستایل جل دەپۆشن، هەروەها خێزانەکانیشیان ( ژنەکانیان) بە پۆشاکی مۆدەوە دەردەکەون. نزیکەی بیست ساڵ پێش ئێستا، لەوەیە شازادەیەك لەخانووێکی قوڕاوی بێ فیزی چۆڵەوە ژیانی بەسەر ببردبایە. کەچی لە چەرخی ئێستادا هەمان شازادە لە کۆشکێکی بەرز دانیشتووە، بە نوێترین مۆدێلی ئەساس و کارەباییەوە کۆشکەکەی ڕازاوەتەوە، دەوروبەریشی بە دیواری بەرز دەورەدراوە.

شۆڕشی ئێرانی ١٩٧٩ هەڕەشەی تێکدانی ئەم پارچەیەی دەکرد. ئەوکاتەی دەسەڵاتی گرتە دەست، ئایەتوڵا خومەینی بانگەشەی ڕاپەڕینی سەرتاسەری لەدژی حکوومەتی سعودیەکرد، بەجۆرێك خومەینی وەسفی ئەم حکوومەتەی بە "نا ئیسلامی " دەکرد. ئەم هەڕەشەیە لە نۆڤەمبەری هەمان ساڵ بووە ڕاستی ،کاتێك چەکداران هەڵسان بە بارمتەگرتنی مزگەوتی گەورەی مەککە. یاخیبووان دروشمی ئەوەیان ڕادەگەیاند کەوا خێزانی شاهانە گەندەڵن و داوای پاشەکشێیان لەدەسەڵات لێدەکردن. دوابەدوای سێ هەفتە، هێزی ئاسایشی سعودی هێرشێکی زۆر وردیان ئەنجامدا، سەرئەنجام بووە هۆی کوشتنی ژمارەیەك لە چەکداران و دەستگیرکردنی ئەوانیتر، کەلەدواتر لەسێدارەدران. لەپاشان حکوومەت دامەزراوە ئایینیەکانی وەرگرتەوە و کۆنترۆڵێکی توندی لەسەردانان، دەسەڵاتێکی زۆری بە پۆلیسەکان دا بۆ چاودێریکردنی ئەم شوێنانە لە هەڵسوکەوتی میوان و هاووڵاتیاندا. یاسای کۆمەڵایەتی سعودی زیاتر سنوردارتربوو، لە بەهێزکردنی توخمە کۆنزەرڤاتییەکانی نێو کۆمەڵگا. ئەم ڕووداوانە لەلایەن زانا و توێژەرە توندڕەوانەی لە سوریا و مصر هاندەدران و یارمەتیدەدران، بەجۆرێك ئەم وڵاتانە ( سوریا و مسر) نەیارەکانیان لەحکوومەتەکەی خۆیان دووردەخستەوە،

کەچی ئەمانیش لەگەڵ خۆیاندا چەندین رادیکالیزمی ئیسلامی دەهێنن کە زۆر چالاك و سیاسیترن لە ئەجیندای تەقلیدی وەهابییەکان.

لەم کاتەشدا، نرخی بەرزی نەوت، عەرەبستانی سعودی گەیاندە ئەوپەڕی خۆشگوزەرانی. لەکۆتاییەکانی سالآنی ١٩٨٠ هەر هاووڵاتییەکی سعودی لە پێداویستییەکانی تەندروستی و پەروەردە ئازادبوو. هەر دەرچوویێکی زانکۆ، نێر یان مێ، شایستەی ئەوەیە ٥٠،٠٠٠ دۆلاری پێببەخشرێ بۆ دەست پێکردنی بزنسێکی سەرەتایی. هەر کەسێك دەگاتە تەمەنی هەرزەکاری پارچەیەك زەوی پێدەدرێت لەگەڵ ٨٠،٠٠٠ دۆلار بەقسیت بۆ دروستکردنی خانوو. ئاو و کارەبا بەبێ بەرامبەر بە خەڵکەکەی دەدرێت. سعودییەکان و راوێژکاران پێشبینی کۆتایی هاتنی ئەم کاتە خۆشانەیان دەکرد. ئەم وڵاتە بەهۆی شکست خواردنی بۆ پلان دارشتنی پێشینە و ئەو هاووڵاتییانەی کە ماڵ و سەروەتیان بەبەلاش سەرف دەکەن نزمبوونەوەی بەخۆیەوە بینیوە.

لەنێوان سالآنی ١٩٨١ تا ٢٠٠١ دانیشتوانی سعودیە زیاتر لە دووئەوەندەی لێهات. ئەگەر ئافرەتانی سعودی بەردەوامبن لە نانەوەی منداڵ ( حەوت منداڵ بۆ هەر یەکێك) ئەوا دووبارە دانیشتوانیان لەساڵی ٢٠٢٠ دەبێتە دوو ئەوەندەی ئێستاکە. کاتێ ئەم هەموو گەنجە بەدوای کاردا دەگەڕێن، بێگومان هەندێکیان تووشی بێ ئومێدی دەبن لەپەیداکردنی کار. رێژەی دانەمەزراندنی فەرمانبەران سەدا ٢٠٪ بەرزبۆتەوە لەکاتێکدا رادەی بەرهەمهێنان نزم بۆتەوە بەبەراورد لەماوەی چل ساڵی رابردوو. دەستکەوتەکانی نەوتی وڵات بۆ هەرتاکێکی سعودی لەساڵی ١٩٨٠، ٢٢،٠٠٠ دۆلاری ئەمەریکی بوو، ئەم رێژەیە کەمبۆوە بۆ ٤،٠٠٠ دۆلار لەساڵی ٢٠٠٤ لەگەڵ ئەوەی نرخەکانی نەوت بەرزبۆتەوە. شارە رووناکەکانی سعودیە دەڕوانێتە سەر شارەکانی شوێنەکانیتر، هەروەها بەهۆی دراوسێیە پیسەکان و قەرەباڵغی بینایەکان تارادەیەك تێك شێواون.

لەکاتێکدا فشارە کۆمەڵایەتییەکان بەرزدەبێتەوە، جیاوازی نێوان ستایلی ژیانی رۆژئاواییەکان و ئیسلامی بۆهەموو لایەك روون دەبێتەوە. دیاردەی نوێی پەیدابوونی سەتەلایت و تەلەفزیۆن و کۆبوونەوەی ئازارەکانی عەرەب و موسڵمانان، بۆتە جێگای گرنگیدانی سۆزەکانی دژە رۆژئاوایی. لەسالآنی ١٩٩٠، هێزەکانی سەربازی ئەمەریکی لەنێو ئەم پادشایەتییەدا جێگیربوون بۆ رێگەگرتنی سەددام حسێن لەدووبارە داگیرکردنەوەی وڵاتی

کوێت. ئەمەش بووە مایەی شکاندنی پیرۆزی ئەم شوێنە کەلەلایەن بن لادن و قاعیدەوە بەمجۆرە لێکدەدرایەوە.

بەیەکگەیشتنی ئەم فاکتەرانە خوێندنەوەیەکی نوێ دەبەخشێ لەدوای ٩/١١ وە. لەپرێکا، عەرەبستانی سعودی—ئەو شوێنەی کە چواردە لەکۆی نۆزدە رفێنەرانی هێرشەکەی ٩/١١ لەم جێگەیە لەدایکبوونە—چیتر لەگەڵ ستریۆتایپی کۆمەڵگایەکی دەوڵەمەند و رێکخراو نەدەگونجا. لەوکاتەوە ماڵی ئال سعود لەهەموو سایدەکانەوە کەوتنە ژێر گەمارۆ. لەکاتێکدا هەندێك لەرۆژئاوا خێزانی شاهانەیان بە پاڵپشتیکردنی قاعیدە تۆمەتباردەکرد، لەوکاتەشدا قاعیدە ئیدانەی ئەم کارەی سعودیای دەکرد بەوەی هاریکاری نهێنی و دوور لەدڵسۆزی لەگەڵ رۆژئاوا دەکات. قاعیدە دەڵێ پادشایەتی سیستەمێکی نایاساییە، وتارەکانی سەرۆك بۆش لەبارەی گۆڕین و دیموکراتیکردنی رۆژهەڵاتی ناوین، گەربێتو وەك دەرئەنجامێکی لۆژیکی وەربگیرێت، هەمان پرسیار دەخاتەڕوو. لەڕووی ناوخۆییەوە، ئەم رژێمە رووبەڕووی فشاردەبێتەوە بۆ کرانەوەیەکی فراوانی سیاسی لەلایەن ئەو ئافرەتانەی کە هیچ مافێکی سیاسیان نییە، رۆشنبیرە خاوەن ئەقڵە ریفۆرمەکان، کەمایەتییە شیعەکان، هەروەها گەنجە هاننەدراو و نارازییەکان. توخمە ئایینییە کۆنزەرڤاتییەکان شەڕ لەدژی هەر گۆڕانکارییەك دەکەن کەببێتە مایەی کەمکردنەوەی کاریگەریەکەیان. زۆربەی زۆری هاووڵاتیان حەز بە دەنگێکی بەرچاوتردەکەن لەچۆنیەتی، یاخود بۆ بەرژەوەندی کامەلایەنە ئەم وڵاتە بەڕێوەدەبردرێت.

حکوومەتی سعودی بەبێ ئەوەی ئاگای لێبێت خۆی لەنێو گۆڕەپانی میندا دۆزیوەتەوە. بۆئەوەی خۆی لەم نێوەندەدا بهێنێتە دەرەوە، پێویستی بەوەدەبێت ئەو زانا ئایینیانە لەخۆی جیابکاتەوە کە بۆچوونێکی لۆژیکی دەبەخشنە تیرۆریزم. پێویستە دەستبکات بە مۆدێرنکردنی لایەنە ئابووریەکەی، هەروەها فەراهەمکردنی سەدان هەزار کاری نوێ، هەروەها چاوپێخشاندنەوەی هەڵوێستی بەرامبەر بەئافرەتان. پێویستە وەڵامی کاریگەر بداتە رەخنەگرانی رۆژئاوا بێ رازیکردنی بانگەشەکانی قاعیدە بەوەی پەیوەندی عەرەبستانی سعودی زۆر نزیکە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا. ئەمانە هەمووی سیستەمێکی درێژە بۆکۆمەڵگایەك کە زۆربەی سەرکردە باڵادەستەکانی لەتەمەنی حەفتا تا هەشتا ساڵیدانە هەروەها گەورەکراون بۆ چاوەڕوانکردنی ژیانێکی نیمچە جیاواز کە بناغەی لەسەر نەریتی کۆن و راستەقینە ساکارەکانەوە چەقی گرتووە.

ئایا حکوومەتی عەرەبستانی سعودی بەرپرسیارە لەڕووداوەکانی ۹/۱۱؟ نەخێر. ئایا عەرەبستانی سعودی هاوپەیمانیەتی هەیە لەگەڵ قاعیدە؟ بێگومان نەخێر. ئایا ئەمە پێشنیازەکی شووم نییە بەوەی گوایە گرووپێکی سعودی چەند رۆژێك دوای ۹/۱۱ بە فڕۆکەیەکی تایبەتەوە ولایەتە یەکگرتووەکانیان جێهێشتووە؟ نەخێر بەگوێرەی کۆمیتەی سەربەخۆیی ۹/۱۱، تیایدا هاتووە هەموو ئەو گەشتیارانەی کە دوای ۹/۱۱ گەشتیانکرد لەلایەن نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدرالی (FBI) بە شاشای گەورە وێنەیان نیشاندەدرا کە "هیچ کەس نەناسرایەوە کە پەیوەندی هەبوبێ بە تیرۆریزم، و بەم فڕۆکانەوە ئەمەریکای جێهێشت بێ". سەرکردەکانی سعودی خۆپارێزن، رادیکاڵ نین، لەسەرووی هەمووشیانەوە، خەڵات بۆ سەقامگیری دەبەخشن. پەیوەندی نێوان کلتووری سعودی و قاعیدە دەوەستێتە سەر ئەم پرسیارەی ئایا ئەم حکوومەتە کەوتۆتە داوی تیرۆریزمەوە. هۆکارێك بۆ لێدانی ئەو زەنگە ئەویش ئەو بوارەیە کە پارەی تایبەتی سعودی یارمەتی دارایی کردە تیرۆریستییەکان دەدات. دووەم هۆکار ئەوەیە ئایا سەرکردە سعودیەکان بەبێ بوونی بەڵگە باوەڕیان بە رۆڵی د. فرانکشتاین کردووە، بەدروستکردنی دڕندەیەك بەجۆرێك خۆیشیان نەتوانن کۆنترۆڵی بکەن.

لەساڵی ۱۹۸٦، شا فەهدی عەرەبستانی سعودی بەفەرمی ناونیشانی خۆی گۆڕی لە " خاوەن شکۆ" بۆ "خزمەتکاری هەردوو مزگەوتە پیرۆزەکە" (خادم الحرمین الشریفین)، فەهد (لە مانگی ئۆگۆستی ۲۰۰۵ مرد). شانازی بەو کارەی دەکرد، بەجۆرێك منی نیگەرانکرد—پاڵپشتی حکوومەتەکەی پێشکەشکرد بۆ دامەزراوە ئیسلامییەکان لە دەرەوەی وڵات، لەنێوانیاندا، نزیکەی ۲۱۰ ناوەندی ئیسلامی، زیاتر لە ۱.۵۰۰ مزگەوت، ۲۰۰ کۆلێژ، زیاتر لە ۲،۰۰۰ قوتابخانە. سعودیەکان کەوتونەتە جێی باوەڕ کە ئیمانەکەیان زۆر راستە بەجۆرێك هیچ نەگونجانێك و خیلافێك لە ئایینەکەیان نابینن لەهەمان کاتیشدا قەدەغەی پراکتیزەکردنی هەموو ئایینێك لەماڵەکانیان دەکەن. لەگفتوگۆکانماندا، کاربەدەستانی سعودی زۆربەی هەرە زۆری مەکانەتی پادشایەتییەکەیان بۆ پارێزگارو بەرگریکاری ئیسلام بەکاریانهێناوە. ئەمەش رەنگدانەوەی دەبێ لەسەرهەستی هەڵاوێردن و ئەرکیان، هەروەك خۆیان دەیبینن، بۆ بڵاوکردنەوەی ئیمانیان. ئایا ئەمەش هۆکارێکی گونجاوە بۆ شانازیکردن، هەرچەندە، پشت دەبەستێ لەسەر چۆنیەتی یان لەرێگای کامەوە ئەم ئیمانە وەردەگیردرێت (تەرجەمە) دەکرێت. لەماوەی کۆبوونەوەکانم پێش ۹/۱۱، لایەنە سعودییەکان بەتووڕەییەوە بەرپەرچی هەر

پێشـنیازێکیان دەدایــەوە کــە تۆڕەکـانی تـیرۆری موسـڵمانان هێزیـان دەسـتکەوتبێ. ئـەو بانگەشانەیان کە دەخستەڕوو وەك هەوڵێك بۆ ناشرینکردنی ئاینی ئیسلام بەکاردەهێنرێن.

لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی کەچی ڕوویانداوە، لەوەتەی عەرەبستانی سعودی بەپێویستی زانیوە سەیری لێپرسراویەتی خۆی بکات لە چەندین ڕوانگەی جیاوازەوە. ڕاستە کە هەنـدێ نووسـەر لەئەمــەریکا و ئــەوروپا و ئیســرائیل عەقیــدەکانی ئیســلام و سیاســەتەکانی ســعودیایان شێواندووە، لەکاتێکدا باس لە تەعەسوبیەتی کلتووری عەرەبی دەکەن بەو ڕادەیــەی کەتــەنها ئەوانن ڕاستییەکان دەزانن. بەڵام ڕووخانی ڕاستەقینەیی بۆ ئیسلام لــەو بکوژانــەوە سەرچاوە دەگرێت کەخۆیان وانیشاندەدەن موسڵمانی ئایینداڕن، هەڵدەستن بــە دروســتکردنی وێنەیــەکی ناشرین بۆ ئیمانەکەیان. ئەگەر عەرەبستانی سعودی دەیەوێت پێشڕەوی بکات لەبەرگریکردنی ئیسلام، ئەمانە دوژمنن پێویستە لەسەرەتادا بەسەرئەوانەوە زاڵبێت.

لە شاری **ریاض**، پایتەختی عەرەبستانی سعودی، یەکــەم کاردنــەوەی هێرشــەکانی ٩/١١ نکۆڵیکردن بوو. لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵی ئوسـامە بــن لادن و نەتــەوەیی زۆربــەی ڕفێنــەرەکان لــە ســعودیاوە بــوون، کاربەدەســتانی ســعودیە نەیاندەویســت دان بــەوە بنــێن کــەوا قاعیــدە ئامادەییەکی گرنگی هەیــە لــەنێو پادشـایەتییەکەیان. ئەمــەیان وەك بەشـێك لەپەیوەندییــە گشتییەکانەوە بینی، نەك وەك بوارێکی ئاسایش. لەپاشاندا، لە ١٢ی مایســی ٢٠٠٣، ســێ لەتیرۆریستی خۆکــوژ نزیکــەی ســی و پێــنج کەســی لەشــاری **(ریــاض)** کوشــت. لــەمانگی نۆڤەمبەر، تەقینەوە تیرۆریستییەکان کۆشکێکی لەو شوێنەیان هەژانــد. لەمایســی ٢٠٠٤، هەندێ چەکدار بیست و دوو هاووڵاتی لە کۆمەڵگایەکی نیشتەجێ بۆ کرێکارانی پیشەســازی نەوت لە خوبار کوشت. هەر لەو مانگە، دووبارە لە **(ریــاض)** ڕفێنــەران پــۆڵ جۆنســۆن، کــە مقاولێکی ئەمەریکی بوو، گرت و سەریانبڕی. لەمانگی دیسەمبەری هەمان ساڵ، چــەکداران هێرشیان بردە سەر قونسوڵخانەی ولایەتە یەککگرتووەکان لە جەددە، پێنج کارمەندیان کوشت.

تەنانەت دەسەڵاتدارانی سعودیش ناتوانن کەمتەرخەم بن لەم جــۆرە کــردە توندوتیژیانــە، حکوومەت سەدان تیرۆریستی گومــانلێکراوی دەســتگیرکرد، کەپەیوەنــدییان لەگــەڵ هەنــدێ شانەی خوێناوی سەر بە قاعیدە هەبوون، تیایدا هەنــدێ دۆکیــومێنتی ســەفەری نایاســایی و بــۆمبی دەســتی و چــەکیان دۆزیــەوە. لەکۆتاییــدا کاربەســتانی ســعودی گەیشــتنە ئــەو ڕاستییەی—بەلایەنی کەمەوە بەشێوەیەکی نادیار—پەیوەندی هەیە لە نێوان ئەوەی لەســەر شەقامەکانیان ڕوودەدات لەگەڵ ئەوەی لەمزگەوتەکان فێردەکــرێن. زیــاتر لــە ٣،٥٠٠ ئیمـام

داوایان لێکرابوو بۆ بەشداریکردنی بەرنامەکانی دووبارە فێرکردنەوە و پەروەردەکردن کە بۆ بەرزکردنەوەی گیانی لێبوردەیی لەنێو ئایینی ئیسلام رێکخرابوو. زانایان هاندەدران بۆ وتاردان لەبارەی مەترسی زێدەڕۆیکردن لەئیسلام. ئەو تێکستانەی کەدەبوونە هۆی زیادکردنی توندوتیژی لەدژی کەسانی ناموسڵمان لە خوێندنی قوتابخانەکان لابران. لەژێر فشاری ولایەتە یەکگرتووەکان، سعودیەکان چەند یاسایەکیان دەرچوواند بۆ رێگەگرتن لەو پارانەی کە بەنایاسایی دەچنە بانکەکانی دەرەوەی وڵات.

راگەیاندنی سعودی دوورن لە رادەربڕینی ئازادانە، بەڵام بەشێوەیەکی سنووردار گفتوگۆی دڵسۆزانە ئەنجامدەدەن. هێرشی قسەکردن لەدژی ئیسرائیل تێکەڵی نێو گفتوگۆیەکان بوو کەلەبارەی ماناو ئەرکەکانی ئیسلامەوە دەردەبڕان. سەرنووسەری یەکێك لە رۆژنامەکان، کەهاوڕێی منالّی ئوسامە بن لادن بوو، وتارێکی نارەزایی نووسی بۆئەوانەی کەوا قورئان بەکاردێنن بۆ ئیدانەکردنی مەسیحی و جوولەکەکان. ژمارەیەك لە کۆڵەمنیستەکان رەخنەیان لە قاعیدەی دەگرت بەوەی هەوڵی کێشانی وێنەیەکی ناشرینی ئیسلام دەدات لەنێو هزری کەسانی بیانی وەك ئایینی شەڕکردن. (عبدالرحمن الراشد) بەڕێوەبەری گشتی کەناڵی سەتەلایتی العربیە تایبەت بە گواستنەوەی هەواڵ، رایگەیاندن.

*راستییەکی روونە کەوا هەموو موسڵمانان تیرۆریست نینە، بەڵام بەدڵنیاییەکی یەکسانەوە، بەداخەوە، زۆربەی زۆری تیرۆریستان موسڵمانن... لەناخی خۆمانەوە ناتوانین لەو کەسانە ببورین کە رۆژنامەنووسەکانمان دەفرێنن، خەڵکی سیڤیل دەکوژن، باسی پڕ لە خەڵکی بێگوناه دەتەقێننەوە، ناتوانین لەخۆمانیان حیساب بکەین، لەگەڵ هێنانەوەی هەر بیانوو و پاساوێك بۆ تاوانکارییەکانیان. ئەمانە جۆرە خەڵکانێکن ناوبانگی ئیسلامیان زراند و لەکەیان هێنایە سەر وێنەی پاکی ئیسلام.*

لەسەر ئاستی لێپرسراواندا، سەرکردە سعودییەکان زۆر بێزاربوون لەدەربڕینی نارەزایی بەرامبەر تیرۆریزم بەوەی وەك" تاوانێکی جیهانی و بە مێشکێکی شەڕانگێزانییەوە بەرامبەر مرۆڤایەتی کاری رق هەڵگرو تیرۆریستی دەکەن". زانایانی پادشایەتی بەشێوەیەکی بەردەوام لەسەر تەلەفزیۆنەکان دەردەکەون بۆ رەتکردنەوەی تیرۆر و ئاراستەی پێچەوانەی لەگەڵ ئیسلام. ئەم راگەیاندنانە پێشوازی لێدەکرێت، بەڵام باقی ئەوانیتر ئارام نابنەوە تا قەناعەتیان نەبێت بەوەی کە نە پارەی سعودیە و نە رێبازەکانی سعودی بەکارنایەن بۆ بەخێوکردن و گەشەکردنی نەوەی داهاتووی قاعیدە. ئەمەش نابێتە هەنگاوێکی یارمەتیدەر بەوەی کاربەدەستانی

سعودی جەخت لەسەر ئەو نکۆڵیکردنە دەکەنەوە بەوەی کەوا ئەم توندڕەوانە هیچ پاڵپشتییەکیان لەنێو وڵاتەکەیاندا هەبێ، کەچی لەیەکێك لە ڕاپرسییەکاندا کەبەشێوەیەکی تایبەت بەم مەسەلەیەوە ئەنجامدرابوو، ئەوەی روونکردەوە کە لەنێو ئەم پادشایەتیەدا ٤٩٪ ی خەڵکەکەی پاڵپشتی لە ئایدیاکانی بن لادن دەکەن. بەشێوەیەکی یەکسان، لەنێوانیشیاندا زیاتر لە بیست و چوار زانای دیاری سعودی، کە وانە لە زانکۆ دەڵێنەوە، لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٤ فتوایەکیان دەرکردووە لەسەر عێراق، " بۆ بەرگریکردنی خۆیی و شەرەفی و خاکی و نەوتی و ئێستای و داهاتووی لەدژی هاوپەیمانە ئیمپریالیستیەکان، تەواو وەکو ئەو کاتەی لەرابردوو بەرگەی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیان گرتبوو". واژووکەران باسی ئەوەیان دەکرد، " جیهاد لەدژی داگیرکەران ئەرکێکە لەسەر شانی هەموو کەسێکی تواناداڕ"[٣]. بۆیە نابێ سەرمان سووربمێنێ بەوەی زۆربەی خۆکوژە بیانییەکانی ناو عێراق لە سعودیەوە دێن.

لەفێبرایەری ٢٠٠٥، بەشداریمکرد لە کۆبەندی ئابووری جەددە. بۆنەکە لە هۆڵی هۆتێلێکی گەورە سازدرابوو، ئامادەبووان پیاوانی دەریایی بوون کە بەجلێکی سپییەوە بەشداریان تیادەکرد. بەدرێژایی لایەکی هۆڵەکە بە دیواری ئاوێنەیی داپۆشرابوو، کەلەبەر قەبارەی ئاوێنەکان سەرنجت رادەکێشرا. لە تێبینی و روونکردنەوەکانمدا، پیرۆزباییم لە سعودیەکان کرد لەو بڕیارەی بە سازدانی هەڵبژاردنی شارەوانییەکان ( کاتی هەڵبژاردنەکان نزیك بوونەوە)، هەروەها وتم هیوام وایە ئافرەتان ئەو مافەیان پێبدرێت بتوانن بەشداربن لەدەنگدان بە جۆرێك ئافرەتانی عەرەبستانی سعودیە خێراتربن لە ئافرەتانی نێو ولایەتە یەکگرتووەکان.

بەسەرسوڕمانییەوە، ئەم قسانە بە چەپڵەلێدانەوە لەدەوروبەرمەوە پێشوازیی گەرمی لێکرا. کاتێ سەیری ئامادەبووانی بەردەمی خۆمکرد، کەس چەپڵە لێنادا. پیاوانی دەریایی هیچ جوولەیەك کاریی لێنەکردبوون. لەبری ئەوەشدا، کەچی چەپڵەلێدانەکە لەپشتەوەی دیوارە ئاوێنەیەکانەوە دەهاتە ژوورەوە ئەو شوێنەی کە ئافرەتە سعودییەکانی لێ کۆببونەوە و

---

(٣) ئەم لێدوانە، لە ٥ ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٤ بڵاوبۆوە، لەلایەن باڵوێزی سعودیە لە ولایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیای گەورە رەخنەی توندی لێگیرا. ژمارەیەك لە کۆڵەمنیستە سعودیەکان ئیدانەی ئەم فتوایەیان کرد کەبۆ هاندانی گەنجانی وڵاتە تابەرەو عێراق بچن بۆ ئەنجامدانی کاری توندوتیژی. پشتیوانانی ئەم لێدوانە ستایشی ئەم لێدوانەیان کرد بۆ ناچارکردنی یەکگرتنەوەی لایەنی سوونی و شیعەکانی عێراق هەروەها بۆ لاوازکردنی توندوتیژی لەدژی کەسانی بێ چەك، لەنێویشیاندا بێگانەکان وەك رۆژنامەوان و کرێکارانی دەستی.

بەشداریان لەم کۆبەندییە دەکرد. ئافرەتانی ئەم وڵاتـە هەمیشـە جیاکراونەتـەوە لـە پیـاوان، بەدیارناکەون—بەڵام مایکرۆفۆنیان لەبەردەمە، کەچی دوورن لە ئامێرە بیستەنیەکان. کـاتێ وەزیری کاروباری سعودیە باسی ئەوەیکرد کـەوا ئافرەتـانی سـعودی پێویسـتە پابەنـدبن بـە سیاسەتی جیاکردنەوەی جێندەری لەشوێنی کارکردن و هیچ بەرژەوندییەك لەوەدانییە بۆ رێگە پێدانیان لە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل. ئافرەتێك پرسیاریکرد بـەوەی کـە بۆچـی وەزیـر بـەمجۆرە بیردەکاتەوە. وەزیر ئاماژەی بەو هەموو ئیمەیلـە پاڵپشـتیەدا کەبەدەسـتی گەیشـتوون بۆیـە بەمجۆرە بیردەکاتەوە، ئافرەتانیش داوای ناونیشانی ئەم ئیمەیلـەیان لێکـرد. ئافرەتـان نیـوەی دانیشتوانی زانکۆکانی سعودیە پێکدێنێت، بەڵام کەمتر لـە یـەك لـە دەی هێـزی کـارکردنی وڵاتی بە ئافرەتانەوە نابینرێت. زوو یا درەنگ، ئەم ئافرەتە خوێندەوار و خاوەن بڕوانامانە—کەسوودمەندی شـارراوەی نیشـتیمانن—دەربـڕین و دەسـتەیەکی فـراوانتر لـەدەرەوەی مـاڵ دەدۆزنەوە.

لەکاتی گفتوگۆیەکانمان لە جەددە، یەکێك لە پیاوە سعودیەکان دڵنیـای کردمـەوە لـەوەی سیاسەتی وڵاتەکەی بەرامبەر ئافرەتان لەسەر بناغەی ئارەزووەوەیە نەك کپکردنی مافەکانیان بەڵکو بۆ رێزگرتنی ئافرەتانە. وتی: " ئێمـە بڕوامـان بـەوە هەیـە کـەوا ئافرەتـان لەبـەردەم دەروازەکانی بەهەشتەوە دانیشتوون، تەنها ئامانجـەکانمان پاراسـتنی شـەرەفی ژنەکانمانـە". منیش وتم: تێیگەیشتووم، وەبڕوام وانەبوو رۆژئاوا ئەم هەموو وەڵامەی هەبووبێ. پـێم وت، " هەرچەندە، بڕوای تەواوم بە مافی خەڵکی هەیە بۆ دروستکردنی هەڵبـژاردە بنەڕەتییـەکانی. ئەگـەر ئافرەتـان ئیختیاریـان لەبەردەسـتبایە، لەوانەیـە هەنـدێکیان بڕیـاری ئـەو ژیـان بەسەربردنەیان دابووایە کەئێستاکە تیداینە. بەڵام ئافرەتانیش، شانبەشانی پیـاوان پێویسـتە دەرفەتی ئەوەیان پێبدرێت بۆئەوەی بڕیـار بۆخۆیـان بـدەن. ئـەوان گـەنجن، خـۆ منـداڵ نـین، پێویستە بەگوێرە سروشتیانەوە مامەڵەیان لەگـەڵ بکرێـت. ئـەی ئێـوەی پیـاوان لەچییەوە دەترسن؟ هیچ کەسێك لەبەرژەوەندیدا نییە دەست بە شەڕێکی رەگەزەکان پێبکات".

وەك هەرزەکارێك، ئەوکاتەی لەیەکەم ژوانەکانم لەگەڵ کوڕان دەردەچووم کە ئۆتۆمۆبێلیـان هەبوو، باوکم سووربوو لەسەر بەدواکەوتنمان بەئۆتۆمۆبێلی خێزانەکەمان بەدرێژایی رێگاکـە. سیستەمی سعودی زۆر موتەحەفیزە، جگە لەوەی کە باوکەکە لەنێو ئۆتۆمۆبێلەکە لەپێشـەوە لەگەڵ کوڕەکانی دادەنیشێ و کچەکانیش لەدواوە، لەپشت پەردەن.

لەسەردانەکەمدا دەرفەتی ئەوەم بۆ ڕێکەوت بۆ نوێکردنەوەی ناسینەوەکانمان لەگەڵ شازادە عبدالله دابنیشین، ئەم ڕووداوە شەش مانگ پێش ئەوە بوو کە دواتر پادشایەتی لە شا فەهد وەرگرت، لەبەرئەوەی شا فەهد بۆماوەیەکی درێژ نەخۆش کەوتبوو. هەرچەندە عبدالله تەمەنی لەسەرەتای هەشتاکانەوەبوو، بەڵام خاوەن جەستەیەکی بەهێزبوو، تەواو خۆشی لەژیان وەردەگرت. سمێڵ و سەکسووکەیەکی پڕی هەبوو، هێشتاکە هەر بەڕەشیەوە دەیپاراستن، لە قسەکردندا زۆر هێمن و شکۆدار بوو. کاتێ پێموت بەنیازی نووسینی کتێبێکی ئاوام، زەردەخەنەیەکی رازیبوونانەی کرد و ئاماژەی بە کۆپییەکی قورئانی بەرگ سەوز کرد کەلەتەنیشت خۆیەوە لە نووسینگەکەی دایابوو.

لەکاتی قسەکردنەکانماندا، زۆر بەراشکاوانە لەو وێنە شێواوانە دەترسا کەهەندێ کەس ئەنجامیدەدەن و دەیخەنە پاڵ ئیسلام، بەجۆرێك خۆی ئیسلامی وەك ئایینێکی ئاشتی و میهرەبان ناودەبرد. وتی: مەسیحییەت و یەهودی و ئیسلام هەرسێکیان لە توخمە سەرەکییەکانیان یەکدەگرنەوە، هەندێ مەسیحی کۆنزەرڤاتیڤ هەنە واهەستدەکەن کەپێویستیان بە دروستکردنی مەسەلەك هەیە بۆئەوەی ململانێی کۆتایی دونیا (Armageddon) بێنن. ویستم ئەوە بزانم کە ئایا ئیسلام موسڵمانانی قەدەغەکردووە لە بەخشین و دەستهەڵگرتن لەخاکێك کەرۆژێك لەرۆژان فەرمانڕەوایی تیاکردبێ. وتی، هیچ شتی وا بەمجۆرە رەق نەبووە، جگە بۆهەندێ ناوچەی تایبەت و شوێنی پیرۆزنەبێ. پرسیاری ئەوەم لێکرد، " لەم کۆمەڵگا ئایین پەروەرە بەرزەیە، بەبۆچونی ئێوە چ رۆڵێك پێویستە تا داوا لە خوای گەورە بکەی بۆئەوەی لەئیدارەی ئەم پادشایەتییە بەرێوە ببرێت؟". وەڵامی دایەوە، " ئیمان دەبێ بەردەوام هەبێ، بەڵام تۆ داوا لەخودا ناکەی پێش ئەوەی راوێژی لەگەڵ هاوڕێ و راوێژکارەکان نەکەی. دواتر پشت بە خودا دەبەستی بۆئەوەی یارمەتیت بدات لە دەرکردنی بڕیارەکان، و داواشی لێدەکەیت بۆئەوەی هەموو شتەکان بەقازانجی تۆوە بگێرێت". کاتێ پرسیاری عێراقم لێکرد، بەرووخسارێکی ناشرینەوە وتی: "پێویستە، بابەتەکە بگۆڕین".

لەماوەی ئەو سەردانەی کۆتاییم بۆ عەرەبستانی سعودی، جیاوازییەکی سەرسوڕهێنەرم بەدیکرد بەبەراورد لەگەڵ گەشتەکانی پێشووترم. هەڵوێستێکی گشتی دروستبووە بەجۆرێك بڕیار لەسەر هەموو پرسە گرنگەکان دراوە. ئێستاکە، هەموو شتێ بەردەوام لەگۆڕاندایە، کەش و هەوای سیاسی و تێڕامان و گفتوگۆیەکان، سیاسەتی سعودیە ئەدگاری درامی خواستووە.

لەماوەی حەوت ساڵی رابردوودا، ماڵی ئال سعود بانگی چاکسازی دەکەن بێئەوەی خۆشیان بگرێتەوە. ئەم هەنگاوەش لەوەیە بەرەو زیادبوون بچێت لەبەر رۆڵی نوێی عبداللە. لەوکاتەی هێشتاکە هەر شازادەبوو، سەرپەرشتی زنجیرەیەك کۆبوونەوەی نیشتیمانی لەسەر مافەکانی کەمە ئایینییەکان و ئافرەتان دەکرد، دروستکردنی ناوەندێکی فیدراڵی بۆ دیالۆگ، هەروەها رێگەدان بە هەڵبژاردنەکانی پێشبڕکێی شارەوانی. وەك شایەك، فەرمانی بە ژووری پیشەسازی و بازرگانی جەددە دا بۆ رێگەدان بە کاندیدە مێینەکان بۆ هەڵبژاردنەکانی بۆردەکە، ئەوەبوو دووانیان هەڵبژێردران. نزیکەی ٣،٣ ملیار دۆلاری بۆ مۆدێرنکردنی سیستەمی خوێندنی سعودی و مەنهەجەکانی تەرخانکرد. لەلایەنی ئابوورییەوە، عەرەبستانی سعودی گەیاندە نێو رێکخراوی بازرگانی جیهانەوە، زۆر بەسەرکەوتوویی دەتوانێ پاساو بۆ نەهێشتنی گەندەڵی بێنێتەوە، هەروەها دووبارە رێکخستنەوەی بیرۆکراسی خەوتووی وڵات و چاککردنەوەی پەروەردەیی لەهەندێ بابەتی دونیایی وەك ئەندازیاری، زانست، هەروەها بیرکاری.

سەرکردەکانی ئەمەریکی لەلایەن کۆنگرێسەوە فشاریان دەخرێتە سەر، بۆ وەرگرتنی هەڵوێستێکی توند لەگەڵ سعودیە لەسەر ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە تیرۆریزمەوە هەیە. ئێستا ئەمەریکا هەیبەتەکەی کەمتر بۆتەوە لەوەی پێشووتر. سعودییە چیتر پشت نابەستێ بە ولایەتە یەکگرتووەکان بۆ تەکنەلۆژیا، گرنگی ئەمەریکا وەك کڕیاری نەوت کەمتربووەتەوە بەبەراورد لەگەڵ وڵاتەکانیتر. بەهۆی مەسەلەکانی ئاسایشی ئێستای جیهانییەوە، سعودییەکان کەمتر حەز بەوەدەکەن بێنە ولایەتە یەکگرتووەکان، هەروەها ئەمەریکییەکانیش کەمتر گەشت بۆ عەرەبستانی سعودیە دەکەن. ئەگەر ئەم لێك تێگەیشتنە نێگەتیڤانە بەردەوام بێت، ئەوا سەرکردە سعودی و ئەمەریکییەکان کەمتر یارمەتی سیاسی یەکتردەدەن.

سعودیەکانیش زۆر هەست بە ئاسودەیی ناکەن بەو رۆڵەی کە خەلکانێك هەڵیانبژاردوون: "چەشنێك لە دڵی نەوتاوی نێو تاریکایی" یەکێك لە نووسەرەکان ئەم ناوەی پێداون، " کانییەك لە ئاڵۆزی، سیستەمی بەهای دوژمندارییەتی". زۆر خۆشحاڵ دەبن بەگەڕانەوەی ئەوکاتانەی کە ئەم دوو وڵاتەی سەرەڕای بوونی جیاوازییەکانیان لەگەورەترین شەڕەکانی رۆژهەڵاتی ناویندا بەیەکەوە کاریاندەکرد. پێویستە لەسەرمان هانی سعودییەکان بدەین بۆ گەڕانەوەی ئەو پەیوەندییانە، ئەمەش بێگومان لەرێگای پاراستنی هەوڵەکانیان بۆ پاکسازی قاعیدە، هەروەها لەرێگای رێگەگرتنی کۆمەککردنی تیرۆریستان و سوود وەرگرتن لەهەموو

دەرفەتەکان بۆ بەبیرهێنانەوەی هاوولاتیانیان بەوەی کەوا کوشتنی کەسانی بێ چەك پێچەوانەی کلتووری عەرەبییە و هیچ ڕێگایەکیش نییە بۆ بەدەستهێنانی شوێنێك لەبەهەشت.

شەڕی فەلسەفی لە عەرەبستانی سعودی لەدەوری ئەم پرسیارە فەندەمێنتالیەوە دەسووڕێتەوە ئەویش: سعودییەکان خۆزگە بە بوونی چ جۆرە ولاتێکەوە دەخوازن: قەلایەکی جیاکراوە کەلەلایەن تەقلیدە کۆنزەرڤاتییەکانەوە فەرمانڕەوایی لێدەکرێت یاخود ولاتێکی مۆدێرن (ولاتێکی تا ئەوپەڕی ئایینی) کە دەبێتە هۆی کرانەوەی جیهان. لەکاتێکدا سعودییەکان حەزدەکەن بەدوای ئەو سنوورانەدا بگەڕێن کە ئیسلام ڕێگای پێداوە، کەچی هەندێك هەن تائەوپەڕی توانایان بڕیار لەسەر سنووردارکردنی ئەم ئایینە دەدەن. سەرت سوڕنەمێنێ، گەر بلێین هەندێك لە سعودییەکان ناتوانن خۆیان لەهیچ سایدێك بێننەوە. پێویستییەکانی بەمۆدێرنکردن زۆر بەڕوونی دیاریکراوە، بەلام ترسی ئەوە هەیە کۆنترۆلمان لەدەستبچێ. ئەم گفتوگۆیە لەتەواوی جیهانی عەرەبی و هەندێك لەکۆمەلگا موسلمانەکانیش دەنگیدایەوە. ئەنجامەکەی بەرهەمی ئالۆزییەکی زۆر گرنگە لەرووبەڕووبوونەوەی دوو ئایدیەی گەورە: ئەویش هەموو تواناکان لەلایەن خوداوەیە، هەروەها دەسەلاتی شەرعی سەر ئەرزیش لەلایەن خەلکەکەیە.

## (١٥)

# ديموكراسييەتی عەرەبی

لەتەمموزی ساڵی ١٩٦٧، جۆن کەنێیدی، لەوکاتەی سیناتۆری پلە ناوەندی ولایەتە یەکگرتووەکان بوو لە مەکسیکۆستی ئەوەی راگەیاند کەوا، " بەهێزترین سوپای جیهان لە ئەمرۆکەدا نە کۆمۆنیزمە، نەسەرمایەداریشە، نە مووشەکی ئاسمانیشە—بەڵکو خۆزگە و ویستی نەبڕاوەی مرۆڤە کە دەبیّ ئازاد و سەربەخۆبێت".

بەردەوام دەبێت و دەڵیّ، " دوژمنی گەورەی ئەم ئازادییە پێی دەوترێت ئیمپریالیزم. بۆیەش تاکە تاقیکردنەوەی گرنگی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا کەپێویستە پەیڕەوی بکات ئەوەیە دەبیّ رووبەڕووی بەرەنگاربوونەوەی ئیمپریالیزم ببینەوە، ئەوەی دەمانەویّ ئەنجامی بدەین فەراهەمکردنی زیاتری ئازادی مرۆڤە".

لەقوولاییەکانی جەنگی ساردا، کەنێیدی—بەشێوەیەکی بەرچاو—پێناسەی کۆمۆنیزمی نەکرد، بەڵکو پێناسەی ئیمپریالیستی وەك تاقیکردنەوەی سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکای کرد. لەوکاتەی کەنێیدی ئەو قسانەی دەکرد جەنگاوەرانی ئازادی جەزائیری کەوتبوونە نێوان ململانێی مەرگ و ژین بۆ وەرگرتنی سەربەخۆیی لە فەرەنسا، وتەبێژی پارتی دیموکرات، ئەدلای ستیڤن سۆن، لەسەر ئەوە رازیبوو کەوا، قسەکانی کەنێیدی زۆر گرنگ بوو لەهەمان کاتدا داوەتکردنی ژاوەژاوەبوو، هەروەها هەڕەشەیەکیشە بۆ NATO. بەڵام سەربەخۆیی ئایدیایەك بوو بەجۆریّ کاتی خۆیان هاتبوو،جەزائیر لەساڵی ١٩٦٢ توانی بەدەستی بێنیّ. لەوکاتەیدا، کەنێیدی سەرۆکی وڵات بوو، حەزی وابوو ولایەتە یەکگرتووەکان بخاتە لایەنی ئازادی بۆ ئەو خەڵکە داگیرکراوانەی لەناو هەموو ئەم جیهانە پێشکەوتووەوەن، بەشێکی گرنگ هەبوو ئەویش موسڵمانان بوون. کاتیّ کەنێیدی باسی لە ئازادی مرۆڤی دەکرد، مەبەستی پەرۆشی نەتەوەکانی دەردەخست بۆ رزگاربوونیان لە داگیرکەری بێگانە. بەڵام سەربەخۆیی هیچ گەرەنتیەك نادات بەجۆرێك خەڵکەکەش ئازادبێت لە کپکردنیان

لەلایەن حکوومەتەکانیانەوە، هەروەها دامەزراندنی ئەمجۆرە ئازادییە شتێکە تەنانەت بەرەنگاربوونەوەکەشی سەختره.

لەنۆڤەمبەری ساڵی ٢٠٠٣، سەرۆك بۆش ئەوەی راگەیاند کەوا، ولایەتە یەکگرتووەکان بەدوای "ستراتیژیەتی رۆشەن لە رۆژهەلاتی ناویندا دەگەڕێت". ئەم وتارەی لەبەردەم ئەو ئامادەبووانە پێشکەشکرد کەبۆ ئاهەنگێرانی بیستەمین ساڵەی دیاری نەتەوەیی بۆ دیموکراسی کۆببونەوە، بۆش وتی" سەقامگیری ناتوانرێ لەسەر حیسابی ئازادی بکرِدرێتەوە. تائەوکاتەی لە رۆژهەلاتی ناویندا ئەو شوێنەی تیایدا ئازادی پێشوەچوونی بەخۆیەوە نەدیوە، هەروەها وەك شوێنێکی ئاوسان و تووڕەیی و توندوتیژیشەوە دمێنێتەوە. هەروەها لەگەڵ بلاوبوونەوەی چەکە بەکۆمەلکوژییەکانەوە بەجۆرێك دەبێتە هۆی دروستبوونی هەرەشەی مەترسیدار بۆسەر ولاتەکەمان و هاوپەیمانانمان، بێ سوودە لە قەبوولکردنی ئەم بارودۆخەیە".

لەهەرێمێك کەوا تیۆرەکانی کودەتای تێدا زاڵە، گومانێکی زۆر فراوان هەیە لەبارەی مەبەستەکانی ئیدارەی بۆش. ئەو بیرۆکەیەی کە ئەمەریکا پشتیوانی لە دیموکراسی دەکات زۆر بە ئاسانی باوەڕی پێناکرێت چونکە بەرژەوەندییەکی زۆری بۆ عەرەبەکان تێدایە. هەرلایەنێك ئەوەیتر تۆمەتباردەکات، و هەوڵی گۆڕینی باباتەکەش دەدات: سەرکردە ئەمریکییەکان قسە لەبارەی ئەو پێویستیانە بۆ حکوومەتەکانی عەرەبی دەکەن کە گونجاوبێ بۆ ریفۆڕمی سیستەمەکەیان زیاتر لەوەی کێشەی فەلەستینی باسبکەن، کەچی سەرکردەکانی عەرەبی قسە لەبارەی هەموو شتێکەوە دەکەن جگە لە دیموکراسی نەبێ.

سەرۆك لەهەولدانەکەی راست بوو بۆ چاککردنەوەی ئەم ئینتیمایەی کەهەلوێستی ئەمەریکا لەسەر ئازادییەوە وەستاوە لەهەموو شوێنێك جگە لە ولاتە عەرەبییەکان، ئەمەش لەبەرئەوەی هەندێ راستی لەپاڵ ئەمەوەیە. بۆماوەی چەندین دەیە ساڵ دەچێ ئیدارە دیموکرات و کۆمارییەکان وەك یەك هەمان هۆکاری باشیان هەیە بۆ گەڕان بەدوای پەیوەندی میانڕەوی لەگەل سەرکردە عەرەبییە ئۆتۆکراتییەکان. ئەو ولاتانەی کە لەروویێکی ستراتیژییەوە گرنگن بۆ فەراهەمکردنی سەقامگیری، ئەمەریکا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەل باشکردووە وەك عەرەبستانی سعودی و مصر. عەرەبەکان نەوت بەرهەم دێنن، کریارە ئەمەریکییە داوای دەکەن. عەرەبەکان تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو داوادەکەن، کۆمپانیا ئەمریکییەکانیش پێیان دەفرۆشن. لەکاتی جەنگی سارددا، ئەمەریکا لەدژی یەکێتی سۆڤیەتی پێویستی بە پالپشتی عەرەبەکان هەبوو. لەسالانی ١٩٩٠، ئیدارەی کلینتۆن بەدوای

پاڵپشتی وڵاتە عەرەبییەکان دەگەڕا بۆ دانانی پڕۆسەی ئاشتی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەم وڵاتە عەرەبییانە، کە خاوەن بیرکردنەوەی زۆر خەوشدارن، واپێدەچوو پەسەندی ئەڵتەرناتیڤ بکەن. لەکۆتاییشدا، زۆر سەرقاڵی سەددام حسێن لەعێراق، موعەممەر قەزافی لە لیبیا ، هەروەها رژێمی تیۆکراتی لەئێران بووین. هەرچەندە زۆربەی ئەو مەسەلانە ماونەتەوە و چارەسەرنەکراون، کاتەکەش زۆر گونجاوە بۆمامەڵەیەکی نوێ. یەکێك لە بیانوویەکانی رێکخراوی قاعیدە ئەوەیە کە ولایەتە یەکگرتووەکان پاڵپشتی لەو حکوومەتانە دەکات کە زۆردار و ناشەرعی و گەندەڵن. رێگایەك بۆ نکۆڵیکردنی پاڵپشتی لە ریفۆرمە دیموکراتییەکان لەهەموو وڵاتەکان نەبوونی ئازادییە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە بێین سیستەمی خۆمان بەسەر خەڵکانێك بسەپێنین کەخۆیان نایانەوێ. ئیسلام فێری دواکەوتووەکانی دەکات کە باشترینی شتەکان لە شارستانیەت وەربگیرێت، دیموکراسیەتیش گەورەترین لایەنی قسەکردنە لە لایەن رۆژئاواوە. تاقیکردنەوەکان ئەوەیان سەلماندووە بەشێوەیەکی گشتی دانیشتوانی عەرەبی و موسڵمانان حەز بە چەمکەکانی وەك ئازادی را دەربڕین، فرە سیستەمی، مامەڵەکردنی یەکسان لەژێر یاساوە دەکەن. زۆربەی خەڵك دەڵێن زۆر گرنگە بۆ سەرکردەکان دیموکراتی بن لەوەی بەهێزبن. هەربۆیش دیموکراسی هەنووکە بەرێوەیە. وڵاتێکی بچووکی وەك قەتەر خاوەن دەستوورێکی نوێیە کە پێشکەشی دەستەی راوێژی کردووە تیایدا پارێزگاری لە ئازادی ئایینی و ئازادی را دەربڕین و مافەکانی مرۆڤ دەکات. پەرلەمانی کوێتی، دوای چەندین ساڵ لەرەتکردنەوەی پرۆپۆزەلەکەی، لەکۆتاییدا رێگای بە مافی ئافرەت دا بۆدەنگدان. لەساڵی ٢٠٠٣ ئوردن و یەمەن لە هەڵبژاردنەکانیان پێشبڕکێ لەپرۆسەکە بەدیدەکرا بەمەش تارادەیەك ئازادی پێوە دەبینران. دەسەڵاتداریەتی فەلەستینی هەڵمەتی هەڵبژاردنیان سازدا بۆ هەردوو سەرۆك و پەرلەمان. ئێستا زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکان جۆرێك لە دەستەی تەشریعی و راوێژکاریان هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هێزەکانیان بێ فیزە. لەسەرتاسەری ئەم ناوچەیە هەستێك هەیە کەوا رێگایە کۆنەکان لەگۆڕاندایە، بۆئەوەی لەلایەن شتێکی ترەوە جێگای بگیرێتەوە هێشتاکە بەتەواوەتی پێناس نەکراوە، بەڵام نوێ نییە.

ئیدارەی بۆش هیوای وابوو مۆدیلێکی دیموکراسی لە عێراق سەرهەڵبدات و عەرەبەکانیش پەرۆش بن بۆ لاسایی کردنەوەی. لەوەیە رۆژێك دابێ ئەم هیوایە بێتەدی. بەڵام لەروانگەی سیاسییەوە کاتێ ئەم هەموو شەڕ و توندوتیژییە لەناو شەقامەکان روودەدەن، ئەوکاتەیە کە

زۆربەی عەرەبەکان سەیری عێراق دەکەن دەڵێن، " خۆزگە دەخـوازم وڵاتەکەشـم وەك ئەمـەی لـێبێ". تـاوەکو ئێسـتا هـیچ نموونەیـەکی مـۆدێلی دیموکراسـی نییـە عەرەبـەکان پێیـەوە رازیبن[1](١). لەساڵی ١٩٩٢، شا فەهـدی عەرەبسـتانی سـعودی باسـی ئـەوەی دەیکـرد، " سیستەمی هەڵبژاردن لەناو عەقیدەی ئیسـلامیدا نییـە، ئـەو عەقیدەیـەی کـەوا بانگەشـەی حکوومەتێکی ئامۆژگاری و راوێژ و ئاگاداربوون لە رەعیەتەکان دەکات". ئەم بیرۆکەیەی—کەوا دیموکراسی مۆرکێکی ئیسلامییە—لەوەیـە جێـی رەزامەنـدی بێـت لەلایـەن هەنـدێك پادشاکانی عەرەبی، بەڵام توزێك قورسایشی هەڵگرتووە. نەریتی عەرەبی، هەروەك شا فەهـد ئاماژەی پێدابوو، دەکرێ بەناو رێساکانی دیموکراسیەتەوە درێژبکرێتەوە ئەم ویستانە ببەخشـێ کە بـوونی هەیـە. بەدڵنیاییـەوە، لـەدەرەوەی نیمچـە دوورگـەی عەرەبییـەوە ئیسـلام هـیچ بەربەسـتێکی بـۆ ئـازادی سیاسـی نییـە، نیـوەی موسـڵمانانی جیهـان لـەژێر حکوومـەتی هەڵبژێردراوەوە دەژین—لەو شوێنانەی وەك ئەندەنوسیا، هیندستان، بـەنگلادیش، مالیزیـا و تورکیا.

ئیسلام بەربەست نییە لەبەردەم ئـازادی، لەهـەمان کاتیشـدا رێ خۆشـکەریش نییـە بـۆ بەدەستهێنانی گۆڕانی دیموکراسی. لەو وڵاتانەی تیایـدا ئیسـلام بـە کۆنزەرڤاتیڤـەوە تەفسـیر دەکرێت، ریسکێك هەیە بەوە دیموکراسـی وەك هاورێیـەکی ئیسـلام وەرناگیرێـت بـەڵکو وەك جێگرەوەیەکی لێکدەدرێتەوە—بەتایبەتی ئەگەر ئـەم دیموکراسـییەتە بـەرێگای سـەرکەوتنە لەلایەن ولایەتە یەکگرتووەکانەوە هێنرابێت. لێك تێنەگەیشتن لەدواوەی بەکارهێنانی هەنـدێ وشە دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی کێشە. هەندێ موسڵمان، وەك مەسیحی و جوولەکـەکانیش، داوای یەکسان بوونی زاراوەکانی " عیلمانی" و "بێ خودایی" دەکەن، چونکە نـابێ کەسـێك ئایینداربێ کەچی بێ ئەوەی بگەڕێتـەوە سـەر سەرچاوەکانی ئـایینی کارەکـانی حکوومـەت راپەڕێنێ. یەکێك لە پسپۆڕان دەنووسێت، " بوون بە عیلمانی مانای وایە...نـەك هەرتـەنها رەتی عەقیدەی ئایینەکە دەکەیت بـەڵکو دەبـێ تـەواوی پـەیڕەوە ئـەخلاقی و نـەریت و ئـەو یاسایانەی کە لەنێو کۆمەڵگا موسڵمانەکانیشەوە کاری پێدەکرێت وازی لێبێنی". ئەمە بەبێ

---

(١) (مصر) لەنێوان دوو شەڕی جیهانییەوە پێشکەوتنی باشی بەخۆیەوە بینییەوە لەبواری فرە سیستەمی، بەڵام کاتێ هێزی سەربازی جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست لەساڵی ١٩٥٢، ئەم بارودۆخە نەما.

هیچ گومانێك ئەم تێڕوانینەش كاریگەری زۆری هەبووە لەسەر ئـەزموونی موسـڵمانان لـەژێر دەستی قورسی سەركردە عیلمانییەكان وەك (ناصر) لە مصر و شا لە ئێران.

ئەمەو چەندین مەسەلەی تر هۆكارێك بوون بۆ كردنەوەی ئەم بۆچوونەی كـەوا دیموكراسـی لەگەشەكردندایە بەمەبەستی لاوازكردنی ئیسلام. بۆ رەوینەوەی ئەم بۆچوونە، بانگەشـەكارانی ریفۆرمخوازی پێویستە ئەوە بۆ خەڵكەكە روونبكەنەوە كەوا پالپشتیكردن لە دیموكراسی مانـای ئەوە نییە فەرمانی مرۆڤ لەسەرووی فەرمانی خوداوە دەبێ. بەپێچەوانەوە مانای نكۆڵیكردنە لە فەرمانی زۆرداران و پەیڕەوكردنی خواوەندە لەسـەر زەوی. دیموكراسـی دەنـگ دەبەخشـێتە هەموو هاووڵاتییەك نەك هەرتەنها بە گرووپێكی بالادەست و بەختەوەر. لەیەكێك لەسـەركردە ئیسلامییەكانم گوێ لێبوو، كە خەڵكی نایجیریا بوو، دەیوت ئیسلام دیموكراتیتیرین ئایینە بـۆ ئەم مەبەستە، چونكە هەموو كەس لەبەرامبەر خودا یەكسانە.

هەندێك لە چاودێران وای بۆدەچن كە گرنگی ئایین سەرتاپای وڵاتانی گرتۆتەوە ئـەو مەسـەلە جددییەی كە پێیەوە پەیوەندە ئەویش لایەنی ئابوورییە—عەرەبەكان قەناعەتیان بەوە هەیە كە دیموكراسی رێگای فەراهەمكردنی ژیانێكی خۆشتریان پێدەدات، هیچ شتێكیتر پێیەوە پەیوەست نییە. ئەم مەسەلانە ساتێكی ئەم فیلمەم بیر دێنێتەوە "دەرچوو—المتخرخ" كـاتێ كارەكتـەری فیلمەكە دۆستن هوفمان لەوە دڵنیایە كە كلیلی خۆشگوزەرانی داهاتووی كارێكە لـە پلاسـتیك. بیركردنەوەیەك لە نێو رۆژئاوادا بەربلاوە ئەویش هەموو كەس دەیەوێ وەك رۆژئاواییەكان بـژیت. بەگوێرەی ئەم بیركردنەوەیە، ئەگەر عەرەب و موسـڵمانەكان تـووڕە و یـاخین، ئـەوەش تـەنها لەبەرئەوەیە چونكە ئیرەیی بە خۆشگوزەرانی و ئارامی ژیانی رۆژئاوا دەبەن.

لایەنە پێچەوانەكەی وەرنەگیراوە: كەبەلایەنی كەم هەندێ عەرەب بڕوایـان وایـە رۆژئـاوا لەهەوڵی ئەوەدایە بۆ ئیغرا و سەرنجڕاكێشی ئـەو عەرەبانەیـە بـۆ ژیـانێكی دەسـتكرد و بـێ رەوشت لەعنەتكراویە هەتاهەتایە بەجێیان دێڵن. بەرژەوەندی ماددی گرنگـی خـۆی هەیـە، مێژوو پێمان دەڵێ بەتوند وەرگرتنی مادده یان ئەوەتا ژیانت رۆشـەن دەكـات یـان لەخشـتەی دەبات. یەكێك لە زانایـانی بـەناوبانگی موسـڵمان دینووسـێت، " ئەگـەر یـەكێك پرسـیار لەموسڵمانێك بكات، ئایا ئازادیت دەوێت، بەدڵنیایـیـەوە وەڵامەكـە بـە بـەڵێ دەبـێ. بـەڵام زۆربەی موسڵمانان ئەمە زیادەدەكەن، لەسەرەتا، بە بۆچونی خۆیانەوە، ئازادی مانای *ئازادی* لە خودا و ئایین ناگەیەنێ، ئەوان ئازادی تر لەباوەش دەگرن، بـەجۆرێك ئـەو عەقیـدەیان لـێ تێكنەدات كە مانایەك بەژیانیانەوە دەبەخشێ".

قوتابخانەیەکیتری بیرکردنەوە پێشنیازی ئەوە دەکات کە هەردوو نیوەی ریفۆرمی دیموکراتی—ئابووری و سیاسی—یەك لەدوای یەك دێت. بەگوێرەی ئەم تیۆرە، عەرەبەکان ئامادەنین بۆ پێشوازیکردنی دیموکراسیەت. ئەوان لەسەرەتادا پێویستە زیاتر رۆشنبیرتر و کراوەتر و زیاتر لە چینی ناوەڕاست نزیك ببنەوە : بەمانایەکیتر، زیاتر رۆژئاوایی بن. ئەمە فیزی پێوەدیارە، هەروەها گرنگینەدانە بەوەی ئەو راستییەی کە ریفۆرمەکانی ئابووری و سیاسی یەکێك ئەوەیتر بەهێزدەکات. دەسەڵاتی رەها بەربەستێکە بۆ پێشکەوتنی ئەو شوێنەی کە دیموکراسیەت یارمەتی میانڕەوی رێگاکە دەدات. هەندێك لە سەرکردەکانی عەرەبی زۆر بەتوندی سەرنجیان بۆئەم ئایدیایە راکێشراوە سەرەتا بە دانانی ریفۆرمەکانی ئابووری، بەو هیوایەی ئەمە ببێتە هۆی دواخستنی گۆڕانی راستەقینەی سیاسی بۆکاتێکی نادیار. سەرۆك حوسنی موبارەکی مسری باشترین نموونەیە.

لەوەتەی جڵەوی دەسەڵاتی لەساڵی ١٩٨١ گرتۆتە دەست، موبارك بۆتە کەسێکی دیاری نێودەوڵەتی کە پشتگیری لە هەڵوێستە میانڕەوەکان دەکات لەمەسەلەکانی جیهانی و پشتیوانییەکی گرنگی پرۆسەی سیاسی دەکات لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. خۆیشی سیاسەتمەدارێکی زیرەکە توانیویەتی چەندین گۆڕانکاری ئابووری پێویست ئەنجامبدات. لەگەڵ ئەوەشدا، کەسێکی دیموکراتیش نییە. بۆزیاتر لە چارەگە سەدەیەکە، چاوی پۆشیوەتە نارەزایی سیاسی لەرێگای بەردەوامبوونی حاڵەتی هەمیشەیی نائارامی لە وڵات. هەر هاووڵاتییەکی مسری بەرهەڵستی موبارك بکات تووش دەستبەسەرو ریسك تەنانەت ئازاردانیش دەبێتەوە. موبارەك ئەوەی راگەیاندووە کە سیاسەتەکانی زۆر سەختن لەدەرەوەی پێویستیدانە بەجۆرێك زۆر بەفراوانی کاریان لەسەرکردووە، لەچەند ساڵی رابردوودا چەند رووداوێکی تیرۆریستی ناوەخۆیی روویاندابوو. سەرۆك بۆش دەڵێ، " ئازادی چارەسەری تیرۆرە"، سەرهەڵدانی رێکخراوی قاعیدە هانی رژێمەکانی عەرەبی دەدا بۆئەوەی بەرەو ئاڕاستەی دیموکراسی هەنگاو بنێن. هەر دوای ماوەیەکی کەم لە هێرشەکانی ٩/١١ سەرەك وەزیرانی (مصر) بەپێچەوانەی بۆش جەختی لەسەرئەوە کردەوە کە تیرۆریزم هانی ولایەتە یەکگرتووەکان دەدات بەرەو ئاڕاستەی (مصر) هەنگاوبنێت. ". دەیووت، "ولایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا، لەنێوانیشیاندا گرووپەکانی مافی مرۆڤ، لەڕابردوودا، داوایان لە ئێمە دەکرد بە پێدانی 'مافەکانی مرۆڤ' بە تیرۆریستان. ئێوە دەتوانن ئەم مافە مرۆڤانەیان پێبدەن کە شایانیانە تاوەکو لەرێگای ئەم مافانە بتانکوژن. دوای ئەم کردە قێزەوەنانەی لەنیویۆرك و ڤێرجینیا

ئەنجام دران، لەوەیە ولاّتانی رۆژئاوا بیر لە شەڕی (مصر) بکەنەوە لەدژی تیرۆر وەك مۆدێلێکی نویّ".

سەرۆك بۆش بانگەشەی مسری کرد بۆئەوەی" پێشڕەوی ئەم رێگایە بکات" بەرەو دیموکراسیەتی عەرەبی. موبارەك وەلاّمی دایەوە و رازیبوو لەسەر رێگادانی بەرامبەر کاندیدە بەرهەڵستەکان لەکاتی دووبارە هەڵبژاردنەوەی لە سێپتەمبەری ٢٠٠٥. ئەمە جۆرێك لەتێڕوانینەکان بەرهەم دێنیّ کە بەشێوەیەکی هامشی لە ولاّتە دیموکراتەکانیش بەدیدەکرێن. هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بە پیلانێکی زۆری دیموکراسی و بابەتێکی کەم هاتەبوون. هەڵمەتەکە زۆر کورت بوو، تەنها نۆزدە رۆژبوو. پارتی دەسەلاّت کۆنترۆڵی هەموو دەزگا راگەیاندنەکانیان کردبوو شانبەشانی بودجەی هەڵمەتەکەش. کاندیدەکان پێویست بوون رووبەڕووی هەموو ئەم پێوەرانە ببونایەوە کە موبارەك، بەشێوەیەکی چاوەڕوانکراو لەهەڵبژاردنەکان دەرچوو، گوشیبوونی. سەرەڕای ئەم هەموو ناڕازیبوونە، هێشتاکە لایەنی هاندان بەدیدەکرێت. بۆیەکەمجارە لەمێژووی درێژی ئەم ولاّتە، مسرییەکان لەبەرچاوی سەرکردەکەیاندا لە پێشبڕکێی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا داوای پاڵپشتی لە هاوولاّتیان دەکەن. دەنگدەران ئەزموونی دەنگدانی زیاتر لەیەك هەڵبژاردەیان پێدرا. ئاپۆرای خەڵك ئەوەی بەخۆیەوە بینی کە دروشمەکانی دژی حکوومەت بەرزبکەنەوە و بیّ ئەوەی ئازاربدرێن. دانیشتوانی مسری زیرەك و رۆشنبیرن بۆ پاڵپشتیکردنی پارتە سیاسییەکان بەهەموو رووخسارە ئایدیۆلۆژییەکانەوە، ئەگەر هەڵبژاردنەکان بە شێوەیەکی کراوە و راستەقینەوە سازبکرێن، پارتی دەسەلاّتی بەرهەڵست دەکەوێتە دەست گرووپە ئیسلامییەکان—ئیخوان موسلمین، ئەو پارتەی کە لەساڵی ١٩٢٨وە دامەزراوە. ئیخوان موسلمین بەشێوەیەکی فەرمی توندوتیژی رەتکردۆتەوە، هەروەها لقیان لەهەموو ولاّتانی عەرەبی هەیە. باوەڕی سەرەکیان ئەوەیە کەوا ئیسلامی سوننی چارەسەری پێشکەش بە هەموو کێشەکان کردووە، هەروەها گەڕانەوە بۆ عەقیدەیەکی پاك و بێگەرد دەبێتە هۆی چاککردنەوەی هەموو نەخۆشییە کۆمەلاّیەتییەکان. لەم چەند ساڵەی رابردوودا لە (مصر)، گەشەیان بەزمانی دیموکراسیدا و کارکردنی زیاتر لەگەڵ گرووپە ریفۆرمە عیلمانیەکان. هەرچەندە رێکخراوەکە بەفەرمی لەکارو چالاکییەکانیدا قەدەغەکرا، بەلاّم کاریگەریە کۆمەلاّیەتییەکەی هێشتاکە بە گەورەیەوە ماوەتەوە، ئەندامەکانی—وەك بێلایەن خۆیان کاندیدکردبوو—ناوی خۆیان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ٢٠٠٥ تۆمارکردبوو. ئیخوان موسلمین گەشەی بەخۆیەوە داوە، ئەگەر رێپێدراوبیّ، وەك پارتی ئیسلامی بیّ لایەن بەجۆرێك

کە دەسەڵاتی کەوتە دەست لە وڵاتــانی وەك تورکیــا، ئەندەنوســیا، بۆســنیە هێرســەگۆڤینیا، ئێستاش بەشێوەیەکی نهێنی لە عێراق. سیناریۆیە کەمتر گوڵیەکانیش پێشوازی لێــدەکرێت. حکوومەتی مسری جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە کە ئیخوان موسلمین خۆیان ئامادە دەکەن بــۆ بەکارهێنانی توندوتیژی، هەربۆیەش حکوومەت ڕێگا بــەو گرووپــە نــادات تــاوەکو ڕکابــەری گرتنە دەستی دەسەڵات بکەن بەرێگایەکی ناتوندوتیژی. ئەمەشی کپکردنێکی لۆژیکیانەیە.

بێگومان، نییەتی موبارك بەخێوکردنی ئۆپۆزۆسیۆنێکی ڕێکخراوەییــە کــە ڕووخســارێکی دیموکراســی نیشــانبدات بێئــەوەی هەڕەشــە لــە پارتەکــەی خــۆی بکــات لــە کەمکردنــەوەی دەسەڵاتەکەی. دانیشتووانێك کەتازە لەخەو هەڵسابن کۆنترۆڵکردنیان ئاستەمە. ئەو ئایدیایەی کە مسرییەکان پێویستە ئەڵتەرناتیفی ڕاستەقینەیان هەبێ بۆ حوکمی تاکە پارتی وەکو ئەوەیە بۆبەدەســتهێنانی هێــزی زیــاتر لــەنێوان ئێســتا و ٢٠١١ وادەی هەڵبــژاردنی ســەرۆکایەتی داهاتووەوە. بۆکەمکردنەوەی فشاری گۆڕان، موبارك بەردەوام ســوودمەندی خــۆی لــەم بــوارە بەبیری سیایەت دانەرانی ولایەتە یەکگرتووەکان دێنێتەوە. دوای دەرچوونی بەشی غەززە لەژێر کۆنترۆڵی ئیسرائیل و هەڵکشانی بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســت بــۆ جــارێکیتر، موبــاڕەك چاپووك دەبێ لە ڕێکخستنی ڕووداوەکان کە دەبێتــە نیشــاندانی توانســتی خــۆی بــۆ بینینــی کاریگەری لەسەر فەلەستین و ڕۆڵی وەك پیاوی وڵاتێکی گەورە لەنێو ناوەندی عەرەبیدا.

دوای سی و چوار ساڵ لە وتارەکەی جۆن کەنێیدی دەربارەی ئازادی، سەربەخۆیی جەزائیر، لەکۆتییدا هەڵبژاردنی فرە حیزبی نەتەوەیی ئەنجامدرا. ئەو کــات ســاڵی ١٩٩١ بــوو، پــارتی ســەرکەوتوو ئیســلامی بــوو. سیاســەتمەدارانی ڕۆژئــاوا نیگــەرانبوون بــەوەی ئــەم پارتــە —کەبەشێوەیەکی دیموکراتی هاتۆتــە ســەر دەســەڵات—هــەرەس لــە بــەجێهێنانی ئەرکــەکانی دیموکراتی دێنێ—وەك ڕێگەدان بە ئۆپۆزۆسیۆنە یاساییەکان، ئازادی ڕاگەیاندن، سەربەخۆیی دادوەری. کاتێ سوپای جەزائیری هاتنــە ژوورەوە، ئەنجامــەکانیان ڕاگەیانــد، ئیــدارەی بۆشــی یەکەم هەستی بەئارامیکرد. وەزیری دەرەوەی پێشوو جەیمس بەیکــەر وەســفی ئــەم حاڵەتــەی دەکرد:

*کاتێ من لە وەزارەتی دەرەوە بووم، سەرقاڵی دوورخستنەوەی سیاسەتی فەندەمێنتاڵە ڕادیکاڵییەکانی جەزائیرمان بووین، تەنانەت وامان دەزانی ئەوە سیاسەتێکە کە دژی پاڵپشتیکردنمانە لە دیموکراسیەت. بەشێوەیەکی گشتی، کاتێ تۆ پاڵپشتی لە دیموکراسیەت دەکەی دەبێ بزانی کە دیموکراسیەت خۆی چیت پێدەدات. ئەگەر*

*دیموکراسیەت فەندەمێنتاڵە ئیسلامییە رادیکاڵەکانت پێدەدات، ئەوا دەبێ تۆش لەگەڵ ئەمانە بژیت. ئێمە نەماندەویست لەگەڵ ئەمانە بژین لە جەزائیر چونکە هەستمانکرد تێڕوانینەکانی فەندەمێنتاڵە رادیکاڵییەکان زۆر جیاوازە لەوەی ئێمە باوەڕمان پێی هەبوو... هەروەها بۆ بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان.*

هەروەك مێژوو پێمان دەڵێ، کەوا هەموو هەڵبژاردنە دیموکراتییەکان تەنها دیموکراتەکان براوەنینە. لەزۆربەی کۆمەڵگا عەرەبییەکان، گەورەترین گرووپی بنەڕەتی کۆمەڵگاکان لەدەوروبەری ئایینەوە رێکخراون. ئەگەر دیموکراسیی بۆ بەرهەمهێنانی بەیانی بووبایە، ئەوا ئەنجامەکانی هەڵبژاردن زۆربەی بە قازانجی سەرکردە موسڵمانەکانەوە دەشکایەوە لەوەی بەلای گرووپە بچووکە ئەکادیمیاو خەڵکانی بزنس و پرۆفیشناڵەکان، ئەوانەی کە پاڵپشتی سەرەکی گۆڕانی دیموکراسین. ئەمەش بەڕاستی کەیسێکە لەدەسەلاتداریەتی فەلەستینی و عێراق بەدیدەکرێت.

لەساڵی ٢٠٠٥، بەشداریم لە تیمێکی کارکردنی فرەحیزبی لەسەر دیموکراسیەتی عەرەبی بۆ ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە کرد. هاوکارەکەم کۆنگرێسمانێکی پێشوو بوو، ڤین ویبەر، کەسێکی زۆر بەڕێزبوو. تیمی کارکردنەکە گەیشتنە ئەم دەرئەنجامەی کە ئەگەر عەرەبەکان بتوانن بەئازادی و سەلامەتی سکالاکانیان دەرببڕن، ئەوا زیاتر لە دروستکردنی کۆمەڵگای سەرکەوتوو و پێشکەوتووەوە نزیك دەبنەوە. ئەمەش سوود بەوان و ئێمەش دەگەیەنێ. بۆزیاتر قسەکردن لەسەر ئەم بابەتە، لە بەرەو پێشچوونی دەزگا دیموکراسییەکان، پێویستە ئەوە لەمێشکمان دانێین کە گۆڕانی لەناکاو نە پێویستە و نە خوازراویشە. ئامانجمان دەبێ هاندانی گەشەکردنی دیموکراسی بێ نەك شۆڕشی دیموکراسی. ئەم ئاگادارکردنەوەیە زۆر بەپێی پێویست نەبوو بۆیەکێك لەئەندامانی ئەم تیمە کە نارەزایی ئەوەی نوسیبوو ولایەتە یەکگرتووەکان بەهیچ شێوەیەك بۆی نییە تەرکیز بخاتە سەر هەڵبژاردنەکانی جیهانی عەرەبی. وتی "تەنانەت پارتە عەرەبییە میانڕەو و ناتوندوتیژەکانیش، هەروەها نارازیشبوو بەرامبەر بە ئامانجەکانی ئەمەریکا لەسەر مەسەلەکانی عەرەبی- فەلەستینی و بەهیچ شێوەیەکیش ئامادەنییە بە رازیبوونی ئەم جۆرە کاریگەری و رۆڵەی کە ئێستاکە ئەمەریکا لەناوچەکە دەیگێڕێ". سەرم سوڕما لەم لێکدانەوەیە، کەلەگەڵ ئەم کاتە ناگونجێ. باوەڕکردن بەوەی ئەمەریکا دەتوانێ

بەردەوامبێ لەسەر ئەم کاریگەریەی کە لەسەر ولآتە موسڵمانەکان هەیەتی بێئەوەی پاڵپشتی لە هەڵبژاردنی ئازاد و دادگەری بکات هەمان ئەو باوەڕەیە بەوەی کە ئەمەریکا دەتوانێ بەسەر تیرۆریستانا زاڵبێت بەهۆی بەکارهێنانی ئەو رێگایانەی کە سەرکردە تیرۆریستەکان چاوەڕوانیان دەکرد. وەك ئەوە وایە شەڕ لەسەر خاکێك دەکەین کە سەقامگیری قاچەکانمان پێدەبەخشێ، بەمەش بەلایەنە ستراتیژییەکەی هیچ مانایەکی نییە.

هەندێ لە توێژەران ترسی ئەوەیان هەیە کە دیموکراسیەت رێگا بە بزووتنەوە سیاسییە ئیسلامییەکان بدات تەواوی دەسەلآت بگرنە دەست لە باکووری ئەفریقیا درێژبێتەوە بۆ رۆژهەلآتی ناوەڕاست و کەنداو، هەروەها بەسەر ولآتانی باشووری ئاسیاشەوە. ئەنجامەکەش دەبێتە کوتلەیەکی مەترسیدار بە ولآتانی یەکگرتووی بۆ رق هەڵگرتن لە ئیسرائیل و بەرهەڵستیکردنی ئەمەریکا و بەرگەگرتنیان لە فشارە دەرەکییەکان لەبارەی تیرۆریزم و بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی. هەرچەندە ریسك کارێکی سروشتی دیموکراسییە. هەروەها نموونەی ئەم ئەنجامە دوورە. ئیسلام توانای زۆر زیاترە بۆ کۆکردنەوەی ئەم هەموو کۆمەڵگایانە لەوەی کۆمۆنیزم هەیبوو، هیچ بزووتنەوەیەکیش ناتوانێ سەرکەوێ لەنێو ئەم هەموو جیاوازیی کلتووری و تیۆلۆژیانە لە چوارچێوەی ئەم عەقیدەیە.

ئەو تێڕوانینەی کە موبارەك و سەرکردە عەرەبە هاوبیرەکانی وەك خۆی دایانهێنا ئەوەبوو کە ئەو پارتە سیاسیانەی لەدەورەی ئیسلامەوە دروستدەبن دوورن لەدیموکراتی و هەوێنی توندوتیژی. ئەمە گریمانەیەك بوو لەلایەن ولایەتە یەکگرتووەکان هەردوای هەڵبژاردنەکەی جەزائیر لەساڵی ١٩٩١ دروستبوو. ئەمەش بیرۆکەیەکە ناکرێ بە سادەیی دووربخرێتەوە. لەڕاستیدا، بیرمان بۆئەوە دەچێ کەوا ئەنجامی هەڵبژاردنی ئازاد لە هەندێ ولآتدا بردنەوەی رژێمە ئیسلامییە توندڕەوەکانی لێدەکەوێتەوە. ناشکرێ قەدەغەی بەشداریکردنی ئەم پارتە سیاسییانە بکەین لەسەر بناغەی ئەوەی کە هەندێکیان چ جۆرە رەفتارێك ئەنجامدەدەن. زۆر ئاسانە بۆ حکوومەتێکی سەرکوتکار ناوی" تیرۆریست" لەو کەسانە بنێت کە رازینین بە سیاسەتی ئەم حکوومەتە. ئەگەر دیموکراسی رۆچووە نێو رەگی رۆژهەلآتی ناوەڕاست، پارتە ئیسلامییەکانیش ناکرێ دووربخرێنەوە لەم دیموکراسیەتە. لەمێژوودا، زۆر پارتی سیاسی هەبوونە کە لە بنەڕەتدا لەدەرەوەی

چوارچێوەی یاساوە دروستبوونە، تەنانەت بزووتنەوەکانیش کە رۆژێك لەرۆژان پەیوەندییان لەگەڵ تیرۆریستانەوە هەبووە پێویستە هان بدرێن بۆئەوەی واز لە توندوتیژی بێنن و بەرەو رێگای راست هەنگاوبنێن.

بۆئەوانەی کە دوودڵن لەبەرامبەر پارتە ئیسلامییەکان، باشتروایە خۆیان سەرقاڵ نەکەن بە قەدەغەکردنی ئەم پارتانە بەڵکو دەستبکەن بە پێشبڕکێکردن لەسەر سندووقەکانی دەنگدان لەگەڵیاندا. لە رۆمانەکەیدا بەناوی *بەفر*، نووسەری تورکی ئۆرهان پامۆك باس لە سەرکەوتنی ئەوان دەکات.

> *دەربارەی ئیسلامییەکان، دەرگا بەدەرگا بەگرووپ سەردانی یەکتردەکەن، قۆری و مەنجەڵ، هەروەها ئەم کەرەستانەی کە پورتوقاڵی پێوە دەگوشرێت دەدەنە ئافرەتەکان، لەگەڵ سندووقە سابوونەکان، گەنمە کوتاو و ماددەی پاککەرەوە. جەخت لەسەر دراوسێییە هەژاراکان دەکەن، خۆیان لەگەڵ ئافرەتەکان دەناسێنن، قولاب بە دەزووی زێر دەدوورن بە شانی منداڵەکانیان دەکەن بەنیازی پاراستنیان لە ئەهریمەن و جنۆکە. دەڵێن، " دەنگت بدە پارتی خۆشگوزەرانی، پارتی خودا، ئێمە کەوتووینەتە نێو هەژاری و نەداری چونکە سەرمان سوڕماوە لە رێگای خودا..." ئەوان باوەڕی تووڕەبوون و بێ کارەکانیان بردۆتەوە، لەگەڵ خێزانەکانیان دادەنیشن، نازانن ژەمە نانخواردنی داهاتوویان لەکوێوە دێت، کەچی هیوایان پێدەدەن، بەڵێنی دیاری زیاتریان پێدەدەن... ئێمە تەنها قسە لەبارەی نزمترینی حاڵەتەکانی دونیا ناکەین. هەتا خاوەن کارەکان—تەنانەت بازرگانەکانیش—رێزی ئەمانە دەگرن، چونکە ئەم ئیسلامییانە زیاتر لەسەر کارەکانیان جددیترن، دڵسۆزترن، بێ فێزترن لەهەر کەسێکیتر.*

گرتنەخۆی پارتە ئیسلامییەکان بەشێك لەپرۆسەی دیموکراسیەت بەحکومەت دەبەخشن، هەروەك دوورخستنەوەشیان بەشێك لە تێکدانی ئەم پرۆسەیە دەبەخشن. دیموکراسی چەمکێکی زۆر بەهادارە چونکە دوور لە توندوتیژی رێگای چارەسەرکردنی سەختترین کێشەکان دەبەخشێ، لەرێگای گفتوگۆ و دەنگدان. سەختترین کێشەکان لەجیهانی عەرەبی ئیمرۆکە لەدەوری ئەو مەسەلانە دەسووڕێتەوە کە پەیوەندیان بە پارتە ئیسلامییەکانەوە هەیە: ئایا ئیسلام چ داوا دەکات؟ چۆن تیرۆر پێناس دەکرێت؟ ئایا

گەنجەكان پێویستە فێری چ بكرێن؟ چۆن بتوانین هاوسەنگییەك لەنێوان داواكراوە مۆدێرنەكان و بەها تەقلیدییەكان رابگرین؟ پێویستە بۆ راگرتنی ئەم هەموو مەسەلانە باشتر وایە نیشاندان و داواكردن ( عرض و طلب) لەپرۆسیجەری دیموكراتی بەكاربێنین، لەوەی هەوڵی چارەسەركردنیان بدەین لەرێگای بەكارهێنانی توندوتیژی و سەركوتكردنیان.

هەندێ كۆمەڵەی بچووك لەوەیە بەڕاستی ئامادەبكرێن بۆ سەركەوتن لەرێگای هێز یان تیرۆر. بۆناسینەوەی ئەمە، پێویستە لەسەر هەموو پارتە سیاسییەكان پابەندبن بە بڕیارەكانی دیموكراسی، لەنێوانیشیاندا رێزگرتن لە پرۆسجەرەكانی دەستووری دوور لە توندوتیژی، هەروەك پارتە ئیسلامییەكان هەنووكە بەڵێنی پابەندبوونیان داوە[٢] (١).

لەمەودایەكی درێژتر، باشترین رێگا بۆ پەراوێزكردنی ئیسلامییە توندڕەوەكان كردنەوەی بوارێكی فراوانترە بۆ وەرگرتنی تێڕوانینە جیاجیاكانی دوور لەتوندوتیژی. هیچ شتێ هانی بزووتنەوە سیاسییەكان نادات تابەرەو سەنتەر هەڵبكشێن خێراتر لەو پێویستییەی بۆ دۆزینەوەی ئەو سیاسەتانەی كەدەبێتە هۆی راكێشانی دەنگەكان. سەرۆك بۆش، كە هەندێ شت لەبارەی بردنەوەی هەڵبژاردنەكانەوە دەزانێ، بەمجۆرە ئەم تێڕوانینەی كێشا،" لەوەیە هەندێك بڵێن...، دەنگم پێبدەن، پێشبینی تەقینەوەی ئەمەریكا دەكەم‘ بەڵام ...وای بۆدەچم، بەشێوەیەكی گشتی ئەو خەڵكەی كە خۆیان بۆ پۆستێك كاندید دەكەن دەڵێن، دەنگم پێبدەن، بۆئەوەی چاكسازی لەناو سیستەم بكەم و دڵنیاتان دەكەمەوە لە نانی سەر خوانەكەتان" تیپ ئۆنیل، لەشوێنێكیتردا هەمان خاڵی ورووژاند، " هەموو سیاسییەكان ناوەخۆیینە".

---

(٢) بەگوێرەی راپۆرتێك كەلەلاین گرووپی ئاریشەكانی نێودەوڵەتی ئامادەكراوە، *ئیسلامیزم لەباكووری ئەفریقیا ١: میراتەكانی مێژوو* (نیسانی ٢٠٠٤)، " بزووتنەوەكانی ئیسلامی سیاسی لە باكووری ئەفریقیا چیتر ئیدانەی دیموكراسیەت ناكەن وەك بیرێكی نائیسلامی یاخود ئایدییەك كەپێچەوانەی ئەم ئایدیەیانە بێت كەئێستاكە لە ولاتە موسڵمانەكان بوونی هەیە. لەڕاستیدا، زۆر بە ئاشكرا رەتی ئایدیە تیۆكراتییەكان دەكەنەوە و قەبووڵی رێساكانی دیموكراسی و فرەیی، هەروەها رێز لەو یاسایانە دەگرن كە لەنێو دەستووری هەنووكەدا نووسراونەتەوە".

سەرکردە عەرەبەکان پێویستە چاك ئەمە بزانن کە گەشەسەندنی دیموکراسی لە جیهانی عەرەبی ئەنجامی باشی لێدەکەوێتەوە لەڕووی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ولایەتە یەکگرتووەکان و پێچەوانەکەشی راستە. ئەو دەوڵەتانەی هەنگاو بەرەو دیموکراسیەت دەنێن پێویستە تێبینییەکی تایبەت بۆ بوارەکانی بازرگانی، وەبەرهێنان، هاوکاری بکەن، هەروەها واشنتۆنیش خۆی بەدوور دەگرێت لەو حکوومەتانەی کە هەمیشە رەتی دانپێدانی مافی هاووڵاتیانی دەکەنەوە.

ولایەتە یەکگرتووەکان پێویستە پاڵپشتی لەدیموکراسیەت بکات لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەروەك ئەوەی لەهەموو شوێنەکانیتری جیهان هەوڵی بۆدەدات لەسەر ئەساسی هەمان مەبەست. هیوادارم بەردەوام بین لەگەڵ بوونی هەندێ ئەدگاری بێ فیزی. دیموکراسی دیارییەك نییە کەنە لەلایەن خوداوە و نەلەلایەن ولایەتە یەکگرتووەکانیشەوە ببەخشرێت، بەڵکو سیستەمێکی حکوومەتە بەوەی هەر وڵاتێك لەوەیە هەڵیبژێرێت بۆ بەرەو پێشچوونی هەنگاوەکانی و شێوازی فەرمانڕەواییکردنی. لە وتاری دووەم خولی هەڵبژاردنەکەی، سەرۆك بۆش رایگەیاند، "لەرۆژی دامەزراندنمانەوە، ئەوەمان ئاشکراکردووە کە هەر پیاو و ئافرەتێك لەسەر ئەم زەویە ماف و کەرامەت و بەهای بێ سنووری خۆی هەیە". ئەمەی زیادنەکرد کە لە ولایەتە یەکگرتووەکان لە ١٣٥ ساڵی یەکەمدا یان زیاتر، نیوەی ئەو خەڵکەی کە بەهای بێ سنووری هەبوو (کە دەکاتە نیوەی دانیشتووانی ئەوسای ولایەتە یەکگرتووەکان- و) مافی دەنگدانیان نەبوو. یان لە حەفتا و پێنج ساڵی یەکەم، ملیۆنەها کەس بە زنجیر بەستراببوونەوە، یان پێش ئەوەی شارستانیەتی ئەمەریکا دروستببێ، بێگومان شارستانیەتێکیتر هەبووە و ناچار بەنەمانیکراوە.

دەبێ تەواو واقعی بین لەوە کە پێشبینی چی دەکەین. بە بۆچوونی ئیدارە، گۆڕانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆر پێویستە بۆ سەلامەتی ئەمەریکا—نەك بۆ ئەو تێڕوانینەی کە زۆربەی عەرەبە ریفۆڕمخوازەکان حەز بەبەکارهێنانی دەکەن. دیموکراسیەتی عەرەبی، ئەگەر بەتەواوەتی بێت، ئەوا دەبێتە هۆی بەدیهێنانی ئارەزووەکانی عەرەب. ئەمەش بە شەو و رۆژێك ناگۆڕێت کەچۆن عەرەب سەیری جیهان دەکات، نە چاکبوونیان لەگەڵ ئیسرائیل، نە دڵنیابوونیشیان لە بەدەستهێنانی لیبڕالی کۆمەڵایەتی. بەڵام هەڵبژاردنەکان هێشتاکە هەنگاوێکن لە ئاڕاستەیەکی راست ئەگەربێتوو پێشڕەوی گفتوگۆیەکی سیاسیانەی

راستەقینە بکەن. جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو کۆمەڵگایەی کە بۆچونەکان پشت دەبەستن بەوەی" هەرتاکێك چۆن بیردەکاتەوە" لەگەڵ کۆمەڵگایەکیتر کە هاووڵاتییەکانی دەستدەکەن بە وتنی، "با ئەوەت پێ بڵێم کەخۆم بیری لێدەکەمەوە".

کاتێ لە حکوومەت کارمدەکرد، زۆرجار پێشنیازم پێشکەشدەکرد و هاوکارەکانم ئەوکات رەتیان دەکردەوە، کەچی دواتر لەئامێزیان دەگرت ئەوکاتەی وەك پێشنیازی خۆیان حیسابیان دەکرد. منیش پێشنیازی کەسێکیترم رەتدەکردەوە بۆئەوەی دەرفەتی زیاترم هەبووایە تا بیرم لێکردبایەوە ئینجا قەبوولم دەکرد. سەرکردە عەرەبەکان لێیان چاوەڕوان ناکرێ بەشەو و رۆژێك بەدیموکراسیەت رازیبن، ئەگەر بینرا، ئەوا ناچار بە رازیبونیان کراوە. هەموو جیهان هیوای ئەوە دەخوازن ئەم سەرکردە عەرەبییانە بەلایەنی کەم پێشکەوتنێك لە سیستەمی حوکمڕانییەکانیان بەدیبێنن کە نزیك بێت لە دیموکراسی هەتا ئەگەر ناوێکیتریشی لێبنێن. کاتێکیش ئەمە روودات، ئەمە نابێتە کاری رۆژئاوا. بەڵکو ئەمە روودەدات لەبەرئەوەی سەرکردە عەرەبەکان فێربوونە، لەوەیە زەحمەتترین رێگا، هەروەك جۆن کەنێیدی چەند ساڵێك پێش ئێستا باسی لێوەکردووە ئەوەیە کە، بەهێزترین هێز لەجیهان ئارەزووی مرۆڤە بۆئەوەی ئازاد بێت.

# (١٦)

## ئیسلام لەرۆژئاوا

هەردوای ئەوەی پۆستی وەزیری دەرەوەم پێبەخشرا، دەستمکرد بە گەشتێك بەدەورەی جیهان، پێنج وەستانی یەكەمم لەئەوروپابوو. تەنها لەئەڵمانیا ئایین مەسەلەیەكە، ئایین لەم وڵاتە بۆتە بابەتی زانستی. سەركردە ئەڵمانییەكان، بانگەشەی ئەوەدەكەن، كەوا ئایین بۆتە سیستەمی پارە پەیداكردن، بۆیەش قەدەغەی ئەم كارەیانكرد، ولایەتە یەكگرتووەكان (بۆ ئەم هۆكارانە پێویست ناكات توانج بە تۆم كروز بدەین) ئەم ئایینەی وەك عەقیدەیەكی شەرعی وەرگرتووە. لەساڵی ١٩٩٧، ئەم مەسەلەیەش وەك خیلافێكی ئایینی گۆڕا.

ماوەی ئەمجۆرە بەرائەتە بەسەرچووە. هێرشەكانی سەر دوو تاوەرەكە و تەقینەوەكانی شاری مەدرید و تەقاندنەوەی میترۆی شاری لەندەن روانینی داهاتوومانی تاریك كرد. ئەم كردەوانە جیاوازبوون لەئەنجامدان و قەبارەی قوربانییەكان، بەڵام بەهەمان ئاراستە وەردەگیرێن بە دیمەنێكی هاوبەش لەنێو مێشكماندا مۆربووە—دووكەڵەكە، رووخسارە خوێناوییەكان، نیگەرانی تیمی رزگاركردن، هەنسكی خزم و كەسەكان، رووناكی مۆمەكانی دەست قەشە و دەستە گوڵی كڵۆڵ. هەروەك چاوەڕوان دەكرا، ئەم تراژیدیانە بوونە هۆی نزیكبوونەوەی ئەوروپییەكان و ئەمەریكاییەكان، بەڵام ئەم هاریكارییە مشتومڕێكی زۆری لەسەرە. سەركردەكان لەسەر ئەو ئامانجەی رێگەگرتنی هێرشی زیاتر رازین، بەڵام نەك لەسەرئەوەی چۆن بەباشترین شێوە ئەم ئامانجە بەدەستبێنین. لەگەشتەكانمدا، ئەوروپییەكی زۆرم بینی كە زۆر لەمەسەلەی عیراق تووڕەبوونە و قەناعەتیشیان بەوە هەبوو كەوا هەستی ناكۆكی سەرۆك بۆش لەبارەی بەشەرعیكردنی پرۆسەكە و وتارەكانی دەربارەی جیاكردنەوەی بەرەی خەیر و شەڕ بووە هۆی دروستكردنی تیرۆریستی زۆرتر لەوەی بەسەریاندا زاڵبێت.

ئەوروپاییەكان، بۆماوەیەكی درێژ لەژێر سەرچاوەی جیاوازی هەڕەشەی تیرۆریستانەوە ژیان بەسەردەبەن، سەریان لە داواكراوەكانی ولایەتە یەكگرتووەكانەوە شێواوە بەوەی ٩/١١ هەموو

شتێکی گۆڕی. لەلایەن خۆیەوە، ئیدارەی بۆش پێشنیازی ئەوەیانکرد هەندێ کەس لەوبەری ئۆقیانووسی ئەتڵەسییەوە ئەم هەڕەشانەی بەو جددیەوە وەرناگرن، بەتایبەتی ئاماژەی بە پاشەکشێکردنی سوپای ئیسپانیدا لەعیڕاق بەماوەیەکی کورت دوای تەقینەوەکانی مەدرید—— ئەم کاتە ناخۆشە ئەو جوولەیەی بەتیرۆریستاندا کە خۆیان بەدوایدا دەگەڕان.

ئەزموونی من لەگەڵ تەقینەوەکانی ئەوروپا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی ساڵانی منداڵیم، کاتێك خۆم لەگەڵ خێزان و دراوسێکانمان لەژێر زەمین لەکاتی جەنگی بەریتانیا حەشاردەدا. گومان لەوەدا نەبوو لۆمەی کێ بکرێت بەهۆکاری سەرەکی ئەم تیرۆرە. مەسەلەی لێپرسراویەت زۆر بە توندی مشتومڕی لەسەرکراوە، دوابەدوای هێرشەکانی سەر لەندەن دێت لە تەمووزی ۲۰۰۵. هەندێك، لەنێوانیشیاندا حاکمی لەندەن (کەچەپ رەوە) هەروەها کینیت کلارك (کە راست رەوە)، بڕوایان وایە ئەم تەقینەوانە هۆکاری ئەوەیە بەریتانیا بەشداریکردووە لە هێرشەکانی بۆسەر عێراق، هەندێکیتر لۆمەی ئەم وتارە توند و تیژانە دەکەن کەلەلایەن هەندێ زانای موسڵمانەوە دەدرێن و لەبەریتانیاوە نیشتەجێن. هیچ کام لەم لێکدانەوانە تەواو رازیکەرنین. داگیرکردنی عێراق رێگاکەی بۆ ئیمامەکان ئاسانترکرد بەوەی جەخت لەسەرئەوەبکەنەوە کە موسڵمانانی هەموو جیهان لەژێر هێرشکردندانە، بەڵام هەستی قوربانیدان ئەو پاساوە ئەخلاقییە نادات بە تەقاندنەوەی ئەندەرگراوند لە لەندەن.

ئەم مشتومڕە گەشەسەندنی زۆری بەخۆیەوە بینیوە لەبابەت پێناسەکردنی بەها ئەوروپییەکان، چوارچێوەکانی دەربڕینی ئازاد، گەشەسەندنی کێشەی کۆکردنەوەی کۆچبەرە موسڵمانەکان. لەوەتەی ساڵی ۱۹۷۵ ەوەیە ژمارەی موسڵمانانی کیشوەری ئەوروپا بۆ سێ ئەوەندەی خۆی زیادبووە، ئەمەش لەبەر رێژەی لەدایکبوون و هاتنی بەکۆمەڵی کرێکارەکان لە باکووری ئەفریقیا، رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری ئاسیا. ئەگەر ئەم ئاراستەیە بەمجۆرە بەردەوام بێ، ئەوا موسڵمانان لە ساڵی ۲۰۲۰ سەدا ۱۰ی دانیشتوانی یەکێتی ئەوروپا پێکدێنن. لەهەمان کاتدا، دەیان ملیۆن کۆچبەر چاوەڕوانی دەرفەت دەکەن، بەبێ کار لەسەر شەقامەکانی تونس، رەبات، جەزائیر و دیمەشق رۆژدەکەنەوە. ئەم بەنداوەی کەبۆتە هۆی جیاکردنەوەی ئەوروپای مەسیحی و رۆژهەڵاتی موسڵمانان دووچاری لیك هاتووە، هەروەك هەموو ئەوانەی بەسەر شۆستەکانی شاری لەندەن و پاریس دادەڕۆن شاهێدی ئەوە دەدەن، هیچ شتێ ناگەیەنێ جگە لە گۆڕینی کلتووری ئەوروپا نەبێ.

گەیشتنی کۆچبەرانی هەر کۆمەڵگایەك کاریگەری خۆی لەسەر وڵاتی میواندار هەیە. لە ولایەتە یەکگرتووەکان هەر شەپۆلێکی یەك لەدوای یەکی کۆچبەران مەترسی لەسەر ناسنامەی ئەمەریکی دروستدەکات ئەویش بەوەی یان بەرەو لاوازی دەچێت یان بەرەو نەمانی یەکجارەکی دەبات. بەرزبوونەوەی ئێستای دانیشتووانی ئاسیا و لاتینی کاردانەوەیەکی گۆڕاو نیشاندەدات، بەڵام گونجاندن لە ئەوروپا سەختترە، ئەو وڵاتانەی کە کەمتر لێڕاهاتوونە بۆئەوەی توانای وەرگرتنی ئەم خەڵکانە بدەن. فراوانبوونی یەکێتی ئەوروپا بۆ رۆژهەڵات و باکوور و باشوور سیمایەکی نوێ بە پرسیارە کۆنەکە دەبەخشێ لەبارەی ئایا بوون بە ئەورووپی چ مانایەك دەدات. ئایا تەنها پرسیارێکە ئەو کەسە شەوانە لەکوێ بەسەر دەبات، یاخود وەڵامەکە لەسەر بناغەی بەها و نەریت و باوەڕەوە دەدرێت؟ هەروەك سەرکردەیەکی کڵێسە لە ئەڵمانیا تێبینی ئەوەیکرد، "وڵاتانی ئەوروپا هەمان بنەمای کلتووریان هەیە. ئێمە دەزانین چۆن لەگەڵ کاسۆلیك و پرۆتستانتیەکان بژین چونکە ئیمانی هاوبەش و باوەڕی هاوبەشمان بە مەسیح هەیە. بەڵام پەیوەندییەکان لەگەڵ موسڵمانان تەواو جیاوازە... ولایەتە یەکگرتووەکان خەڵکی لە زۆربەی کلتوورەکان کۆکردۆتەوە. بەڵام وڵاتانی ئەوروپا لەرووە تەقلیدییەکەیەوە هەمان شێوە و کلتووریان هەبووە".

تەمەنم یانزە ساڵان بوو کاتێ خێزانەکەم لە ولایەتە یەکگرتووەکان نیشتەجێبوون. هەرچەندە شانازیم بە کلتووری ئەورووپی خۆم دەکرد، بەڵام تاکە بەرزخوزایم (**طموح**) گونجانم بوو لەگەڵ ئەم وڵاتە نوێیە. پەرۆش بووم بەوەی وەك رۆئاڵێکی (هەرزەکار) ئەمەریکی دەبینرێم، بنێشتم دەجوی، کتێبی خەندە ئامێزم دەخوێندەوە، لەڕووی جلوبەرگ و قسەکردنەوە لاسایی هاو پۆلەکانم دەکردەوە. شێت دەبووم کاتێ دەمبینی باوانم وەك بێگانە مامەڵەدەکەن، دایکم بەردەوامبوو لە خوێندنەوەی چیرۆکی چارەنووس و خورافی، باوکیشم گرنگی زۆری بە رەفتاری رەسمیات دەدا بە پۆشاککردنی چاکەت و بۆینباغ تەنانەت ئەوکاتەی دەچووە راوە ماسیش. کەچی ئەمرۆکە لە ئەورووپا، مامەڵەکردن لەنێو نەوەی خێزانی موسڵمانان پێچەوانەیە. گەورەکان زیاتر توانای گونجاندنیان هەیە لەوەی منداڵەکانیان یاخود نەوەکانیان. گەنجەکانی بێرمینگهام، مەرسیلیا، رۆتەردام، وەکو ئەوانەی لە قاهیرە و (**دارالبیضاء**) دەعوە دەکەن—یاخود لەلایەن بیرکردنەوەکانیانەوە فشاریان دەخرێتە سەر—بۆ سەلماندنی پێناسەی ئیسلامی خۆیان لەڕێگای دەربڕینی بۆچوونە سیاسییەکانیان و پۆشینی بەرگی ئیمان و کڵاو و سەرپۆش و ریش دانانەوەیە.

بەرەنگاربوونەوەی پێکەوەبوون بەتایبەتی لە وڵاتی فەڕەنسا زۆر بەدیدەکرێ، دیمەنی ئەو ئاژاوە بەرفراوانەی کەلە پاییزی ۲۰۰۵ روویدا، لەدەرئەنجامدا دوو رووئاڵی موسڵمان لەبەردەست پۆلیس رایانکرد دواجار بەبەکارهێنانی کارەبا کوژران. خەڵکانی گەنج، زۆربەی بێکارەکان، و ئەوانەی کەلەسەر شەقامەکان ژیان بەسەردەبەن، ئاگریان لەهەزاران ئۆتۆمبێل بەردا، لەبەرناڕەزایی جیاوازی لەمامەڵەکردن، بێزاری، هەندێ خەڵك ئەنجامدانی ئەم ئاژاوەیە تەنها "بۆ خۆشی" ناویان دەبرد. دەسەڵاتدارانی فەڕەنسا باری نائاساییان لە وڵات راگەیاند، ئەوەش بۆجاری یەکەمە لەوەتەی جەنگی سەربەخۆیی جەزائیر بەرپابوو لەنیوەی سەدەی رابردوو. زۆربەی ئەوانەی ئەم ناڕەزاییانە شیدەکەنەوە لۆمەی فەڕەنسییەکان دەکەن بەوەی کە بەجۆرێك رەفتار دەکەن وەکوئەوەیە دروشمەکەیان " ئازادی، یەکسانی و برایەتی" واقیعی بێ لەجیاتی ئەوەی نموونەیی. وڵاتی عیلمانی فەڕەنسی جیاوازی ئایینی و رەگەزی ناناسێتەوە، بۆیەش هیچ بنەمایەك بۆ سیاسەتەکەیان نییە کە بگەڕێ بەدوای کەمکردنەوەی رێژەی بەرزی بێکاری لەنێوان هاووڵاتیانی رەسەنی باکووری ئەفریقیا. ئەنجامدانی رووپێوێك لەبارەی بنەچەی رەنگ و عەقیدەوە کارێکە لەوەیە ئەمەریکی و بەریتانییەکان بیکەن نەك فەڕەنسییەکان. ئەمەش کۆچبەران لە ناخۆشی و ئاریشەوە جێدێڵێت، پێیان دەوترێت ئێوە تەواو هاووڵاتی فەڕەنسین، بەڵام زۆرجار وەك هاووڵاتی نمرە دوو مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت لەکاتی پێدانی کار و بەکرێگرتنی شوققە و خانوو. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، حکوومەت ئەنجوومەنێکی پێکهێناوە بۆ رووبەڕووبوونەوەی جیاوازی چینایەتی و دەستیکردووە بە ئەنجامدانی چەند هەنگاوێك بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی پڕۆگرامەکە بەشێوەیەکی ئەرێنی. ئەمەش دەبێتە هەنگاوێکی شۆڕشی بۆ فەڕەنسا و بەرگەگرتنی توندوتیژی راست رەوەکانی نێو وڵات.

تەنانەت پێش ئەم کردەوە ئاژاوەیەی فەڕەنسا، سەرکردە ئەوروپاییەکان نیگەران بوون لە نەتوانینی ئەو کۆچبەرانە بۆ گونجانی خۆیان لەگەڵ ژیانی ئەو وڵاتانەی کەهەڵیانبژاردووە. بۆ موسڵمانان لەئەوروپا، ئەوە مەسەلەی ئیسلام و رۆژئاوانییە، ژیانیان رەنگدانەوەی ئاریشە و

دەرفەتی ئیسلامە لە رۆژئاوادا. توانستی ئەوروپا بۆ وەرگێڕانی ئەم واقیعە بۆ شتێکی پۆزەتیڤ هێشتاکە لەپێواندایە(*).

دەرفەتی ئەوەم هەبوو گفتوگۆی ئەم بەرەنگاربوونەوەیە بکەم لە سێپتەمبەری ٢٠٠٥ لە کۆنفرانسێکدا کە سەرۆکی پێشوو کلینتۆن لەنیویۆرك میوانداری کردبوو. لەنێو بەشداربووان مستەفا سیرتج، گەورە موفتی بۆسنی دانیشتبوو. سیرتج پێشنیازی ئەوەیدەکرد کە ئەوروپاییەکان بە ساردییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو بەشداربوونە دەکەن کە موسڵمان و جووەکان پێشکەش بەمێژووی ئەوروپای دەکەن. بۆچەندین سەدە دەچێ موسڵمانان لەناوەڕاستی ئەوروپا و بەلقان و رۆژئاوا دەژین، ملیۆنان نەوەی دووەم و سێیەمی کۆچبەران کەبەتەواوەتی ئەندامی کۆمەڵگایەکە پێکدێنن. بەمەش شەپۆلێکی گەورەی هاتووەکان کە پێکەوەبوونێکی دژواری دروستکردووە. سیرتج وتی، پێویستە موسڵمانان بە حوکمی ئەو شوێنە رازیبن کە تیایدا یاساکانی ئیسلامی جێبەجێناکرێت  وەخۆیشیان تیایدا کەمینەن.

بەڵام ئەم ئەوروپیانەش پێویستە قەبووڵی مافەکانی موسڵمانان بکەن تاوەکو بەیەکسانی لەگەڵ ئەوانیتر بژین. پەیمانێکی کۆمەلایەتی پێشکەشکرد بەجۆرێك موسڵمانە ئەوروپییەکان بەڵێن دەدەن بۆ راپەڕاندنی رێسا دیموکراتییەکان لەکاتێکدا جەختیش لەسەر مافە سیاسی و ئابووری و ئایینەکانی خۆشیان دەکەنەوە. سیرتج باس لەوەدەکات کە موسڵمانان دەبێ تەرکیز بخەنە سەر لێپرسراویەتەکانیان بۆئەوەی شایانی وەرگرتنی ئازادی بن هەروەها ئەوروپییەکانیش بزانن کە ئیسلام بەکلتووری ئەوانەوە بێگانە نییە بەڵکو بەشێکە لەم کلتوورە.

ئەرکەکەی سیرتج زۆر زەحمەت دەبێ بەهۆی بوونی ژینگەیەکی سیاسی گرگرتوو بەجۆرێك تۆمەتەکانی لایەنگیری خول بەدەوری کەمترین خرۆشانی لایەنێکەوە دەخواتەوە بەبەراورد لەگەڵ بانگەشەکانی رادیکالیزمی لەلایەنەکەیتردا. لە سێپتەمبەری ٢٠٠٥، رۆژنامەیەکی دانیمارکی زنجیرەیەکی کاریکاتێری کارتۆنی بڵاوکردەوە لەسەر شێوەی محەممەد پێغەمبەر کە

(*) مەسەلەکانی گونجان و پێناسە کەلەم بەشەدا خراوەتەڕوو، پەیوەندیشی بە ولایەتە یەکگرتووەکان هەیە، بەڵام بە رێژەیەکی کەمتر. هەرچەندە ژمارەی تەواو دیاریکردنی ئاستەمە، بەڵام موسڵمانان سەدا ١ تا ٢ی رێژەی دانیشتوانی ئەمەریکا پێکدێنن. لەم ژمارەیەدا، بەلایەنی کەم، یەك لەسەر سێی ئەفریقی ئەمەریکییە لە ولایەتە یەکگرتووەکان لەدایکبوونە. شێوە و ئاراستەی (ئیسلامە ئەمەریکییەکان" بابەتی دیراسە و توێژینەوەیە لەنێو کۆمەڵگاکانی ئایینی و ئەکادیمی.

لـەقالبی تیرۆریستان ئامـاژەی بۆکردبـوو. شـەپۆلێك لـەناڕەزایی و هەنـدێك توندوتیـژیش، بەرپابوون لەوکاتەی ئەم کارتۆنە ریسواکەرانە دووبارە لە شوێنێکیتری ئەوروپا لەچاپدرانەوە و لەسەر تۆڕی ئینتەرنێتیش بڵاوکرایـەوە. ئـەم هەڵچـوونە بەشـێوەیەك دروسـتبوو بەهۆیـەوە ئەورووپیە عیلمانییەکان و موسڵمانان دابەشبوون، هـەروەها پەرۆشـی تونـدڕەوەکان لەهـەموو شوینێکەوە رقی خۆیان بەرامبەر بەرژەوەندییـەکانی ئـەوروپا هەڵڕشـت. بڵاوکردنـەوەی ئـەم کارتونانە، لەگەڵ ئەوەی راهێنانێکی ئازادی رادەربڕینە، هەروەها کارێکی تەعەسوبیەتیشـە. پرۆتستۆکردنەکانیش بەهەمان شێوە راهێنانەکی ئازادی رادەربڕینە، جگە لەوانەی ئاراسـتەی پرۆتستۆیەکەیان بـە توندتیژییـەوە گـۆڕی. هـەموو ئـەم کارانـەی کـران زۆر جێگـای داخ و پەشیمان بوونەوەی لەدوا هات، سـەرکەوتنێکی سـۆزبوو بەسـەر عـەقڵ. ئـەم هەڵوێسـتانەی کەبووە هۆی پەیدابوونی ئەم ئاریشەیە، کارێکی تازەنەبوو بەڵکو بەرنامەرێژبوو.

لەساڵی ۱۹۹۱، بەشداریم کرد لە رووپێوێك کەرۆژنامەی لـۆس ئـەنجلۆس تـایمز ئـەنجامی دابوو بەناونیشانی " تریەی ئەوروپا". بەدۆزینەوەی لایەنگری بەرامبەر گرووپـە کەمینـەکان مەندەهۆش نەبووین، بەڵام بەو هەستە ناخۆشانەی کەبەرامبەر موسـڵمانەکانەوە دەردەبـڕدران سەرسام بووم، بەتایبەتی ئەوانەی لە باکووری ئەفریقییاوە کۆچیانکردووە. کاتێ جەنگی بۆسنە بەرپابوو، تووشی شۆك (بەڵکو غەمباری) ببووم بەو هەڵوێستانەی هەندێ هـاوڕێی ئـەوروپیم ئەوانەی موسڵمانەکانی بۆسنیەیان بە نـا شارسـتانی و نارۆشـنبیری لەقەڵـەم دەدا بەرامبـەر زۆردارە کرواتی و سربیەکان. لەماوەی ئەم چەند ساڵەی رابردوودا گوتارێك هەبوو کە بەدەنگی بـەرزەوە هـاواری بـۆدەکرا "ئـەوروپا بـۆ ئەورووپیـەکان" و "بێگانـەکانیش بـۆ ماڵـەوە". سیاسەتمەدارەکان بەشێوەیەکی رۆتینی بانگەشەی خۆبەستنەوەیەکی توندتر لەسـەر کۆچـبەران دەکەن لەکاتێکدا موسڵمانەکان سکاڵای ئەوەدەکەن کە جیاوازی چینایەتیان لەدژیەوە دەکرێ، چونکە ئەوان بەگوتەی خۆیان بوونەتە قوربانیانی " فۆبیای ئیسـلام". ئاریشـەی کارتۆنـەکان دوابەدوای هەندێ رووداوی ناشرینەوە دروستبوون—لەساڵی ۲۰۰۲ کوشتنی سیاسەتمەدارێکی هۆڵەندی کە رەخنەی لە ئیسلام گرتبوو، کوشـتنی هۆڵەندییـەکی تـر لـە ئۆکتۆبـەری ۲۰۰٤ کەسێکی سینەماکاربوو، فیلمێکی دەرهێنا کە بە دژایەتیکردنی ئیسلامی دادەنرا.

لەهـەمان کاتـدا، کلتـووری لێبـوردەیی، کەبۆماوەیـەکی زۆرە جێـی شـانازی زۆربـەی ئەورووپییەکانە، بۆتە جێگای گومان لەلایەن ئەوانەی کەدەڵێن" بژی و لێگەرێ کەسانیتریش با بژین" ئەوا دەبێتەهۆی لەدەستدانی کۆنترۆڵ. زانایان نیگەرانن لـەوەی ئـەوروپا ببێتـە خـاکی

خوێناوی بۆ تیرۆریستان. شـوێنێکە کەتیایـدا پیلانگێـڕان دەتـوانن خۆیـان لەپشـت دیـواری یاسایەوە حەشاربدەن و دەسـتکەوتنی سـوودمەندییە کۆمەڵایەتییـەکان، نـەریتی ئـازادی را دەربڕین و نەبوونی سزای لەسـێدارەدان. پێشـڕەوانی موسـڵمانانی ئـەوروپی لـەبارەی هـەمان باوەڕەوە زۆر نیگەرانن. هەوڵیان داوە بۆ لابردنی مایکرۆفۆن لەبەردەم ئەم ئایدیۆلۆژیایانەی کە دەربڕینی تووڕەبوونـەکانیان ناونیشـانە سـەرەکییەکان وەردەگـرن بـەڵام شـەرمەزاردەبن یـان ڕووبەڕووی مەترسی زۆرینەی موسڵمانان دەبنەوەی ئەوانـەی پابەنـدن بەیاسـا(*)(*). بـوونی توخمی توندڕەو ململانێی لەگەڵ ناکرێت.

لە نیسانی ٢٠٠٤، پۆلیسی بەریتانی دەسـتیانگرت بەسـەر نیوتـەن مـەوادی ئـەمۆنیۆم نـیترات، کـە تـوخمێکی تەقەمەنییـە، پێشـتر لـە هێرشـە تیرۆریسـتەکانی بـالی و تورکیـا بەکارهاتووە. دۆزینەوەی ئەم مەوادە بووە هۆی دەستگیرکردنی هەشت پیاوی موسڵمان. دوای ساڵێك، پۆلیسی ئیسپانی گرووپێکی پاکستانی گرت گوایە پەیوەندیان بە قاعیدەوە هـەبووە. لەسەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٥، پۆلیسی فەرەنسی و ئەڵمانی خانەیەکیان تێکدا کەلەرێگەیـەوە ناونووسی توندڕەوەکانی بۆ عێراق لێ ئەنجامدەدرا. چالاکوانانی ڕێکخـراوی تیرۆریسـتی ئـەبو موسعەب زەرقاوی لە شەش وڵاتی ئـەوروپی دەسـتگیرکران. کاربەدەسـتانی بـەریتانیا وای بۆدەچن ١٠،٠٠٠ تا ١٥،٠٠٠ موسڵمان هەبێ لەناو شانشینی یـەکگرتوو کـە پاڵپشـتی لـە قاعیدە دەکەن ، لەنێوانیشیان ٦٠٠ کەسیان لەسەر دەستی گرووپە توندڕەوەکانی ئەفغانستان و شوێنەکانیتر ڕاهێنراون. بێ ئومێـدی دەسـەڵاتداران لەوەدایـە کـە گومـانلێکراوانی تـیرۆر بەرێکی لەگەڵ هیچ پرۆفایلێکی دیموگرافی ناگونجێن. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەیان لـەنێو خێزانـە کۆچبەرەکانن، جێبەجێکارانی تەقینەوەکەی تونێلی مـیترۆی لەنـدەن لـەدایکبووی بـەریتانی

(*)تەقینەوەکانی لەندەن خێراییی دایە سەرکردە موسڵمانەکانی ئەمەریکا بۆ چڕکردنەوەی هەوڵەکانیان بۆ ڕێگەگرتن لە کاری توندڕەوی و توندوتیژی. بەگوێرەی سەلام مەرەیاتی بەڕێوەبەری تەنفیزی ئەنجوومەنی کاروباری ئیسلامی لە لۆس ئەنجلوس: "پێش ئەوەی خەڵك بیربکاتەوە، هیچ شتێکمان لەگەڵ تیرۆریستان نییە، ئایینەکەمان ڕوونە، دەبێ بۆهەموو کەسێکیش ئاشکرابێ. لەئێستاوە نابێ چیتر دوورەپەرێزبین، بەڵکو دەبێ بەشداربین لەبیناکردن. بۆیە بەکۆمەڵە ئەم کارە ئەنجامدەدەین، بەیەك دەنگ قسەدەکەین، بەمنداڵەکانیشمان دەڵێین ئەمە بەڕاست وەربگرن، نابێ سەرلێشێواوبن و بەوکەسانە باوەڕبکەن کەدێن و پێیان دەڵێن بواری توندوتیژی لە ئیسلام هەیە.

بوون، یەکێکیان باری دارایی زۆر باش بوو، هیچ کەسێکیشیان رابردوویەکی بەوجۆرە خراپ و توندوتیژی نەبوو. ئەگەر ئەمەش نموونەیەك بێ، ئەوا ناونووسکراوە بەئەزموونەکان گـۆڕانێکی خێرایان لەهەڵوێستی ئایینەوە بەسەرهاتووە. موسڵمانێك بەبێ مەبەسـت ژیـان بەسـەردەبات گرنگییەکی کەم بە عـەقیدەکەی دەدات، لەپڕێکا لەرێگای پەرستن و تێکۆشانەوە ناسنامەیەکی نوێ دەدۆزێتەوە. سەرەك وەزیرانـی بـەریتانی، تـۆنی بلێـر، پێـی وتم، "بەشـێك لـە تایفـەی ئیسلامییەکان لەگەڵ ئەم کۆمەڵگایە ناگونجێن و تێکـەڵ نـابن. جوولەکـەکان، هینـدۆزەکان، چینییەکان و زۆرینەی موسـڵمانەکان توانیویانـە خۆیـان بگـونجێنن، بـەڵام هەنـدێ گێرفـانی موسڵمانان هەیە بۆ کاری توندڕەوی تەراخانکراوە". چـونکە لـەنێو ئیسـلامی سـوننی هـیچ ناوەندێکی دەسەڵات نییە ، بۆیە هیچ کەس نییە وەك زانایەکی ئایینی وتارەکـانی پێشـکەش بکات. بلێر دەڵێ، " لەم هەلومەرجانەدا، یەکێك هەڵدەستێتەوە ئیعلانی ئەوە دەکات، "مـن ئیمامم و ئەم قسانەش فتوانە". بۆیە ئیمامە رادیکاڵـەکان زۆر مەترسـیدارن. ئـەوەی فێـری خەڵکی دەکەن ئیسلامی راستەقینە نییە، بەڵکو وەرگێڕانێکی شێواوە تێکەڵ بە سیاسەتکراوە و جۆرە پەندێکە کەدوورە لە ناوەڕۆکی دەستەواژەکانی قورئانی کە تەنها لەلایەن بـن لادنـەوە پەسەندکراوە. موسڵمانە لاوەکان بەدوای شتێکدا دەگەڕێن کەماناداربێ، تـاوەکو گرنگـی پـێ بدەن، بەڵام سەریان لێ دەشێوێنن و ئەو گوتارانە دەدۆزنەوە کـە لـە جیهـاد بـەکاردەهێنرێن، بۆیە دووبارە وەك تیرۆریست لەدایك دەبنەوە.

بەندیخانەکانی ئەورووپا بنارێکی بەموسڵمانەکانەوە پڕبۆتەوە. لە وڵاتی فەرەنسـا زۆرینـەی بەندییـەکان پێکـدێنن. پسـپۆڕانی بـواری رووبەڕووبوونـەوەی تیرۆریـزم لـەوە دەترسـن کـە کۆبوونەوەی تاوانباران گرنگترین شوێنە بۆ ناو تۆمارکردن کە قاعیدە کـاری لەسـەربکات(*).

---

(*) ریتشارد رید، یەکێك بوو لەو سەرنشینانەی ئەو فڕۆکەیەی کەبەرەو مەیامی لە دیسەمبەری ٢٠٠١ بەڕێدەکەوت، لەنێو پێڵاوەکانیدا بۆمبی هەڵگرتبوو، لەنێو بەندیخانەیەکی بەریتانی ببووە ئیسلام. محەمەد بوییری، بکوژی سینەماکاری هۆڵەندی تیۆ ڤان غۆخ، بووە کەسێکی رادیکاڵ لەماوەی حەوت مانگی بەندکردنی. لەکۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٤، پۆلیسی ئیسپانی سێزدە کۆچبەری باکووری ئەفریقیایان دەستبەسەرکرد کەپلانی تەقاندنەوەی دادگای نیشتیمانیان لەمەدرید داڕشتبوو. ئەو پیاوانەی، کەبۆماوەیەکی کورت گیرابوون، دوای یەکتربینینیان لە بەندیخانە، بڕیاریاندا بە دەمەزراندنی گرووپێکی تیرۆری، بەناوی شەهیدانی مەغریب.

ژمارەیەکی کەمی بەندی رۆژئاوایی ئامادەکراون بۆ پێشکەشکردنی رێنمایی ئەخلاقی دەنگی بۆ ژمارەیەکی زۆری هاوبەندییە موسڵمانەکان. حکوومەتەکانی ئەورووپی لەم کێشەیە ئاگادارن بەڵام دڵنیانین لەچۆنیەتی وەڵامدانەوەی. هەندێکیان هەوڵی جیاکردنەوەی بەندییە موسڵمانەکانیان دەدا، هەندێکیتر پێیانوایە ئەمە تەنها بڵاوکردنەوەی مەترسییە. هەرچۆنێك بێ ماوەی بەندیخانە دیاریکراوە. بەرەنگاربوونەوەیەکیتر دۆزینەوەی رێگەیەکە بۆ رێگەگرتن لە دراوسێیە ئەتنیکییەکان لەتێکچوونەوە بۆ پەنهانکردن. ئەوەی دواتر نیشتیمانێکە جۆرێکە لە بێبەشکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەوانەی لەنێو خەڵك دوورخراونەتەوە بەجۆرێك سەدەیەك پێش ئێستا تادەگاتە پەیماننامەی یوتۆپیای مارکسیزمەوە.

لەم رووەوە، سەرکردە ئەوروپییەکان هەڵبژاردەی زۆریان لەبەردەست نییە بۆ دووبارە چاوپێخشاندنەوەی نزیکبوونەوەکان لەهاوسەنگکردنی نێوان گرنگی ئاسایش و رێساکانی دیموکراسی. پرسیارێك لەهەردوو بازنەی ئایینی و عیلمانی دەکرێ ئایا ئەمە زیرەکییە بەهەوڵدان بۆبەخشینی نەریت و بەهاکانی کۆچبەران یاخود سووربوون لەسەر ناچارکردنیان بۆئەوەی بەتەواوی پابەندبن بە یاسا ئەوروپییەکان. پێگیرەکان (متشددون) پێشنیازی ئەوەدەکەن که گرتنەبەری دیالۆگ بێ بەرهەم دەبێ چونکە گەیشتن بەو کەسانەی کەکێشەکان دروستدەکەن نسکۆ دێنێ، تیرۆریستان بەشداری لەکۆنفرانسێ ناکەن کە ئەندامانی مەسیحی دانشتبن تیایدا، هەروەها گوتارەکانی خۆشیان ناگۆڕن. بۆیە دەبێ سەلامەتی لەپێش هەموو شتێکەوەبێ.

هەر لەم رۆحیەتەوە، هەوڵەکان بەردەوامن لەوزۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکان بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتی پۆلیس بۆ سیخوڕیکردن و راوەدونانی تیرۆریستە گومانلێکراوەکان. وڵاتەکان زۆر ئاسانتر هەوڵەکانیانداوە بە دوورخستنەوەی وتاربێژە توندڕەوەکان و دەستکردن بە داڕشتنی پرۆگرامەکانیان بۆ راهێنانی کەسانی بێلایەن و میانڕەو ، بەهیوای چاودێریکردنی پێشکەوتنەکانی مۆدێلە ئەوروپییەکەی ئایینی ئیسلام. هەندێ وڵات هەڵساون بە کۆمەکردنی مزگەوتەکان تاوەکو وایان لێبکەن کەمتر پشت بە سەرچاوەکانی دەرەکی ( وەك عەرەبستانی سعودی) ببەستن بۆئەوەی زیاتر ئاوێتەی مەسەلەی کۆمەڵایەتی بن. لەهۆڵەندا، داوا لەزانایانی ئیسلامی کراوە وتارەکانیان بە زمانی هۆڵەندی بخوێننەوە لەوەی بە عەرەبی. حکوومەتەکەی بلێر قەدەغەی هاتنە ژوورەوەی ئەو کەسانەیانکردووە کە رابردووەکیان لە پاڵپشتیکردنی تیرۆر هەیە، هەروەها لیستێکی رەشیشیان ئامادەکردووە بۆ بلۆککردنی ئەو کەسانەی کە سۆزدارن

بۆ تیرۆریستان و دەرکردنی ئەوانەش کە ئێستا لەبەریتانی نیشتەجێن. هەنگاویشی ناوە بۆ راگرتنی ئەو وتار و نووسین و ماڵپەڕانەی کەدەبێتە هۆی خۆشکردنی ئاگری تیرۆریزم.

دیموکراسی لەنێو پرۆسەیەکی کراوەی گفتوگۆ چەق لەسەر بنچینەی جیاوازی سیاسەتەوە دەگرێ. هەر حکوومەتێکی دیموکراتی دەستبکات بە داخستن و رێگەنەدانی هەموو پۆلێنەکانی دەربڕین ئەوا لەناکاو خۆی لەناو خاکێکی غەریب دەدۆزێتەوە، وەك زۆردارەکان لەسەریەوە رێدەکات. کۆمۆنیستەکان ئەوانەی لەسالآنی جەنگی جیهانی دووەمەوە کۆنترۆڵی دەسەلآتی چیکۆسلۆڤاکیایان کرد لێبوردەیی پارچەبوونیان نەبوو، بۆیە خێزانەکەمان لە ولایەتە یەکگرتووەکان نیشتەجێبوون. بۆچەندین سەدەیە دەچێ، دیکتاتۆرەکان بەندیخانەکانیان بەو خەڵکانە پڕکردۆتەوە کە بیروباوەڕەکانیان بە مەترسیدار و تووڕەکەر لەقەلەم دەدرێن، یاخود هانی توندوتیژی دەدات لە سیستەمی حوکمڕانی ئێستادا. لەماوەی ئەم سالآنەی رابردوو، ستەمکارەکان هەڕەشەی تیرۆریستی وەك پاساوێك بۆ بێدەنگکردنی بەرهەڵستە توندوتیژو ناتوندوتیژەکان وەك یەك دێننەوە. ترسی ئەورووپای ئەمڕۆ (بۆ ولایەتە یەکگرتووەکانیش) ئەوەیە جیاوازی لەنێوان پاڵپشتیکردنی تیرۆریزم و رەخنەگرتن لە سیاسەت ناکات و هەردوولایەنی تێکەڵکردووە، پاساش بەکاردێت وەك هۆکارێکی رێگەگرتنی گفتوگۆی رێپێدراو.

ئەم ترسە لەدژی ئەوانیتریشەوە حیساب دەکرێت، لەنێوانیشیاندا ئەم وشە خوێناویانەی کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی فیتنە و دووبەرەکی، زنجیرەیەك کە رابردووەکی لەخۆیەوە هەڵگرتووە. وتەی کۆن لەبارەی ئازادی رادەبڕین ئەوەیە کە ئەم ئازادییە درێژنابێتەوە بۆ "ئاگر" گرتن، لەناو شانۆیەکی قەرەباڵغ. ئێمە ئێستاکە لەناو شانۆیەکی قەرەباڵغ داینە، وای بۆدەچم زۆر دادگەرییە بە قەدەغەکردنی ئەم دەربڕینانەی کەبە ئاشکرا دبێتە هۆی بەرزکردنەوەی کردەی تیرۆریستی. منیش هاوڕام لەگەڵ ئاگادارکردنەوەکەی بلێر بۆئەو کەسانەی لە وڵاتەکانیتر دێنە ناو بەریتانیای گەورە جا ئەوەی بەمەبەستی شوێنگەیەکی سەلامەتی سیاسی دادەنێت یاخود بۆ دەرفەتی ئابووری دەگەڕێ. دەیوت، " لێرە بمێنەوە خۆت بەئەرکێکەوە سەرقاڵ بکە، ئەم ئەرکە بەشداریکردن و پاڵپشتیکردنە لەو بەهایانەی کە بەردەوامی بە شێوازی ژیانی بەریتانی دەدات. ئەوانەی کە پێشێلی ئەم ئەرکە دەکەن هەوڵی نانەوەی کاری توندوتیژی لەدژی وڵاتەکەمان دەدەن، جێگایان لەم شوێنە نابێتەوە". هەمان هۆشداریش بۆ ولایەتە یەکگرتووەکان بە گونجاو دادەنێم.

کاتێ ئەوە دەڵێم، باوەڕی خۆم دەخەمە نێو کۆمەڵگا و دادگەی سەربەخۆی تەشریعی و دیموکراسیەتی ئەورووپی و ئەمریکی بۆ پاراستنیان لەدژی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات. ئەو هاوسەنگییەی کە لەهەردوولای ئەتڵەسییەوە بەدوایدا دەگەڕێین جگە لەبەرهەمی هەستێکی گشتی پاك چیترنیە: وەستاندنی ئەوانەی هەوڵی رووخانی سیستەمەکەمانیان دەدا، بێئەوەی خۆمان لاوازبکەین لەبەرامبەر رێسا بنچینەییەکان کە پێناسەی ئەم سیستەمە دەکەن.

سەرکەوتنی راستەقینە بەسەر تیرۆریزم بە بێدەنگکردنی خەڵکان نایەتە بوون، بەڵکو لەرێگەی گەورەترکردنی دەنگە عەقلانییەکانەوە دەبێ وەك مستەفا سیریتج. لەئەورووپا، وەکو شوێنەکانیتر، شەڕ حیسابی زۆر لایەن دەکات و لەسەر هەموو ئاستەکانی نێو دڵ و رۆحی ئیسلامەوە دەستی پێکردووە، وەك لەنێو خێزانەکان، دراوسێیەکان، کۆمەڵگاکان، هەروەها نەتەوەکان. لەم شەڕەدا، هەر هاوپەیمانییەك جیاوازییەك دروستدەکات، هەر هاوپەیمانییەکی ونبوو پێویستە بدۆزرێتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشەوە، زۆر نیگەرانم بەو ئیتحیمالەی کە ئەورووپاو ویلایەتە یەکگرتووەکان پشتیان لە خەڵك و حکوومەتی تورکی کردووە، کەبۆماوەیەکی درێژدەبێ ئەم حکوومەتە دۆستی رۆژئاوابووە ئێستاکەش لە شوێنێکی دوور لە یارمەتیدانە.

سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە جەنگی جیهانی یەکەم هەموو ئەو پاشماوانەی لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی مابوونەوە تێکیشکاند، لەخۆڵەمێشەکەی ئەم ئیمپڕاتۆریەتە شتێك سەری هەڵدا کەهەرگیز لەپێشووتر نەبینراوە: وڵاتێکی ئیسلامی عیلمانی. کۆماری تورکیا لەسەر دەستی یەکەم سەرۆك، کەمال ئەتاتورك، دروستبوو، پیاوێك کە تواناکانی بێ سنووربوو لە بنیاتنانی وڵاتێك کە لەلایەك مۆدێرن بوو لەلایەکیتریشەوە ئاڕاستەکەی بەرەو رۆژئاوا هەنگاودەنا. ئەتاتورك بەباوەڕ بەخۆبوونێکی زۆرەوە وەسفی ئایینی دەکرد بەوەی " وەك خەنجەرێکی ژەهراوی وایە رووەو دڵی خەڵکەکەم هەنگاوینەوە". بۆ کاردانەوە لەدژی دەروێش و شێخە ئایین پەروەرەکانی ئەو سەردەمە، ئەوەی راگەیاند، " زۆر بە توندی رەتی باوەڕهێنانی ئەوە دەکەمەوە، کە ئەمڕۆکە... لەژێر سایەی زانست و زانیاری و شارستانیەتدا، ... لەنێو کۆمەڵگای شارستانی تورکییەوە، کەسانی زۆر سەرەتایی هەبن بەدوای لایەنی خەیری ماددی و ئەخلاقیدا بگەڕێن لە رێنماییکردنی... شێخێکەوە".

ئەتاتورك چەکوشێکی گەورەی بەسەر بناغەکانی کۆمەڵگا داهێنا، خەلافەتی ئیسلامی هەڵوەشاندەوە و جەختی لەسەر کۆنتڕۆڵکردنی دەوڵەت لەسەر ئایین کردەوە. هەربەم

ئاڕاستەیەوە، قوتابخانە ئایینییەکان داخران، بەلاتینی کردنی زمانی تورکی، شێوە دەستووری ڕۆژئاوایی لەناو تورکیا پەیڕەودەکرا، پڕاکتیزەکردنی جیاکردنەوەی ڕەگەزەکان لەناو پۆلەکان و شوێنی کارکردن کۆتایی پێهات. بانگەشەی ئەوەیدەکرد، " نابێ لە جیهانی نوێ دابڕێین، ئەگەر بتوانین تەنها نیوەی دانیشتووانەکەش بەمۆدێرن بکەین". لەدوای چەند سەدەیەك، سوپای تورکی وەك پاسەوانی میراتی ئەتاتورك خزمەتیان دەکرد، پارێزگاریان لە سروشتی عیلمانیەتی حکوومەتەکەیان دەکرد. بەپەرۆشەوە حەزدەکەن هەڵوێستێکیان وەك وڵاتێکی ئەورووپی هەبێ، تورکیا لەساڵ ١٩٦٠ دەستیکرد بە پێشکەشکردنی داوای بەئەندامبوونی لە بازاڕی گشتی ئەورووپی، کەدواتر بووە یەکێتی ئەورووپا، تاوەکو ئێستاش لەو دەرگایە دەدات.

وەکو یانە تایبەتییەکان، یەکێتی ئەورووپا ئەندامانی خۆی هەڵدەبژێرێ. خۆتێهەلقولێنی وەزیرەکانی دەرەوەی ئەمەریکا هیچ لەبابەتەکە ناگۆڕێ وکاریگەری نییە. کاتێ لە پۆستی خۆم خزمەتم دەکرد، هانی هاوڕێیە ئەورووپیەکانم دەدا بۆئەوەی تورکیا لەم یەکێتییە قەبووڵبکەن. تێڕوانینەکەم، کە ڕەنگدانەوەی سیاسەتی ولایەتە یەکگرتووەکانە، یارمەتیدەربوو بۆ سەرکەوتوویی و پاڵپشتی ڕۆژئاوا بەوەی تورکیا هۆکاری سەرەکییە بۆ دڵنیابوون لەسەقامگیری ناوچەکە. زۆر خۆشحاڵ بووم بەوەی لەساڵی ١٩٩١، یەکێتی ئەورووپا ئەوەی ڕایگەیاند کە تورکیا کاندیدی سەرەکییە. لەوکاتەشەوە تورکیا هەڵساوە بە چاوپێخشاندنەوەی لیستی درێژی گۆڕانکارییەکان کە پێویستە ئەنجامبدرێن تاوەکو لەگەڵ هاوکێشە ڕێساکانی ئەورووپا بگونجێن. هەڵسا بە لادانی سزای لەسێدارەدان، چاکسازی لە یاسادانان کرد، یاسایەکی نوێی سزادانی نووسییەوە، یاساکانی بانکی گۆڕی، هەروەها پاراستنێکی زیاتری بۆ مافەکانی مرۆڤ فەراهەمکرد. زۆربەی ئەم چاکسازییانە لەژێر سەرکردایەتیکردنی پارتی گەشەپێدان و ئاشتی ئیسلامییەوە جێبەجێدەکران، ئەو پارتەی کە سەری لە ستریۆتایپی ئیسلامییەوە شێواندووە کەلەلایەن شێوازی ئەتاتورکی عیلمانییەوە قەبووڵکرا، بەرەو ناوەندی سیاسییەوە هەنگاوی دەنا، بەشێوەیەکی گشتیش ڕێزی لە مافەکانی ئافرەتی تورکی کەمەنەتەواییەکان دەگرت.

تورکیا گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەیە چونکە تاکە ئەندامی پەیمانی باکووری ئەتلەسییە کە لە ناو ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی جیهانییەوەیە، کەنوێنەرایەتی هەموو وڵاتە ئیسلامییەکانی جیهان دەکات، هەروەها یەکێکە لەو چەند وڵاتە ئیسلامییەی کەپەیوەندی دیپلۆماسیان لەگەڵ

ئیسرائیل هەیە. لە وتەکانی وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدوڵا گوڵ[*] ،" ئەو کاتەی خەڵك باسی بەریەککەوتنی شارستانیەتەکان دەکەن، تورکیا پردێکی سروشتی شارستانیەتەکانە. هەموو ئەوانەی ئێمە هەوڵی بۆدەدەین بەکارهێنانی شوێنگەی تورکیایە بۆ نزیکتربوونەوەی ئیسلام و رۆژئاوا". یۆشکا فیشەر، وەزیری دەرەوەی ئەوکاتەی ئەڵمانیا لەسەر هەمان بیرکردنەوە وەڵامی دایەوە، ، " بۆ بەمۆدێرنکردنی وڵاتێکی ئیسلامی دەبێ لەسەر بنەمای بەشداریکردنی بەهاکانی ئەورووپی بێت ئەوکات دەبێتە رۆژێکی گرنگ بۆ ئەورووپا لەجەنگی دژە تیرۆر". بۆیە گرنگترین پێشکەوتن بوو لەوکاتەی یەکێتی ئەورووپا لە دیسەمبەری ٢٠٠٤ بڕیاریدا بە وەرگرتنی هەنگاوی دووەم، رایگەیاند کە تورکیا پێشکەوتنی پێویستی ئەنجامنەداوە بۆدەستپێکردنی دانوستانی فەرمی لەبارەی بەئەندامبوونەکەیەوە. پرسیارەکە لێرە ئەوەیە ئایا ئەورووپییەکان تورکە موسڵمانەکان لەباوەش دەگرن یاخود هاوبەشیەکی دیپلۆماسی شانێکی ساردیان پێدەدەن.

لە حوزەیرانی ٢٠٠٥، کاتێ ئەندامانی ئەڵمانی و فەرەنسی رەتی دەستووری نوێی پێشنیازکراوی یەکێتی ئەورووپایان کردەوە، سۆزدارانی دژە تورکی تووشی لۆمە و گلەییەکی زۆربوونەوە. هەرچەندە زۆربەی سەرکردە ئەورووپییەکان پاڵپشتی خۆیان بۆداواکەی تورکیا دەربڕی، بەڵام زۆرینەی هاڵبژاردەکانیان بەم داوایە رازینینە. پرۆسەی فراوانبوونی یەکێتی ئەورووپا دەوەستێتە سەر بینینی کیشوەرەکان وەك دینامیێتییەك و سەیرکردنی دەرەوە، بەڵام زۆربەی ئەورووپییەکان —لەڕوانگەی جیهانگیرییەوە— پەسەندی ئەوەدەکەن پێویستە ئەم یەکێتییە لە فراوانبوون بپارێزرێت. فراوانبوونی ئەم یەکێتییە توانیوەتی والە ملیۆنەها کرێکاری نوێ بکات پێشبڕکێ لەسەر کار بکەن. ئەورووپییەکان حەزناکەن سنوورەکانیان لەگەڵ تورکیا بکەنەوە، وڵاتێك کە دەوڵەمەندە (بە رێژەی دانیشتووانەکەی کە ٧٠ ملیۆن کەسە) و هەژارە (بەوەی کە داهاتی هەر تاکێك دەکاتە نیوەی داهاتی هاووڵاتییەکی پۆڵەندی).

ئەو زەحمەتیانەی کەلەپشت دۆلار و یۆرۆوە سەریان هەڵداوە، بۆ مەسەلەیەکی جەوهەری دەگەڕێتەوە: ئایا کلتووری تورکی لەگەڵ کلتووری ئەورووپی دەگونجێ. ئەو رق لێبوونەوەو رێزنەگرتنەی بەرامبەر موسڵمانانی ئەنجامدرا لەکاتی شەڕی بۆسنیە بەهەمان شێوەش

---

(*) ئەو کاتەی ئەم کتێبە نووسراوەتەوە لە ٢٠٠٦ عەبدوڵا گوڵ وەزیری دەرەوە بوو، ئێستاش سەرۆك کۆماری وڵاتە- و.

رووبەڕووی توركیا دەبێتەوە. ئەمەش لەوە رەنگدەداتەوە كە هەموو ئەوروپا لەچەند روییێكەوە شەریان لەدژی توركەكان دەستپێكردووە، یۆنانییەكان چەند جارێك لەسەر قوبرس و چەند دورگەیەك لەسەر دەریای ئیجە لەگەڵ توركەكان بەرەو رووی یەك بوونەتەوە، مەسیحییەكانیش ئەم كۆمەڵكوژییە لەبیرناكەن كە توركەكان لەكاتی جەنگی جیهانی یەكەمەوە لەدژی ئەرمەنییەكان ئەنجامیاندابوو. ئەم مێژووە دوور لەهەموو رووەكانییەوە، لایەنگیرییەكی لەنێو خۆیدا دروستكردووە. سەرەك وەزیرانی ئیتالیا سیلڤیۆ بێرلیسكۆنی زۆر شانازی بە "باشترینی" شارستانیەتی ئەوروپا دەكات بەبەراورد لەگەڵ شارستانیەتی "وڵاتە ئیسلامیەكان".

ڤالێری جیسكار دیستان، سەرۆكی پێشووی فەڕەنسا، ئەوەی راگەیاند، " توركیا وڵاتێكی ئەوروپی نییە"، بەردەوامبوو دەیوت، وەرگرتنی توركیا مانای، " كۆتایی هاتنی یەكێتی ئەوروپا"یە. كاردینالٔ جۆزیف راتزینگەر بەرلەوەی ببێتە پاپا بێندیكتی شازدە، بەرهەڵستی خۆی بەرامبەر داواكەی توركیا دەربڕی، "توركیا هەمیشە نوێنەرایەتی كیشوەری جیاواز دەكات، بەپێچەوانەی ئەوروپا".

سەرنەكەوتنی دەستووری ئەوروپی بۆ پێكەوە گەیاندنی دەنگدەران شكستێكی گەورەبوو بۆ پشتیوانانی فراوانبوونی یەكێتی ئەوروپا. ئێستاكە زۆر كەس هەنە حزبە لەبیركردن و بەلاوەنانی مەسەلەی بەئەندامبوونی توركیا دەكەن. نابێ لەبیربكرێت. دوورخستنەوەی توركیا هەڵەیەكی زۆر گەورەیە. هەروەها لەوەیە ببێتە دیارییەكیتر بۆئەوكەسانەی حەز بە بوونی كێشە دەكەن لەنێوان موسڵمانان و رۆژئاوا.

ئەگەر گریمانەی ئەوەبكەین دانوسانەكان بەرەو پێش دەچن، هەندێ رێسا هەیە نابێ پشت گوێیان خەین. یەكەم، لایەنی یەكێتی ئەوروپا و توركیا گەیشتوونەتە لێك تێگەیشتنێك. ئەگەر توركیا لە پێشكەوتنە خێراكانی خۆی بەرەو ستاندارده ئەوروپیەكان بەردەوام بێ، مافی ئەوەی هەیە بۆ پێشبینیكردن لەبەدەستهێنانی پاڵپشتی بەئەندامبوونی لەلایەن سەركردە ئەوروپییەكان. ئەمەش پاساوی ماقولەكانە لەپشت پرۆسەی دانووسانەكان.

دووەم، نابێ پرسیار لەبارەی ناسنامەی توركیای ئەوروپی بكرێ. هەرچەندە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لەوكاتەیەوە، دەسەڵاتی زیاتربوو لەهێزی ئەوروپییەكان، كەهەرگیز لە هێزی ئەوروپا كەمترنەبوو. هێشتا توركیا ناوچەی ئاوای تێدایە گەر سەیری ناوەوەیان بكەیت، زۆر كەم

گۆڕانکاری بەسەر ژیانی ڕۆژانەیاندا هاتووە سەرەڕای تێپەڕبوونی سەدان ساڵ، بەڵام لەوەتەی ئەتاتورك هاتووە، گومان لەوەدانییە کە گرنگیدانی سەرەکی تورکیا بەرەو ڕۆژئاوایە.

سێیەم، نابێ ناسنامەی ئایینی تورکیا تێکەڵ بەداواکەی بکرێ بۆ پەیوەندکردنی بە یەکێتی ئەورووپا. ئەم ڕێسایە وەك بنەمایەکە، بەڵام هێشتاکە ڕوون نییە بۆ لێك تێگەیشتن. هەردوولا ئەورووپا و تورکیا حکوومەتی عیلمانییان هەیە. ئەورووپا، وەك ولایەتە یەکگرتووەکان، گەشەی بە کۆمەڵگای فرەنەتەوەیی داوە. گرنگییەکە لەوەیە، یەکێتی ئەورووپا لەدەوری پێوانەکانی دیموکراسی ڕۆژئاوا ڕێکخراوە، کە لەناو دڵی ئەم ئازادی ئایینییەوە پەیدابووە. سەرئەنجام دەبێتە خیانەتێکی گەورە لە بەهاکانی خودی ئەورووپا بەدوورخستنەوەی وڵاتێك کەلەسەر بنچینەی ئایینەوە بێ.

لەکۆتاییدا، گفتوگۆکردن لەسەر ئەم بابەتە زۆر ڕازیکەر نییە، هەروەك هەندێك قسەی لەسەردەکەن، بەوەی ئەندامبوونی تورکیا دەبێتە هۆی لێکترازانی گونجاندنی کلتووری ئەورووپی بەگشتی. لەوەیە ئەم بیرکردنەوەیە مانایەکی بدایە لەکاتی بازاڕی هاوبەش کەژمارەیان تەنها شەش ئەندام بوون، بەڵام بۆ ئەمڕۆی یەکێتی ئەورووپا، لەگەڵ بوونی بیست و پێنج ئەندام و کلتووری جیاواز هیچ مانایەك نادات. بۆیەش بەزیادکردنی تورکیا ئەم کلتوورە ناگۆڕێ.

لەساڵانی ١٩٩٠، دەرفەتی پەیوەندیکردنی NATO پاڵنەرێکی بەهێزی بەخشی بۆ چاکسازی دیموکراتی لەنێو وڵاتانی ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی ئەورووپای ئازادی نوێ. لەبری دووبارە گەڕانەوەی ناکۆکییە مێژوویەکان، جەخت لەسەر ئامانجە دیموکراتییەکان دەکرێتەوە، وەکو ڕێزگرتنی بڕیاری یاسا، مافەکانی مرۆڤ، گیانی دەست پێشخەری ئازاد، کۆنترۆڵکردنی مەدەنی بەسەر سوپای سەربازی. NATO هێزێکی موگناتیسی بەخشی بۆگۆڕانکاری ئەرێنی، شوێنێك بۆئەوەی دوژمندارانی پێشوو تیایدا کاربۆ فەراهەمکردنی ئاشتی بکەن. یەکێتی ئەورووپا هەمان خزمەت دەکات، بەڵام بەردەوام نابێ تاوەکو دەرگا بۆ داواکارە نوێیەکان نەکاتەوە و مێشکیان بەکراوەیی نەپارێزن بۆبڕیاردان لەسەر ئەوانەی کەبەنیازن داواکانیان پێشکەشبکەن. تۆنی بلێر دەڵێ، " گومان لەوەدانییە وڵاتێکی زۆر کەم دەنگیان بە بەڵێ دەدا ئەگەر بهاتایە ڕاپرسییەك لەبارەی بەئەندامبوونی تورکیا بکرابووایە. بۆیە پێویستە لەسەرمان کاربکەین بۆ گۆڕینی ئەم تێڕوانینە. تورکیا ڕێگایەکی دووری بڕیوە، ئێستا بۆ ئێمە دەبێتە هەڵە بۆ گۆڕینی تورکیا بەرەو ئاڕاستەیەکیتر".

ولایەتە یەکگرتووەکانیش ئەرکی تایبەتی خۆی هەیە. بڕیاری ئیدارەی بۆش بەداگیرکردنی عێراق تورکەکانی تووشی شۆك کرد، سەدا ٤٠ ی ئـەوان—بـەگوێرەی راپرسـیێك کەلەسـاڵی ٢٠٠٥ ئەنجامدرا - ئەمەریکا وەك گەورەترین دوژمن دەبینن. پڕ فرۆشترین رۆمانی تـورکی، *گەرەدلوولی کانزا*، پێشبینی داگیرکردنێکی ئەمەریکا بۆ تورکیا دەکات، بـۆ تۆڵەسـەندنەوەی تەقینەوەی بۆمبێکی ئەتۆمی نزیك کۆشکی سپی.

لەم ساڵانەی رابردوودا چەند جارێك گەشتم بـۆ تورکیـا کـردووە. ولایەتـە یـەکگرتووەکان عێراقی—دراوسێی تورکیا—داگیرکـرد بـێ وەرگرتنـی بۆچـونی تورکیـا وابەئاسـنی لـەبیر نابردرێتەوە. ئەم بۆچونە کاریگەری قورس دەکاتە سەر پەیوەندی ئاڵۆزی تورکیا و کوردەکـان. تورکیـا بـەوە نیگەرانـە کەسـەربەخۆیی کوردسـتان لـەناو عێـراق دەبێتـە هـۆی هانـدانی بەرزخوازییەکانی ناسیۆنالیزمی لەنێو کەمینە کوردەکانی وڵاتی تورکیا، هەروەها دوودڵیشـە بەوەی تیرۆریستە کوردەکان خۆیان لەژێر قاچی باکووری عێراق پاراستووە، هەروەها نیگەرانـە بەوەی کوردەکانی عێراق زاڵبن بەسەر کەمینە تورکمانەکانی عێراق بـۆ کـۆنترۆڵکردنی شـاری کەرکوکی دەوڵەمەنـد بـە نـەوتی خـاو. سیاسـەتی داهـاتووی ئەمـەریکا پێویسـت ناکـات بەتەواوەتی بگونجێ لەگەڵ سیاسەتی تورکیا لەسەر ئەم مەسەلانە، بەڵام زیرەکییە ئەگـەربێتو بە هێمنانە هاوکاری یەکتربکەن لەوشوێنەی کە دەکـرێ، لەکاتێکـدا هێشـتا جـەخت لەسـەر رێزگرتنی مافەکانی کوردی دەکاتەوە.

گەر سەیری دە ساڵ دواتر بکەین، لەوەیە ئێران بەهاوپەیمانیەتی شـیعەکانی عێـراق ببنـە تاکە هێزی کۆنترۆڵکردن لە کەنداوی فارسدا. کـارێکی سـەختە بـۆ زێـدەڕۆییکردنی گرنگـی تورکیا لەم رووەوە، وەك ئەندامێك لە NATO، سەرکردەیەکی نێو رێکخـراوی کۆنفرانسـی ئیسلامی جیهانی، هاوڕێی ئیسرائیل، هەروەها هێزێکی یەکگرتوو لەسەرتاسـەری ئـەورووپا و نزیك ئاسیا. زۆر زەحمەتە، لەسەر بنەمای بەراوردکردن، بۆ بەهای مامەڵـەکردنی ئـەورووپا و ولایەتە یەکگرتووەکان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی تورکیا کە زۆر جددی بێ بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆمان. ئەگەر رۆژئـاوا رێـزی وڵاتێکـی ئیسـلامی وەك تورکیـا نـەگرێ بـەجۆرێك کـە زۆر یارمەتیدەربووە بۆ بەرژەوەندییەکانمان، زەحمەتی زۆری دێتە پێش بەدروستکردنی ئـەو بـاوەڕە لەگەڵ هەر وڵاتێکیتری ئیسلامی کە هاوڕێیەتی پاداشتی لەدواوەیە.

هەنـدێجار ئامـاژەکردنی بچـووك جیـاوازی گـەورە دروسـتدەکات. ئـەم تێبینیـەم لەکاربەدەستانی تورکی کرد کەنە رازیبوون و نە رەتیشیان دەکردەوە، بەڵکو چاوەڕوانی گۆڕانی

بابەتەکەیان دەکرد. بابەتەکەش بارودۆخی کۆلیژی حلقی لاهوتی ئۆرتۆدۆکسی بوو لە دورگەی هێیبیلیادا، بەنزیکەی کاتژمێرێك بەبەلەم لە ئەستەنبۆڵ دوورە. ئەم کۆلیژە لەساڵی ١٨٤٤ دەستی بەکارەکانی کردووە، بەجۆرێك وەسفکراوە وەك " بەشێکی سەرنجڕاکێشی هونەری تەلارسازی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم—سەقفێکی بەرزی هەوایی بەجۆرێك لەهەر ئاڕاستەیەکەوە بەسەر هەموو دیمەنەکانی شار دەڕوانێ". ئەم کۆلیژە لەساڵی ١٩٧١ داخرا، نەك لەبەرئەوەی بە تێکدەر لەقەلەمدراوە، بەڵکو لەبەرئەوەی بوونی ئەم کۆلیژە ریسوایەکە بۆ یاسا عیلمانییەکانی وڵاتی تورکیا. ئەگەر دەزگا ئیسلامییەکان رێگایان پێنەدرێ لەدەرەوەی کۆنترۆڵی حکوومەت کاری خۆیان بکەن، ئەی بۆچی رێگا بەم کۆلیژە مەسیحییە بدرێت؟-- یاخود ئەم بیرکردنەوەیە دەڕوات. ئەم سیاسەتە بۆ گرووپێکە هەروەك ئەورووپییەکان ئاماژەیان پێداوە بە، "یەککگرتوویێکی گەمژانە".

من وەك هاوڕێیەك و وەك کاربەدەستێکی ئەمەریکی قسەمکرد، فشارم خستە سەر تورکەکان بۆکردنەوەی ئەم کۆلیژە وەك ئاماژەیەك بۆ نیشاندانی نییەتپاکی بەرامبەر ٢٥٠ ملیۆن مەسیحی ئۆرتۆدۆکسی جیهان—ئەمەش هەنگاوێکە مانادارترە بۆ راستییەکانی مێژوو: بەجۆرێك ئەم ناوەندە ئۆرتۆدۆکسییە مەسیحییە لە وڵاتێکی مەسیحی نییە بەڵکو لەتورکیایە. نەك هەر فەتحکردنی قوستەنتەنییە لەلایەن عوسمانییەکان لەساڵی ١٤٥٣ بۆ ناچارکردنی پاتریارکییە—کە هاوشانی ئۆرتۆدۆکسییەکانی فاتیکان بوو—بە پایتەختی مێژوویی خۆی.

دەرفەتی ئەوەم هەبوو لەگەڵ سەرۆك و خانم کلینتۆن (هیلاری) چاوم بە بەتریارك مەسکۆنی **بارثولومیو** بکەوێت لە بارەگای سەرەکی خۆی لەناوەڕاستی شاری ئەستەنبۆڵی کۆن. ئەستەنبۆڵ شارێکی خۆشە، بەڵام بەدەنگە دەنگ و قەرەباڵغە. بەپێچەوانەوە، پاتریارکییە هێمن و سادەبوو. بەتریارك خۆی هاووڵاتی تورکییە، دەرچووی کۆلیژی حلقی و ئەندامی پێشووی سوپای تورکییە. شێوەی بەوجۆرەیە کە هەر بەتریارکێك هەیەتی، ریشێکی سپی درێژ، چەندین میدالییەی پێوەنراوە، خاچێکی بەملیەوە خوولاندووتەوە، لەگەڵ عەبایەکی رەشی سەرنجراکێش بەسەر شانیەوە شۆڕبۆتەوە.

لەوکاتەی ئەم پۆستەی پێدراوە لەساڵی ١٩٩١ ەوە، **بارثولومیو** ستایشی زۆری لەبارەی ژینگەی چالاکی و هەوڵەکانی ئاشتکردنەوەی فرەئایینییەکان وەرگرتووە. کەسێکی رۆشنبیرو پربیرە، توانای قسەکردنی حەوت زمانی هەیە، بەڵام زۆر ئالۆزە کاتێ قسە لەبارەی کۆلیژی

حلقی دەکات. لەوە تێنەدەگەیشت بە چۆڵکردنی ئەم دامەزراوەیە کێ سوودمەندبوو، یاخود ئەم کۆلیژە یان ئەم کەمەنەتەوە مەسیحییە بچووکەی لەتورکیا دەژین چۆن وەك هەڕەشە بۆسەر هەرکەسێك هەژمار دەکرێت. بەپێچەوانەوە، کردنەوەی ئەم کۆلیژە بەدڵنیاییەوە دەرفەتی تورکیا زیاتر دەکات بۆ ئەندامبوونی لە یەکێتی ئەورووپا، ئەمەش ئامانجێکە کە بەتریارك بەتەواوی پاڵپشتی دەکات. حکوومەتیش دەڵێ دەمەوێ بەدوای چارەسەریەك بگەڕێم، بەڵام دوای سی و پێنج ساڵ ئەم گەڕانە دەبێ کۆتابێ. چارەنووسی تاکە سەنتەرێکی فێرکردن گرنگییەکی بەجۆرەی نییە لەپەیوەندی نێوان دوو شارستانیەتدا، بەڵام لەجیهانێك وەك جیهانی ئێمە، نابێ لەو دەستکەوتانە کەمبکەینەوە کەئەم کۆلیژە لەماوەی کارکردنەکەیەوە بەدەستیهێناوە.

## (١٧)

# ئەفریقیا: پێشبڕكێی ڕۆحەكان

یەكێك لە سەركردە موسڵمانەكانی ئۆگەندا دەیوت، " هەروەك دەیبینی ئێمە بەرەو بەریەككەوتن هەنگاو دەنێین". ولایەتە یەكگرتووەكان "هەرگیز لە شەڕكردنتان ناوەستێنێ تاوەكو لـەئایینی خۆتـان دوورنەكەونەوە". یەكێكیتر لە ئۆگەندییەكان، كە وەزیرێكـی مەسـیحی بـوو، وتـی، "پێشـبڕكێیەك هەیە. ئیسلامیش هەمیشە پێشبڕكێی وەرگرتنی ڕۆح و مێشـكی ئەفریقییـەكان دەكـات". لـەهیچ شوێنێك بووژاندنەوەی ئایینی جیهانی نییە وەك لەوەی لە ئەفریقیادا بەدیـدەكرێ، ئـەو شـوێنەی كـە دوو تەیاری دژیەك سـەری هەڵدا و شۆڕشـی زانیـاری ناچـاری موژدەبـەرانی مەسـیحی و زانایـانی ئیسلامی كرد لە ژوورەكان و هۆڵـەكانی كۆمـەڵگا كۆكردنـەوە. وڵاتـە ئیسـلامییەكانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست و باكووری ئەفریقیا ( بەتایبەت عەرەبستانی سعودی و لیبیا) پارەیەكی زۆریان بۆ فێركـردن و پەروەردەكردنی گەنجەكانی ئەفریقا هەڵڕشت. مزگەوتی نوێ و قوتابخانەكانی ئـایینی زۆر بـەخێرایی زیادبوون، فێركردن و ڕێنماییكردن بە زمانی عەرەبی ڕوو لەزیادبوون بوو، ئیسـلام شـوێن پێگەیـەكی گەورەی دۆزییەوە تەنانەت لەنێو وڵاتە مەسیحییە تەقلیدییەكانیشەوە وەك زامبیا، ڕواندا، و ئۆگەندا.

لەهەمان كاتدا، ژمارەی ئەو ئەفریقیانەی كەخۆیان بە مەسـیحی ئینجیلـی نـاودەنێن زۆر زیـادی كردووە، لەماوەی سی ساڵی ڕابردووەوە لە ١٧ ملیۆن كەپێشبینیی دەكرێ بۆتە ١٢٥ ملیـۆن كـەس، كۆی گشتی دەبێتـە زیـاتر لـە ٣٥٠ مەسـیحی ئـەفریقی. ناوچـەكە پڕبـووە لـە كڵێسـە و ڕەشمـاڵی بووژاندنەوەی ئایینی و نووسین لەسەر ئۆتۆمبێڵەكان وەك "مەسیحی ڕزگاركار". كتێبی پـیرۆز و ئـەو تێكستانەی پەیوەندیان پێوە هەیە بۆ سەدان زمان و دیـالێكتی نـاوخۆیی وەرگێـڕدراون. واپێشـبینیی دەكـرێ لەبیسـت سـاڵی دادێ ژمـارەی مەسـیحییەكان لـە ئـەفریقیا زۆر زیـاتربێ لـەژمارەی مەسیحییەكانی هەردوو ئەوروپا و ئەمەریكای باكوور پێكەوە. ئەم فراوانبوونـەش لەلایـەن بزووتنـەوە

تەبشیرییەکان و ناسیۆنالیستەکان یارمەتی دەدرێن هەروەها لەلایەن کڵێساکانی رۆژئاواوە کۆمەکی دارایی دەکرێن.

زۆربوونی ئەمانە باشە، باوەڕ دەتوانێ هیوا بەو کەسانە ببەخشێ کە زەحمەتی دەبینن بەهۆی سەختی ژیانی رۆژانە کەخەریکن روو لەهەڵدێر دەکەن. پشکدارانی دارایی—جا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بێ یان ناوەڕاستی ئەمەریکا—دەتوانن قوتابخانە و کلینك و سەنتەرە کۆمەڵایەتییە پێویستییەکان بکەنەوە. پەیوەندی دامەزراوی نێوان کڵێساکانی ئەفریقی و ئەمەریکی دەکرێ قووڵتر بێتەوە لەتێگەیشتن و پاڵپشتیکردنی تێڕوانینی ئەمەریکا لەسەر دیموکراسی و تیرۆریزم، لەکاتی بەرزکردنەوەی هۆشیاری لەبارەی ریسواییەکانی وەك توندوتیژی ناوخۆیی و خەتەنەکردنی ئەندامی مێیینەی ئافرەتان.

فراوانبوونی هاوکاتی چالاکییەکانی ئیسلامی و مەسیحی مەترسیش دروستدەکات. لەو وڵاتانەی کە دانیشتووانەکەیان بەشێوەیەکی یەکسان دابەش دەبێ، پێشبڕکێیە ناکۆکەکانیش سەرهەڵدەدەن. لەو وڵاتانەی کە یەك باوەڕ باڵی کێشاوە، زۆرجار کەمینەکان هەست بە نزیکبوونەوە دەکەن. ئەمڕۆکە ئەفریقیا بۆتە گۆڕەپانێکی جەنگی ئایینەکان، هەروك گۆڕەپانی جەنگی ئایدیۆلۆژییەکان بوو لەماوەی جەنگی سارددا. ئەم پێشبڕکێیە، لایەنی ئەرێنی خۆیشی هەبوو. ولایەتە یەکگرتووەکان، ئەورووپای رۆژئاوا، یەکێتی سۆڤیەت، چین هەموویان کۆمەکی دارایی ئەفریقیایان دەکرد بەمەبستی پێشکەوتن، هەریەك لەمانە پەرۆش بوو بۆ فێرکردن و سەرنجڕاکێشانی سەربازگەکانیان بۆ گەورەکردنی نەوەیەك لە هەڵبژاردەکانی ئەفریقیا. ئەم پاڵنەرانە بەگران لەسەریان وەستا، لەڕێگای لەدەستدانی ئەو رۆحانەی لەکاتی بەرزبوونەوەی ناکۆکییە ناوخۆییەکان بۆ شەڕە بریکارەکانی لیستێکی درێژی وڵاتانی وەك، چاد، سودان، ئەتیوبیا، سۆماڵ، ئەنگۆلا، مۆزەمبیق، زائیر. ئەوکاتەی بەکرێگیراوانی کۆمۆنیزم و جیهانی ئازاد کەوتنە بەربەرەکانێی یەکتر، سوپاکان وەك لێشاو هاتنە نێو ناوچەکە، حکوومەتە ئۆتۆکراتییەکان یارمەتی دەدران، هەروەها ئەرکە پێویستییەکانی بنیاتنانی نەتەوەی گرنگی پێنەدەدرا، وەکو دروستکردنی هەستی نیشتیمانپەروەری و دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێز.

لەسەر ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتی، گرنگترین پێویستی لەئەفریقیا هەروەك چەند دە ساڵێکە وەك خۆی ماوەتەوە: بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی پێکبەستراو و حکوومەتێکی بەهێز بەجۆرێك کە هانی پێشکەوتن بدەن. ئەم ئەرکە لەسەر رووی هەموو لایەنێکەوە زۆر سەختە لەبەرهۆی جیاوازی زمانی و ئەتنیکی. ناخۆشتر لێرەوەیە ئەگەربێتوو هەرتاك و گرووپێك بانگ بکرێت بۆ جێگرتنەوەی ناسنامە ئایینییەکەی لەپێش دڵسۆزی نیشتیمانەکەی.

ئایینییە تەقلیدییەکانی ئەفریقیا ئەمجۆرە داوایە ناکەن. بڕوایە ڕۆحییەکان زۆر گشتگیرە و لەسەر ئەم قەناعەتە چەقی گرتووە کە خودا لەنێو هەموو دروستکراو و بابەتێکەوە بوونی هەیە، هەروەها ڕۆحی ئەژدادەکانیشمان بوونیان لەم جیهانەدایە. بەپێچەوانەی عەقیدە نوێیەکان، **طقوسی** عەقیدە ڕۆحییەکان ژیانی ڕۆژانەی پارچە پارچە کردووە، هیچ جیاکردنەوەیەکی ناچاری نییە، کاتێ مەسیحییەکان دەچنە کلێسا و موسڵمانان بۆنوێژکردن دەوەستن، هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕەمزی نییە لەنێوان ئینجیل و قورئان، خاچ و مانگ، وە عەرەبی و زمانەکانیتری ناوخۆیی.

حکوومەتێك هەوڵی ڕێکخستنی سوپایەك بدات یاخود بنیاتنانی سیستەمێکی باشتری قوتابخانەکان ئەوانی خۆی بەشەرمەزاری دەبینێتەوە ئەگەربێتو هەر هەنگاوێك بەوجۆرە شیبکرێتەوە کە کاریگەری دەبێ لەسەر کێبڕکێی نێوان مەسیحییەکان و موسڵمانان. ئەم ڕکابەرییە زۆر تاڵتردەبێ کاتێ داواکاران (مبشرون) بۆنەی عەقیدەی خۆیان بگۆڕن بە شێواندنی عەقیدەی ئەوانیتر. موسڵمانەکان لەوەیە شوێنکەوتووانی مەسیح تۆمەتباریکەن بە پەرستنی سێ خودا لەجیاتی یەك خودا. مەسیحییەکانیش وەسفی محەمەد دەکەن بەوەی کەسێکی سەرنجڕاکێش ناشایستەیە بەبەراورد لەگەڵ مەسیح کەئەوەندە پەرجو (معجزە) انەی ئەنجامدەدا. هەرچەندە سەرکەوتنی ئەم ئایینە لەوەتەی بازرگانە موسڵمانەکان یەکەمجار سەردانی کەنارەکانی ئەفریقیایانکرد لەسەدەی حەڤدەم، لەم ساڵانەی دواییدا ئەم هێرشکردنانە بەرەو خراپتربوون چوون.

پەیوەندی پڕکێشەی نێوان مەسیحی و موسڵمانان بەهۆی دەستێوەردانی دەرەکی بەرەو خراپتردەچێ، ئەوانەی کە بەرژەوەندییان لەم ململانێیە ناوخۆییەی ئەفریقیاوە هەیە—زۆربەیان نییەتیان پاکە وەهەندێکیتر پێچەوانەی ئەم نییەتەن. مەترسییەکیتریش هەیە بەوەی کە ئەفریقییەکان سوود لەم دەستێوەردانە وەردەگرن بۆ پەیداکردنی پاڵپشتی سیاسی و دارایی بۆ هۆکارەکانی "ئەخلاقی"، کەچی لەڕاستیدا تەواو پێچەوانەی بەهاکانە. ئەمەش جاری یەکەم نییە. ئەوپارەیەی کە بۆکاری خێری ئیسلامی بەرزکراوەتەوە زۆرجاران بۆکاری سیاسی و دەستکەوتی شەخسی بەکاردێت، لەساڵانی ١٩٨٠، ڕاستڕەوە مەسیحییەکانی ئەمەریکا پاڵپشتی گرووپە یاخیبووەکانی مۆزەنبیق و ئەنگۆلایان دەکرد کەبانگەشەی کاری ئایینیان دەکرد کەچی لەڕاستیدا لە دڵدا بۆ بەرژەوەندی خۆپەرستی بوو.

توندوتیژی نێوان مەسیحی و موسڵمانان کێشەیەکە زۆربەی بەشەکانی ئەفریقیای گرتۆتەوە، بەڵام بەتایبەتی ئاژاوەی لەنێو سودان دروستکردووە، کەگەورەترین وڵات و نایجیریا کەپڕ دانیشتووانترین وڵاتی ئەم کیشوەرەن. بابەتی زۆر هەیە کەوای لەم دوو وڵاتە کردووە شەڕی لەسەر بکەن،

لەنێوانیشیاندا نەوتی خاو. هەردوولاش کاریگەری زۆریان هەیە لەناوچەکە—سودان لە باکوور و ڕۆژهەڵاتی ئەفرقیا، نایجیریا لە ڕۆژئاوا—هەردووکیشیان سەرقاڵی ڕاکێشانی گرنگیدانی ولایەتە یەکگرتووەکانن.

هەرچەندە ڕەخنەی زۆر لە دانەرانی سیاسەتی ولایەتە یەکگرتووەکان دەگیرێ، بە گرنگینەدانی بە ئەفریقیا، من خۆم کاتێ لە حکوومەت کارم دەکرد حەوت جار سەردانی ئەم کیشوەرەم کردووە، زیاتر لە دوانزە وڵات وەستاوم، لەنێوانیشیاندا سودان، لە بەهاری ١٩٩٤. زۆر دوودڵ بووم چونکە ئەمەیان یەکەم ئەرکی دیپلۆماسیم بوو بۆ حکوومەتێك کە وەك دوژمن حیسابمان بۆدەکرد. تاوەکو ئێستاش، لەلایەن سەرۆك عمر ئەلبەشیر پێشوازی گەرممان لێدەکرێت، کە ئەفسەرێکی سەربازی پێشووبوو، لەڕێگای کودەتایەکی سەربازی چەند ساڵێك لەمەوبەر دەسەڵاتی وڵاتی وەرگرت.

بەشیر، تەمەنی لەسەرەتای پەنجاکانە، خاوەن سمێڵ و ریشێکی کورت و ڕووخسارێکی زبرە، لەکاتی کارکردنیدا گۆچانێکی دار بەکاردێنێ، لەدەربڕینیشدا زۆر جددییە. بەر لەوەی دەست بەگفتوگۆکانمان بکەین، گلاسێکی درێژی پڕ لە شلەی ڕەنگ پەمەیی پێشکەشکردم، شامپووی تێدابوو. زۆرجاران دەکەمە گاڵتە بەوەی وەك باڵیۆزێك لەجیاتی هاووڵاتییە ئەمەریکییەکان دەخۆم و دەخۆمەوە، بەڵام ئەمەیان لەدەرەوەی ئەرکی خۆمە. لەگەڵ ئەوەشدا، تێبینی ئەوەم کرد، بەشیر ناخواتەوە، وەك هەر سودانییەکیتر. بۆچی؟ ئەو ترسەم هاتە مێشکی کە ئەوان هەوڵی ژەهراوی کردنم دەدەن. ئەوکاتەی بەشیر سەیری دەکردم، خواردنەوەکەم هەڵگرت، بە قەناعەتەوە قومێکم نۆشکرد، بەڵام دڵنیا نەبووم کە شتێکی تێدابێت و قووتم دابێ. تامەکەی زۆر شیرین بوو، وەکو پێپتۆ-بیسمۆڵ. لەکاتی حەوانەوەمدا، بەهۆیەوە هیچ گۆڕانکارییەکم لەخۆ بەدینەکرد.

بابەتی دانیشتنەکەم لەگەڵ بەشیر جگە لە خواردنەوە چیتر نەبوو. مەبەستم گەیاندنی هۆشداری بوو لەرۆلی سودان بە پێدانی پێگەیەکی ئارام بەتیرۆریستانەوە. هۆشدارییەکەم گوێی پێنەدرا. لەساڵانی دواتر ئەم حکوومەتە تۆمەتی ئەوەیدراپاڵ کە بەشداریکردووە لەو هەڵمەتە سەرنەکەوتووەی کەبۆ تیرۆرکردنی سەرۆکی مسری دارێژرابوو. لەوکاتەدا، دەسەڵاتدارانی سودانی لەپرۆسەی هەوڵدانی گۆڕینی سیستەمی وڵاتەکەیان بوون بۆ پێشەنگی هەرێمی شۆڕشی ئیسلامی. لەنێو ئەو تیرۆریستانەی کە داڵدەی دەدان ئوسامە بن لادن بوو، بەجۆرێك کۆمپانیای بیناسازی کەخۆی خاوەنیەتی دەکرد چەند ڕێگایەکی سەرەکی دروستکرد بۆشەڕکردن لەدژی جوداخوازانی باشوور.

ڕووبەری سودان یەك لەسەر چواری ڕووبەری ولایەتە یەکگرتووەکانە، سنووری وڵاتەکەی لەکەنارەکانی دەریای سوور درێژدەبێتەوە تا هێڵی ناوەڕاستی کیشوەر. نیوە بەشی باکوور هەژارن،

دانیشتووانەکەی زۆربەیان موسڵمانن. نیوە بەشی باشوور هەژارترن، ماڵی ئەفریقییە رەشەکان و مەسیحییەکانە، هەروەها لەگەڵ هەندێ موسڵمان. ئەم خاکە بە پیتە توانای پێدانی خواردنی هەموو سودانییەکان و زیاتریشی هەیە، کەچی لەبری ئەمە بەمین داپۆشراوە. لەوەتەی سەربەخۆیی وەرگرتووە لەساڵی ١٩٥٦، سودان بۆتە دیمەنی نەوەستانی شەڕی ناوخۆیی. سەرکردەکانی پایتەخت، خەرتووم، بۆماوەی چەندین دەیە ساڵە بەدوای خۆبەهێزکردنی سیاسیدا دەگەڕێن تاوەکو کۆنترۆڵی باشوور بکەن، بەشێکی لەبەر نەوتە خاوەکەیە. لەساڵانی ١٩٨٠ بەدوای کۆنترۆڵکردنی ئایینیشدا دەگەڕان، لەڕێگای چەسپاندنی شەریعەتی ئیسلامی. بزووتنەوە یاخیبووەکانی باشوور، سەرەڕای دابەشبوونیشیان، شەڕیان لەپێناو سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمی دەکرد. سەرئەنجام بووە ئاریشەیەکی بەردەوامی مرۆڤایەتی، بەهۆی گەردەلوولی تۆزاوی و شەپۆلی وشکە ساڵی بارودۆخەکە خراپتربوو، هەروەها بەهۆی شەڕی دڕندەیی نیشانەیەك بە رووخساری ئەم وڵاتە داهێنرا، کەبووە هۆی لەدەستدانی گیانی ٢ ملیۆن هاووڵاتی. لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو لایەنەکان تاوانبارن بەرامبەر کوشتنی ئەم سڤیلیانە، حکوومەتەکەی بەشیر بە ریسواکەری سەرەکی دێ، بەهۆی راگرتنی بەخشینی خواردەمەنی، هێرشکردنە سەر لادێیەکان، ناچارکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵك بەدەرکردنیان لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان بۆ ئەو شوێنانەی کەنەیان دەتوانی تیای بژین.

گەڕان بەدوای رێگای یارمەتیدان، لەهەردوولا لە ئەفریقیا و واشنتۆن، چاوم بەو کەسانە کەوت کە شاهێد حاڵی کۆمەڵکوژی ئەم شەڕانەن. چیرۆکەکانیان لەبارەی برسیکردن، بەندایەتی، مامەڵەی خراپی ئایینی، ئازاردان، هێرشەکان بۆسەر سڤیلییەکان زۆر تووڕەیان کردم. زۆر سەرسام بووم بە گەنجێکی سودانی کە نەحتێکی مەسیحی رەش پێشکەشکردم بە گرووپەکانی قوتابخانەی مندالانی ئەمەریکی کەبۆ نوێژکردن هاتبوونە ئەوێ. قەشەیەکی کاسۆلیکی، کەبۆماوەیەکی زۆر بوو لە چیاکانی نوبا Nuba Mountains کاریدەکرد، ئەوەی روونکردەوە کە زیاتر لە دوازدە قوتابی سەرەتایی گیانیان لەدەستدا لەکاتێ بۆردومانکردنی بەئەنقەستی قوتابخانەکەیان. وتەبێژێکی حکوومەت زۆر بە توندی وەڵامی ئەم تراژیدیایەی دایەوە، دەیوت ئەم قوتابخانەیە ئامانجێکی سەربازی یاسایی بوو. ئەم قەشەیە داوای یارمەتی لەمن کرد تاوەکو ئەم کارە تراژیدیایانە دووبارە نەبێتەوە. کاتێ لەوێ دانیشتبووم بەم هەموو هێزەی ولایەتە یەکگرتووەکان کەلەپشتمەوەبوو، دەبووایە بڵێم، دڵنیا نیم لەوەی زیاترمان پێبکرێ. ماوەیەکی زۆرە ئابلوقەی سەربازی و ئابووریمان بەسەر سودان سەپاندووە. هەروەها ئەوەشمان بۆیان روونکربۆوە ئەگەر سودان نیازی پەیوەندییەکی نۆرماڵی لەگەڵ ئێمە دەوێ، پێویستە رێ بگرێ لەبەردەم ئەم پێشێلکردنانەی مافەکانی مرۆڤ.

هەروەها زیاتر لــە ١ ملیـار دۆلارمـان بەخشـییە حەوانــەوەی مرۆڤایـەتی ( **اغاثـة الانسانیة**) بـۆ قوربانیانی ئەم شەڕانە، لەگەڵ دەستنیشانکردنی نێردراوێکی تایبەت بـۆ یارمەتیـدانی دانووسـتانەکان لەنێوان حکوومەت و بەشی باشوور. فەرماندەی یاخیبووانی باشـوور جـۆن گـەرانگ بـوو. تەمـەنی پەنجاو دوو ساڵ بوو کاتێ بۆیەکەمجار لە ئۆگەندا چاوم پێکەوت. پیاوێکی چوارشـانە، سـەرێکی شـێوە خـڕ و ریشـێکی سـپی بـەدەوری گەردەنیــەوە سـووڕاوەتەوە. خوێنـدنی لـە ولایەتـە یـەکگرتووەکان تەواوکردووە، گـەرانگ خـاوەن ناوبـانگێکی باشـی بـوو لـە رازیکردنـی هەرکەسـێك لـە تیۆریزانـە کۆمۆنیستەکان بۆ چالاکییە مەسیحییەکان، سەرسوڕمان نەبووم کـاتێ بـەروونی پێـی وتم، دەمـەوێ گوێم لەچی بێت: گەرانگ پاڵپشتی لە ئاشتی دەکرد، رێزی لەمافەکانی مرۆڤـی دەگـرت، حـەزی بـە دابەشکردنی دەسەلات بوو، هیوای ئەوەبوو سودان گەشە بکات بۆ ولاتێکی دیموکراسی. ئێمە دەزانـین قسەکانی گەرانگ دوورە لە هەر پەلە و خەوشێك، ناشمانەوێ ولایەتە یـەکگرتووەکان ببێتـە لایـەنێك لەو شەڕە ناوخۆییەی سودان. لەگـەڵ ئەوەشـدا، (گـەرانگ) مـان بینـی وەك تاکـە کەسـێك بتـوانێ بۆیەکگرتنەوەی باشوور و فشار بخاتە سەر حکوومەت بۆچاکسازی شـێوازەکانی. گـەرانگ، لەوەتـەی ١٩٨٣ یەوەیە کەسێکی جەنگاوەربووە، ستایلی کاریزمـایی و زانیـاری باشـی لـەبارەی سـەرکردەی راستەقینە لاهەیە، شارەزایی لەبارەی کاروباری ئابووری و سەربازیدا هەبوو. شێوە رووخسـاری لەسـەر هەموو لافیتەکان و تیشێرت T-shirt ەکان نەخشێنراوە.

هێرشەکانی ٩/١١ لەوەیە گۆڕانکاری بەسەر هەموو شـتەکان نـەهێنابێ، بـەلام ترسـێکی لـەناو حکوومەتی سودانی دروستکرد بۆئەوەی بەدوای چاککردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ واشنتۆندا بگـەڕێ. لەناکاو بەشیر دەستیکرد بە راگەیانـدنی هەلۆیسـتی یارمەتیـدانی لەسـەر تیرۆریسـتان و کردنـەوەی دەرگای دانوستاندن لەگەڵ گەرانگ، بەلام دوور لەپەلـەکردن. نێـردراوی ئەمـەریکا، جـۆن دانفـۆرت، قەشـەی پرۆتسـتانی و سـیناتۆری پێشـوو، بەبـەردەوامی هـەردوولا بـاکوور و باشـووری ناچـار بـە گفتوگـۆکردن دەکـرد. لەکۆتاییـدا، لـە سـاڵی ٢٠٠٥، گەیشـتنە دەرئـەنجامێك و بەلێنیانـدا بـە تێکەڵکردنی سوپاکان و دابەشکردنی دەسەلاتی سیاسی و داهاتـەکانی نـەوت. ئـەم رێککەوتنـە بـە ئاهەنگ و پۆبێلەوە پێشوازی لێکرا. نزیکەی ١ ملیۆن کەس لەناوەڕاستی شـاری خـەرتووم ئاپۆڕایـان دروستکرد بۆ دەربڕینی خۆشـییەکانیان، کـاتێ بینیـان ئـەم دوو دوژمنـەی لەپێشـینەیە—بەشـیر و گەرانگ—دەستیان لەناویەکتردا بەرزکردۆتـەوە وەك دوو شـەریکی حکوومـەتێکی نـوێ. سـەما و گۆرانی لەنێو شەقام پەیدابوو.

ئاهەنگەکە لە ٩ی تەمموز دەستپێکرد و هاوکاتیش بوو لەگەڵ دەست نیشانکردنی گەرانگ بۆ جێگری سەرۆکی وڵات. ئەمەیان خاڵێکی بەرزبوو. سێ هەفتە دواتر گەرانگ بە ڕووداوێکی کەوتنە خوارەوەی هەلیکۆپتەر کوژرا. وتاربێژان لەکاتی مەڕاسیمی بەخاك سپاردنی گەرانگ، بەراوردیان لەگەڵ پێغەمبەر موسا پێدەکرد، پێشڕەوێك کەلەسە خاکی بەڵێندراو (الارض الموعودة) لەناویان برد. جێگرەکەی، سالڤاکیر مەیاردیت، لەگەڵ بەشیر دەستیان بەرزکردەوە و بەڵێنی جێبەجێکردنی میراتی پێشڕەوە مردووەکەی بدات لەڕێگای جێبەجێکردنی ئاشتی.

هەست بە هیوایەك دەکەم بەڵام گەشبینیش نیم. کەسایەتی والەناو سودان هەیە کە سوود لەم سیستەمەی پێشووتر وەردەگرێ هیچ بەرژەوەنییەکی نییە کار لەگەڵ بەشی باشوور بکات وەك شەریك لەحکوومەت. ئەوان لەدژی یەکتری وەك گرووپێکی بچووکی ڕکابەری جیاواز حیسابیان بودەکرێ، یاخیبووەکانی پێشوو لەهەوڵی خۆیەکخستنەوەدان لەهەمان کاتدا پەرە بەبواری بەڕێوەبردنی پێویست دەدەن بۆ خزمەتکردنی گشتی. نەتەوە یەکگرتووەکان ئامادەی یارمەتیدانە، هەروەها گەڕانەوەی ڕۆشنبیرە سودانییەکان لەپەناهەندەیی، بەڵام پێویستییەکانی پێشکەوتنی ئەم وڵاتە بێ سنوورە. دابەشبوونی ئایینی بۆتە بەربەست لەبەردەم یەکگرتوویی ئەم وڵاتە وەك چالاکوانە ئیسلامییەکان بەدوای فراوانکردنی کاریگەرییەکانیان دەگەڕێن بۆ بەرگرتنی لە مەسیحی و ڕۆحانییەکان. بەڵکو لەوانەش مەترسیدارتر، ڕێککەوتنی ئاشتی کەناتوانێ ئاشتی بۆسەرتاسەری سودان دابینبکات. ئەمەش درێژنابێتەوە بۆ دارفۆر، لە ڕۆژئاوای سودان، تیایدا میلیشیاتە تاوانبارەکان، کەلەلایەن حکوومەتەوە پاڵپشتی دەکرێن، گەڕان بەدوای پاکتاوکردنی هەرێمە ناعەرەبیەکان لەسەر حیسابی گیانی سەدان هەزار هاووڵاتی. هەروەها حکوومەت بەردەوام بوو لەسەر دابینکردنی شوێنگەیەکی ئارام بۆ سوپای بەرگریکاری ئۆگەندی. سەرەڕای پەرەپێدانی خودی خۆی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، بەشیر هێشتاکە زۆر بابەت ماوە وەڵامیان بداتەوە.

لەژێر ڕێککەوتنی ئاشتی، هەڵبژاردە نەتەوەییەکان لەساڵی ٢٠٠٩ نەخشەی بۆدانراوە. دوای دووساڵیتر، باشوور مافی ئەوەی هەیە ڕاپرسیەك بکات کەئایا حەز بەمانەوە لەگەڵ حکوومەت دەکەن یان جیابوونەوە. هەرچەندە گەرانگ هەوڵی زۆری بۆ پێکەوەبوونی وڵاتدا، بەڵام تێڕوانینی جیابوونەوە زۆربەی شوێنکەوتووانی بۆلای خۆی کێشکرد. ولایەتە یەکگرتووەکان ئەوەی لەتوانای دابێ بۆیارمەتیدانی ئەم ڕێککەوتنە ئاشتییە دریغی ناکات کەبۆتە هاندەرێك بۆ چارەسەری فراوانتری دیپلۆماسی کەلەکۆتاییدا ببێتە بنبڕکردنی جینۆساید و توندوتیژی ترسێنەری لەباکووری ئۆگەندا. ناسینەوەی ئەم ئایینە نابێ پشتگوێبخرێ، دەبێ بەردەوام ئەوە بەگوێیانەوە بچرپێنین کە سیاسەتی

ئێمە مەبەستی یارمەتیدانی هەموو سودانییەکانە. ئەوەدەکەین کەدەتوانین بـۆ ڕێگـەگرتن لـە هێـزی دابەشبووی دەرەکی، جا ئایا مەسـیحی بـێ یـان موسـڵمان، بۆئـەوەی بـەهۆی دەسـتێوەردانەکانیان بارودۆخەکە خراپتر نەکات. لەبری هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی هەموو شتێ لەلایەن خۆمانـەوە، پێویسـتە کار لەگەڵ وڵاتانیتریش بکەین پاڵپشتیکردن لـە هەوڵـەکانی گرووپـە ناوبـژیکارەکان بـۆ بەسـتنەوەی سودان لەسەر هێلەکانی جوگرافی، ڕەگەزی، و ئایینی.

ئەزموون ئەوەمان پێدەڵێ، کە نیوەی ئەو وڵاتانەی لەدەرەوەی شەڕی ناوخۆنە توانای دەسـتکەوتنی سەقامگیریەکی بێ کۆتاییان دەبێ. گەیشتنی ئاشتی بۆ باکوور و باشووری سـودان زیـاتر لـە بیست ساڵی خایاند، پاراستنی ئەم ئاشتییە—ڕێگەگرتن لەهەر بازنەیەکیتری ئەشکەنجەدان—پێویستی بـە هەوڵدانی بەردەوام هەیە. کۆنترین شاری ڕۆژئاوای ئەفریقیا—کـانو لـە نایجیریایـە—تـاوەکو ئێسـتا هیچ وەزیرێکی دەرەوەی ئەمەریکا ئەو سەرەڕۆییەی نـەکردووە سـەردانی ئـەم شـارە بکـات، منـیش لەبەرئەم هۆیە چوومە ئەوێ. جیهان گۆڕداربوو، دیپلۆماسیەتی ولایەتە یـەکگرتووەکان پێویسـتی بـە گەیاندنی نوێ بوو. بۆهەزار ساڵ دەچێ، کانو—ئێسـتاکە شـارێکی نیـو ملیـۆن کەسـییە—ببـووە سەنتەرێکی ئیسلام. لەوەتەی ١٨٠٤، ئەم شارە ببووە بارەگـای خەلیفەیـەك کـە لـەدوای زنجیرەیـەك شەڕی پیرۆز—جیهادەوە—بنیاتنراوە. سێزدەمین خەلیفە، ئەمیر ئادۆ بـایێرۆ، لەوەتـەی **١٩٦٣** ئـەم پۆستەی وەرگرتووە. لەساڵی **١٩٩٩** ئەو خۆی میوانداری کردم.

لەکۆشکەکەی خـۆی چـاوم پێیکـەوت. دوای گۆڕینـەوەی سـلاو، بـەرەو هـۆڵێکی نەخشـێنراوی ئەندازەیی هەنگاومانا. بەرلەوەی خۆی لەسەر ئەم کورسییە دابنیشێ کەبە پێستی بەرخ داپۆشـرابوو، داوای لێکردم لەلای دەستە ڕاستییەوە دانیشتم، وەك نیشاندانی ڕێز بۆ میـوان. سەرپۆشـەکەی ئـەمیر زۆر بە جوانی ڕازابۆوە، بەو ڕەنگانەی کە ئاماژەی بۆ لادێ و خێزانەکـەی دەکـات، بـەدەوری ملیـەوە پێچی خواردبۆوە تالەسەری گرێی دابوو. بۆ سوود وەرگرتنی ڕیپۆرتمانـەکان، سـەرەتای دانیشـتنەکەی بە بەخێرهێنانی مـن دەسـتی پێکـرد بـەزمانی نـاوخۆیی (هاوسـا)، دواتـر منـیش بـە ئینگلیـزی قسـەمکرد. هاتینـە دەرەوەی هۆڵەکـەی لـەژێر دوو چـەتری ڕیشـەدار دەڕۆیشـتین بـەنێو ئاپۆڕایـەك کەلەبەردەم هۆڵەکە کۆببوونەوە، ببوونە دوو بەش وەك دەریایەکی سوور لـە مـرۆڤ. هەرکـەس لـەلای خۆیەوە گۆرانی دەچری، منیش هیچ ئایدیایەکم نەبوو لەوەی ئەمانە چ دەڵێن. پیاوە پیرەکان تفـەنگیان بەرزکردبۆوە، ئەوانیتریش تیرو ڕمەکانیان لەهەوا دەشـەکاندەوە. منـیش دەسـتم بۆیـان بـەرزکردبۆوەو سلاوم لێیان دەکرد. ئەمیریش لەلایەن خۆیەوە دەستی توند گیرکردبوو وەك مست بەڕووی خەڵکەکـەی دەجوولاندەوە، ئەو کات لەوە فێربووم کە ئەمانە هەمووی ئاماژەیەکن بـۆ ڕێزگرتنـی میـوان. بەسـەر

سەکۆیەك کەوتین، ئەو شوێنەی من وەك دیمەنی بێ هاوتای دوربـار durbar ەوە مامەڵـەم لەگـەڵ دەکرا: ئەم بۆنەیە بەبیرهێنانەوەی ئـەم جیهـادە سـەرکەوتووەبوو بـەر لـە دوو سـەدە، لـە نیشـاندانی تێکەڵبوونی کلتووری دەوڵەمەندی ئەفریقی و ئیسلامی بوو.

بۆنەکە لەلایەن حاکمەکانی ناوخۆیـەوە دەسـتپێکرد لەگـەڵ پێـداوتنی بـە شـان و بـاڵی ئـەمیر لەرێگای گۆرانی وتن و سەماکردن و کاری پێکەنیناوی. کۆمەڵـە پیاوێـك بەسـواری ئەسـپەوە جـۆرە دروشمانەیان هەڵگرتبوو کەئاماژە بەو لادێیانەیان دەکـرد کـە لێیـەوە هـاتبوون. جـەنگاوەران تەقـەی رووناکی مۆدەی کۆنیان بەهەوادا دەتەقاند. پیاوانی پزیشکی دەهاتن بەخەنجەر لـەخۆیان دەدا و بەچـاو و گوێ و لێویانـدا دەخشـاند بـەو مانایـەی کـە ئازاریـان نـادا. ئـەمیر، بەشـانازیەوە، هەنـدێ لـەو سوارچاکانای بۆم پێناسکرد، کەتەمەنیان لە حەڤدە ساڵ تێپەڕی نـەدەکرد. لـە ترۆپکـی ئاهەنگەکـە، جەنگاوەران ریزەکانی خۆیان یەکخست بەرەو سەکۆی نیشاندانەکە هەنگاویان دەنـا. بەخۆشـحاڵییەوە، پێم وترابوو کە پێشبینی ئەم رووداوە بکەم، هەروەها ئەوەشم پێووترابوو کە ئەسپەکان لـەکاتی خۆیـان دەوەستن. بەڵێ وەستان. بەپەرۆشەوە سوپاسگوزاری خۆمم بـۆ نیشـاندان، لەسـەر پێیـەکانم هەڵسـام، دەستم کرد بە چەپڵە لێدان پێش ئەوەی بەبیرم بێتەوە کەدەبێ دەسـتی تـوونگیراوم وەك مسـت بۆیـان بەرزکەمەوە.

ڤیستیڤاڵەکانی دوربار و نەریتەکانیتر پەیوەندیان بە رەنگدانەوەی خەلافەت و شـانازی کلتـووری و ئایینی کۆمەڵگای ئیسلامییەوە هەبوو. ئەمیر خۆی لەهەردوولا بەرجەستەی ئەم شانازییەی دەکـرد و هەروەها لـە جیاوازییـەکانیش دەچـووە دەرەوەی ئاهەنگـەکان. لەچوارچێوەی هەرێمەکـەی خـۆیی و سەرتاسەری نایجیریا کەسێکی خۆشەویست بوو چ لەلایەن موسڵمانانەوە وەچ لەلایـەن مەسـیحییەکان. کەسێکی ئاوا پێویستە چاودێری و گرنگی پێ بدرێت چونکە ژمارەی دانیشـتوانی نایجیریـا خـۆی لـە ١٢٨ ملیۆن کەس دەبێ بەجۆرێکیش دابەش ببوونە سەر هەردوو باوڕەوە. هەروەکو ئەوەی لـە سـودان بەشی بـاکووری موسـڵمان تیایـدا زاڵـن، وەلـە باشـووریش مەسـیحییەکان. توانسـتی ئـەم دووانـە پێکەوژیانیانە وەپێویستیشە بۆ داهاتووی ولاتەکە.

بەداخـەوەی نیشـانەی کێشـە و دووبـەرەکی هـەردوای سـەردانەکەم لەنێوخۆیانـدا سـەریهەڵدا. نایجیریـەکان اولوسـیگۆن ئۆباسـینگۆ یـان وەك سـەرۆکی خۆیـان هەڵبـژارد، کەسـێکی سیاسـی، کەبەتێڕوانینی هەندێك لە نایجیرییەکانی باکوور، سێ خاڵی لەدژی ئەمیر هـەبوو: یەکـەم، ئۆباسـینگۆ خەڵکی بەشی باشوورە، دووەم، لەدایکبووی مەسیحییە، سێیەم، بڕیاریداوە پاکسازی گەنـدەڵی لـەنێو سوپای نایجیری بکات، کەزۆربەی ئامانجەکانیشی ئەفسەرە پلەدارەکان موسڵمانی بەشـی بـاکووربوون.

لەبەرئەم هۆکارانەیە، سەرکەوتنی ئۆباسینگۆ وەك سەرۆك کاردانـەوەی دەسـتبەجێ و ترسـی لەلایـەن دانیشتووانی ولایەتەکانی بەشی باکوور لێکەوتەوە. کاندیدێکی حاکمی یـەکێك لـەم ولایەتانـە بـیری لەوە دەکردەوە کە زیرەکییە گەر بەڵێن وەربگرین لـەوەی بەرژەوەندییـەکانی موسـڵمانان دەپارێزرێـت، ئەگەربێتو سەرۆك بەیاسای ئیسلامی هەڵبژێردراوە. تەڵەکـە سـەرکەوتووبوو، بەڵێنەکـەش بـەخێرایی هاتەجێ. حاکمەکانیتریش رازیبوون، لەنێوان دوو هەفتەدا، یاسای ئیسلامی لە دوانزە ولایەتی بـاکوور پەیڕەودەکرا، لەنێوانیشیاندا کانو.

لەپێشدا، موسڵمانان رێگایان پێدەدرا بە بڕیـاردان بـە کاروبـارە کەسـیەکان (وەك تـەڵاق) لـەنێو دادگاکانی خۆیاندا، لەکاتێکـدا کاروبارەکـانی تاوانکـاری رادەسـتی دەسـەڵاتداری مـەدەنی دەکـرا. پەیڕەوکردنی یاسای ئیسلامی مانای ئەوەبوو یاساکانی دەبێ بەشێوەیەکی فراوانتر جێبـەجێ بکـرێن. سەرکردە موسڵمانەکان پاساودێننەوە بۆکردارەکانی وەك رێگەگرتن لـە گەنـدەڵی، کـۆنترۆڵکردنی بـەد رەوشتی و تاونکاری. هەرچەندە، مەسیحییەکانیش هەست بە هەڕەشە دەکەن. نارەزایان بەرامبەر ئـەو داواکاریانە دەردەبڕی کە قورئان و زمانی عەرەبی دەبـێ لـە قوتابخانـەکان بخـوێنرێن. مەسـیحییەکان بەرهەڵستی ئەم سزا توندانەیان دەکرد بەوەی کە شـەریعە دیـاری کـردووە ( هەرچـەندە زۆر بەکـەمی جێبەجێدەکرێ) هەروەها سەپاندنی قەدەغەکراوەکان لەدژی کحول و سـەماکردن. ئـەوان بـەبێ سـوود ئاماژە بە دەستووری نایجیری دەدەن، کە قەدەغەی هەر ولایەت و حکوومەتێکی ناوخۆیی دەکـات لـە بەکارهێنانی ئایینی رەسمی.

هەرلەوکاتەیەوە ژاوەژاوی موسڵمان و مەسیحییەکان بە کاری توندوتیژی تۆمەتبارکران. لە کـانو، خانووی قەشەیەکی مەسیحی، کە تۆمەتبارکرابوو بە هەڵگەڕاندنەوەی موسڵمانان، ئاگری تێبـەردرا و تەواوی خێزانەکەشی کـوژران. شـەڕی بـەرفراوان لەسـاڵی ٢٠٠٢ دەسـتیپێکرد کاتێـك یـەکێك لـە رۆژنامەنووسـە کۆڵەمنیسـتە ناوخۆییـەکان بەهـەموو حەماسـیەتیەوە نووسـیبووی، یـەکێك لـە بەشداربووانی فیستیڤاڵی شای جوانی شـایانی پێغەمبـەر مووحەممـەد بـوو بـۆ زەواجکـردن. سـەدان رووداوی ئاژاوەی توندوتیژی لەدژی کڵێسا و مزگەوتەکان دروسـتبوون، زۆرجـار بانگەشـەی نادروسـت دەبووە هۆی ئەوەی شوێنکەوتووانی ئەم باوەڕە رێز لەوەیتر نەگرێ. نزیکەی ١٠،٠٠٠ کەس کـوژران و هەزارانیتریش ماڵیان بەجێهێشت. هەرچەندە حکوومەتی فیدراڵ قەدەغەی وررووژانی ئـایینی دەکـرد، بەڵام کەمتەرخەمی هەبوو لە شێواز و دەسەڵاتی ئەخلاقی بـۆ جێبـەجێکردنی ویسـت و بڕیارەکـانی. سەرکردە مەسـیحییەکان بـەردەوامن لـە تۆمـەتبارکردنی موسـڵمانەکان بـەوەی دەیانـەوێ هـەموو

مەسیحییەکان بەتەواوی لەبەشی باکووری نایجیریا دەربکەن، موسڵمانەکانیش تووڕەن بەرامبەر هەوڵەکانی مەسیحی بۆ بەمەسیحی کردنی دانیشتووانی موسڵمانان.

رەگی ناکۆکییە ئایینیەکانی نایجیریا تەنها مەسەلەی ئایینی نییە. وەکو وڵاتەکانی ئەفریقیا (لەنێوانیشیاندا، سودان، هەروەها عێراقیش)، نایجیریا لەگەڵ هێزەکانی رۆژئاوای بەیەکەوە ژمارەیەکی زۆر گرووپی ئەتنیکیان دروستکردبوو. هەر لەرۆژەکانی یەکەمی سەربەخۆییدا، حکوومەتی فیدرالی نایجیری لەهەوڵی خۆسەلماندن دابوو تاوەکو کۆنترۆڵی هەرێمە بەرهەڵستەکانی بکات. بۆماوەی چەندین دەیە ساڵە، دیکتاتۆرە چلێسەکان ئابووری نایجیریا بەخراپە بەکاریاندەهێنا، داهاتی نەوتەخاوەکەشیان تالاندەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتووانەکەشیان بە هەژاری و گاڵتەجارییەوە بەجێدەهێشت. لەهەر شوێنێك ژمارەیەکی زۆر هەژاری و بێکاری هەبێ، لەهەر پرۆشەکەیەك چاوەڕوانی ئاگرێکی گەورە بکە. لەگەڵ ئەمەشدا، گاوانە موسڵمانەکان لەناوەڕاستی بانەکانی نایجیریا تووشی شەڕکردن بوونەوە لەگەڵ جووتیارە مەسیحییەکان لەسەر مافەکانی لەوەڕاندن و پێدانی ئاو بۆ مانگاکانیان. (هەمان رکابەری لەسەر سەرچاوەکانی کشتوکاڵی لەسەر سنوورەکانی ئەمەریکا لەسەدەی نۆزدەهەم روویاندا). لەنایجیریا گرژییەکان بەرەو خراپتربوون دەچوو بەهۆی کۆکردنەوەی کەمی ئاوی باران و رێژەی بەرزی چاندن، بەجۆرێك وای لەخەڵکەکەکرد کەهەوڵی خۆ ژیانیان بدەن لەسەر زەویەکی کشتوکاڵی بچووکتر. لەکاتێکدا گرژییەکانی ئابووری دەبنە سەرچاوەی سەرەکی بۆ توندوتیژی، بەڵام جیاوازییە ئایینییەکان کێشەکە سادەتردەکەن بەوەی وای نیشاندەدەن ئەم کوشتنانە مەبەستی گەورەتری لەدواوەبوو لەوەی تەنها لەسەر مافی لەوەڕاندن و زەوی دانەوێڵە بێ.

لەسودان و نایجیریا و هەندێ شوێنیتری ئەفریقیا مەترسییەکان بەردەوامیان هەیە: دانیشتووانی موسڵمانە گۆشەگیرەکان شوێنی گونجاویان تەرخانکردووە بۆ ناونووسکردنی گرووپەکانی وەك قاعیدە. حکوومەتە لاوازەکان، سنوورە بێ چاودێرییەکان، ناکۆکییە ناوخۆییەکان رێگە خۆشکەرن بۆ دروستبوونی رێکخراوە ئیجرامییەکان. ئیسلام لەئەفریقیا میانڕەوترین و بە لێبووردەترین ئایین بوو، بەڵام فشاری توندڕەوەکان کەلەدەرەوەی وڵاتەوە دەهاتن، پارەیان دەدایە رادیکاڵییەکان بۆ ئیدارەکردنی مزگەوت و سەنتەرە کۆمەڵایەتییەکان بۆ ئەوەی یارمەتی پێشکەش بە هەژارەکان بکەن. سەرکردە تەقلیدییە موسڵمانەکان لەبەرنەبوونی سەرچاوەی پێویست توانای رکابەریان نییە، پەیامەکانیشیان کەمتر کاریگەریان بەسەر خەڵکەکەوە هەیە. هەنووکە، ژمارەیەکی زۆر لەئەفریقیایەکان لەریزی یاخیبووانی دژی حکوومەت بینراون شەڕ لەعێراق دەکەن. ولایەتە یەکگرتووەکان وەڵامی ئەوانەی دایەوە بەناردنی هێزی سەربازی بۆ جیبۆتی وەك بەشێك لە ئەرکی

نەهێشتنی تیرۆر لە کیشوەری ئەفریقیا. هەروەها هەڵساوە بەڕاهێنانی زۆرێك لەلایەنە سەربازییە جیاوازەکانی ئەم ناوچەیە لەسەر شێوازی رووبەڕووبوونەوەی تیرۆر. ئەمەش بەها و گرنگییەکی خۆی تێدایە، بەڵام لەهەمانکاتیشدا مەترسیداریشە. دەمانەوە لەوە دڵنیابین کە ستراتیژییەکەمان هەردوو لایەن دەگرێتەوە هەم گشتگیرە و هەمیش هەڵبژاردەیە. لەکاتی جەنگی سارد دا، هەندێجار پاڵپشتیمان لەحکوومەتە دژبەکۆمۆنیستەکان دەکرد کەچی لەبەرامبەر خەڵکەکەی بەبێ ڕێزی و زراندنی ناوبانگی لێکدەدرایەوە . ئەگەر ئێمە کۆمەکی پێشکەش بەو هێزە سەربازییانە بکەین کەهاوکاری لەشەڕکردنی لەگەڵ قاعیدە دەکەن، بەڵام بەشێوەیەکی فراوان کارێکی رق هەڵگرە، لەم رووەوە خۆمان داواکانی قاعیدە بەهێزدەکەین.

ئەگەر بمانەوێ یارمەتی ئەفریقییەکان بدەین بۆشەڕکردن بەوجۆرەی کە قاعیدە پڕاکتیزەی دەکات، پێویستە یارمەتیان بدەین لەڕێگەی شەڕکردن لەگەڵ ئەو هێزە گەورانەی کە مەترسیان لەسەر دروستدەکات—لەنێوانیان نەخۆشی، کەمی ئاوی پاکی خواردنەوە، نەبوونی فێربوون و پەروەردەی پێویست، تێکچوونی باری ژینگەیی. ئەگەر بمانەوێ راهێنانی سەربازییان پێشکەشکەین، دەبێتە ئامانجێك بۆیارمەتیدانی هێزەکانی ئاسایشی ئەفریقی بۆ رێگەگرتن لە ململانێی ناوخۆیی و جینۆساید، هەروەها شەڕکردن لەگەڵ تیرۆر. پێویستە لەسەرمان گەشە بە ئاڕاستەی مەسەلەی عەقیدە بدەین. پێشتر ئەوەم بۆ دیپلۆماتە ئەمەریکییەکان نووسیوە کەدەبێ زانیاریان لەسەر ئایین و بیروباوەڕی ئەم وڵاتانە هەبێ کەبەنیازن سەردانیان بکەن.

*گۆڕانییەکانی جادوویی*، لەلایەن نووسەری نایجیری، بێن ئۆکری، نووسراوەتەوە، بەوە دەست پێدەکات: " ئاژاوەمان نەبینی کاتێ گەورەبوو، کاتێکیش شەپۆلەکانی لەنێوان خۆماندا دۆزییەوە ئامادەنەبووین بەرگەی گێڕانەوە تووڕەیەکە و رووخسارە دڕەندەییەکەی بگرین" . ئەمڕۆکە، هیچ پاساوێکمان نییە. دەبینین کەچۆن ئاژاوەکان گەشەدەکەن. خودا یارمەتیمان بدات گەرێتوو خۆمانیان بۆ ئامادە نەکەین.

## (١٨)

# هەموو گونجاوە پێکاوەکان

مەهاتما غاندی دەیوت، "چاو بەچاو وادەکات تەواوی جیهان کوێرەبن". لەبەشەکانی پێشووتر، تەماشای ئەم ئازارەمانکرد کە بەهۆی نزیکبوونەوەی سفری بوو لـەئایینی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاست، ئێـران، عێـراق، ئەفغانسـتان، ئـەوروپا، و بەشـەکانی ئـەفریقیا. دەمـانتووانی بـەدوای هـەمان مەسەلەکان بگەڕێین لەو وڵاتانەی وەك ئەندەنوسیا، تایلەند و فیلیپین لە باشووری ئاسـیا، هـەروەها قەوقاس و شیشان لە ئاسیای ناوەڕاست. دەمانتوانی ئەم کردە هاوسەنگییە زەحمەتە تاقیبکەینـەوە کە ئەدگاری سروشت ولایەتە یەکگرتووەکانە بەرامبەر پاکستان، یـاخود دیمـەنی دەرەوەی لوبنـان، ئەو شوێنەی موسڵمانە شیعی و سوننەکان و مەسیحییەکان خەبات دەکەن بۆ هێمن راگرتنـی ئـەم مەنجەڵە دابەشکراوەی کە پەیوەندی بە مەسەلەکانی خێڵەکی و سیاسی و رێبازەوە هەیە. تەنانەت لە ئەمەریکای باکووریش، ئەو شوێنەی کە ئیسـلام بـە خێراتـرین گەشـەکردنی ئـایین دادەنرێـت، هەندێ پرسیاری قەبووڵکردنی کلتـووری و جیـاوازی رەگـەزی هەیـە کـە وەڵامدانـەوەیان تووشـی هیلاکیت دەکات، بەمەش لەلایەن ترسەکانی توندوتیژی توندڕەوەکان قووڵتر دەبێتەوە، تیرۆریستانی ٩/١١ لەوەیە لەشوێنیتر لەدایك بووبن، بەڵام لەناو ولایەتە یـەکگرتووەکان دەژیـان و راهێنرابـوون بۆماوەی چەند مانگێك بەر لەهێرشەکان.

لەوەیە هەندێ خەڵك کۆتاییەك بۆئـەم گشـتگیری و چـرپە ناکۆکیانـە بێـنن بـەوەی کەئـەمڕۆ بەرەنگاربوونەوەی ناوەندی لەجیهان ئەوەنییە چۆن خۆت لە بەریەککـەوتنی شارسـتانیەت بپـارێزی بەڵکو چۆن ئیدارەی ململانێیەك دەکەی کەبەڕێوەیە. ئەمەش وێنەیـەکی زۆر تاریکـە. قاعیـدە و شوێنکەوتووانی بەنیازن شۆڕشە ئیسـلامییەکانی جیهـانی تێکـەڵ بکـەن، بـەڵام ئەمـەش مانـای ئەوەنییە کە سەردەکەون.

ترس خۆراکی تیرۆریزمە. تەنها ئەگەر ترس رێگە بە بڵاوبوونەوەی درا ئـەوا قاعیـدە پاڵپشـتی بەردەوامی دەبێ. روپێوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە عەرەب سەیری تەعەسوبیەتی ئـایینی دەکـەن

وەك كێشەیەكی گەورە لەهەردوولا لەنێو كۆمەڵگاكانی خۆیان و رۆژئاوادا. بەشێوەیەكی گشتی موسڵمانان حەزبە پێوەلكانی توندوتیژی ناكەن. ئەگەر بەشتێكەوە رازیبوون، ئەوە سروشتی ئاشتیانەی ئایینەكەیەتی. تەنانەت ئەوكاتەی بزووتنەوەی تالیبان دەسەڵاتی زۆربەی ئەفغانستانی گرتە دەست لەكۆی پەنجاو سێ وڵات كە زۆرینەی دانیشتوانەكانیان موسڵمانن تەنها سێ وڵات دانی بەم حكوومەتە نا. هێرشە تیرۆریەكان كەبووە هۆی كوژرانی موسڵمانان لە وڵاتەكانی وەك عەرەبستانی سعودی، ئوردن، (مصر)، توركیا، ئەندەنوسیا، و بەنگلادیش و هەندێ موسڵمان ئەوانەی كە سۆزداری قاعیدەبوون و بیركردنەوەیان گۆڕابوو.

لەلایەن خۆشیەوە، ئیدارەی بۆش، سەرەڕای هەڵە گەورەكانی لەكاتی بڕیاردان، بەڵام خۆی نەهاوێشتە نێو كێشەی خاچ پەرستی ئایینییەوە. سەرۆك لەوە تێدەگات كەباشترین رێگا بۆ زاڵبوون بەسەر قاعیدە بێبەشكردنی ئەم رێكخراوە تیرۆریستییە لە پاڵپشتی و سۆزی ئەو كەسانەی كەلەنێو موسڵمانانن، بەجۆرێك قاعیدە هۆشی ئەوانی بۆخۆی كێشكردبوو. زۆربەی ئەمەریكییەكانیش هەمان بیركردنەوەیان هەیە. ژمارەیەكی كەم، تەنانەت لەنێو مەسیحییە ئینجیلییەكان، لەگەڵ پات رۆبێرتسۆن كۆكن بەوەی رووبەڕووبوونەوەی قاعیدە لەبنەڕەتدا، "ململانێی ئایینییە"(*). فرەیەكان وادەبینن كە ئیسلام وەكو ئایینەكانیتر نییە بۆ هاندانی توندوتیژی.

كارێكی باشە بەوەی بەشێوەیەكی رێژەیی هەڵوێستە تەندروستەكان بەردەوامیان زیاتربوو سەرەڕای كۆمەڵێك رووداوی لەسەریەك كە هەوڵی بەژەهراوی كردنیانی دەدا. راستییەكە لێرە ئەوەیە زۆربەی موسڵمانان بەرژەوەندی لەباریان هەیە لەگەڵ ئەوانەی لەرۆژئاوان، عەرەبەكان و ئەمەریكییەكان سوود لە چاككردنی پەیوەندییەكانیان وەردەگرن. لەڕاستیدا، ویلایەتە یەكگرتووەكان بەبێ یارمەتی عەرەبەكان ناتوانێ بەسەر قاعیدەدا زاڵبێت، عەرەبەكانیش بەبێ وەبەرهێنەرەكانی رۆژئاوا ناتوانن تەندروستی ئابووری خۆیان بپارێزن. كەواتە هیچ شتێ لەئارادانییە بەناوی شەڕی پیرۆز، جیهاد.

---

(*) رۆبێرتسۆن لە ٢٠٠٤ لە قودس بەگوێگرانی وت: خوشكان برایان بەهەڵە تێمەگەن—تەواوی جیهان بەهۆی ململانێی ئایینییەوە دەهەژێ. شەڕەكە بۆ پارە و ناوچە نییە، شەڕەكە لەدژی هەژاری و سەرمایە نییە، شەڕەكە لەدژی نەریتە كۆنەكان بۆ مۆدێرنیتی. نەخێر—ململانێیەكە بۆ ئەوەیە ئایا هوبەل، خودای مانگی مەككە، كە وەك الله دەناسرا، ئەو باڵایە، یاخود خودای مەسیحی و یەهودی كەلەكتێبی پیرۆز ناوی هاتووە باڵایە".

لەگەڵ ئەوەشدا، جیاوازی ترسناکی بۆچوون هەیە لەبارەی سێ مەسەلەی سۆز هەڵگر: یەکەم، دارشتنێکی دادگەری، تەواونییە لە رۆژهەڵاتی ناوەراست، دووەم، شەرعییەت بوونی سەربازانی ئەمەریکی لە عێراق، سێیەم، سروشتی تەواوی مەبەستەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان. کاتێ ئەم مەسەلانە راستیان پێوە بینرا، تێروانینی گەشەسەندن لەهەموو لایەکەوە دروستدەبێ. دوای چەندین ساڵ لەتوندوتیژی، ئێستا هەردوولا فەڵەستین و ئیسرائیل سەرۆکی نوێیان هەیە. لەگەڵ گۆرانکاریەکان ژاوەژاو دروستبووە، کەچی دەرفەتیش هەیە. ئیسرائیلییەکان، لەژێر سەرکردایەتی شارۆن، قەبوولی هەندێ داوکاری کرد کە زۆربەی خەڵك نکۆڵیان لێدەکرد—موساوەمەکردن لەسەر خاك پێویستە بۆپاراستنی ولاتێکی دیموکرات و زۆرینەی جوولەکە. فەڵەستینییەکانیش، سەرۆکێکیان، مەحمود عەبباس، بۆخۆیان هەڵبژارد، کە بروای تەواوی وایە دانووستاندن، نەك بەگژداچوون و شەرکردن، باشترین رێگەیە بۆ دەستەبەرکردن و فەراهەمبوونی پێداویستە سەرەتایی و هیواکانی خەڵکەکەی. هەرچەندە ئێستاکە حەماس کە شوێنگەیەکی باشی هەیە بۆتە بەربەست لەبەردەم بەرەو پێشچوونی ئاشتی، تەڵبەندێك لەنێوان هەردوو سایدا هەیە بۆدۆزینەوەی چارەسەریەکی بەردەوام. هیچ شتێ لەوە باشترنییە بۆ رێککەوتنی ئاشتی نێوان ئیسرائیل و فەڵەستین و دانانی پەیوەندییەکان لەنێوان عەرەب و رۆژئاوا لەسەر خاکێکی رەق.

دەربارەی کەیسی عێراقییەکان، پێشبینییەکانی عەرەب زۆر نزمن بەجۆرێك دەستکەوتە بێ فیزەکان دەتوانن کاریگەری گەورە دروستبکەن. ئەگەر عەرەبە سوننییەکانی عێراق پرۆسەی دیموکراسیەت لەباوەش بگرن، ئەوە کاری ئەو عەرەبانەیە کەبەردەوام لۆمەی سیاسەتەکانی ئەمەریکا دەکەن لەشوێنەکانیتر بە زەحمەت دێنی. ئەگەر توندرەوەکانیش کەمبوونەوە، ئەوا بارودۆخەکە ئاسانتر و سەلامەتتر دەبێ بۆ کشانەوەی سەربازانمان. ئەگەر خۆمان بەخۆبەخشی دەربازکرد لەماوەیەکی ماقوول، ئەگەر ئەو حکوومەتەی لەدوای خۆمان بەجێدێڵین شەرعی بێت و ولاتێکی دابەشنەکراوبێ، ئەوا تووڕەبوونەکان دەرەوێتەوە و گومانەکانی سەر هاندانەکانمان کەمتر چڕ دەبنەوە.

کۆمەڵێك لەم "ئەگەرانە" ئەوە نیشاندەدا چەند عەرەب لەبیرکردنەوەیان بەرەو گۆران راستن. بۆچوونی هەنووکەی ناوچەکە، بەپێی دیراسەیەکی هاوبەشی گرووپەکان لەولایەتە یەکگرتووەکان و مصر رێکخراوە، ئەوەیە کە، " ئەمەریکاییەکان، لەخۆباین، دەسەڵات پەرستن، رەوشت داروخاون، نادادگەرن، دڵرەقن، بەهەوەسەوە بەرەو دەسەڵات و سامان دەچن". رووپێوی دووەم ئەوە نیشاندەدا کە زۆربەی موسڵمانان بەمجۆرە ئەمەریکییەکان دەبینن کە خەڵکانی چلێس و بێ رەوشت و

توندوتیژن. ئەم ستریۆتایپانە ناتوانرێ بەتەنها لۆمەیان لێبگیرێ، یاخود بەشێوەیەکی سەرەکی، لەسەر سەرۆك بۆش، بەڵام لەماوەی دەورەی یەکەمی ئەم کێشانە زۆر قووڵبیوون. ئەمەش هاوکات نەبوو. بەتایبەتی، لەعێراق، سەرۆك قوربانی بە پاڵپشتی نێودەوڵەتیدا بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجانەی کەخۆی پێی وابوو راستن، بەبێ رەچاوگرتنی بۆچوونی عەرەب و موسڵمانەکان. لەبەر هەستی وەزارەتی دەرەوە، کە ئەوکات کۆڵن پاوڵ بەڕێوەی دەبرد، ئەو هەوڵە ناپێویستیانە بەلاوەنران کەبۆ رێگە خۆشکردنی دیپلۆماسی گرترابوونە بەر. سەرۆك هێز و ویستی هەبوو بۆ جێبەجێبکردن ئەجینداکەی خۆی. بۆباشترکردن یان خراپترکردن، بۆ خراپترکردن، گوێنەدان بە رای گشتی جیهان.

لەکاتی وەرگرتنی پۆستەکەی لەسەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٥، کۆندەلیزا رایس رایگەیاند، " ئێستا کاتی دیپلۆماسیەتە". بەراستی، لەژێر رێنماییەکانی رایس، وەزارەتی دەرەوە زیاتر شەفافیەتی پێوەدیاربوو لە سیاسەتی دەرەوە لەوەی لەکاتی دەورەی یەکەمی بۆش، هەروەها ئیدارەش زیاتر بەپەرۆشەوە کاری لەگەڵ هاوپەیمانان و وڵاتەکانیتر دەکرد. تەنانەت سەرۆك، واپێدەچوو هەوڵی زیاتر دەخاتەگەڕ بۆ سارێژکردنی ئەم برینانەی کە لەپێشووتر دروستبوونە، کارین هیوزی راسپارد، کەیەکێکە لە باوەڕپێکراوترین یاریدەدەرەکانی، بۆ هاریکاریکردنی و پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ جیهانی ئیسلامی.

لەکاتی مەراسیمی سوێندخواردنەکەی هیوزدا، سەرۆك وتی، من پێشبینی ئەم کارەم بۆئەو دەکرد، هیوزیش ئاشکرایکرد " هەموو دەزگا و وەزارەتێك کار بۆ دیپلۆماسیەتی گشتی دەکات منیش بەهەمان ئاستی پێشینەیی کاری بۆدەکەم". دواتر قسەکانی لەسەر سێ خاڵی ستراتیژی چڕکردەوە: داواکردنی یارمەتی بۆ کەرتی تایبەت، وەڵامدانەوەی خێرای پڕۆپاگندەکانی تیرۆریستان، ناچارکردنی ئەمەریکییەکان بۆ "خوێندنی مێژوو و ترادیشناڵەکانی گەورەی" رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. دواتر ئەمەشی زیادکرد و وتی هەر هاووڵاتیەك کە" پێشوازی لە قوتابی بکات بۆ ناو ماڵی خۆیان ( لەچوارچێوەی بەرنامەی ئاڵوگۆڕکردن) ئەوا وەك باڵیۆزێکی ئەمەریکی سەیردەکرێ". کێشەی ئەم سۆزە گوڵاوییە لێرە ئەو قوتابییە موسڵمانانەن کەبۆ وەرگرتنیان لەزانکۆکانی ئێمە چاوەڕوانن بۆشوێنێکیتر هەنگاو دەنێن، ئەمەش لەدەستدانی دەرفەتە لەبەردەم هەردوولا کەلەوەیە نەوەیەك بۆ چارەسەرکردن وەربگرێت. بەمەش پشکداری لە دیپلۆماسیەتی گشتی گەورە دەکات ئەگەر ئێمە بتوانین هاوسەنگییەکی باشتر بدۆزینەوە لەنێوان پێوانەکانی ئاسایشی شەرعی و ئەو سیاسەتانەی کەلێك تێنەگەیشتن دروستدەکەن. ئەمڕۆکە، زۆربەی عەرەبەکان ئەم هەستەیان هەیە کە ولایەتە یەکگرتووەکان بەچاوی تیرۆریستی راستەقینە و

شارراوە سەیریان دەكات. هەندێكیشیان گەیشتوونەتە ئەم قەناعەتەی، بۆنموونـە، كـەبۆ وەرگرتنـی ڤیزا بۆ گەشتكردنیان بۆ ئەمەریكا، عەرەبەكان دەبێ سەرەتا وێنـەی بـە رووتـی بگـرن، بۆئـەوەی بسەلمێنرێت كە بۆمبیان لەگەڵ خۆیان حەشار نەداوە.

من خۆم لەبارەی ئەم هەموو ترسە زێدەڕۆییەوە هەست بە هەژانێكی دەروونی دەكـەم، ئەگـەرنا بۆئەم ئەزموونەی كەهەیەتم لەبارەی ئەو كەسەی كەناوی دەنێم ئەحمەد.

ئەحمەد هەمیشە ولایەتـە یـەككگرتووەكانی وەك مـاڵی خـۆی هەسـتپێدەكرد. لـە زانكۆكـانی ئەمەریكا خوێنـدنی تـەواوكردبوو، لـە وڵاتەكـەی خـۆی وەك فەرمانبـەرێك لـە ژووری بازرگـانی ئەمەریكی كاریدەكرد، چەند جارێك لەبۆنە تایبەتییەكان سەردانی ولایەتە یەككگرتووەكانی كردبوو. كەسـێكە كـەدەزانێ و حەزیشـی بـە ئەمەریكایـە چـونكە دەزانـێ هاوپـەیمانی بەرهەڵسـتكردنی توندڕەویە. لە ئۆگەستی ٢٠٠٥، لەرێگا بـوو لـەناو فڕۆكـە بۆئـەوەی لـە كۆنفرانسـێك ئامـادەبێ كەخۆشم یەكێك بووم لەبەشـداربووان، ئەحمـەد لەیـەكێك لـە فڕۆكەخانـەكانی بـاكووری ولایەتـە یەككگرتووەكان وەستێنرا. بەبێ هیچ هەراسـانكردنێك پرسـیاریان لـەبارەی تەندروسـتی "هـاوڕێ" یەكەی ئوسامە بن لادن لێكرا. لەدوایدا بۆچـەند سـەعاتێك چـاوەڕێی كـرد، پرسـیاریان لێـدەكرد لەبارەی شێوازی كلاسـیكی پۆلیسـی باشـی / پـۆلیس خـراپ، هـەروەها جانتـا و لاپتۆپەكەشـی پشكێنرا. لەماوەی ئەم میحنەتەدا، وێنەی كوڕە شەش ساڵانییەكەی بـووە هـۆی تۆمـەتباركردنی ئەحمەد بەوە حەز بە كاری سێكسی منداڵان دەكات. كۆپییەك لەكتێبەكەی رۆبێرت كێسلەر، كە بە یەكێك لە پرفرۆشترین كتێبەكان دادەنرێت، بەناوی *شەڕی CIA لەسەر تیرۆر*، زنجیرەیەك لەپرسیارە گاڵتەئامێزەكانی لەبارەی گرنگیدانەكانی ئەحمەد بە تیرۆرەوە بڵاوكردۆتەوە. ئەجێندای كۆنفراسـەكە كەخۆی بەنیازبوو بەشداری تیابكات وروژاندنی هەندێ پرسیاربوو لـەبارەی پەیوەندییـەكانی خـۆی لەگەڵ عەرەبەكانیتر. بینیان كۆپییەك لە بەرنامەیەكی كۆنی تەلەفزیۆنی سـی ئـێن ئـێن لـەبارەی قاعیدەوە لەنێو جانتاكـانی لەگـەڵ خـۆی هـەڵگرتبوو، سـەرئەنجام بـووە هـۆی ئـەوەی ڤیزەكـەی هەڵبوەشێتەوە بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی. لەوەیە كارمەندانی هـەواڵگری بیربكەنـەوە كـە ئەمـەریكا ئارامتر و سەلامەتتر رادەگرن، بەڵام ئەم كارانە و هاوشێوەی ئەمانە ئەركی كارین هیوز ناخۆشـتر و قورستر دەكات.

وێنەی كوڕە شەش ساڵانییەكەی بووە هۆی تۆمەتباركردنی ئەحمەد بەوە حەز بە كاری سێكسـی منداڵان دەكات.

دیپلۆماسی گشتی ناتوانێ دەستکەوتی زۆر بەدەستبێنێ تاوەکو ئەو سیاسەتانەی کەبۆ پاڵپشتیکردنی ئەم دیبلۆماسیەتە دیزاینکراون تواناداربن نەبێ بۆ سەرکەوتن بۆئەو خەڵکەی کەبۆ گوێگرتن بەشدارن(*) (*). لەهەردوو حاڵەتدا، ئیحتیمالاتەکان رۆشەن دەبن، گەریێتوو سیناریۆیەکان ببنە راستی هەروەك لەبەشەکانیتریش باسمان لێوەکردبوون، ئەگینا کێشە هەنووکەییەکانیش روو لەخراپتربوون دەکەن. بۆنموونە نسکۆیەکانی سیاسی و ئەمنی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەتوانێ بەئاسانی توندوتیژی بێنێتە بەرهەم. عێراق تووشی پارچەپارچە بوون دەبێ یان شکستخواردن، کەبۆتە مۆڵگەی بەهێزبوونی تیرۆریستان، وای لە سەربازانی ئێمەکردووە یان ئەوتا بەبێ نیزامی پاشەکشێ بکەن یان لەشوێنی خۆیان بمێننەوە بێ ئەوەی گەرەنتی سەرکەوتنیشان هەبێ. ناکۆکییەکانی نێوان سوننە و شیعە لەوەیە ببێتە رکابەریەکی زووگرگرتووی ناوچەکە. بەشێوەیەکی فراوانتر، فشارەکانی ناو ئیسلام لەنێوان موسڵمانان و مەسیحی و جوولەکەکان زیاددەبێ، والە شوێنکەوتوانی هەرسێ ئایین دەکات بەلەدەستدانی بەها هاوبەشەکانیان.

راوێژکاری پێشووی ئەڵمانی کۆنراد ئەدینوار تێبینی ئەوەیکردبوو، " مێژوو بریتییە لەکۆمەڵێك رووداوی کۆکراوە دەکرێ لێیانەوە رزگاربین". رووبەڕووبوونەوەی گشتی نێوان ئیسلام و رۆژئاوا دەکرێ و پێویستیشە لێیەوە بەدووربین، دەشبێ ئەگەر ئەوانەی خاوەن هێزن بۆ دروستکردنی رووداو و هەڵوێستەکان خۆیان لەمانە بپارێزن. حەوت ئایدیەم پێشکەشکردووە—ئەگەر نەبێتە کۆڵەگەی زیرەکایەتی—بەلایەنی کەم هۆشدارییەکە لەدژی هەڵە گەمژەییەکان.

یەکەم، بەناوەخۆکردن، نەك بۆ بەجیهانکردن. قاعیدە پەرۆشی تەختی شانۆی جیهانە، بۆیە دەبێ کاربکەین بۆرێگەگرتنی لەداواکردنی پەیامەکانی. ئاوێتەبوونی مەسەلە سنووردارەکان لە شیشان، نایجیریا، رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، عێراق، ئەو شوێنانەی کە ئاژاوەی لێ بەدیدەکرێت، دەبێ هەریەك بەجیا مامەڵەی تایبەتی لەگەڵدا بکرێت. بەمەش بۆچارەسەرکردن ئاسان دەبێ، لەکاتێکدا رێگەش لەبەردەم تیرۆریستان دەگیرێ لە وێناکردنی هەر کێشەیەك وەك بەشێك لە ململانێی تاکە ئایینی.

---

(*) نموونەیەکی روون بۆ پەیوەندی نێوان سیاسەت و جەماوەر بریارەکەی سەرۆك بۆش بوو بۆگەیاندنی یارمەتییەکی گەورەی سەربازی و مەدەنی بۆ لێقەوماوانی کارەساتەکەی تسونامی ساڵی ٢٠٠٤ لە رۆژهەڵاتی ئاسیا. تەقدیراتی ولایەتە یەکگرتووەکان لە ئەندەنوسیا و هیند بەشێوەیەکی دراماتیکی بەرزبۆوە وەهەر بەم ئاستە بەرزەوە مابۆوە.

دووەم، ئەوەت بەبیربێت کە کێ دوژمنتە. خانووێکی پیشەسازی راڤەکارانی رۆژئاوا هەیە پەرۆشی ئەوەن پێناسەی " ئیسلامییە رادیکاڵییەکان" بە کۆمۆنیزمی نوێ بکەن. سەرکردەی عەرەبی هەیە بەشێوەیەکی پێچەوانە ئیستیغلالی ترسی هاووڵاتییەکانی دەکات بەوەی ئیسلام لەژێر هەڕەشەی خەڵکانی بێگانە دایە. بەڕاستی بێ مانایە. نە ئیسلام و نە رۆژئاواش لەژێر هیچ هەڕەشەیەکی بێگانەدا نییە. هەردوولا تووشی ترس بوونە لەلایەن قاعیدە و رێکخراوە تیرۆریستەکانیتر. بۆیە پێویستە زاراوەکانی رووبەڕووبوونەوە تادەتوانرێ بەرتەسکتر بکرێنەوە.

سێیەم، یاری لەگەڵ ئاگر مەکە. کەش و هەوای سیاسی هەنووکە زۆر گەرم بووە. هەر لێکدانەوەیەکی هەڵەی وشە و کردار پلەی گەرما بەرزتر دەکاتەوە. لەتیۆریدا، گەیاندنە مۆدێرنەکان سۆزەکان هێمن دەکەنەوە لەرێگای دروستکردنی بناغەیەکی راستییە وەرگیراوەکان. لەڕاستیدا، دەزگا راگەیاندنەکان سۆزەکان لە قەبارەی خۆی زیاتر گەورە دەکەن لەرێگای پەخشکردنی بانگەشە ئازاردراوەکان و وێنە سەرسورهێنەکان ( یاخود کارتوونە ئابڕووبەرەکان) بۆ بینەران و گوێگرەکانی سەرئەنجام خەڵکەکەش بەپەرۆشەوە کاردانەوە لەدژیانەوە ئەنجامدەدەن. لەبەهاری ٢٠٠٥، ئاژاوەیەکی گەورە روویدا کەتیایدا چەند کوژراو و بریندراری لێکەوتەوە وەك وەڵامدانەوەیەك بەرامبەر ئەو راپۆرتە دوور لە جێی باوەڕەی کەگوایە سەربازە ئەمەریکییەکان پیرۆزی قورئانیان شکاندووە. بۆخۆلادان لەم جۆرە رووداوانە و هاوشێوەی ئەمانە، کاربەدەستانمان پێویستە رابهێنرێن لەسەر دیسپلینی نائاسایی لەوەی کە چ دەڵێن و چ دەکەن، داواکردنی هەمان هۆشداری لە بەردەستەکانیان. ئەمەش تاکە رێگای ئامانجەکە نییە. ئەوەی قسەیەکی ناشیرین دەکات یان مامەڵەی خراپ بەرامبەر کتێبە پیرۆزەکان دەکات دەبێ ئیدانە بکرێت —وەك سەرکردە موسڵمانەکان پێویستە فشاریان بکرێتە سەر بۆ رازیبوون—ئەمەش پاساوهێنانەوە نییە بۆ توندوتیژی.

لەهەر حاڵەتێکدا، هەموو هەوڵێك دەبێ بۆ باشترکردنی پەیوەندییەکان بێت. بۆنموونە، دوژمنایەتی ئیدارەی بۆش لەبەرامبەر تۆڕی کەناڵی سەربەخۆی عەرەبی ئەلجەزیرە لەجێی خۆی نییە. بینەرانی ئەلجەزیرە ئەوانەن کەپێویستیان بە کاربەدەستانی ولایەتە یەککگرتووەکانە بۆ گەیشتن بەم کەناڵە. لەبری هێرشکردنە سەر ئەلجەزیرە، حکوومەتەکەمان پێویستە باشترین بێژەری رەسمی ئامادەبکات بۆئەوەی لەبەرنامەکانی ئەم تۆڕە بەدیاربکەوێ و گۆشەیەك پێشکەشبکات.

چوارەم، پێویستە تێگەیشتنێکی هاوبەشمان لەسەر تیرۆریزم هەبێ. لەسیاسەتدا، کۆنترۆڵی ئەو وشە پڕمانا قبووڵکراوانە بکەن کە گرنگیان وەك کۆنترۆڵکردنی گۆڕەپانی جەنگە: لەهەنکەوە،

هەوڵی هەندێك بۆ وەسفكردنی پۆلێكی دیاریكراوی تیرۆریستان كە وەك جەنگاوەری ئازادی باس دەكرێن. ئەم هەوڵانەش نابێ رێگا بەسەركەوتنیان بدرێ. خەڵك تیرۆر وەك رێگایەك بەكاردێنێ بۆ وەرگرتنی سەربەخۆی نەتەوەكەی، یاخود بۆ بەرگەگرتنی داگیركردن لەپێناو ئازادی كەلەنێو مێشكیان چەسپاوە، بەڵام هاندانەكانیان پاساونییە بۆ شێوازی دەربڕینەكانیان، ئەمانە تیرۆریستن دەشبێ لەسەر ئەم ئەساسەوە مامەڵەیان لەگەڵ بكرێ. زۆرجاران قسەم لەگەڵ سەركردە عەرەبییەكان لەمبارەیەوە كردووە. هیچ كام لەوان بەڕوونی پاساویان بۆ توندوتیژی نەهێناوە لەدژی خەڵكی سیڤیل، بەڵام زۆربەیان وایان دادەنا كە هێرشە تیرۆریستییەكانی فەلەستینی بۆسەر ئیسرائیل توخمی یاسایین بۆ گەڕانەوەی خاكی داگیركراویان. سعودیەكان، بۆنموونە، پارە بۆ ئەو خێزانانە دەنێرن كەخۆیان دەتەقێننەوە، تەنانەت ئەگەر لە راگەیاندنەكانیش بڵاوبكرێتەوە(*). كاتێ پرتستۆی ئەم كردانەم دەكرد، دەیانوت، ئەم پارەیە "بۆهۆكاری مرۆڤایەتی" دەبەخشرێت.

بەم دوایانە لەبارەی ئەم بۆچوونە، لەلایەن سەید موحەممەد ئەلموسەوی سەرۆكی رابیتەی موسلمانە شیعەكانی جیهانی لە لەندەن، جەختی لەوە دەكردەوە كە " دەبێ جیاوازیەك بكرێ لەنێوان ئەو كەسە خۆكوژانەی كەبەمەبەستی هەوڵدانە بۆ بەرگریكردنی خۆیان لەدژی داگیركەرەكان، كە شتێكی جیایە لەگەڵ ئەوانەی خۆكوژی دەكەن تەنها بۆ كوشتنی خەڵكی بێگوناهی سیڤیلە، كەئەمەش بە تاوانێكی گەورە هەژماردەكرێ". هەرچییەك بووترێ لەمبارەیەوە ئەوا لەبەر رووناكی خۆكوژەكانی فەلەستینی ون دەبێ. چۆن ئەمە بەرگریكردنە بە تەقاندنەوەی پاسی قوتابخانە و چێشتخانەی پیتزا و بازاڕی سەوزەفرۆشان؟

توندوتیژی بەئەنقەست بەرامبەر كەسانی بێ چەك لەڕووی یاسای و ئەخلاقییەوە هەڵەیە. ئەم رێسایە لەسەر ئەو كەسانە جێبەجێدەبێ كە بۆمب لەشوێنی گشتی دادەنێنەوە، بۆ هەموو لایەنەكانی ناو عێراق، رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەهەروا بۆ تاكەكان و میلیشیاتەكان و هێزە

---

(*) باڵیۆزخانەی سعودیە لە واشنتۆن لە ٢٠٠١ وتارێكی بڵاوكردەوە، تیایدا داوای لە كۆمیتەی سعودی كردبوو بۆ پاڵپشتیكردن لەراپەڕینی قودس، كەلەلایەن وەزیری ناوخۆ ئەمیر نایف سەركردایەتی و ئیدارە دەكرا. ٣٣ ملیۆن دۆلاری تەرخانكرابوو بۆ یارمەتیدانی بریندارا‌ن و كەم ئەندامانی فەلەستینییەكان بۆ (٢،٢٨١ خێزانی بەندكراوەكان و ٣٥٨شەهید). هەروەها رۆژنامەكە راپۆرتێكی بڵاوكردبۆوە بەوەی ئەم كۆمیتەیە " بەڵێنی داوە بڕی ٢٠،٠٠٠ ریالی سعودی ( ٥،٣٣٣$) بداتە هەر خێزانێك كە بەهۆی شەهیدبوونی یەكێك لەئەندامانی ئازار دەچێژن"

سەربازیی ڕێکخراوەکان جا ئایا خزمەت بە دیکتاتۆری دەکەن یاخود بە دیموکراسی. هەروەها لەسەر ئەو کەسانەش جێبەجێدەکرێ کە دڵنیان لەوەی رووخسەتی خودایان هەیەکە ئەوان لەم نێوەندەدا هەڵاوێرد کراون (استثناء). ئەم ڕێسایە جیهانییە.

ئەمە مانای وانییە کە بەراورد لەنێوان کاری یاسایی و نایاسایی هەمیشە دیارو بەرچاوە. زۆرجاران هاوسەنگییەکی بەئازار داواکراوە—تەنانەت لە مەسەلە دادگەرییەکانیش—لەنێوان دەستکەوتە پێشبینیکراوەکانی سەربازی و ریسکە شیاوەکانی سەر خەڵکی سڤیلەکان. خەڵکی تێگەیشتوو لەهەندێ حاڵاتدا زۆر بەباشی جیاوازی دەکات لەنێوان ئەو کەسانەی کە جەنگاوەرن و ئەوانەی کە هەونینە. هەروەها، هێڵی نێوان بەرگریکردنی خودی و کاری دوژمنکاری لەتوانایدا هەیە ون ببێ سەرئەنجام هەریەك دەبێتە ترس لەسەر ئەویتر. لەلایەکیتریشەوە زانیاری هەڵە لەوەیە هەڵەی تراژیدی و رووداوی ترسناکی لێبکەوێتەوە. کلۆسوێتز لەسەر حەق بوو کاتێ ئەوەی نوسیبوو کە رووداوەکان توانای وەرگرتنیان هەیە لەسەر، "رەهەندە زێدەڕۆییەکان و رووخساری ناسروشتی"وەکو " کاریگەری تەم و تریفەی مانگ".

هەرچۆنێك بێ، بەلایەنی کەم، دەتوانین روون بین لەگەڵ ئەوەی کەچی روونە. هیچ پاساوێك نییە بۆ بەئەنقەست هێرشکردنە سەر خەڵکی بێ چەك، یاخود حیساب نەکردنی ئەو کەسانەی کە چەکیان پێنییە لەکاتی پێکانی ئامانجە سەربازییەکان. ئەو وڵات و خاوەن مەسەلانەی کەناتوانن بەبێ بوونی هێزی سەربازی تەقلیدی ئامانجەکانیان بەدەستبێنن مافی ئەوەیان نییە بۆ قەرەبووکردنەوەیان ڕێگای نا تەقلیدی بەکاربێنن بۆ بڵاوکردنەوەی تیرۆر لەنێو خەڵکی سڤیلدا.

پێنجەم، پێویستە قسە لەبارەی ئافرەتەوە بکەین لەو سۆنگەیەی کەدەبێتە پێشکەوتنی راستەقینەی بارودۆخەکانیان. خۆم پاڵپشتی لە بەهێزبوونی ئافرەت دەکەم لەهەردوولا وەك مافەکانی تاکی مرۆڤ یاخود وەك توخمێکی سەرەکی پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی. هەرچۆنێك بێ، ئەم مەسەلەیە لەلایەن زانیاری هەڵە و رەخنەگرتنی ساکار لە ئایینی ئیسلامەوە پێش ناکەوێ. لەمێژوودا هەندێ کۆمەڵگا هەبوون شانازی بەخۆیان دەکەن لەبەر مامەڵەکانیان بەرامبەر بە ئافرەتان. تەنانەت لەرۆژگاری ئەمڕۆکەش، لەلایەن هەندێ موسڵمانانەوە پرسیاری ئەوەم لێدەکرێ ئایا من حەزدەکەم کچێکی رووئاڵی تازە پێگەیشتوو لە بورکا ببینم یاخود لە قەحپەخانە. ئیسلام نە ئافرەتانی پەراوێزکردووە و نە پاساویشی بۆ هێناینەوە، بەڵام ناشکرێ ئەم دوو رەگەزە کە لە قورئان هاتووە فەرامۆشبکرێ، ئەگەر قورئان بەگوێرەی ئەوانەوە قسەی خودایە. کەسانی ناموسڵمان مافی سەپاندنی پێوەرەکانیان نییە، پێویستیش ناکات بیسەپێنن. لەزۆربەی

کۆمەڵگا ئیسلامییەکان، ئافرەتان دەتوانن و دەبێ پەرە بەخۆیان بدەن و پێشبکەون، هەرچەندە هەندێکیتر ململانێی لەدژیەوە دەکەن بەجۆرێك شۆڤینییە درەندەکان کەبەرێژەیەکی زۆر لەنێو هەموو کلتوورێکدا دەبینرین. هەڵدەکەین گەر لۆمەی ئیسلام بکەین یاخود گریمانەی ئەوەبکەین کەوا هەموو شتێك لەژێر باڵی یاسای شەریعەتەوە لەدەستچووە، ئاراستەیەکی باشتر ئەوەیە خەبات بکەین بۆ دەستکەوتنی ئەو مافانەی کە ئافرەتان پێویستە لەژێر باڵی یاساوە هەیانبێ جەخت بکەین لەسەرمافەکانی ئافرەتان لەهەموو شوێنێکەوە بۆ دیاریکردنی رۆڵیان.

شەشەم، مەسیحی و موسڵمان و جووەکان پێویستە ئەوە بزانن کەلەچەند شتدا لەگەڵ یەك هاوبەشن. هەمان ئەو هێزە جیهانگیری و گۆڕانکارییەی کەبۆتە هۆی بەرزکردنەوەی ترس لەنێو کۆمەڵگا ئیسلامییە کۆنزەرڤاتییەکان، بەهەمان شێوە بۆتە هۆی دروستبوونی دڵەڕاوکێ لە رۆژئاوا. هەستی لەدەستدانی رۆلی خودا وەك سەرچاوەی سەرەکی یاسا و رێنماییکردنی خەڵك لەلایەن ئاییندارەکانی کەنساس بەهەمان شێوە لە کەراشی وەك یەکە، هەروەها لەتەواوی ئۆرتۆدۆکسی کیبۆتز و لەگەڵ **ریاض** وەك یەك وانە. ریك وارەن، قەشەیەکی ئینجیلی بەناوبانگە، نووسەری کتێبی *The Purpose-Driven Life* باسی نوێبوونەوەی ئاشتیخوازانەی ئیسلامی دەکات وەك ئامانجێکی نێونەتەوەیی سەرەکی لەبیست ساڵی داهاتوو. من رازیم، بەڵام لەگەڵ دروستبوونی جارێکیتری باوەڕەکان لەناو کۆمەڵانی ئەمەریکی، لەوە دڵنیانیم کە کێ شیاوە بۆئەوەی وانە بەو کەسانە بڵێتەوە کەپێویستیان بە نوێبوونەوە هەیە. موسڵمانە کۆنزەرڤاتییەکان واتێدەگەن شەڕ لەدژی ئیسلامە، مەسیحییە کۆنزەرڤاتییەکانیش بڕوایان وایە ئەوان لەژێر گەمارۆدان. خێزانە ئاییندارەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی و باشووری ئاسیا حەزناکەن واشنتۆن پێیان بڵێت کەچۆن منداڵەکانتان پەروەردە بکەن، بەهەمان شێوەش راستە خێزانەکانی فلۆریدە و ئەلەسکا، جا سەیری خاڵەکانی نێوانیان بکە. ئەو کەسانەی کە مەیلیان بەرەو رووێکی عیلمانیتر هەنگاو دەنێ و یاخود پراکتیزەی عەقیدەیەکی کەمە نەتەوەیی دەکەن نیگەرانن بەوەی کە بۆچوونە ئەخلاقییەکانی زۆرینەی ئایینەکە لەسەریانەوە بسەپێنرێت، لە ولایەتە یەکگرتووەکان، هەندێك هەست بە ترس دەکەن، بەوەی بەربەستە دەستوورییەکانی نێوان ئایین و دەوڵەت دەبێ بشکێنرێت. سەرنجراکێشترین هەڵوێست لەبارەی نێوان ئیسلام و رۆژئاوا ئەوەنییە کەئێمە چەندە جیاوازین، بەڵکو ئێمە چەندە لەیەکچووینە. لەسەرهەردوولامان پێویستە باشتر لەیەکتر بگەین.

کاتێ لەڕێگای تەلەفۆن پرسیارم لەمبارەیەوە لە بیل کلینتۆن کرد، وتی پرسیارەکە لەوە دێت کەئایا ئێمە ئامادەین دان بەوەدا بنێین کە هەموو راستییەکانمان لانییە. وتی، ئەمەش، " بوونی هەموو گونجاوە پێکاوەکان، بوونی هەموو سیستەمە".

بەردەوام بوو، " شتێکی ئاساییە بلێی بڕوات وایە ئایینەکەت راستە، تەنانەت راستترە لە ئایینەکانیتر، بەڵام نەك بڕوات وابێ کە تۆ لەو خاوەنیەتە دابیت سەدا سەد لەژیانتدا راست بی". ئاماژەی بە وتەیەکی پۆلس کرد کەلەبارەی جیاوازی نێوان ژیانی سەر زەوی و ژیانی بەهەشت دەکات: "ئێستاکە من بەتاریکی لەنێو گلاسەوە دەڕوانم، بەڵام ئەوکات ڕووبەڕوو دەبینم، ئێستا بەشێك دەزانم، بەڵام ئەو کات بەجۆرێك دەزانم تەنانە وەك خودا دەناسرێم".

لەگفتوگۆیەکی دواتر، لەماڵی خۆی لە تشاباکا، لەنیویۆرك، کلینتۆن پێی وتم، " ئەگەر رازیبوویت بەوەی هەموو شتێك نازانی، زەحمەتترە لەوەی هەستکردن بەهەرجۆرە خۆشییەك کە لەئازاردانی کەسانیتر وەریدەگری. گەرەنتیت دەدەمێ ئەوکەسانەی فڕۆکە بەرەو سەرەوەی هەورەکان دەفڕێنن بڕواناکەن کە بەتاریکی لەنێو شووشەکان ببینن، ئەوانەی مزگەوت دەتەقێننەوە و شوێنە پیرۆزەکان دەڕووخێنن بیرلەوە ناکەنەوە کە ئەوەی دەیزانن بەشێکە لەزانیارییەکان، ئەو کەسەی ئیسحاق رابینی کوشت بەو مەبەستەی کە " جووێکی خراپ" بوو، قەناعەتی تەواوی هەبوو کە ئەمانەی هەموو دەزانی. ناتوانی نیشانی ئەوە بدەیت ئەگەر تۆ کەسێکی ئیماندار کە ئایین کاریگەری بەسەر سیاسەتەکانی تۆوە نییە، بەڵام گەر بڕوات وابێ هەموو ئەو شتانە دەزانی کە پێویستە بزانرێ، ئینجا وابیر لەخەڵك دەکەیەوە کە پیرۆزیان کەمترە، بەهایان کەمترە و شایستەی رێزگرتنیشیان کەمترە. نەخێر ئەوە ناگەیەنێ کە راستەقینە نییە، بەڵکو ئێمە لەهەموو شتەکان نازانین. زۆربەی ئایینەکان هەمان شتەکان فێری خەڵك دەکەن—جۆرێك لەئاوێتەبوون کەئەمەش بۆهەر کۆمەڵگایەك کارێکی باشە. بارودۆخمان باشتر دەبێ گەر دیالۆگێکی راستگۆیانە لەبارەی خاڵە جیاوازەکانمان بکەین و بەهەموو کەسێکیش بڵێین هەموو راستییە رەهاکان نازانن".

قورئانیش ئایەتێکی تێدایە هەمان ئەو مانایەی دەستەواژەکەی کلینتۆن دەدات کە لەپۆڵس وەریگرتبوو: ((فاستبقوا الخيرات الى الله مرجعكم جميعا فينبئكم بما كنتم فيه تختلفون)) ئاماژەکردنی کوشتنی جالوت بەدەستی پێغەمبەر داود، قورئان ئامۆژگاری دەکات و دەڵێ، ((ولولا دفع الله الناس بعضهم لبعض لفسدت الارض ولكن الله ذو فضل على العالمين)).

زێدڕۆیی نییە گەر بڵێین کەئەگەر داهاتوومان " پڕبێت لە بەزەیی" ئەوا خەڵکی هەموو ئایین و کلتوورە جیاوازەکان پێویستیان بەگونجانی یەکترەوە هەیە. لێرە فێرکردن رۆلی سەنتراڵی هەیە.

پێویستە لەسەرمان بەدوای هەموو شێوازەکانی پێشکەوتن و گواستنەوەی تێگەیشتنە هاوبەشەکانی زیاتری مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پەیوەندییەکانی نێوان ئیسلام و رۆژئاوا و وەرێکخستنی هەرسێ باوەڕەکانی ئیبراهیمی، هەموو ئەو مەسەلانە بگەڕێین کە چۆنیەتی جیاوازییەکانی نێوان ئاستی و پڕۆپاگەندەی خورافی دیار دەکەن. ئەمانە مەسەلەی گەورە و تەشەنەکراون، پێویستیان بە پشتبەستنی سەرچاوەی زۆر هەیە، نەك تەنها بە دەستە وەڵامێکی "راستە". ئەم رازیبوونە گشتگیرییە پێویستی بە بیرکردنەوە و هیوای زیاتر هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا گفتوگۆی گەردەلوولی و یەکلایکەرەوەکان ئەرزیەتێکی هاوبەش پێکدێنن بۆئەوەی بەشداربووان وتارە لاوازەکانیان شانبەشانی وتارە زیندووەکان بخەنەڕوو. دیالۆگ بەتەنها گەرەنتی نییە بۆ ئاشتی، باشتروایە هەندێ لایەن سەرقاڵی پاراستنی دۆگما کۆنەکان بن و ئەوانەشی کەدەمێننەوە دووبارە بەسەریاندا بچنەوە بۆ هەمووارکردنیان.

ساویلکەییم پێوەدەبینرێ گەر هەموو باوەڕم لەو پڕۆژانەدا بنێم کە بە کۆمەڵ کاری بۆدەکەین لەژێرناوی، " بۆچی ناتوانین هەموومان لەگەڵ یەکدا بگونجێین؟" بەشێوەیەکی نۆرماڵ، ئەو خەڵکانەی لەمجۆرە پڕۆژانە بەشداریدەکەن پێویستیان بە رازیکردن نییە، ئەوانەشی کە لێپرسراون لەکێشەکان بەشداری ناکەن. ئەنجامەکەی زۆر شیرین دەبێ- بەرچاوڕوونیشە، بەڵام لەخواردندا کەم تواناداێ. لەسەر ئەم کۆمەڵە مەسەلانەوە، بەتایبەتی لەم کاتە، تەرکیزکردن لەسەر تواناکان لەسەر تەواوی ئاستەکان بەهای خۆی هەیە. لەوەیە نەتوانین ئایدیەی توندڕەوی بگۆڕین، بەڵام دەتوانین چالاکتر و یەکگرتر و دڵنیابوونی بکەین.

بۆیەش، لەلایەن ئەم راستییەوە هاندەدرێم بەوەی کە هەوڵەکانی تێکەڵبوونی کلتوور و ئایینەکان بۆتە گەشەکردنی پیشەسازی لەزۆر رووی کۆمەڵگاوە وەك زانکۆ و دەزگاکان. زۆرجار لە هەموو شوێنێکدا دەبینی، مەسیحییەکان و موسڵمانەکان و جوولەکەکان—زۆرجار خەڵکانی ئایینی تریش—بەیەکەوە کۆدەبنەوە گفتوگۆ دەکەن واژوو لەسەر بەیاناتەکان دەکەن و بەدوای ستراتیژیەتدا دەگەڕێن. جێی سەرسوڕمانی نەبێ، دەستپێشخەریە جیهانییەکەی بیل کلینتۆن، کە جێبەجێکردنی چوار لایەنی کردەیی گرتەوە، لەنێوانیشیاندا ئایین. گرووپی باڵای شارستانیەتەکانی هاوپەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان، کەلەلایەن تورکیا و ئیسپانیاوە سەرپەرشتی دەکرێ، تێدەکۆشن لەپێناو بەرزکردنەوەی گیانی لێبووردەیی و نزیککردنەوەی هەندێ ئەقڵەکانی جیهان. رێکخراوێکیتر کەپێی دەڵێن میدان—ناوەکەی لە وشەی عەرەبی وەرگیراوە بەمانای چوارڕیانی شار—زنجیرەیەك گفتوگۆی راستەوخۆی پێکدەینی. بۆنموونە، ئایا چ پرسیارێك لە باوانی کچێکی

عەرەبستانی سعودی بکرێ، قوتابییەکی کۆلیژ لە پاکستان، دوکاندارێکی سوننی لەعێراق، یاخود مامۆستایەك لە ئێران؟ ئایا چیمان لەوان دەوێ تالەبارەی ئێمەوە بزانن؟

بەناوی ئەم شارە ئیسپانیا کراوە، کەتیایدا لەچەرخەکانی ناوەڕاست موسڵمان، مەسیحییەکان، جوولەکەکانی لێ دەژیاو بەیەکەوە گەشەیان دەکرد. زانکۆی یاڵ بەشداریکرد لەگەڵ سەنتەری نیشتیمانی بۆ ئینجیلییەکان و حکوومەتی مەغرب بۆ دەستپێکردنی دیالۆگ لەنێوان مەسیحی و موسڵمانان. دەزگای لاوانی فرە ئایینی، بارەگاکەی دەکەوێتە شیکاغۆ لەلایەن دکتۆر ئێبوو پاتێل سەرپەرشتی دەکرێت، بۆ هێنانی خەڵکانی لاو لە ئایین و نەتەوەی جیاواز بۆئەوەی بەیەکەوە بەشداربن لە کارکردن لەپێناو دادگەری کۆمەڵایەتی. ڕێکخراوی چاندنی تۆوی ئاشتی بەردەوامە لە پێدانی دەرفەت بە لاوانی عەرەبی و ئیسرائیلی بۆفێربوون لەبارەی هەریەکەیان و لە ژینگەیەکی ئازاد لەنێو فشاری توندی نیشتیمانەکانیاندا.

هیوا هانی ئەمجۆرە پڕۆژانە دەدات بۆ هێنانی بیرۆکەی چیرۆکێکی ئەم دراما ئەڵمانییەی بەناوی Nathan the Just ی سەدەی هەژدەم. ئەم چیرۆکەیە باس لە ئەلقە (خاتم)یەکی تایبەت دەکات کەدەبێتە هۆی گواستنەوەی ڕێزگرتنی هاوشانی خۆی لەسەر زەوی و ڕەزامەندی خودا. ئەم ئەلقەیە لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکیتر ئەم دەست و ئەو دەست دەکات، هەمیشە دەکەوێتە چاکەکارترین کوڕەکان (ئەمەش، لەپاش هەموویان، لە سەدەی هەژدەم، هیچ لە کچەکان ڕۆلیان نامێنێ لە چیرۆکەکە). سیستەمەکە بەباشی کاریدەکرد لەلایەن یەکێك لەنەوەکان پێکهاتبوو لە سێ کوڕی یەکسان لە چاکەکردن. بابەکەش بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، هونەرمەندێکی ڕاسپارد بۆئەوەی دوو ئەلقەی هاوشێوەی تریش دروستبکات، بەجۆرێك هیچ کام لەم کوڕانە نەتوانن جیاوازی لەنێوان ئەم دووانە و ئەلقە بنەڕەتییەکەدا بکەن. بەرلەوەی ژیانی زیاتر خراپ بێ، باوکەکە هەرسێ ئەلقەکەی بەکوڕەکانیدا و پێشی ڕاگەیاند هەریەك لەئێوە بەجۆرە ڕەفتاربکات کە خۆی خاوەن ئەلقەی بنەڕەتییەکەیە. کوڕەکان کەوتنە مشتومڕ گوایە ئەلقەی کامەیان بنەڕەتییەکەیە، مەسەلەکەش ڕادەستی دادگاکرا. بەهۆی ڕێنمایی دادگا، هەموویان ڕازیبوون لەسەرئەوەی کەتاکە چارەسەر ئەوەیە هەریەکێکیان تەواو باوەڕی بە ئەلقەی خۆیەوە هەبێ بە بەرزە بەهاوە بپیارێزێ لەکاتی ئەنجامدانی کردە ئەخلاقییەکان. لەگەڵ ئەوەی ڕێگابدەن بە هەندێ شیاوانەی تر.

لەم ڕۆحییەتەوە، گەیشتینە پێشنیازەکانی حەوتەم و کۆتایی. سەرکردەکانی قاعیدە نە بەواقیعیانە قسە دەکەن، نە بە گاڵتە. خۆیان وەك مەسەلەکانی مێژوویی، ناسنامەیی، ئیمانەوە

حیساب دەکەن. بۆئەوەی گوێمان لێبگرن، پێویستە بەقووڵی مامەڵە لەگەڵ مەسەلەکان بکەین. هەر سێ ئایینە یەکگرەکان نەریتێکی دەوڵەمەند دەداتە ڕێسا و ئەخلاق و باوەڕە ئاوێتەبووەکان. هەریەکەیان شوێنی بەهایەکی بەرز لەسەر دادگا و بەزەیی دەگرێتەوە، لەسەر هەمان ئەرزیەتی هاوبەش ڕێنماییی دەدەن، پێشکەشکردنی دەرفەت بۆ لێبوردن، هەریەکەشیان ئایینی ئاشتین. سەرکردەکان نابێ دوودڵ بن لە کێشکردنی بەهاکان بۆ پێناسەکردنی ئەو شتانەی کەباشترینیانە بۆ کلتووری هەردوو ئایینی ئیسلامی و مەسیحی، گەڕان بەدوای ئامانجە هاوبەشەکان. ئەم ئامانجانە هێرشکردنە بۆسەر هەژاری جیهانی هەروەك ئامانجەکانی پێشکەوتنی هەزارەیی کەلەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە وێنای بۆکێشراوە، یاخود " ئاشتی ئازا" کە ئیسحاق رابین ئارەزووی بۆدەخواست لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، یاخود بەدیهێنانی ئەم ئارەزووە کە شا عەبدوڵڵای ئوردن دەریدەبڕی، بەدیتنی ١.٢ ملیار موسڵمانی جیهان ببنە " شەریکی تەواوی ئەم پێشکەوتنەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی، هەروەها گەشەکردنی مرۆڤایەتی لەم چەرخەماندا.

لەیەکێك لە چیرۆکە خورافییەکانی رۆمانی ئەیسوب، شێرێك راوی مێگەلە گایەك دەکات بێ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بێنێ، چونکە ئەم شێرە هەمیشە ئەم مێگەلەیەی دەبینی لەیەك بازنەدا کۆدەبوونەوە. لەهەر لەیەکەوە ئەم شێرە نزیك دەبۆوە و هێرشی دەبرد تووشی چەند قۆچێك دەبۆوە. رۆژێکیان گایەکان مشتومڕیان دەکەوێتە ناو تووڕە دەبن لێك دەترازێن، هەریەك بەنێو مێرگەکەدا پەرتەوازە دەکەن. بەتاکە گیران، هەریەکەشیان بووە نێچیری شێرەکە. پێویستە ئاگاداری خۆمان بین، بەبێ ڕێزی سەیری باوەڕەکانمان نەکەین، چونکە ئەم جیهانەی ئەمڕۆ خالی نییە لە شێری بۆسەکێشراو.

## (١٩)

## داواکردنی فریشتەیەکی باشتر

زۆر وریای ئەو کەسانەم کەداوای دڵنیابوون لە پرسیارە گەورەکان دەکەن. دڵنیابوون خۆی لەخۆیدا سوودمەندی نییە، بەجۆرێك پشت دەبەستێ بەوەی ئایا ئەو کەسە تاچەند دڵنیایە لەوەی راستییەکی راستەقینەیە. ئایین بەشێوەیەکی تایبەت پشت بە هەوڵەکانی سەلماندن دەبەستێ. بۆنموونە، هەندێ گرووپی مەسیحی لەو هەوڵەی ئەوەدابوون بۆ بەکارهێنانی رێگای زانستی بۆ نیشاندانی ئەوەی کە دوعاکردن سوود بەخاوەنەکەی دەگەیەنێ. ئەمەش بەدابەشکردنی دوو گرووپی خەڵکی نەخۆش، دوعایان بۆ گرووپێکیان کرد بۆئەوەیتریان نەکرد. تائەمڕۆکەش ئەنجامەکانی ئەم تاقیکردنەوەیە یەکلاییەنەکراوەتەوە. ئایا ئەمەش لەبەرئەوەی خودا گوێ نادات یاخود لەبەرئەوەی باشترینی شوێنکەوتووانی مەسیحی ئەم تاقیکردنەوەیە هەرەس پێدێنن بەوەی بەنهێنی دوعای بۆهەردوو گرووپەکە دەخوێنن؟ هەروەك س، لویس مێژوونووسی Narinia(*) ، تێبینی ئەوەیکرد، " مەسیحی و بەرهەڵستکارەکانیان پێشبینی ئەوەدەکەن هەندێ دۆزینەوەی نوێ یان ئەوەتا دەبێتە هۆی گۆڕانی عەقیدە بۆ مەعریفە، یاخود دەبێتە هۆی کەمکردنەوەیان بۆ عەبەسیەتێکی ئاشکرا. بەڵام ئەمەش هەرگیز رووینەدایە".

کاتێ دەچمە نێو تەمەنەوە، کاسۆلیەکی باشم بەبیردێتەوە—هاورێیەکی هاورێیەکمە—ئەو پارچە نووسینەی لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە ئەوەبوو، " ئەم جیهانەم بەجێهێشت کەلێیەوە هاتمە ژوورەوە: سەرسام بن". ئەم ساڵانە هیچ دڵنیایەکیان لەبارەی ئایینەوە بۆنەهێناوم. مەسیحییەکی زۆر گەشبینم، بەڵام باوەڕیشم بەخۆم نییە، گوماندارم. رێز لەهەموو ئایینەکانیتر دەگرم چونکە دەزانم ئەوانیش بۆهەمان راستی هاتوونە، بەس بە وێنەیەکی جیاواز. زانای لاهوتی پرۆتستانتی پۆڵ تیلیچ دەینووسێ،

---

(*)Narinia، زنجیرەیەکە پێکدێت لە حەوت چیرۆکی خورافی منداڵان.

" گومان پێچەوانەی عەقیدە نییە بەڵکو توخمێکە لەتوخمەکانی". زۆر بەم مانایە سەرسامم.

دوای دانپێنان بەو دوودڵیەی، زۆر بەتوندی دەڵێم فەندەمێنتالیستەکان هەڵەن، بەڵام زۆر لەوە دڵنیان ئەوان لەسەر بیروباوەڕێکی راست بن. ئینجیلییەکان رازین لەسەر پێدانی دەسەڵاتێکی بەرز بۆ تێکستی ئایینی کەچی فەندەمێنتەلیستەکان سوورن لەسەرئەوەی هەموو وشەیەکی کتێبی پیرۆز راستە. باوەڕ لەکتێبی پیرۆز یاخود هەر کتێبێکیتری پیرۆزی هاوشێوە گریمانەی زۆرە لەبارەی توانستی گێڕانەوەی مرۆڤ بۆ بەرزکردنەوەی کاریگەریەکانی زەمان و شوێنەکانیان. کتێبی پیرۆز پڕیەتی لە سیاسەت. بەبۆچوونی من،

بنەمای فێرکردنەکان، کێشی ئەوەی هەڵگرتووە کە ئایین لەبارەی چییەوە دەدوێ. نیگەرانم بەرامبەر ئەو کەسانەی، کە ئاماژە بەهەندێ سەرچاوە دەکەن وەك دەستەواژە وەریدەگرن، بڕوایان وایە کە ئافرەت نابێ رێگای پێبدرێ بۆئەوەی سەرپەرشتی کلێسە بکەن یاخود سێکسی هاوڕەگەزی لەلایەن خوداوە بەکاری قێزەوەن دەناسرێت. وەك رێنماییەکی پراکتیکی بۆ ژیانی ئەخلاقی ئیسرائیلی کۆن، کتێبێکی وەك Leviticus لەوەیە خزمەتێکی باشی کردبێ، بەڵام پارچە نووسراوێك کە قەبووڵی بەندایەتی دەکات، دەسەڵات دەداتە کەسێك بە فرۆشتنی کچەکەی، قەدەغەکردنی رازاندنەوەی ریشی، هەروەها قەدەغەکردنی لەبەرکردنی ئەو پۆشاکانەی کەبە دەزووی جیاوازەوە دەدوورێن بێ خەوش و تاهەتان. مەسیح پێغەمبەر فەندەمێنتالیست نەبووە. لەلایەن فەریسەکانەوە ئیدانە دەکرا بەوەی لەرۆژانی شەممە کاردەکات، مێزی خواردنەکەی لەگەڵ کۆکەرەوەی باجەکان دابەشدەکرد، یارمەتی کەسانی زیناکاری دەدا. بەربەستەکانی کلتووری وشەی قەدەغەکراوی شکاند بە گفتوگۆکردنی لەگەڵ ئافرەتان لەسەلا بیرەکانی ئاو، قسەکردنی بەجددی لەگەڵ منداڵان. بەئاشکرا رێسای " چاو بەچاو" ی رەتکردەوە.

ئەگەر خودا بەرنامەیەکی هەبێ، ئەوا جێبەجێ دەکرێت. ئەمەش دەسەڵاتێکی ئاسمانییە، نەوەك هی ئێمە. ئەگەر یەکێك بڕوای وابێ لەگەڵ دروستکردنی ژیان و ئازادی سەربەخۆیشمان پێدرابێت، ئەوا ئێمە لەبەردەم پرسیارێکیتر سەرسام دەبین ئایا چیمان پێدەکرێت لەگەڵ ئەم دوو دیارییە. بەمەش هەردوولا دەگرێتەوە

بەرەنگاربوونەوەیەکی پڕاکتیکی و ئەخلاقییە، هەروەها لەگەڵ ئەوەی ئەم کتێبە باسی لێوە دەکات.

ئایین گرنگی بە هیوا و ترسەکانی هەموو ساڵاکان دەدات زاراوەی سەرۆکەکانی ئەمەریکا زۆر خۆشنوود نییە. سیاسەتەکانی حکوومەتی ولایەتە یەکگرتووەکان پێویستە لەسەر ئەو بنەمایەوە بنیاتبنرێ کەخۆمان هیوامان وایە بۆ سەرکەوتنی ولاتەکەمان لە ماوەیەکی بێ سنوور لەسەر ئەم زەویە، نەك بۆ پێشبینیکردن بۆماوەی هەزاران ساڵ. لەهەمان کاتدا، ئەوەی لەسەر زەوی بەدەستمان هێناوە تێکەڵەیەکە لەگەڵ ئەو تێگەیشتنانەی کە مرۆڤ لەبارەی خوداوە هەیەتی. ئەوکاتەی گەشتم بە جیهاندا دەکرد، زۆرجار رووبەڕووی ئەم پرسیارە دەبوومەوە،" ئایا بۆچی ناتوانین ئایین لەدووری سیاسەتی دەرەوە رابگرین؟" وەلامەکەشم ناتوانین و ناشکرێ. ئایین لایەنێکی گەورەیە لەهاندانی خەڵك و وێناکردنی بۆچوونەکانی رەوشتە دادگەری و راستەقینەکان. پێویستە ئەمانەش بە هەند وەربگیرێن. ناکرێ سەرکردەکانمان هەر بڕیارێك دەربکەن دووربێ لە باوەڕە ئایینییەکانیان. سنوورێك هەیە کە تاچەند مێشکی مرۆڤ پۆلێن دەکرێ. بەهەر حاڵ، بۆچی سەرکردەکانی جیهان ئەوانەی ئاییندارن بەجۆرێك کار و قسەدەکەن کەهیچ رەنگدانەوەیەك نییە لەگەڵ ئایینەکەیان؟ پێویستە لەگەڵ بیروباوەڕەکانمان بژین لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ جیاوازییەکانیشماندا بگونجێین نکۆڵیکردن کارێکی باش نییە.

ئەم مانایە نییە، بەوەی گرنگی ئەم جیاوازیانە گەورەبکەین. بەڵکو ئەمە ئەدگاری مرۆڤە بە رێکخستنیان بۆ گرووپەکان. بەگوێرەی زۆربەمان ئەم پڕۆسە بەزۆریە کارێکی نێگەتیڤە. ئەو گرووپانەی ئێمە پەیوەندیمان پێوە هەیە بەشێکن لە میرات و کلتوورمان—ئەنجامی ئەوەی لەکوێ لەدایك بووینە و چۆن گەورەبووینە. میراتی خێزانەکەم جوولەکەیە، بەلام من وەك مەسیحییەکی کاسۆلیکی گەورەبوومە. ئەگەر، ئەو کاتەی مندال بووم، بناردرابامایە مەعبەد لەبری ئەوەی بۆ کلێسا، ئەوا تادەگەیشتمە تەمەنی رووناڵی لەگەڵ گرووپێکی ناسنامە جیاواز گەورەدەبووم. خۆم لەدەرەوەی ولات لەدایك بوومە. ئەگەر جەنگی سارد نەبووایە خێزانەکەم کۆچیان نەدەکرد بۆ ولایەتە یەکگرتووەکان، هەروەها منیش هەرگیز نەدەبوومە هاوولاتییەکی ئەمریکی.

سروشـــت بـــەجۆرێك ڕێگامـــان پێـــدەدا نـــە باوانمـــان هەڵبـــژێرین و نەشـــوێنی لەدایکبوونیشمان. ڕاستە، هەنـدێکمان تـەوازنی پێشـبڕکێی فەلەسـەفیانە و گـۆڕینی ئایینێك بۆ ئایینەکەی تر لەسـەر بناغـەی ڕوونـاکی ڕۆحـانی و قەناعـەتی عـاتفی و فکرییە. هەندێکیتر هۆکار دەدۆزنەوە بۆ گۆڕینی دڵسۆزیان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکیتر. بەڵام زۆربەمان لەسەر هەمان پۆلێنی گشتی دەمێنینەوە ئەوانەی کە پێشتر لەسەریەوە مابووینەوە بەهۆی هەندێ هۆکـار کـە لـەدەرەوەی کـۆنترۆڵی خۆمانـەوەبوو. ئەمـەش دەستکەوتێکی زۆر مەزن نییە.

بەشێوەیەکی لۆژیکی، جیاوازییەکان کێشەیەکی وا گەورە نییە. خەڵکی نێو نەتەوە جیاواز و ئایینە جیاوازەکان پێویستە خۆیان بگـونجێنن. لەگـەڵ ئەمانەشـدا، بۆشـایی نێوان ئەوەی کە پێویستە و ئەوەی لە واقیعدا هەیە بۆتـە سەرچـاوەیەکی دووبـارە لـە تەواوی بوونی مرۆڤدا. چەند دەیە سـاڵێك پـێش ئێسـتا، ڕەینهۆڵـد نیبـور ئاگـاداری کردینـەوە لـەوەی ئـەم کـارە نامرۆڤانەیـەی کەلەبەرامبـەر نەتـەوە و گرووپەکانـەوە ئەنجامدەدرێت نابێ وەك مەسـەلەیەك تێپـەڕبێت بـەجۆرێك تاچـەندە هـەوڵی خۆمـان دەدەین. دەنووسێ، " ناکۆکی کۆمەڵایەتی، کارێکە دوورە لەخۆ ڕزگارکردن لەمێژووی مرۆڤ، لەوانەشە تاکۆتاییەکەشی بێت". دان بەوەدەنێ، پیاوی چاك و زیرەکەکان لەوەیە بەدوای ڕێگەگرتنی کارەسات بگەڕێن، بەڵام لەوەیە نـەتوانن بـەرەنگاری ئـەو تـرس و بەرزخوازیانە ببنەوە کەوا لەم گرووپانە دەکات ڕووبـەڕووی یـەك ببنـەوە. زیرەکییـە، بەوەی نیبور بەرلـە ڕوودانـی جـەنگی جیهـانی دووەم گەیشـتۆتە ئـەم بڕیـارە. خـۆی کاردانەوەی بۆ جەنگەکە نەبوو، بەڵکو پێشبینی ڕوودانی دەکرد.

ئەگەر دانێین نیبور لەسەر ڕاستییە، گەڕان بەدوای ئاشتی هەمیشە کارێکی زەحمەتی بەدواوەیە. هێشتاکەش، ناتوانم بـەم بۆچـوونە قەبووڵبکـەم چـونکە کارەکتـەرەکانمان خەوشدارن، هیچ شتێك لەئارادانییە بۆ سەلماندنی بارودۆخی مرۆڤ. دانـەرانی سیاسـی بەڕێگەیەکی سوودمەندانە دەتوانن بەدوای ئەو ڕێگایانە بگەڕێن بۆ کەمکردنەوەی ئەو ناکۆکییە کۆمەڵایەتییانەی کە نیبور ئاماژەی پێـداوە—لەگـەڵ ئـەو کەموکوڕیانـەی هەمانە هێشتاکە هیوامان هەیە بتوانین داهاتوویێك بۆخۆمان دروستبکەین. دەزانین کە ڕێگای ڕاست بۆ سەرکردایەتیکردن دەتوانێ زۆر شت بکات بۆ ڕێگەگرتن لە شەڕەکان،

دووباره بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا وێرانەکان، فراوانکردنی ئازادی، هەروەها یارمەتیدانی هەژاران.

لەسەرەتای ئەم کتێبە ئەوەم نووسیوە، بەنیازم ئەم شێوازانە بخەمە روو بۆ کۆکردنەوەی خەڵك لەپاڵپشتیکردنی سیاسەتەکان کە رەنگدانەوەی یەکگرتوویی دەدەن لەوەی پەرتەوازەی ئایین بکەن. ئامانجم ئەوەنییە بە دروستکردنی بازنەیەکی رۆحانی بەجۆرێك ببێتە کەمکردنەوەی پێشبڕکێی داوایە ئایینییەکان بەرژەوەندیم لە چارەسەرکردنی کێشەکان وەڵامدانەوەی رێبازێکی سیاسی پراکتیکییە. تەکنەلۆژیا زیاتر شەفافیەتی لەگەڵ خۆی هێناوە، سنوورەکان زیاتر هاتنە ژوورەوەی بەخۆوە بینیوە، چەکەکان زیاتر ترسناك بوونە، ناکۆکییەکان تێچووی زیاتری دەوێ. لەپرۆسەی ئاشنابوون بە خەونەکانمان، زانایانیش مۆتەکانی نزیکترکردوون لە ژیانی واقیعی. کاری سەرکردەکانمان چاودێریکردنی ژینگەی نێودەوڵەتییە، بەجۆرێك دەتوانین لەگەڵ ئازادی، ئاسایش، دادگەری زۆردا بژین، بەڵام لەسروشتیدا، پێویستی بە هاریکاری و گەیاندن هەیە.

سەرۆك بۆش شایانی سوپاسگوزارییە چونکە وڵاتی ئەمەریکای کردە سەنگەری بەرزنرخاندنی دیموکراسیەت. هەروەها دەبێ ستایش بکرێت لەسەر ناونانی ئازادی سیاسی وەك سەرچاوەیەکی شارراوەی جیهانی یەکگرتوو. توانستەکانی خۆی لاوازکرد لە پێشڕەویکردنی بەنێو ئەم هەموو هەڵە و فەرامۆشکردنانەی کە زۆربەی ئەو وڵاتانە ئەنجامیاندا کە تۆزقاڵێ پەرۆشی لەوەستان لەگەڵ ئەمەریکایان هەبوو. بەڕوونی نابێ، روانینی تەسك و بێ لایەنی یەکەم دەورەی سەرۆك بۆش نابێ دووبارەببێتەوە. پێویستە هاوپەیمانانمان چاکبکەینەوە، هەموو هەرێمێك بە جددی وەربگرین، لەوەش بگەین ئەگەر وڵاتانیترمان دەوێ هاوکاریمان بکەن لەو ترسانەی بوونەتە هەڕەشە بۆسەرمان، هەروەها دەبێ مامەڵەش لەگەڵ ئەو مەترسیانە بکەین کەهەڕەشە لە وڵاتە هاوپەیمانانمان دەکەن.

یارمەتییەکی زۆری ئەمەریکای دەدا گەربێتوو ئەمەریکییەکانی دەرەوەی رەنگە سیاسییەکان کۆببوونایەوە (هەروەك لە بەشی حەوتەم پێشبینیم بۆیدەکرد) بۆ ئەوەی فشاربخەنە سەر حکوومەتەکەمان تاوەکو پێشڕەوی مافەکانی مرۆڤ و مەسەلە مرۆڤایەتییەکانی بکردایە. ئەمەش دەبووە هۆکارێك بۆ زیندووکردنەوەی هاوپەیمانان و زیادکردنی ئاسایش و ئارامی لەدژی هەر کردەیەکی تیرۆری.

لەوەشیان گرنگتر پرسیارێکیترە، چۆن ئەمەریکییەکان پێناسەی ڕۆڵی نێودەوڵەتی وڵاتەکەمان دەکەن. ئایا سەیری خۆمان کردییە وەك ملکەچییەکی یاساکان: یاخود بەمجۆرە مامەڵەمانکردییە کە لەگەڵمان دەگونجێ؟ ئایا ئەم لێپرسراویەتەمان هەیە بۆ بۆبەهێزکردنی دەزگا و یاسا نێودەوڵەتییەکان، یاخود ئەرکێك بۆمانەوەی ئازادی لەنێو ئەم تەلبەندانەدا لە " وەڵامێك بۆ بانگکردنی لە دوورەوەی ئەستێرەکان؟" ئایا ڕۆڵی گونجاوی ئێمە پێشڕەوی کردنە یان زاڵبوون؟

ولیەم کریستۆڵ، نووسەری کۆنزەرڤاتیڤی نوێ، پرسیاری ئەوەیدەکرد، " چ کێشەیەك لە زاڵبوون و خزمەتکردنی ڕێسای ڕاستەقینەکان و نموونە بەرزەکان هەیە؟" ئەمە پرسیارێکە ئەمریکییەکان سەدەیەك پێش ئێستا لەکاتی داگیرکردنی فیلیپین دەیانپرسی. سەرۆك ماکینلی باسی ئەوەیدەکرد کە وەڵامەکەیان لە ئاسمانەوە وەرگرتووە بەجۆرێك ماندێتێکیان لەبەردەستە بۆ چەسپاندنی ویستەکانیان. باوەڕی پێبێنیێ یان نا ئەمە وەڵامێکی ڕاست بوو بۆ سەردەمی خۆی بەڵام بۆ ئەمڕۆکە وەڵامێکی هەڵەیە. سیاسەتی زاڵبوون پێچەوانەی ڕوانینەکانی ئەمەریکایە، هەروەها ڕێگایەکی لاوازیشە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانمان. داواکردنی لەو خزمەتەی لەوەی سەرکردەکانمان باوەڕیان پێ هەبوو " ڕێسا ڕاستەقینەکان و نموونە بەرزەکان"—هەروەك ئێستا لەعێراق پەیڕەو دەکرێ—بۆتە هۆی بەهەوابردنی سەرچاوەکانی ئەمەریکی و هێزە سەربازییەکان و هەیبەتی وڵاتەکەی. با ئەمە وەك وانەیەك وەربیگرین. هەڵاوێردنی ئەمریکی ژیانی دوور و درێژی نەك هەرتەنها قەرزاری هێزی ولایەتە یەککگرتووەکانە بەڵکو زیرەکی و چڕکردنەوەی ئەو هێزەیە کە سەرفیانکردووە—لەنێوانیشیاندا بەکارهێنانەکە تەنها بۆ سەربازی نییە بەڵکو بۆهەموو ئەو توانست و سامانانەیە کەبەشداری دەکەن لە ئاسایش و ناوبانگی باش.

لەکاتی بەرەو پێشچوون، زۆر سوود لەوە دەبینین گەر کارەکتەری ئیبراهیم لینکۆلن مان بەبیرخۆمان بێنینەوە لە سەرکردایەتیکردنی شەڕەکان. قەت لەشەرکردن بۆ مەسەلەیەکی دادگەری پاشەکشەی نەدەکرد، بەڵام هەرگیزیش داوای قۆرغکردنێکی چاکەی نەدەکرد. بەوە ڕازیبوو کە ویستی خودا دێتەجێ بێئەوەی داوای تێگەیشتنی لێبکات. ڕەتی پێشنیارێکی دەکردەوە کە داوا لەخودا بکات ببیە لایەنێك لەم یەکێتییە، بەڵکو لەبری ئەوە داوای دەکرد یەکێتی ببێتە لایەنێکی خودا.

لینکۆڵن سەرکردایەتی وڵاتێکی دابەشکراوی دەکرد. پێویستە ئێمەش سەرکردایەتی جیهانێکی دابەشکراو بکەین. لەبەرئەم هۆیەشەوە، دەبێ ریالیزم و ئایدیالیزم تێکەڵبکەین، شوێنی ئەخلاق لەناوەندی سیاسەتە دەرەکییەکانماندا نزیك بکەینەوە تەنانەت کاتێ گفتوگۆی تێگەیشتنێکی جیاواز دەکەین لەسەرئەوەی ئایا ئەخلاق مانای چییە. پێویستە خۆمان رێکبخەین بۆ تێگەیشتنی جیهانێکی باشتر کە دڵسۆزی ئایینی هەردوو کە هێزێکی پۆزەتیڤی بەتوانا و هێزێکی رووخێنەری پچڕاو. هەروەها پێویستەی بە ورەییەکی بەرز و باوەڕبەخۆبوونەوە وەڵامی مەترسییەکانی قاعیدە و هاوشێوەکانی بدەینەوە. دەبێ لەهەڵوێست و پەیامەکانمان زۆر روون بین نەك تەنها بۆئەو لایەنانەی کە ئەمریکا لەدژیانەوە دەوەستێ، بەڵکو بۆئەوانەش کە لەپاڵ ئەوانیشەوە دەوەستن.

نیو سەدە پێش ئێستا، لە نووسینەکەی لەبارەی جەنگی سارد، باوکم دەیگوت، ئێمە "تاکێکی ئەمریکین، یاخود کرێکارانی بەریتانی، موحافیزکاران یاخود پێشکەوتووان، دیموکراتە سۆشیالەکان، یاخود سۆشیالیستە دیموکراتییەکان، سپی، رەش، یاخود زەرد—دەتوانین هەموو ئەمانە قەبووڵبکەین کە کەرامەتی مرۆڤ و رێزی تاکەکان" دەبێتە خاڵی جەختکردنەوەی هەموو شتەکان. منیش ئەم بڕوایەم هەیە.

رێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و خۆشگوزەرانی هەموو تاکەکان شوێنێکە کەتیایدا باوەڕە ئایینییەکان و ئیلتیزاماتی ئازادی سیاسی نزیکترین پەیوەندیان لەگەڵ یەکدا هەیە. فەلسەفە لەسەر بنەمای ئەم رێسایەوە چەقی گرتووە کە توانایەکی شاراوەی زۆری هەیە بۆ نزیککردنەوەی هەموو ئەو خەڵکانەی کە بۆچوونی جیاوازیان هەیە، چونکە هیچ کەس هەڵاوێردن ناکات، داوا لەهەمووشیان دەکات بۆئەوەی گرنگی بەهەموو ئایدیییەکان بدەن کەپێویستیان بەیەکەوە هەبێ (*).

پرسیارێك خۆی قوتدەکاتەوە: چۆن دەتوانین هیوای ئەوەمان هەبێ بە یەکگرتنی ئەو خەڵکانە لەدەوری رێسایەك—وەك رێزگرتنی تاك—کە چەمکێکی رۆژئاوایی فەریدە.

---

(*) رێزگرتن بۆ تاکەکان، هەروەك هەندێك دەڵێن، پێچەوانەی رێزگرتن نییە بۆ مافەکانی گرووپەکان. بەپێچەوانەوە، تاکەکان هەوڵی وەرگرتنی مافەکان دەدەن بۆ گرووپەکان کەخۆیان پەیوەندیان پێوە هەیە. بۆیەش، ئازادی لە جیاوازی لەسەر بنەمای رەگەز، جێندەر، یاخود ئایین هەردووکە مافی تاك و گرووپە.

بەدڵنیاییەوە، وەڵامەکە نەخێرە. هیندۆیزم داوای ئەوە دەکەن " هیچ کەسێك کارێك لەگەڵ ئەویتر ناکات کە بۆ خودی خۆی قێزەون بێ". تۆراھ ڕێنمایی ئەوە دەدا" پێویستە دراوسێیەکانت وەك من خۆش بوێ". زەردەشت تێبینی ئەویدەکرد، " ئەوەی بۆخۆم پێم باشە، پێویستە بۆ هەمووان باش بێ". کۆنفۆشیۆس دەیوت،" ئەوەی بۆخۆت حەزناکەی ئەنجامی بدەی، دەبێ بۆکەسانیتریش ئەنجام نەدەی". بووزا فێریکردووین، خەڵکانیش وەك خۆمان حیساب بکەین. راقیونەکانی یۆنانی کۆن گفتوگۆیان لەسەرئەوەدەکرد کە هەموو مرۆڤێك" لەبەردەم دادگای ئازادی یەکسانە". ئینجیلی مەسیحی داوای ئەوەمان لێدەکات، "بەوجۆرە رەفتار لەگەڵ خەڵکی بکە کەخۆت پێتخۆشە ئاوا رەفتارت لەگەڵ بکەن". قورئان هۆشداری دەدا بەوەی باوەڕداری راستەقینە ئەوەی بۆخۆی پێخۆشە دەبێ بۆ برای خۆشی پێی خۆش بێ. لەکۆتاییدا، یەکەم یاسای جیهانی رایدەگەیەنێ، "سەرکەوتنی دادگەری دڵنیابوونەوە لەوەی بەهێزەکان ستەم لە بێ هێزەکان ناکات" ئەمەش، هەروەك بیری لێدەکەینەوە، جۆرێکە لە سیستەمی یاسایی لەوەی جیهان پێویستە بەرەوپێش ببات وەك دیاریەك لەگەڵ خەڵکی عێراق بەکاری بێنێ. لەڕاستیدا، ئەمە یاسایەکی حامورابییە، دیاری شارستانیەت چوار هەزار ساڵ پێش ئێستا لە بابیلۆنی کۆن وەرگیراوە، کە ئێستا پێی دەڵێن عێراق.

لەژێر رۆشنایی ئایدییەکەی لەبارەی ئایینی راستەقینە، بینجامین فرانکلین ئەوەی درکاند کەوا، " باشترین خزمەتکردن بەخودا ئەنجامدانی کردەی باشەیە لەگەڵ مرۆڤ". واهەستدەکەم، ناتوانین تەواو لەوە دڵنیابین، بەڵام دەتوانین بەلایەنی کەم ئەوە بخەملێنین ویژدانێکمان بۆ ئەم هۆکارانە پێدراوە.

بەگوێرەی هۆنراوەیەکی ییتس، رووخان ئەو کاتە روودەدا کە کەم و کوڕی لە عەقیدە هەبێ، خراپترین پڕیەتی لە توانای سۆزداری، ناوەند ناتوانرێ بگیرێت، ئاژاوەش بەجیهاندا بەربڵاوە.

لەسەردەمێکدا دەژین کاتێك خراپترین پڕیەتی لەتوانای سۆزداری. پرسیارەکە لێرە ئەوەیە ئایا ئەوەی لەئێمە ماوەتەوە هاندانی بیروباوەڕەکانی هەیە یان ژیریەتی، بۆئەوەی باشترین هەڵبژاردن دەستنیشان بکات. ژیریەتی لە فێربوونەوە دێت، ئەویش لەپەروەردە. دڵی پەروەردە گەڕانە بەدوای راستی. بەڵام چەندین جۆر راستی هەیە.

لە بیرکاری و زانستدا، زانیاریی بەسەریەکدا کۆدەکرێتەوە. تیۆرەکان لەسەر تیۆری تردا سەرچاوە دەگرێ، یاسا لەسەر یاسا. ئەوەمان دۆزیوەتەوە کە زەوی خڕە، هەرگیز جارێکیتر نابێتە تەختایی. ئەوە فێربووینە کە گۆشەی لایەکی سێگۆشەیەکی لا یەکسان یەکسانە بەدوو گۆشەکەی لاکانیتری. لەرێگای ئەزموون و توێژینەوە، زانایان بەشێوەیەکی بەردەوام زانیاریمان زیاد دەکەن. لەم رووەشەوە، ئێمە زۆر زیرەکترین لەنەوەکەی پێشووتر لەبارەی ئەوەی کە جیهان چۆن بەڕێوە دەچێ.

بەلام لەوە دلنیانین کە ئێمە زیرەکتربین بەبەراورد لەگەل رابردوو لەبارەی سیاسەتی جیهانی و تێگەیشتن لەفرەئاییینەکان.

سەدەی بیستەم خوێناویترین سەدە بوو لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. کاتێ هەزارەی سێیەم هات، سوێندمان خوارد کە دەستپێکێکی نوێ دەست پێبکەین، بەلام تاوەکو ئێستاش بەباشەی دەستمان پێنەکردووە.

خۆم کەسێکی گەشبین و زۆر نیگەرانم، تەمەنم نزیکەی حەوت دەیە سال دەبێ، لەژیانمدا زۆر نموونەی خۆبەخشانەم بینی کە مرۆڤ لەگەل مرۆڤ دەیکات بۆمەبەستی بەردەوامبوونی ژیان، هەروەها نموونەی دڕندانەی زۆریشم بینیوە کە مرۆڤەکان لەدژی یەکەوە دەیکەن بەمەبەستی سەرکەوتن بەسەر یەکتردا. خالە ناکۆکەکانی سروشتی مرۆڤ لێك جیانەکراوەی مرۆڤە. ئازادی هەم دیارییە و هەم ئەرکە بەسەر شان، بۆیە هەلگرتنی لێپرسراویەتە بۆهەلبژاردن هەروەها مەسەلەیەکیشە بۆئەوەی هەلبژاردەکان وەربگرین.

ناتوانم کۆتاییەکی دلخۆشانە بۆئەم کتێبە بنووسم. هێشتاکە لەناوەڕاستی ململانێیەکانەوە ماوینەتەوە. هەروەك بیل کلینتۆن بەبیرمان دێنێتەوە، هیچ کەس لەئێمە ناتوانێ ناونیشانێکی تەواو بە راستەقینە بدات. هەموومان هیوای بەسەرکردایەتیکردنی ناوخۆ و دەرەوە دەخوازین، کە ئارەزووی باشترینی بۆخۆمان و ئەوانیتر بکەین. لینکۆلن، دووبارە ئەم دەستەواژەیە دەلێتەوە، کەلەدوای شەڕەوە دەیوت، " باشترینی فریشتەکانی ئەم سروشتەمان"—داواکردنە بۆئەوەی چاودێری یەکتربکەین بەو رێگایانەی کەبەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ بەهۆی بەرژەوەندی کەسی، لۆژیك، هەروەها زانستەوە وەسفبکرێ.

هەربۆیەش ڕێسا زۆر گرنگە: هەموو تاکێك حیسابی بۆ دەکات. ئەگەر بەڕاستی وەرمان گرتو کارمان لەسەرکرد، ئەوا دەبینە خاوەنی بنچینەیەك بۆ یەکگرتوویی بەدرێژایی هەموو سنوورەکان. دەستێکی بەهێزمان دەبێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆریستان، دیکتاتۆرییەکان، ستەمکاران، هەروەها موتەعەسیبەکان. بەشداری هەموو خەڵکمان دەستدەکەوێ، دەتوانین بەرگری لە ئازادی بکەین و فراوانتری بکەین لەبڕی ئەوەی خوێنی لێبچۆڕێنین. بەئەنجامدانی ئەمانە، هیوای ئەوەدەخوازین بە هێواشی لەگەڵ کاتدا پێشکەوین نەك بەرەو شارێکی تایبەت و ڕۆشنی سەر بەرزاییەك، بەڵکو بەرەو جیهانێك کە توانا و ڕاستی هاوڕێی نزیکی یەکترن و کەرامەت و ئازادی پشکی هەموو تاکەکان بێت.